پێشکەش

به سانای خۆشەویستم و وەچەی داهاتوو.

گزنفۆن

# ئاناباس

وەرگێڕانی لە یۆنانییەوە

عەلی فەتحی

هەولێر - ٢٠١٣

## پێرست

# پێشەکی

خوێنەری بەڕێز، کتێبی مێژوویی ئاناباس یەکێک لەو سەرچاوە بەنرخانەیە کە زۆربەی زانا و توێژەرەکانی بواری زانستی کەڵکیان لێوەرگرتووە. لەسەر ناوچەی ڕۆژهەڵات و ئاسیا بە گشتی و کاردوخ و خالدی و خالیڤیەکان بەتایبەتی، زانیاری بەنرخی تێدا. باسی نەتەوەکانی سەر ڕێگای چوون و گەڕانەوەی لەشکری یۆنانی لەگەڵ لەشکرکێشییەکانی کوروشی دووهەم دەکا. کتێبەکە ناسراوە بە (ئاناباس). جیا لە وشە و ناوی ئاناباس، گەڕانەوەی دەهەزار یۆنانیش وەک ناو بەکارهاتووە. لە دەقی یۆنانییەکەدا بەو شێوەیە نییە. ئەسڵەن باسێکیش لەو ناوەی دوایی نەهاتووەتە گۆڕێ. ئەو تیترە واتە گەڕانەوەی دە هەزار یۆنانی تەنیا لەبەر ئەوەیە کە لەو لەشکرە گەورەیە، سەرجەم دەهەزار کەس بە زیندوویی گەیشتنەوە وڵاتی خۆیان. ئەگەر بە هەڵە نەچووبم ئەو سەردێرە تەنیا بەهۆی وەرگێڕەکان بۆ کتێبی ئاناباس دیاریکراوە.

وشەی ئاناباس (ئەناڤاسی) لە زمانی یۆنانیدا واتای هەڵکشان بەرەو ژوور یا سەرکەوتن دەدا. ئەبەدا بە مانای گەڕانەوە نییە، وەک لە زۆر کتێباندا بەو چەشنە لێکدراوەتەوە. یۆنانییەکان وەک نەتەوە خۆیان لە گەلانیتر بە فەرهەنگتر و خاوەن شارستانییەتی پێشکەوتووتر زانیوە. کاتێک لەشکرەکەیان بەرەو ئاسیا داگەڕاوەتە خوار، دوای شکستی کوروش ناچار بە گەڕانەوە بەرەو ژوور، واتە خاکی یۆنان بوو و بۆیەش گزنفۆن ناوی ئەناڤاسی (چوون بەرەو ژوور) لەسەر کتێبەکەی داناوە. بە واتایەک یۆنانییەکان نەک تەنیا لەباری فەرهەنگ و شارستانییەتەوە، بەڵکوو لەباری هەڵکەوتەی جۆغرافیشەوە خۆیان بەرزتر دیوە.

من دەمزانی بەشی زۆری زانیارییەکان کە لەسەر ئەو کتێبە هەن، ڕاستەوخۆ لە تەرجەمەی فارسی، عەرەبی یا تورکی وەرگیراون. بەتایبەت فارسییەکە لە تەرجەمەی فەڕانسەویڕا و لە سەردەمی قاجار وەرگێڕدراوەتەوە سەر فارسی. بە

ئاشکرا دەسکاری کراوە. کاتێک وەرگێڕاوی فارسییەکە و ئەسڵی یۆنانییەکەم لەبەریەکدانا، ئەوسا بۆم دەرکەوت کە بەهەڵە نەچوومە و بۆچوونەکەم درووستە. ئەوەی ئێستا تۆی بەڕێز دەیخوێنییەوە، دەقی یۆنانییەکەیەتی. من دوو جۆر چاپی یۆنانی ئاناباسم لەبەردەستدا بوو. هەردووک چاپیان پێداچوونەوە و تەئیدی بەشێکی زۆر لە مامۆستایانی بەشی مێژووی زانستگاکانی یۆنانیان لەسەرە. پاش فەترەیەک بەراورد لەنێوان فارسی و یۆنانییەکە، بۆم دەرکەوت کە ئێرانییەکان یا واباشترە بڵێم فارسەکان، ئەو کتێبەیان بەدڵی خۆیان تەرجەمە کردوەتەوە. لە هیچ شوێنێکی کتێبی ئاناباس‌دا وشەی ئێران و ئێرانی بەکار نەهاتووە و لەجیات ئەوانە واژەی بەربەر نووسراوە. فارسەکان لەو شوێنانەی باسی خۆیان هاتووەتەگۆڕێ، لەجیات وشەی بەربەر گورجێک فارس یا ئێرانیان نووسیوە. بەڵام لەو جێگایانەی باسی کورد و نەتەوەکانی‌تر کراوە، وشەی بەربەر وەک خۆی ماوەتەوە و دەستی لێنەدراوە. لە زۆر شوێن تێکستەکە یا هەر تەرجەمە نەکراوەتەوە، یا ئاڵوگۆڕی بەسەردا هاتووە و هیچ پێوەندییەکی بە ئەسڵی ماناکەوە نیە و هتد. بە باوەڕی من ئەوەندەش بۆ دابەزینی نرخ و قیمەتی وەرگێڕدراوێک بەسە.

لەهەر حاڵدا هیوادارم بە سەرکەوتوویی توانیبێتم ئەو کتێبە مێژووییە بەوەجە لە زمانی یۆنانی‌ڕا بێنمە سەر زمانی کوردی و کتێبخانەی نیشتمانەکەمی پێ دەوڵەمەند بکەم. هەڵبەت من وەک وەرگێڕی ئەو سەرچاوە بەنرخە، خۆم لە بەرامبەر وشە بە وشەی دەقی یۆنانییەکە بە بەرپرس دەزانم. هیوادارم جێگای پەسندی هاوڵاتییانم بێ. هەڵە و پەڵەش دەخەمە بەر بارەگای گەورەیی و دڵفراوانی و یارمەتی ئێوەی بەڕێز.

**وەرگێڕ: عەلی فەتحی**
**٢٠٠٨-٠٣-١١**

# کتێبی یەکەم:

## بەشی ١

### سەبارەت بە شەڕی نێوان کورووشی لاو و ئەردەشیر پاشای برای – ئامادەکاری کورووش بۆ ئەو شەڕە

داریوش و پەریزاد خاوەن دوو کوڕ بوون، کوڕی گەورە ئەردەشیر و بچووکیشیان ناوی کورووش بوو[٢]. لەبەر ئەوەی داریوش نەخۆش کەوت و لە سەرەمەرگدا بوو، داوای کرد کاتی مردنی، دوو کوڕەکانی لەژوور سەری بن. کوڕی گەورەیان، ئەردەشیر بە هەڵکەوت لەوێ بوو بەڵام کورووش کە ساتراپی بۆ دیاری کرابوو[٣]، ئەو کاتە لە سەحرای کاستۆل[٤] سەرکردایەتی هێزەکانی

---

١- داریوشی دووهەم، خاوەن دوو کوڕ بە ناوەکانی ئەردەشیر و کورووش بووە. ناوبراو منداڵیتریشی هەبووە. بەپێی زانیارییەکانی کتیسیای پزیشک کە فۆتیۆس باسی لێوە دەکات، داریوش سێزدە منداڵیتریشی هەبووە.

٢- ساتراپ، واژەیەکە زەمانی هیخامەنشییەکان لەجیات وشەی ئوستان و پارێزگا کەڵکی لێوەرگیراوە. لە زمانی یونانیڕا هاتووە و مانای پارێزگا یا ئوستان دەدات.

٣- داریوش باوکی کورووش، کوڕەکەی خۆی وەک ساتراپ و سەرلەشکری زۆربەی هێزەکانی ساتراپی خاوەن نەزم و نیزام دیاریکردبوو کە زۆربەی جاران لە دەشتی کاستۆل نمایشی نیزامیان دەدا. تیسافێرنیش خاوەن پلەیەکی لەو چەشنە بوو.

دەکرد[5]. کاتێک کوروش خەبەری گەڕانەوەی پێگەیشت، ٣٠٠ چەکداری یۆنانی بە فەرماندەری کسێنیاسی خەڵکی پەراسیۆی لەگەڵدا بوو و لەگەڵ تیسافێرن هەرچەند گومانی لە دۆستایەتییەکەی هەبوو[6]، گەڕاوە بارەگای پاشا. لەو بەینەدا داریوش مردبوو و ئەردەشیر لە جێگای باوکی دانیشتبوو. تیسافێرن ئەو فرسەتەی قۆستەوە و بە ئەردەشیری گوت کە کوروش خەریکی کارێکی دوژمنکارانەیە. ئەردەشیر باوەڕی بە تیسافێرن کرد. سەرەتا فەرمانیدەرکرد کە ناوبراو لە ڕێگادا چاوەڕوان بێ و پاشان فەرمانی کوشتنیشیدا[7]. هەڵبەت لەبەر خواست و پاڕانەوەی دایکی ناچار لە تاوانی کوروش خۆشبوو، بەڵام دەستووریدا کە بگەڕێتەوە شوێنی فەرمانڕەوایی پێشووی خۆی. کوروش بەو کارەی براکەی گەلێک تێکچوو و هەربۆیە بڕیاریدا هەرچی لەدەستی بێ بۆ دەرهێنانی دەسەلات و سەڵتەنەت لەدەست ئەردەشیر بیکا[8]. پەریزادیش زیادتر هەستی بە نیزیکایەتی کوروش دەکرد تا ئەردەشیری کوڕە گەورەی[9]. جیا

---

٤- ئەو دەشتە لە قەراخ چۆمی کاستۆل هەلکەوتووە. شاری کاستۆلیش لەوێ بووە. گشت ساڵێ یەک جار تەواوی هێزەکانی نیزامی سەر بە پابگانەکانی ڕۆژئاوای ئاسیای بچووک تا چۆمی ئالی، لەو دەشتە ڕیژەی نیزامی ڕۆیشتوون. شاری کاستۆل لە سەردەمی ستیفانۆی بیزانسیدا، سەربە وڵاتی لیدیا بووە.

٥- کوروش تیسافێرنی لەو سەفەرەدا لەگەڵ خۆی برد تا بۆ دوایینجار چاوی بە باوکی بکەوێ و لەڕاستیدا وەک دۆست حیسابی لەسەر کرد. تیسافێرن دۆستێکی ڕاست و بەوەفای ئەردەشیر بوو. کوروش خۆیشی باوەڕی زۆری بە تیسافێرن هەبوو. دوای مەرگی داریوش، تیسافێرن وەک وەسیلەیەک لە دەستی ئەردەشیر پاشادا بوو. ئەو هەمیشە بەدوای کوروشدا دەگەڕا و هەڵسوکەوتەکانی دەخستە ژێر چاوەدێری. لە درێژماوەدا دەرکەوت کە تیسافێرن ئەبەدا دۆستی کوروش نەبووە. بەپێی زانیارییەکانی پلۆتارخیس لە کتێبی لیساندرۆس دێلتادا دەکەوتووە کە تیسافێرن مرۆڤێکی زیرەک و هوشیار و لەگەڵ کوروش بەردەوام کێشەیان بووە.

٦- پلوتارخیس لە کتێبی ئەردەشیری سێهەمدا باسی خەیانەت و نەجاتی کوروش دەکا. کوروش بەوە تاوانبار کرا کە خەریکی وەرگێڕانی تاج و تەختی پاشایەتی براکەی بووە و تێیدا سەرنەکەوتووە و دەستگیر کراوە. هەرچەند پاشا گەرەکی بووە بیکوژێ، بەڵام پەریزادی دایکی نەجاتی داوە.

٧- کوروش جیا لە گیران و سزای مەرگ، تووشی بێحورمەتی نەهاتووە (ڕەنگە ئەشکەنجە درابێ). هەڵبەت ئەو وەختە سزای مەرگیش وەک بێحورمەتی چاوی لێکراوە.

٨- پەریزاد لەو دوو کوڕەی واتە ئەردەشیر و کوروش، دووهەمیانی زیادتر خۆش ویستووە. کوروش بە جەستە کز و لاواز و مرۆڤێکی هەستیار و زێدە گیرۆدەی دایکی بووە. پلوتارخیس لە کتێبی ئەردەشیری دووهەمدا دەڵێ کە کوروش مرۆڤێکی زێدە سەرکێش و لاسار بووە. سێنیسیۆ لە

لەوەش هەرکەسێک لە خزمەت ئەردەشیر پاشادا بوو کاتێک دەچووە لای کوروش پتر گیرۆدەی هەڵسووکەوتی ناوبراو دەبوو[10]. کوروش بۆیە ئەو رەفتارەی دەکرد تا هێزەکانی بەربەر بە گیان و دڵ و خواستی تەواوەوە نۆکەرایەتی و سەربازی بۆ ناوبراو بکەن.

ئەوەش بگوترێ کە کوروش چەندی بۆی کرا قۆشەنی یۆنانی بە نهێنی سازماندا بۆوەی ئەردەشیر پاشا لەداو بخا. ناوبراو فەرمانی بە فەرماندەرەکانی قۆشەنی ساخلوو لە زۆربەی شارەکانی ژێر حوکمی خۆیدا لەشکر و سەرباز وچەکدار لە پێلۆپۆنیسۆ کۆبکەنەوە و ڕایانگرن. بیانووش بۆ ئەو کارە، مەترسی هێرشی تیسافێرن بۆ سەر ئەو ناوچانە بوو. ئەو گوتی: چەندی دەکرێ لەو شوێنانە چەکدار بەکرێ بگرن و رایانگرن. لەڕاستیدا تەواوی شارەکانی یۆنانی پێشتر لەژێر دەسەڵاتی تیسافێرن‌دا بوون[11]، بەڵام دواتر پاشا هەمووی ئەو باژێڕانەی جیا لە میلیتۆ بە کوروش بەخشیبوو.

تیسافێرن لە ترسی ئەوەی نەکا خەڵکی شاری میلیتۆ بچنە ژێر حوکمی کوروش، ئەغڵەبی خەڵکەکەی کوشت و ئاوارەی کردن. کوروش ئەو خەڵکە ئاوارەیەی گرتەوە و هێزی دەریایی و و ویشکایی لێ‌پێکهێنان. شاری میلیتۆی گەمارۆدا و حەولیدا ئاوارەکان بگەڕێنێتەوە سەر ماڵ و مڵکی خۆیان. ئەو کارەی کوروش لەڕاستیدا جووڵەیەکی نوێ بۆ سازدانی قۆشەنێک بوو[12].

---

کتێبی شەرح و بەیانی کەچەڵدا دەڵێ بۆچی پەریزاد کوروشی خۆش ویستووە، چوون پیاوێکی ویچوو و جوان بووە (لە بەشی: سەبارەت بە جوامێری کوروش).

٩- هەرکەسێک لە دەوروبەرەکانی پاشا سەردانی کوروشی کردبا، ناوبراو حەولی زۆری دەدا بە خۆش‌ڕەفتاری بیکاتە دۆستی خۆی. ئەوانە زیادتر پیاوانی پایەبەرز لە بارەگای پاشایەتیدا بوون کە بۆ کاروباری جۆراوجۆر دەهاتنە لای ئەو. ئەرکی ئەو کەسانە چاوەدێری ماڵیات و خەراجی ساڵانە و شێوەی ئیدارەی وڵات بەدەست ناوبراو بووە. بەشێکیان بۆ کاروباری تایبەت و شەخسی خۆیان هاتوونە لای کوروش.

١٠- شارەکانی یوونی لە قەدیمەوە سەر بە هەرێمی حوکمڕانی تیسافێرن بوون. ئەو ناوچانە لەلایەن خودی داریوش پاشاوە بە ناوبراو ئەسپاردرابوون. هەڵبەت تیسافێرن وەک جێگری پاشا بەسەر ئەو شارانە ڕانەدەگەیشت، بەڵکوو کوروش چاوی بە سەریانەوە بوو.

١١- دانیشتووانی میلیتۆ گەرەکیان بوو شارەکەیان لەژێر دەسەڵاتی کوروش‌دا بێ. بەشێکیش لە خەڵکەکە پێیخۆش بوو ئەردەشیر حوکمڕانیان بکا. تیسافێرن جەماوەرێکی زۆری لێ‌کوشتن و

دوای ئەو کارە وڵامی بۆ براکەی نارد و داوای ئیدارەکردنی پتری شارەکانی لە ناوبراو کرد و خۆی لە تیسافێرن بە بەرهەقتر دەزانی و بۆ ئەو مەبەستە زیادتر لە براکەی نیزیک کەوتەوە و دایکیشی پشتیوانی لە خواستی ئەو لەلای ئەردەشیر کرد، بەو شێوەیە کەس بە نەخشەکانی کوروشی نەدەزانی و براکەشی پێیوابوو لە ڕقی تیسافێرن ئەو کارە دەکا و بەوەشەوە ناڕاحەت نەبوو کە ئەو جووتە شەڕیان بێت. کوروش تەواوی ئەوماڵیاتەی دەبوایە تیسافێرن بە پاشای بدا، ناردیە خزمەت براکەی خۆی[١٣].

قۆشەنێکیتریش لە ناوچەی خێرۆنیسۆ هەڵکەوتوو لە بەرامبەر ئاڤێدو بۆ کوروش ساز بوو. چونکە کلیئارخۆسی لاکێدێمۆنی پەنای بۆ کوروش هێنابوو[١٤] و ئەویش بەڕێزەوە وەریگرت. کوروش ١٠ هەزار داریکی[١٥] بە کلیئارخۆس‌دا و ناوبراویش بەو پارەیە لەشکرێکی گەورەی پێکهێنا و دژی تراکییەکان شەڕیدەستپێکرد کە لە شارەکانی ئێلیسپۆندۆ کۆببوونەوە و ئەوەش خزمەتێک بە یۆنانییەکان بوو. خەڵکی ئەو شارانە پارە و ئازووقەیان بۆ کلیئارخۆس نارد بۆوەی لەشکرەکەی بپارێزێ. بەو شێوەیە لەشکری دووهەمیش پێکهات کە لە یۆنان کۆکرابۆوە و بەنهێنی خزمەتی کوروشی دەکرد.

---

ژمارەیەکی ئاوارە کرد. کوروش گەمارۆی ئەو شارەیدا و خەڵکە ئاوارەکەی گەڕاندەوە سەر ماڵ و ملکی خۆیان و بەو کارەی لەشکرێکی فرەی بۆ ساز بوو.

١٢- کوروش بۆوەی هیچ شک و گومانێک لە دڵی پاشادا نەخولقێ، تەنانەت لە شارەکانی ژێر فەرمانی تیسافێرن‌یشرا بە شێوەیەکی ڕێکوپێک خەراج و ماڵیاتی ساڵانەی بۆ بارەگای ئەردەشیر بەڕێکرد. بەپێی زانیارییەکانی هێرۆدۆت، بە فەرمانی ئارتافێرن و لە سەردەمی داریوش‌دا ئەو ماڵیات و خەراجە بەهۆی ساتراپەکانەوە کۆکراونەوە و ناردراونە خەزێنەی پاشا.

١٣- کوروش لە زۆر شوێن لەشکری کۆکردەوە بۆوەی پەلاماری ئەردەشیری برای بدا. گشت هێزەکان بۆ ئەو شەڕە لە ناوچەی خێرسۆنیسۆس و لە دەشتی ڕووبەڕووی ئابید کۆبوونەوە. کلیئارخۆسی لاکێدێمۆنی ڕوحی ئەو لەشکرە بووە.

١٤- داریک یا داریکۆس بەو سکەیە گوتراوە کە لە سەردەمی داریوشی گشتاسپ لێدراوە. لە ڕوویەکی سکەدا داریوش کەمانی بە دەستەوە گرتووە. خەڵکی بەو سکەیەیان گوتووە کەمانگیر. لە ڕووی دووهەمی سکەدا هیچ وێنەیەک بەرچاو ناکەوێ. ئەو سەردەمە هەر سکەیەکی داریک بەرابەری ٢٠ دراخمی زێوی ناوچەی ئەتیکی (ئاتێن) لە یونان بووە. بەپێی حیساباتێک، کوروش قەرار بووە دوو سەت هەزار دراخمی پارەی ئەتیکی بە کلیئارخۆس بدا.

ئاریستیپۆسی[١٦] تیسالی لەدەست هاوڵاتییەکانی خۆی ئازارێکی زۆری چێشتبوو و دۆستی کوروش بوو و پەنای بۆ ناوبراو بردبوو. ئەویش داوای نیزیک بە دوو هەزار شەڕکەر و مووچەی سێ هەزار کەسی بۆ سێ مانگان لە کوروش کرد، بۆوەی بتوانێ دەروەستی دوژمنەکەی خۆی بێت. کوروش ٤ هەزار سەرباز و خەرجی شەش مانگانی دایە و داواشی لێکرد بەبێ پرس کردن، لەگەڵ راپەڕیوان پێوەندی نەگرێ. ئەوەش سێهەم لەشکری یۆنانی بوو کە بۆ خزمەت کردنی ناوبراو لە ناوچەی تیسالی پێکدەهات. کوروش هەروەها فەرمانی بە دۆستەکەی خۆی واتە پرۆکسێنۆسی ڤیۆتیۆدا[١٧] کە هەرچی هێزی سەربازی هەیەتی بیهێنێتە لای کوروش چونکە دەخوازێ پەلامارێکی پیسیدییەکان بدا. پیسیدییەکان گیروگرفتیان لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی ئەودا خوڵقاندبوو. ناوبراو هەروەها داوای لە دۆستانی خۆی واتە سۆڤێنیتی ستیمفالی[١٨] و سوقراتی ئاخایی کرد، ئەوانیش چەندی بۆیان دەکرێ هێز بەکرێ بگرن و بێنە لای، لەبەر ئەوەی گەرەکییەتی لەگەڵ تیسافێرن بکەوێتە شەڕ. ناوبراوانیش ئەو خواستەی کوروشیان پەسندکرد.

---

-١٥ ئاریستیپۆسی تیسالی، هاوڵاتی مێنۆن ئەو کەسە بوو کە پلاتۆناس (ئیفلاتون) لە سەرەتای باسەکەیدا سەبارەت بە مێنۆن دەڵێ: " ئاریستیپۆس و خەڵکی تیسالی شانازی بە عەقڵییەتی خۆیان دەکەن". کاتێک غورغیاس بە ناوچەی تیسالی‌دا دەرباز بوو، تاریفی شێوەی بیرکردنەوەی فەیلەسوفانەی ئەو خەڵکەی بۆ کوروش کردوە. ئاریستیپۆس گرفتی لەگەڵ پیاوانی سیاسی سەردەمی خۆی هەبووە، کوروش مووچەی داوەتێ بۆوەی بەربەرەکانی لەگەڵ دژبەرەکانی بکا. هەربۆیەش لەشکر لە ناوچەی تیسالی کۆبووەتەوە.

-١٦ پرۆکسێنۆس خەڵکی تیڤا و دۆستی گزنفۆن، وەک مێنۆن لە شاگردانی مەکتەبی سوقرات بووە. پرۆکسێنۆس لە کتێبی ئاناباس‌دا بەناوی ڤیۆتیۆس ناوی هاتووە. بە باوەڕی گزنفۆن، پرۆکسێنۆس دۆستی قەدیمی خۆی بووە و هەر ئەویش داوای لە گزنفۆن کردوە و نامەی لێ نووسیوە کە سەفەری ئاسیا بکا و کوروش لە نیزیکەوە بناسێ. پرۆکسێنۆس بە ئاواتەوە بوو کە خەریکی کاروباری سیاسی بێ و هەر بەو مەبەستەش لەلای غورغیا دەستی بە خوێندن کردوە. دواتر لە تەمەنی سی ساڵیدا بە دەستی تیسافێرن کوژرا.

-١٧ سۆفێنێتوس ستێمفالیۆس خەڵکی ئارکادیا، جوامێرترین ستراتێژ (سەرتیپ) لەنێو لەشکری میرییەکاندا بوو. ستێفانۆسی ڤیزاندی دەڵێ کە سۆفێنێتوس سەبارەت بەو لەشکرکێشییەی کوروش گەلێک بابەتی نووسیوە. ناوی‌تری سۆفێنێتوس، ئارکاس بووە بەبێ پاشگری ستێمفالیۆس.

# بەشی ٢

## وەرپێکەوتنی کوروش – تیسافێرن مەبەستی کوروش لای ئەردەشیر ئاشکرا دەکا- چاوپێکەوتنی ئێپیئاکسا و کوروش ڕێژەی نیزامی – لەشکر گەیشتە تارسوو وتوویژی سیئێنیسی پاشای کیلیکیا (سیلیسی) و کوروش

کوروش کاتێک بڕیاریدا بەرەو ژوور و ئامانجەکەی واتە رووخاندنی تاج و تەختی ئەردەشیر وەرێکەوێ، بیانوویەکی سازدا کە دەخوازێ پیسیدییەکان لە ناوچەی ژێردەسەڵاتی خۆی وەدەرنێ و بۆیە هێزە یۆنانییەکان و بەربەری کۆکردەوە[19]. کوروش فەرمانی بە کلیئارخۆس‌دا بە تەواوی قۆشەنی ژێر فەرمانییەوە بێتە لای ئەو و هەروەها بە فەرماندە ئاریستیپۆس‌یشی ڕاگەیاند

---

١٨- بیانوویەکی کە کوروش بۆ لەشکر کۆکردنەوە لە شاری سارد هێناوییەتە گۆرێ، گرفتی پیسیدییەکان بووە و ناوبراو ویستوویەتی لە وڵات وەدەریان بنێ، چونکە جێگای هەڕەشە و مەترسی بوونە. تیسافێرن بەو بیانوویەی زانیوە و هەستی بەوە کردوە کە ژمارەی ئەو لەشکرە لەوە زیادترە کە بۆ دەرکردنی پیسیدییەکان کەڵکی لێوەرگیرێ و بۆیە خێرا ئەردەشیر پاشای لەو مەبەستەی کوروش ئاگادار کردوەتەوە.

لەگەڵ دژبەرەکانی سیاسی خۆی لە وڵات ئاشتبێتەوە و چی هێزی لەژێر دەستی دایە بۆلای ئەو بیهێنێ[20]. ناوبراو داوای لە کسێنیاسی ئارکادی سەرکردەش کرد ئەو جەنگاوەرانەی بەکرێی گرتوون، بیانهێنێتە لای ئەو. تەنیا ئەو هێزانە بهێڵێتەوە کە بۆ پاراستنی قەڵای نیزامی شارەکان پێویستن. کوروش ئەو هێزانەش کە گەمارۆی شاری میلیتۆیان دابوو بانگهێشت کردەوە و داواشی لە ئاوارەکانی ئەو شارە کرد ببنە هێزی نیزامی ناوبراو و بەڵێنیشی پێدان کە دوای هێرشەکەی و سەرکەوتنی لەو شەڕەدا چەک دانانێ تاکوو هەموویان دەگەڕێنێتەوە شوێن و مەوتەن و سەر ماڵ و مڵکی خۆیان. ئەو جەماوەرەش رەگەڵی کەوتن، چونکە باوەڕیان بە کوروش هەبوو و هەرکە چەکیان وەرگرت لە شاری سارد کۆبوونەوە.

کسێنیاس بە نیزیکەی چوارهەزار بەکرێگیراو لە شارەکانی دەوروبەری خۆی گەیشتە باژێڕی سارد. پرۆکسێنۆس بە هەزار و پێنسەد سووکە چەکدار، سۆفێنیتی خەڵکی ستیمفالیۆس بە هەزار پیاوەوە، سوقراتی ئاخایی بە نیزیکەی پێنسەد کەس و پاسیۆناسی خەڵکی مێغاریئاس بە سێ سەد چەکداری قورس و سێ سەد سووکە چەکدارەوە خۆیان گەیاندە لای کوروش. پاسیۆناس و سوقرات لەو فەرماندە نیزمییانە بوون کە گەمارۆی شاری میلیتۆیان دابوو. ئەوانە ئەو هێزانە بوون کە بە خواستی کوروش[21] گەیشتنە شاری سارد[22].

تیسافێرن، کاتێک تێگەیی ئەو هێزانە لەوە پترن کە بۆ گرتنی ناوچەی پیسیدییەکان پێویست بێ، یەکسەر و بە خێراییەکی تەواوەوە بەرەو بارەگای ئەردەشیر پاشا وەڕێکەوت و نیزیکەی پێنسەد سوارە نیزامی لەگەڵ خۆی برد.

---

١٩- کوروش داوای لە ئاریستیپۆس کرد کە لەشکر بنێرێ. ئەوەش بۆیە بوو کە ئاریستیپۆس وەک خۆی بەشداری لەشکرکێشییەکەی نەکرد (ئەو خەریکی چاوەدێری کردنی دژبەرانی سیاسی بوو). ناوبراو، مینۆن تیسالی ناردوە کە نەخشێکی بەرچاوی لە شەڕەکاندا گێرا.

٢٠- لەبەر خواستی کوروش و خۆشەویستی ئەو، ئەوانەی گەیشتنە ئەو شوێنە بریتی بوون لە: چەکداری قورس، سووکە چەکدار و خەڵکی بێ چەک. هێزەکانی تایبەتی پیادەی لەشکر لە چەکداری قورس و سووک و قۆچەقانی هاوێژ پێکهاتبوون. هەڵبەت بەشی گرینگی لەشکر، چەکداری قورس بوون.

٢١- تەواوی لەشکر بە بیانووی شەڕ دژی پیسیدییەکان لە ناوچەی سارد کۆبۆوە. فەرماندەران یەکبەدوای یەکدا گەیشتنەجێ. کسێنیاس، پرۆکسێنۆس، سۆفێنیتۆس، سوقرات، پاسیۆن و چەندێکیتر.

کاتێک ئەردەشیر پاشا بەهۆی تیسافێرن[٢٣] ئاگاداری نەخشە و پەلاماری کوروش بۆوە، ئەویش دەستی بە کۆکردنەوەی هێز کرد و خەریکی ئامادەکاری بوو.

کوروش لەگەڵ ئەو هێزانەی یارمەتیدەری لە شاری ساردڕا وەڕێکەوت. ناوبراو بە وڵاتی لیدیدا تێپەڕی و مەودای بیست فەرسەخی[٢٤] بە سێ مەنزڵ تێپەڕکرد و بەرەو چۆمی مێئاندرۆ رۆیی. بواری ئەو چۆمە دوو پلێترا بوو. لەسەر چۆم بە کەڵەکی لێکبەستراو پردێک دروست کرابوو. دوای پەڕینەوە لە چۆم بە وڵاتی فریژیدا رۆیشت و بە یەک قۆناخ مەودای هەشت فەرسەخی بڕی و گەیشتە کۆلۆسێس[٢٥] کە شارێکی گەورە و دەوڵەمەندنشین بوو. کوروش لەو شارە حەوت ڕۆژ مایەوە[٢٦]. لەو شوێنە مێنۆناسی تێسالی بە هەزار شەڕکەر و پێنسەد سووکە چەکداری خەڵکی ناوچەکانی دۆلۆپی، ئێنیانۆس و ئۆلینتیوس گەیشتنە لای. کوروش بە سێ قۆناخ بیست فەرسەخیتر بەرەو دەڤەری کێلێنێس[٢٧] رۆیشت کە خاوەن دانیشتووانێکی فرە

---

٢٢- لەسەر ئەوەی کە تیسافێرن یا کەسێکیتر باسی نەخشەی کوروشیان لەلای ئەردەشیر کردبێ، بۆچوونی جیاواز هەیە. پلوتارخیس و گزنفۆن خاوەن یەک نەزەرن، بەڵام دیۆدۆرۆس و سیکێلیۆتیس پێیانوایە کە فارناڤاز ئەو خەبەرەی لە ئالکیڤید بیستووە و خێرا پاشای ئاگادار کردوەتەوە (بە ناردنی سیئێنێسیس بۆلای ئەردەشیر).

٢٣- فەرسەخ وشەیەکی فارسییە و بۆ پێوانی مەودا بەکار هاتووە. یەک فەرسەخ بەرابەری سی ستادیۆی یونانی بووە.

٢٤- شاری یونانی کۆلۆسێس لە قەراخ چۆمی لیکۆس هەڵکەوتبوو. ئەو ناوەی مانای زۆر گەورە دەدات. کەلاوەکانی ئەو شارە ئێستاش هەر ماون.

٢٥- لە زۆربەی شارەکاندا، دانیشتووان هەرکە دەیانزانی کوروش خەریکە نیزیکیان بێتەوە، بۆوەی لەلایەن پاشاوە نەکەونە بەر ئازار و ئەشکەنجە، شوێنی نیشتەجێییان چۆڵدەکرد. شارەکانی کۆلۆسێس، کێلێنێس و پێلتیس لەو شارانە بوون کە خەڵک چۆلی نەکردن و بە هاتنی لەشکری کوروشیش لە جێگای خۆیان نەبزووتن.

٢٦- بەپێی زانیارییەکانی هێرۆدۆت شاری یونانی کێلێنێس لە نیزیک سەرچاوە ئاوییەکانی چۆمی مێئاندرۆ هەڵکەوتبوو و چۆمێکیش بەناو شارەکەدا دەڕۆیی کە پێیدەگوترا کەتاڕاکتیس (ڕێژنە و سۆلاڤ). بەپێی ڕەوایەتەکان، لەو شارە چەرمی مارسیئا هەڵواسراوە کە بەهۆی ئاپۆلۆن کەوڵکراوە. ئەو شارە سەرەتا پێتەختی فریژییەکان بووە. دانیشتووانی کێلێنێس بەپێی زانیارییەکانی ئادیۆخۆسی یەکەم لە سەدەی سێهەمی پێش زاییندا بۆ حورمەتگرتنی خواوەند ئاپاماسی دایک، لە شوێنی تێکەڵبوونەوەی ئەو دوو چۆمە شاری ئاپاما دروستکراوە.

دەوڵەمەند بوو. کوروش لەو شوێنە قەسرێک و باغێکی پڕ لە حەیواناتی وەحشی هەبوو[٢٨]. کاتی خۆی جیا لە وەرزیش و ڕاهێنانی ئەسپ دەچووە شکار و ئەو حەیوانە دڕندانەی ڕاودەکرد. چۆمی مێئاندرۆ بەو باغەدا تێدەپەڕی و لە نیزیک قەسرەکەوە سەرچاوە دەگرێ و بە نێوەڕاستی شاری کێلیندا دەڕوا. لەو شارە قەسری پاشای مەزن بنیات نراوە کە لە نیزیک سەرچاوەی چۆمی مارسی لە خواروی قەڵای نیزامی هەڵکەوتووە و خاوەن شوورەی مەحکەمە. ئەو رووبارەش بەنێو شاردا تێدەپەڕێ و تێکەڵ بە چۆمی مێئاندرۆ دەبێتەوە. بەرینایی بواری رووباری مارسی بیست و پێنج پێ دەبێ. بە رەوایەت دەگێڕنەوە کە خواوەند ئاپۆلۆن لە شەڕێکدا مارسی شکست داوە و عەقڵییەت و زانستەکەی لێئەستاندوە و کەوڵی کردوە و پێستەکەی بە زارکی ئەو ئەشکەوتەدا هەڵواسیوە کە سەرچاوەی ئاوەکەیەتی[٢٩]. لەبەر ئەو هۆیە بەو رووبارە دەگوترێ مارسی. خەشایارشا (کسێرکیس) کاتێک لێرە بەدەست سپای یۆنانی لە شەڕدا تووشی شکست هات، ئەو قەسر و قەڵا نیزامییەی لە کێلین دروست کرد. کوروش لەو شوێنە سێ ڕۆژ مایەوە. کلێئارخۆسی لاکیدێمۆنی ئاوارە بوو و بەخۆی و هەزار چەکدار و هەشت سەد سووکە چەکداری خەڵکی ناوچەی تراکی و دوو سەد کەمانداری کرێتی هاتنە لای کوروش. هەروەها سۆسی خەڵکی سیراکۆسیۆس بە سێ سەد چەکدارەوە و سۆفێنیت بە هەزار شەڕکەری ئارکادیی‌یەوە گەیشتنە ئەو شوێنە. کوروش لەنێو باغەکەدا ڕێژە ڕۆیشتنی لەشکری یۆنانی تەماشا کرد و ژماردنی. سەرجەم دە هەزار چەکداری قورس و نیزیکەی دوو هەزار سووکە چەکدار بەشداری ڕێژەکە بوون.

---

٢٧- بەپێی نووسراوەکانی ئینجیلی قەدیم، بەهەشت بە شوێنێک دەگوترێ کە پێیدەڵێن ئەدەم، واتە جێگای یەکەم مرۆڤەکانی سەرعەرد (دایە عەوا و بابە ئادەم). وشەیەکی فارسی‌یە و واتای باغی گەورە دەدات. لە زمانی یونانیدا پێیدەگوترێ پەرادیسۆس.

٢٨- کێبەرکێ و ڕەقابەت لەسەر ژەنینی مۆسیقا و بەتایبەت بلوێر بووە. باس لە ئەزموونی هۆنەری ئەو مۆسیقایەیە. مارسی‌ئاس پێیوابووە باشتر لە ئاپۆلۆنی ژەنیوە. لەو بەربەرەکانییەدا مارسی‌ئاس بەدەستی ئاپۆلۆن شکستی خواردوە و پاش کەولکرانی، چەرمەکەی هەڵواسراوە. چۆمی کەتاڕاکت لەو کاتەیەوە پێیدەگوترێ مارسی‌ئاس.

کورووش لێرەوە بە دوو قۆناخ دە فەرسەخیتر ڕۆیشت و گەیشتە شاری پڕ حەشیمەتی پێلتیس[30]. ناوبراو سێ ڕۆژ لەو شارە مایەوە. لەو ماوەیەدا کسێنیاس ئارکادی جێژنی لیکەی[31] بە پێشکەش کردنی قوربانی پیرۆز کرد و چەند نمایشێکی زۆرەوانی و پاڵەوانییەتی نیشاندا. خەڵاتی براوەکانیش لەو کێبەرکێیانەدا ستلێنگیدای[32] زێڕ بوو. کورووش دوای ئەو شوێنە بە دوو قۆناخ، دوازدە فەرسەخی بڕی و گەیشتە بازاڕی بە ڕمێنی کێرامۆن[33]، هەڵکەوتوو لە نیزیک سنوورەکانی میسیا. ئەوجار لەوێڕا بە سێ مەنزڵ و سی فەرسەخ ڕێگا گەیشتە شوێنێکی گەلێک ئاوەدان واتە سەحرای کاڤسترۆ. ناوبراو پێنج ڕۆژان لەوێ مایەوە. مووچەی سێ مانگان بە هێزەکانی ژێر فەرمانی قەرزدار بوو. ئەندامانی سپا بەمەبەستی چارەسەری ئەو گرفتە چەند جارێک لە خێمەکەی ئەودا چاویان پێیکەوت و داوای پارەیان لێکرد. کورووش داوای لەو هێزانە کرد جارێ چاوەڕوان بن و سەبارەت بەو گرفتە گەلێک ناڕاحەت بوو، ئەو نەیدەتوانی ئەو پارەیە بۆ هێزەکان دابین بکا[34]. هەڵبەت ئەوە لە

---

۲۹- شاری پێلتیس لە دەشتی قەراخ چۆمی مێئاندرۆ هەڵکەوتبوو. شارێکی فریژی بووە. کورووش ڕاست لەو شارەڕا ڕێگای گۆڕیوە و ویستوویەتی ئەردەشیر پاشای برای هەست بە نیگەرانی نەکا. گزنفۆن لێرەدا باسی ئەو ڕێگا گۆڕینە ناکا و ڕەنگە هەستی پێنەکردبێ.

۳۰- لیکیئا، جێژنێکی ئارکادی بووە کە بۆ ڕێزلێنانی خواوەند دیای ئارکادی بەڕێوە چووە. ئەو خوایە لە بەرزترین لووتکەی ڕیزەکێوەکانی لیکیئا دامەزراوە. خواوەند دیا، خوای ڕووناکی بووە.

۳۱- ستلێنگیس، وەسیلەیەک بووە کە وەرزیشکارەکان لە کاتی خۆشوشتندا بۆ پاککردنەوەی چەورایی لەشیان کەڵکیان لێوەرگرتووە. ئەو کەرستەیە بۆ خاوێنکردنەوەی لەشی ئەسپیش بەکارهاتووە. هەرکات بە شێوەیەکی جوان و وەک دیاری لە زێڕ دروست کراوە، ئەوە بۆ زینەت بەخشینی قژی ژنان بووە و پێیگوتراوە کرۆڤیلۆس. لەو کێبەرکێیەکاندا وەک خەڵات بە پاڵەوانان بەخشراوە.

۳۲- دواپین باژێڕی میسیاس هەمان بازاڕی کێرامۆنئاغۆرا یا بازاڕی دەڵالان بووە و شوێنی هەڵکەوتەی جوغرافیایی ڕوونی دیارنیە. بەپێی زانیارییەکانی Cobet ، شاری میسیاس بە دەلیلی جۆغرافی دەبێ هەمان پیسیدیا بووبێ. لەبەر ئەوەی کورووش گەیشتە کلێئێنیس، کام هۆ باحیسی وەرسووڕانەوەی لەشکری ناوبراو بەرەو باکوور بووە، هیچ باسێکی لێوە نەکراوە. پاندازیدیس بۆچوونەکانی کۆبێت وەڕاستدەگێڕێ.

۳۳- کورووش نەیدەتوانی مووچەی یونانییەکانی بەکرێگیراو بدا. یونانییەکان بەردەوام داوایان لێدەکرد و ئەویش پەیتاپەیتا بەڵێنی پێیاندەدا و گەلێکیش لەوبارەوە ناڕاحەت بوو. لە کاتێکی ئەوتۆ

کەسایەتی کوروش بەدوور بوو کە پارەی هەبێ و خۆی لە دانی مووچەی دواکەوتوو بپارێزێ. ئێپیئاکسا ژنی سیئێنێسی پاشای کیلیکیا لەو شوێنە هاتە خزمەت کوروش و دەگێڕنەوە کە پارەیەکی فرەی بە ناوبراودا. کوروش بەو پارەیە، مووچەی چوار مانگی سەربازەکانیدا. شابانووی کیلیکیا خاوەن گاردی پارێزەر لە پیاوانی کیلیکیایی و ئاسپێندی بوو. هەڵبەت باسی ئەوەش دەکرا کە کوروش بۆرە تێکەڵاوییەکی لەگەڵ ئەو شاژنە هەبووە.

کوروش لەو شوێنەڕا بە دوو مەنزڵ و دە فەرسەخ گەیشتە شارێکی ئاوەدان بەناوی تیمبریۆ[٣٥]. لە قەراخ ڕێگای ئەو شارە سەرچاوەیەکی ئاو هەبوو و پێی دەگوترا کانی میداس[٣٦] و بەناوی پاشای وڵاتی فریژی کرابوو. ڕەوایەتێک هەیە کە لەو کانیاوەدا میداس پاشا توانی ساتیر(نیوە خواوەندی جەنگەڵ) بەدیل بگرێ و ئاو و شەڕاب تێکەڵ بە یەک بوون. کوروش لەو شارەوە بەرەو تیریایۆ کەوتەڕێ و بە دوو قۆناخ دە فەرسەخی ڕێگا بڕی. ئەو شوێنەش شارێکی پڕحەشیمەت بوو. کوروش سێ ڕۆژی لێمایەوە. دەڵێن شابانووی کیلیکیا داوای کرد پێکەوە ڕێژەڕۆیشتنی سپای کوروش ببینن و ناوبراویش خواستی ئەو خاتوونەی بەجێهێنا و سانی نیزامی هێزە یۆنانی و بەربەرەکانیان لەو دەشتە چاو لێکرد[٣٧].

کوروش فەرمانی بە یۆنانییەکاندا بە ڕیز ڕاوەستن وەک لە کاتی شەڕدا عادەتیان بووە و هەر سەرکردەیەکیش بەجیا لەگەڵ هێزەکانی نیزامی خۆی ڕێژەبڕوا. ئەو

---

ناخۆشدا، ژنی سیئێنێسیسی پاشای کیلیکیا پارەیەکی زۆری بە کوروشدا و ناوبراو توانی مووچەی چوار مانگان بە جارێک پەرداخت بکا.

٣٤- لەسەر شوێنی هەڵکەوتەی جۆغرافیایی شاری تیمبریۆ بۆچوونی جۆراوجۆر هەن. توێژەرانی کۆن پێیانوایە لەسەر ڕێگای نێوان سمیرنی (ئەزمیر) و ئیکونیۆ (قوونیە) هەلکەوتبوو. بەشێکیش لەو باوەڕەدان کە ئەو شارە لە نیزیک ئالووبەکار (سەرچاوەی کانی گەورە) لە نیزیک ئیسکالی ئێستا بووە.

٣٥- کانی میدا، شەڕابی لەبەر ڕۆییوە. ساتیر (نیوە خوای جەنگەڵ) لەو شەڕابەی خواردوەتەوە و سەرخۆش بووە. میداس پاشای فریژی بووە. ئاریانۆس باسی ئەوە دەکا کە میداس چۆن بە پاشایەتی گەیشتووە. میداس خزمەت و پێڕاگەیشتنی فرەی ساتیری کردوە، بۆیە دیۆنیسۆس ریزی فرەی لێناوە.

٣٦- ئێپیئاکسا ژنی سیئێنیسی پاشای کیلیکیا ، داوای دیتنی ڕێژەی نیزامی لە کوروش کردوە. چەشنێک مانۆڕی نیزامی لەشکری یونانی بووە. خەڵکی دەڤەرەکە لەو مانۆڕە نیزامییە بەچەشنێک ترساون کە پێیانوابووە شەڕی ڕاستییە. ئێپی ئاکسا خۆیشی لە ترسان ڕایکردوە.

هێزانە لە ستوونی چوارکەسیدا ڕیزبوون[٣٨]. لەلای ڕاستەوە مێنۆناس و هێزەکانی، لە لای چەپەوە کلێئارخۆس و شەڕکەرەکانی و لە نێوەندیش باقی فەرماندەران بە هێزە چەکدارەکانیانەوە دامەزران. کوروش سەرەتا چاوی بە ڕێژە ڕۆیشتنی هێزەکانی بەربەر کەوت کە خاوەن هێزی سوارە و قەوارەی ڕێکی نیزامی بوون. ئەوجار سەیری هێزە یۆنانییەکانی کرد. خۆی بە فایتوونی شاهانە و شابانوو بە فایتوونی جەنگی بە پێش هێزەکاندا تێپەڕین. تەواوی لەشکری یۆنانی کڵاوی مس لەسەر و جامەیەکی ڕەنگ سووری بێقۆڵ لەبەردا و پوزەوانە لەپێ و شمشێر بەدەست ڕاوەستابوون[٣٩]. دوای ئەوەی کوروش نەزارەتی هەموویانی کرد، لەوکاتەدا کە بە فایتوونەکەیەوە لە نێوەڕاستی ستوونەکانی نیزامیدا چەقیبوو، دیلمانجەکەی خۆی بەناوی پیغریتای[٤٠] ناردە لای یۆنانییەکان و دەستووری بە فەرماندەرەکانی نیزامیدا کە چەکەکانیان نیشان بدەن و تەواوی ستوونەکان مانۆڕی هێرش دەست پێبکەن. دیارە فەرماندەکان ئەو دەستوورەیان پێشتر بە هێزەکانیان دابوو و هەرکە دەنگی دەهۆڵ هات چەک بەدەست بەرەو پێشەوە پەلاماریاندا. بەو فەرمانە، پەلامار بە نەڕە و گوڕەی جەنگاوەرانە دەستی پێکرد و بەرەو خێمەکانیان هوروژمیان برد. لەو بەینەدا هێزەکانی بەربەر گەلێک لە نەڕەی شەڕکەرانەی یۆنانییەکان ترسان و شابانوو فایتوونی جێهێشت و پیاوەکانی هەڵاتن و خەڵکی نێوبازاڕیش شتومەکەکانیان فڕێدا و تێیانتەقاند. یۆنانییەکان کاتێک گەیشتنە خێمەکانیان لە قاقای پێکەنینیاندا. شابانوو لەو نەزم و تەرتیباتە و

---

٣٧- ڕیزەکانی لەشکریی پێکهاتوو لە چوار کەس ڕەنگە کەم بووبێ بەڵام باشییەکەی لەوەدا بووە کە پانتاییەکی زۆری داگیرکردوە و بە ژمارە گەورەتر و فرەتر وەبەرچاو هاتووە. سەبارەت بە شەڕی کوناکسا، زانیارییەکی ئەوتۆ لەگۆڕێدا نیە و پیاو نازانی ئایا بەو شێوازە بەڕێوەچووە یانا.

٣٨- جلوبەرگی فینیقی (ڕەنگسوور) وەک جلی شەڕکەرانی لاکێدێمۆنی بووە. بەبۆچوونی ئاریستۆفانی ئاخارنی، جلی سوور و مەتاڵی مس لە کاتی شەڕدا باشتر لەگەڵ یەکتر هاتوونەوە. چونکە خێرا بریقەی داوە و بە هاسانیش تۆزاوی و قوڕاوی بوونە. ئەو شێوە جلوبەرگە نیزامییەی سپارتییەکان لەو سەردەمەدا لە زۆر شوێنیتر کەڵکی لێوەرگیراوە.

٣٩- پیغریتا، یونانی نەبوو و خەڵکی کاریاس بووە. زمانەکانی یونانی و فارسی زانیوە و وەک دیلمانج لەنێوان کوروش و یونانییەکاندا بەکارهاتوە. پیغریتا ناوێکی ئەشرافیە. نەجیبزادەکانی کاریاسی ئەو ناوەیان زۆر پێخۆش بووە. لە زۆر شوێنی کتێبی ئاناباسدا ئەو ناوە هاتووە.

کارلێهاتوویییەی لەشکری یۆنانی سەری سوڕما. کوروش گەلێک لەوە ڕازی بوو کە هێزە یۆنانییەکان بەو شێوەیە لەشکری بەربەریان تۆقاند.

کوروش دوای ئەو ساندیتنەی هێزەکان بە سێ قۆناخ، بیست فەرسەخی‌تر ڕۆیشت و گەیشتە دوایین بازێڕی ولاتی فریژی، واتە ئیکونیۆ[٤١]. لەو شارە سێ ڕۆژ مایەوە. لەوێوە بە لیکائۆنیاسدا تێپەڕی و بە سێ مەنزڵ ، سی فەرسەخی‌تری پێوا. لەو ناوچەیە ئیزنی بە یۆنانییەکان‌دا تالانی بکەن چونکە خەڵکەکە دوژمنایەتییان کردبوو. کوروش لێرەوە شابانووی بە نیزیکترین ڕێگادا بۆ ولاتی کیلیکیا ناردەوە و بۆ پارێزگاری، مێنۆناس و هێزەکانی[٤٢] لەگەڵ ئەو خاتوونە نارد. ناوبراو لەگەڵ هێزەکانی هاوڕێی بە ناوچەی کاپادۆکیادا تێپەڕی و پاش چوار مەنزڵ و بڕینی بیست و پێنج فەرسەخ گەیشتە دانا، شارێکی پڕ حەشیمەت، دەوڵەمەند و بەبازاڕ و سی ڕۆژی لێ‌مایەوە. باس دەکرێ کە کوروش پێوەندییەکی خزمایەتی (یا دۆستایەتی) لەگەڵ ئەو شاژنە هەبووە.

لەکاتی پشوودانی کوروش لەو شوێنە، فەرمانی کوشتنی مێغافێرنی‌دا. ناوبراو ڕاوێژکاری کۆشکی پاشایەتی فارس و یەکێک لە سەرکردەکانی ناوچەیی بوو[٤٣]. بە تاوانی خەیانەت و هەڕەشەی کوشتنی کوروش کوژرا. هێزەکانی کوروش لێرەڕا حەولیان‌دا پەلاماری کیلیکیا بدەن. لەو جێگەیەی قەرار وابوو هێرشەکە دەست پێبکا، تەنیا یەک ڕێگای لەبار بۆ فایتوونەکانی جەنگی هەبوو[٤٤]، ئەویش بەڕاستی دوور و

---

٤٠- ئیکۆنیۆ، یەکێک لە شارەکانی هەرەگرینگی ولاتی فریژی بووە. سەردەمێک لەلایەن سەلجووقییەکانەوە وەک پێتەخت چاوی لێکراوە. لە سەردەمی تورکەکانیشدا ناوی خۆی پاراستووە و پێی گوتراوە قوونیە و لەپێش ئەوانیشدا بەناوی قوونیاریا باسی لێوەکراوە.

٤١- بۆوەی شاژنی ولاتی کیلیکیا بە سلامەتی بگاتەوە شوێنی خۆی، کوروش فەرمانیدا کە مێنۆن بەخۆی و هێزەکانییەوە لەگەڵی بچن. ئەوەش دەگوترێ کە ئەو هێزانەی لەگەڵ شاژن ڕۆیشتن و مێنۆن فەرماندەری دەکردن، سەر بە لەشکری یونانی نەبوون. Cobet دەڵی کە هێزێکی گەورە بە فەرماندەری مێنۆن، جیا لە ڕێزدانان بۆ شاژنی کیلیکیا مەبەستی‌تریشیان لەو سەفەردا هەبووە.

٤٢- مێغافێرنیس بەدەستی کوروش لە شاری دانا کوژرا. ناوبراو فەرماندەیەکی نیزامی فارس بوو و کاری ئەو دابینکردنی جلوبەرگی ڕەنگ سووری شاهانە لە پارچە و قوماشی بەنرخ بۆ پیاوانی دەرباری پاشایەتی بووە.

٤٣- شوێنێکە لە نیزیک دەروازەکانی کیلیکیا. گوزەرێکی تەنگ و نەدیو بە درێژایی ٢٠ ستادیۆ. لە دوو لای ئەو گوزەرە دوو کێوی بەرز چەشنی ڕەوەز هەڵکەوتوون. ئەسکەندەری مەزن، ئەویش

گەلێک دژوار بوو و دەبوایە ئەو هەموو مەودایە بپێون. بەتایبەت لەباری ئەمنیشەوە گونجاو نەبوو. ئەگەر هێزێک ویستبای گرفتیان بۆ دروست بکا یا بۆسەیەکیان بۆ دانێ، بەڕاحەتی بەڕێوە دەچوو.

بەپێی ئاگادارییەکان سیئێنێسیس بەرزاییەکانی دەورووبەری لەژێردەستدا بوو و کوروش بەناچار ڕۆژێکیتریش لەو دەشتە مایەوە. ڕۆژی دوایی پەیکی نیزامی خەبەری هێنا کە سیئێنێسیس ڕێگای بەرزاییەکانی چۆلکردوە چونکە هەواڵی پێگەیشتووە کە هێزەکانی مێنۆن لە دەشتی کیلیکیا و لەنێو جەرگەی کێوەکاندا مۆڵی خواردوە و گەمییەکانی جەنگی لاکێدێمۆنی و هی کوروش لەژێر فەرماندەری تامۆسدا، لە نێوان یوونیا و کیلیکیادا دەخولێنەوە.

لەئاکامدا، کوروش بەبێ هیچ گیروگرفت و بەرگرییەک لە چیاکان وەسەر کەوت و چاوی بە ڕەشماڵی خەڵکی کیلیکیا کەوت کە پارێزگارییان لەو بەرزاییانە دەکرد. ناوبراو لەوێوە بەرەو دەشتی پان و بەرینی دەڤەرەکە داگەڕا خوارێ کە بە ڕەز و دارستان و ئاو داپۆشرابوو. حاسڵاتی ئەو دەشتە بەپرانی ترێ، دانەوێڵە، کونجی، گەنمە شامی (مێلین)[٤٥]، هەرزن، گەنم و جۆ بوو. ئەو دەشتە بە هۆی ڕیزە چیایەکی سەخت و سەرکێش لە دەریاوە دەستی پێدەکرد و دەگەیشتەوە دەریا.

کوروش دوای جێهێشتنی ئەو دەشتە، بە چوار مەنزڵ و بیست و پێنج فەرسەخ ڕێگا گەیشتە تارسوو[٤٦] شارێکی تەواو گەورە و دەوڵەمەندی وڵاتی کیلیکیا. کۆشک و قەسرەکانی سیئێنێسیسی پاشای وڵاتی کیلیکیا لەو

---

کاتی خۆی بەو دەروازانەدا تێپەڕیوە و چووەتە کیلیکیا. ئەو دەروازانە ئیمڕۆ پێیان دەگوترێ گیولیک بوغاز.

٤٤- میلین، چەشنە زورەتێکە. ئەو زورەتە لە زۆر شوێنی یونان بەرهەم دێت و پێیدەگوترێ زورەتی یونانی. زیادتر وەک دەغڵ و دان بە ئاژەڵان دراوە. هێرۆدۆت، گزنفۆن و تیئۆفرستۆس لە نووسینەکانیاندا باسی لێدەکەن.

٤٥- مەبەست شاری (تارسوو)یە. ئەو شارە شوێنی لەدایکبوونی ئاپۆستۆلۆس پاڤلۆسە (یەک لە پیاوانی مەسیحی). ئەو شارە بە تۆڵەی کوژرانی چەند کەس لە سەربازەکانی مێنۆن، لەلایەن یونانییەکانەوە بەتەواوی تالانکرا.

شارەن. رووبارێک بە نێوەڕاستی باژێڕدا تێدەپەڕی و پێی‌دەگوترا کیدنۆس و بەرینایی بوارەکەی دەگەیشتە دوو پلێترا. خەڵکی ئەو شارە لەگەڵ سی‌ئێنێسیس روویان لە شوێنێکی حاستەمی سەرچیا کرد. تەنیا ئەو کەسانە مانەوە کە خاوەن هۆتێل و خواردنگە و بازاڕی بوون. هەڵبەت دانیشتووانی دەڤەرەکانی سۆلوو و ئیسوویش لە شوێنی خۆیان نەبزووتن.

خاتوو ئێپی‌ئاکسا، خێزانی سی‌ئێنێسیس پێنج ڕۆژ بەرلە کورووش گەیشتبوە تارسوو. هێزەکانی مێنۆن کاتێک بە ڕێگای چیاکانەوە بەرەو دەشتایی داگەڕان، دوو گوڕدانیان تێداچوون. بەگوێرەی گوتەی خەڵک، ئەوانە لەکاتی تاڵاندا کوژران، لەلایەکی‌تریشەوە وێدەچوو کە لە لەشکر هەڵبڕابن و ڕێگایان هەتلەکردبێ و لە نێو چیاکاندا سەرگەردان خولابنەوە و قڕببن. ژمارەی ونبووەکان نیزیک بە سەد چەکدار دەبوون. هێزەکانی گەیشتنە تارسوو دانیشتووان و کۆشک و قەسرەکانی شاریان تاڵان کرد، بەو حیسابەی تۆڵەی بێ‌سەر و شوێنەکانیان لە خەڵکەکە کردبێتەوە.

کورووش کاتێک چووە نێو شاری تارسوو، خێرا بەدوای سی‌ئێنێسیس‌یدا نارد. پاشای کیلیکیا تا ئەو کاتە دیداری هیچ کەسێکی نەکردبوو و بۆیە لەخۆی ڕانەدەدی چاوی بە کورووش بکەوێت. دوای ئەوەی کورووش بەڵێنی پێدا کە نایکوژێ، ئەوجار ژنی ناوبراو مێردەکەی ڕازی بەو دیدارە کرد.

دوای ئەو رووداوانە و دیداری کورووش و سی‌ئێنێسیس، ناوبراو پارەیەکی فرەی بۆ مەخاریجی نیزامییەکان بە کورووش‌دا و لە بەرامبەردا چەند دیارییەکی وەرگرت کە بەلای فارسەکانەوە گرینگ بوون. خەڵاتەکانی کورووش بریتی بوون لە ئەسپێک بە لغاوی زێڕ و دەستبەند و ملوانکەی زێڕ و جل‌وبەرگی فارسی و هەروەها بەڵێنی ئەوە کە لە داهاتوودا بە هیچکەس ڕێگە نادرێت وڵاتەکەی سی‌ئێنێسیس تاڵان و وێران بکا و ناوبراو دەتوانێ کۆیلەکانی بەدیل‌گیراویشی وەرگرێتەوە.

# بەشی ٣

## ڕاپەڕینی سەربازەکانی لەشکر و ئاخاوتنی کلیئارخۆس – زیادکردنی مووچەی مانگانەی سەربازەکانی لەشکر

کوروش و هێزەکانی ماوەی بیست ڕۆژ لە شاری تارسوو مانەوە. لەشکرەکانی یۆنانی ڕازی نەبوون زێدەتر ئەو ڕێگایە بپێون و هەستیان بەوە کردبوو کە بەمەبەستی شەڕ دژی پاشای فارس کەڵکیان لێوەردەگرن.[٤٧] گوتیان کە سەرەتا بۆ ئەو خواستە بەکرێنەگیراون. لە دەسپێکی سەرهەڵدانی گرفتەکەدا، کلیئارخۆسی فەرماندەیان تۆزێک زەختی لێکردن. ئەوانیش لە بەرامبەر ئەو پێداگرتنەی کلیئارخۆس، خۆی و وڵاغەکانییان بەردەباران کرد. کلیئارخۆس کاتێک بەدەست ئەو بەردەبارانە ڕزگاری هات، بەو قەناعەتە گەیشت کە ناکرێ هێزەکانی ناچار بە قبوڵی ئەو خواستە بکا، بۆیە بانگهێشتی سەرکردەکانی لەشکری بۆ کۆبوونەوە کرد. پێش دەستپێکی کۆبوونەوەکە لە بەرامبەر ئەندامانی سپاکەیدا گەلێک گریا. ئەوانیش بێدەنگ

---

٤٦- لەشکری کوروش ماوەی ٢٠ ڕۆژ لە تارسوو مایەوە. سەربازەکانی لەشکر حازر نەبوون لەوە زیادتر پێشڕەوی بکەن. ئەوان بەو قەناعەتە گەیشتبوون کە نەخشەی کوروش، شەڕ دژی ئەردەشیر پاشایە. پاش حەول و تەقەللای کلیئارخۆس، ئەوسا گشتیان قبوڵیان کرد کە درێژە بە ڕێگا بدەن.

تەنیا چاویان لە ناوبراو بڕیبوو. لە درێژەدا بەو شێوەیە دەستی بە ئاخاوتن کرد: " سەربازەکان! پێتانوانەبێ لەرووی بێزارییەوە رەوش و بارودۆخی ئێستام تەحەمول کردوە. کوروش دۆستێکی بەنرخی من بوو و کاتێک ئاوارە بووم و لە زێدی خۆم دەرکرابووم، ناوبراو منی بە قەدر و حورمەتەوە وەرگرت و دە هەزار داریکیشی پارە پێدام، منیش دیارە ئەو پارەیەم بۆ پێداویستییەکانی شەخسی خۆم خەرج نەکردوە و خەریکی خۆش رابواردنیش نەبوومە بەڵکوو هەمووی ئەو پارەیەم لە پێناو ژیان و گوزەرانی ئێوەدا خەرج کردوە. پێش هەر کارێک بەیارمەتی ئێوە دژی تراکییەکان شەڕم کرد و تۆڵەی یۆنانم لێیان‌ئەستاندەوە، لە ناوچەی خێرسۆنیسۆ دەرمکردن، چونکە دەیانویست ئەو دەڤەرە لە خاکی یۆنان جیا بکەنەوە. وەختێک کوروش بانگهێشتی کردم ئێوەشم لەگەڵ خۆم بۆلای ناوبراو برد تا ئەگەر هەرەوەزێکی پێویست بێ، یارمەتی ناوبراو بدەین و جوابی ئەو چاکانە بدەینەوە کە دەرهەق بە ئێمە کردویەتی.

بەڵام ئێستا کە ئێوە ناخوازن لەوە زیادتر لەگەڵ من ئەو ڕێگایە بپێون، ناچارم یا دەبێ خەیانەت بە ئێوە بکەم و دۆستی کوروش بمێنمەوە یا لەگەڵ ئێوە بم و لەلای کوروش بە درۆزن دەرچم. نازانم باش یا خەراپ دەجوڵێمەوە، تەنیا ئەوە دەڵێم کە ئێوە بەلای منەوە گرینگترن. هەرچی لە داهاتوودا بەسەرم بێ، مادام لەگەڵ ئێوەم جێگای نیگەرانی نییە و ئەرکی سەرشانمە. کەس ناتوانێ تاوانبارم بکا کە هێزە یۆنانییەکانم بردە وڵاتی بەربەرەکان و قازانج و بەرژەوەندی گەلەکەم لەپێناو دۆستایەتی لەگەڵ ئەوان وەپاش گوێخست. مادام ئێوە بەگوێرەی خواستی من ناجوڵێنەوە[٤٨]، من وەدوای ویستی ئێوە دەکەوم و ئامادەی هەرچەشنە فیداکارییەکیش لەو پێناوەدا هەم. ئێوە دۆست و وڵات و هاوپەیمانی منن و لەگەڵ ئێوە لە هەموو

---

٤٧- پێوەندی و چوارچێوەی مافەکانی ئێمە لەگەڵ کوروش، ناوەرۆکی قسەکانی کلیئارخوس بوون. بەواتایەک نیشاندانی شەڕێوی و ئەو گرفتەکانەی کە لەشکری یونانی ڕەنگ بوو تووشیان بێ، ئەگەر پێوەندی دۆستایەتی لەگەڵ کوروش تێکدابا. یونانییەکان چیان بەسەردێت و کلیئارخوس چۆن خۆی لەگەڵ خواستی ئەوان ڕێکدەخا، بەشێکی‌تر لە ئاخاوتنی ناوبراو بوو.

شوێنێک خاوەن ڕێز و حورمەتم. بەبێ ئێوە ناتوانم نە خێرم بۆ دۆستەکانم هەبێ و نە بەربەرەکانێشم لەگەڵ دوژمنەکانم پێدەکرێ. لە کۆتاییدا بەڵێن بە ئێوە دەدەم کە هەر شوێنێک بخوازن بچن، لەگەڵتان دێم.

کلێئارخۆس بەو چەشنە دوا. هێزەکانی لەشکری و پیاوەکانی ناوبراو و ئەوانیتریش کاتێک گوێیان لەو ئاخاوتنە بوو کە کەس ناچاریان ناکا دژی پاشای فارس بکەونە ڕێ، پێشوازیان لە قسەکانی کلێئارخۆس کرد. پتر لە دوو هەزار کەس لە لەشکری کسێنیاس و پاسیۆناس چەکەکانیان دەستدایە و سوار بوون و لە تەنیشت کلێئارخۆس مۆڵیان خوارد.

کاتێک کوروش بەو خەبەرەی زانی، ناڕاحەت و نیگەران بوو و پەیکەکەی خۆی بەدوای کلێئارخۆسدا نارد. کلێئارخۆس ئەو بانگهێشتنەی کوروشی قبوڵ نەکرد، بەڵام بەنهێنی یەکێک لە پیاوەکانی نیزامی جێگای باوەڕی خۆی ناردە لای کوروش و ڕایسپارد کە متمانەی تەواوی هەبێ، ئەو جۆرەی خواستی کوروشە بە ئەنجام دەگات. داوای لە ناوبراو کرد کە بەردەوام پەیک بنێرێ و بانگهێشتی بکا و خۆشی هەموو جارێ لە چوون بۆلای کوروش دەپاراست و بانگهێشتنەکەی ڕەتدەکردەوە.

دوای ئەو ڕووداوانە، کلێئارخۆس هێزەکانی کۆکردەوە، چ ئەوانەی هی خۆی بوون و چ ئەوانەی هاتبوونە لای و سەرجەم هەرکەسێک ویستبای گوێی لێڕاگرێ. ناوبراو ئەوجار گوتی: سەربازان، هەڵوێستی کوروش ڕەنگدانەوەی قەراری ئێمەیە. نە ئێمە خۆمان بە سەربازی ئەو دەزانین و نە ئەویش ئامادەیە لەوە زیادتر مووچەی ئێمە بدا. هەرچەند دڵنیام ناهەقیمان لەگەڵ کردوە، سەرەڕای ناردنی بەردەوامی پەیکەکەی و بانگهێشتی من، هەروەک ئەو ماوەیە بینیتان، خۆم لە دیداری ئەو پاراستووە. بەڕاست لە ڕووم هەڵنەهات، چونکە دەستخەرۆم کردوە، قەول و بەڵێنەکانم لەژێرپێناوە و لەوەش دەترسم کە بمگرێ و بەتاوانی بەڵێنشکاندن سزام بدا. بەبڕوای من کاتی ئەوە هاتووە لە خەو ڕاپەڕین و لەگەڵ خۆمان خەڵوەتێک بکەین و دوای تاووتوێ کردنی ئەو ڕووداوانەی دوایی، چارەیەک بۆخۆمان بدۆزینەوە.

ئێستا کە بڕیارمان داوە لێرە بمێنینەوە، دەبێ ئەوەندەی ئیمکانی هەبێ ئاستی ئەمنی و نیگابانیمان بەرینە سەر، ئەگەر دەخوازین هەر ئێستا بڕۆین، پێویستە بە ئەمنییەتێکی تەواو و ئامادەکردنی تفاقی پێویست بۆ وڵاغەکانمان وەڕێکەوین. بەبێ لەبەرچاو گرتنی ئەو ئامادەکارییانە، نە سەرباز و نە فەرماندە هیچ بایخێکمان نابێ. پێمخۆشە ئەوەش بزانن، کورووش دۆستی بەنرخی ئەو کەسەیە لەگەڵی ڕاست بێ، دوژمنی دڕندەی ئەو کەسەشە کە دژایەتیی بکا و دژیی شەڕرابگەیێنێ. ناوبراو خاوەن هێزی پیادە ، سوارە و ناوگانی دەریایی بەهێزە. ئێمەش بەوە دەزانین و دیتوومانە و لە مۆڵگە نیزامییەکانی ناوبراویش دوور نین. ئێستا کاتی ئەوە هاتووە هەرکام لە ئێمە بێتە ئێرە و ڕاوبۆچوونی خۆی دەربڕێ.

کلێئارخۆس کۆتایی بە ئاخاوتنەکەی هێنا. لەدرێژەدا هێندێک کەس بۆچوونی خۆیان گوت و چەندێکیش دوای قسەکانی کلێئارخۆس گوتیان کە گەلێک دژوارە بەبێ ڕەزامەندی کورووش بگەڕێینەوە دواوە. یەکێک لەوانە زۆر بە پەلە بوو دەیویست خێرا بچێتەوە[٤٩] یۆنان و لە نێو قسەکانیدا گوتی کە هەرچی زووتر پێویستە سەرکردەیەکیتر لەجیاتی کلێئارخۆس هەڵبژێرین ئەگەر ناوبراو ناخوازێ بگەڕێتەوە دواوە، تفاقێکی فرە بۆ وڵاغەکانمان بکڕین (ئەوە لە حاڵێکدا کادێن و حەمبارەکانی تفاق لەنێو ئۆردوگای هێزەکانی بەربەردا بوون)[٥٠] و باروبنە وەپێچین. دواتر ئەو کەسە لەدرێژەی قسەکانیدا گوتی کە پێویستە بچنە لای کورووش و داوای گەمی بۆ گەڕانەوە لە ناوبراو بکەین. ئەگەر ڕازی بە دانی گەمی نەبوو، داوای چاوساغی لێبکەین بۆوەی لە ڕێگادا هەتڵە نەبین و وەک دۆست بەنێو خاکی خۆیدا دەربازمان بکا. ئەگەر ڕازی بە دانی چاوساغیش نەبوو ئەوکات خێرا ئامادەی شەڕ لەگەڵ ناوبراو

---

٤٨- یەکێک وێدەچێ لە بارودۆخی یونانییەکان حاڵی نەبووە و داوادەکا ئەگەر کلێئارخۆس لە گەڕاندنەوەی لەشکر بۆ دواوە واتە بۆ یوونی خۆی بپارێزێ، ستراتیژیتر هەڵبژێردرێن. ئەوەش کە چۆن و بەکوێدا و بەبێ خواستی کورووش بتوانن بگەڕێنەوە دواوە، کەس باسی لێوە ناکا.

٤٩- لەنێو قسەکاندا گزنفۆن ویستوویەتی نیشانبدا کە وەدەستهێنانی ئازووقە و بژێو لە شوێنێکی نێو جەرگەی هێزەکانی کوروشە، گەلیک دژوار بووە و بەبێ ڕەزامەندی ناوبراو ئیمکانی نەبووە.

بین و پیاوەکانمان بەرزاییەکان بگرن پێش ئەوەی بکەونە دەستی ئەوان یا هێزەکانی کیلیکیایی کە پێشتر تالآنمان کردون.

دوای ئەو کابرایە، کلیئارخۆس دەستی بە ئاخاوتن کردەوە و گوتی: هیچکام لە ئێوە نابی چاوەڕوانی ئەوەی لە من هەبێ فەرماندەری ئەو هێرشە بکەم[51]. لەبەر گەلێک هۆ ناتوانم پێشنیارێکی ئەوەتۆ پەسند بکەم، بەڵام بەڵێن دەدەم مل بۆ فەرمانەکانی ئەو کەسە ڕاکێشم کە وەک سەرکردە دەستوورم پێدەدا. ئەوەش بۆیە دەکەم کە ئێوەم دڵنیا کردبێ و نیشانم دابێ کە زیادتر لە هەرکام لە ئێوە سەری کڕنۆش بۆ بڕیارەکان دادەنوێنم.

دوای کلیئارخۆس یەکێکیتر هەستا سەرپێ و وڵامی بۆچوونەکانی ئەو کەسەی دایەوە کە پێشتر داوای گەمی لە کوروش دەکرد، وەک ئەوەی بخوازێ رووی پەلامار و هێرشەکە بەرەو ناوچەی سارد وەرگێڕێ. ناوبراو لە درێژەی وڵامدانەوەدا گوتی: خواستێکی گەلێک بێمانایە داوای چاوساغ لە کوروش بکەین، گریمان ئەویش لە رووی باوەڕی ئێمەوە کەسێکمان بۆ دیاری بکا، پیاو چۆن بزانێ ناوبراو پێشتر هێزەکانی لە بەرزاییەکان دانامەزرێنێ و زەرەدێکمان پێناگەیێنێ! من بەش بە حاڵی خۆم حازر نیم لەنێو گەمییەکدا دانیشم کە کوروش بۆمانی دەنێرێ و لەولاشەوە ڕێگای نووقم بوونی بۆ لەبەرچاو گرتبێ. هەر بەو چەشنەش غیرەت ناکەم وەدوای چاوساغی دیاریکراوی ناوبراو کەوم کە ڕەنگە بمانباتە شوێنێک کە ڕێگای نەجاتمان بۆ نەبێ. بە بڕوای من ئەگەر قەرار بێ بەبێ ئاگاداری کوروش بڕۆین، باشترە زۆر بەنهێنی وەڕێکەوین. هەڵبەت ئەوەش ئیمکانی نییە. ئەو باسانەی ئەو کابرایە کردی بەلای منەوە قسەی بێ مانان، بەباوەڕی من ئەوەی ڕاستە ئەوەیە کە وەفدێکی ئێمە دەبێ بە سەرپەرشتی کلیئارخۆس بچێتە لای کوروش و بزانێ ناوبراو چی لە ئێمە گەرەکە و کەڵکی چیمان لێوەردەگرێ. ئەگەر بخوازێ وەک بەکرێگیراوانی پێشووی یۆنانی لەگەڵمان هەڵسوکەوت بکا، دەبێ ئێمەش وەک ئەوان لەبەر چاو بگرێ نەک بە کەمتر و

---

٥٠- کلیئارخۆس لە وڵامی ئەو کابرایەدا گوتوویەتی: " هەر شتێک بەستراوەتەوە بە کوروش. ئەو دەتوانێ هەم بازاڕ و هەمیش گەمیمان لە ئیختیار بنێ ".

ئەوساکە ئێمەش ڕەگەڵی دەکەوین. هێزە یۆنانییەکان جاری پێشوو هاوڕێیەتی ناوبراویان کرد تا گەیشتەوە وڵاتی فارس. ئەگەر نەخشە و مەبەستەکانی لەوانەی تا ئێمرۆکە دیتوومانە گرینگتر و دژوارتر و مەترسیدارترن، یا دەبێ بەپلەی بەرزتر وەرمان گرێ یا بۆوەی لەگەڵی بین دڵنیامان بکا و وەک دۆست ئێزنی گەڕانەوەمان پێبدا. ئەگەرنەوجۆرەی گوتم وەک دۆست لەگەڵی بڕۆین، ڕێز و حورمەتمان لەجێی خۆیدا دەمێنێتەوە. ئەگەریش ڕێگای گەڕانەوە بگرینە بەر، دیسان بەسلامەتی و بەبێ گیروگرفت دەچینەوە وڵاتی خۆمان. کوروش هەر وڵامێکی لەو بارەوە داوە، پێویستە هەموومان لێرە گوێبیسی بین. هەرکات وڵامەکانمان پێگەیی، ئەو وەختە ڕاوبۆچوونی خۆمان دەردەبڕین.

گوتەکانی ئەو پیاوە بەلای هەموانەوە دروست بوون، خەڵکەکە چەند کەسێکیان هەڵبژارد بۆوەی لەگەڵ کلیئارخۆس بچنە لای کوروش و بزانن ڕاوبۆچوونی ناوبراو لەهەمبەر بڕیاری ئەو هێزانە چیە.

کوروش گوتی کە زانیاری پێگەیشتووە ئافرۆکۆماسی دوژمنی بە مەودای دوازدە مەنزڵ لە نیزیک چۆمی فورات ئۆردوی لێداوە. بۆیە دەخوازێ هێرش بکاتە سەری. ئەگەر هەر لەوێ مابێ ئەوە سزای دەدا، ئەگەریش پاشەکشەی کردبێ، ئیتر لەوێ بڕیار دەدەن کە پێویستە چبکەن.

وەفدەکە دوای بیستنی ئەو وڵامانە گەڕانەوە و هێزەکانیان لە باس و خواسەکان ئاگادارکرد و هەرچەند شکی ئەوەیان هەبوو کە کوروش بەڕاست خەرێکی پەلامارێک بۆ سەر شای فارسە، بەو حاڵەش بڕیاریاندا ڕەگەڵی بکەون. دیارە داوای مووچەی پتریان لە ناوبراو کردبوو، ئەویش بەڵێنی پێدابوون کە نیوەی مواجبێک زیادتر، واتە سێ و نیو دارێک بە هەر کامیان پارە بدا. لێرەش کەس بە ئاشکرا لە ناوبراوی نەبیست ئاخۆ دەخوازێ هێرش بکاتە سەر ئەردەشیرپاشای برای یان‌نا.

# بەشی ٤

## گەیشتنە ئیسوو - هاتنی گەمییەکان
## ڕۆیشتن لە ئیسوو و چوونە ولاتی شام
## بەجێهێشتنی لەشکر لەلایەن زنیاس و پاسیۆن
## ئاخاوتنی کورووش و گەیشتنە قەراخ چۆمی ئاراس

کورووش لەو شوێنەڕا بە دوو قۆناخ و دە فەرسەخ گەیشتە چۆمی پسارۆ[٥٢] کە خاوەن بەرینایی سێ پلێترا بوو. لەوێشەوە بە مەنزڵێک و پێنج فەرسەخ ڕێگا خۆی گەیاندە چۆمی پیرامۆ. بەرینایی ئەو ڕووبارەش یەک ستادیۆ (١٨٥.٢ میتر) بوو. ناوبراو بە دوو قۆناخ و پازدە فەرسەخ مەودا گەیشتە ئیسوو، دوایین شار بەرەو دەریا و لە لای سنوورەکانی خوارووی ولاتی کیلیکیا. ئەو بازێڕە گەورە و ئاوەدان و پڕ سامان بوو. کورووش و هێزەکانی سێ ڕۆژ لەوێ مانەوە. لەو شارە سیوپێنج گەمی کە لە پێلۆپۆنیسۆوە هاتبوون، تێکەڵ بە هێزەکانی کورووش بوون و پیساغۆراسی

---

٥١- چۆمی پسارۆ ئیمڕۆ لەلایەن تورکەکانەوە پێیدەگوترێ ڕووباری جەیحوون چای. لە شاری (سوودا) ناوی نراوە فارۆس و لە نووسراوەی خەڵکانیتر سارۆس هاتووە.

لاکێدیمۆنی[٥٢] گەمیوانی ئەو کۆمەڵە گەمییەی کردبوو. بیست و پێنج لەو گەمییانە بەدەست تامۆسی میسری لە ئێفێسۆوە بۆ گەمارۆدانی شاری میلیتۆ ناردرابوون. ئەو سەردەمە خەڵکی ئەو بازێڕە پشتیوانییان لە تیسافێرن کردبوو و تامۆس‌یش هاوکات لەگەڵ کوروش دژی ناوبراو شەڕی دەست پێکردبوو. تامۆس و خیریسۆفۆسی لاکێدیمۆنی لەسەر بانگهێشتی کوروش بە حەوسەد چەکدارەوە هاتبوونە خزمەتی ناوبراو. ئەو گەمییانە لە نیزیک خێمەی کوروش لەنگەریان گرتبوو. هەروەها تەواوی هێزەکانی لە خزمەت ئاڤرۆکۆماسدا بوون، سەرکردەی خۆیان بەجێهێشت و هاتنە لای کوروش و ژمارەیان گەیشتە نیزیکەی چوارسەد چەکدار و لەگەڵ ناوبراو دژی پاشای فارس بەشداریان لە هێرشەکەدا کرد.

کوروش لەو شوێنەوە بە مەنزڵێک و پێنج فەرسەخ ڕێگا پێوان گەیشتە دەروازەکانی وڵاتی کیلیکیا و سوریا. ئەو دەروازانە لە دوو ڕیز شوورەدا بیناکرابوون. دەروازەکانی ڕیزی نێوەوە لەژێر چاوەدێری سی‌ئێنێسیس و لەلایەن هێزەکانی وڵاتی کیلیکیاوە پاسەوانی دەکران، لەحاڵێکدا ڕیزی دەرەوە بەرەو وڵاتی سوریا بوون و بەدەست هێزەکانی پاشایەتییەوە بوون. ڕووباری کارسۆس بە نێوان ئەو دوو ڕیزە شوورەیەدا تێدەپەڕی و خاوەن بەرینایی یەک پلێترا بوو. بەرینایی تەواوی نێوان دوو شوورەکە سێ ستا یۆ بوو و بۆیە کەس بە شەڕ نەیدەتوانی لێی‌دەرباز بێ. داڵانێکی تەنگ و بەرتەسک و دیوارەکانیش تا دەریا ڕاکشابوون و لە قەراخ بەحریشەوە بە ڕەوەزی ڕژد و هەڵدێر کۆتاییان پێدەهات. هەردوو شوورەکە خاوەن دەروازە بوون. کوروش مەبەستی بوو بە دەروازەکاندا تێپەڕێ، بۆیە داوای لە هێزەکانی دەریایی کرد چەکدارەکان بۆ نێوەوە و دەرەوەی ئەو دەروازانە ڕاگوێزن. بەو هێزانە فەرمان‌درا لەوێوە زەخت بخەنە سەر هێزەکانی دوژمن ئەگەر هاتوو دەروازەکانی دیوی سوریا بەدەست دوژمنەوە پاسەوانی بکرێن. کوروش هەڵبەت لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە ئاڤرۆکۆماس ڕەنگە ئەو کارە بکا چونکە خاوەن هێزێکی زۆرە. بە پێچەوانەوە ئاڤرۆکۆماس ئەو کارەی

---

٥٢- گەمیوان سامیۆ، گزنفۆن لە کتێبی زمانی یونانیدا دەڵێ: " کابرایەک خەڵکی دورگەی سامۆس بەناوی پیتاغۆراس (فیساغوراس) بووە" .

نەکرد چونکە ئاگادار کرابوو کە کوروش و هێزەکانی بەرەو نێوەندی وڵاتی کیلیکیا ڕۆیشتوون و ئەویش بەرەو دواوە گەڕابۆوە و ڕێگەی پێچەوانەی گرتبوە بەر و بەخۆی و سێسەد هەزار چەکدارەوە رووی لە وڵاتی فینیقیا کردبوو بۆوەی بچێتە لای پاشا.

کوروش بە سوریادا تێپەڕی و دوای قۆناخێک، پێنج فەرسەخ ڕێگا ڕۆیشت و گەیشتە میریاندۆ شارێکی نیزیک دەریا و ئاوەدانی فینیقی. شارێکی بازەرگانی و بەندەری بوو و گەلێک بەلەمی بازرگانی لەوێ لەنگەریان گرتبوو. کوروش و هێزەکانی حەوت ڕۆژ لەو شارە مانەوە. کسینیاسی ئارکادی و پاسیۆنی میگاریێئا، هەردوو فەرمانەدەی نیزامی سواری گەمییەک بوون[٥٤] و پاش بارکردنی کەلوپەلی بەوەجیان ڕایانکرد. هەروەک زۆر کەس دەیگوت پیاوەتی ئەوانە دەرکەوت. کوروش دەستووری بە کلیئارخۆس‌دا کە هێزەکانی بەجێماوی ئەو دوو فەرماندەیە بەرێتە ژێر دەسەلاتی خۆی، هەڵبەت چەکدارەکانی ئەو هێزانە پێیانوابوو دەگەڕێنەوە یۆنان لەجیاتی ئەوەی شەڕ دژی پاشای فارس بکەن. بەشێک لە خەڵکەکە دەیگوت کە گەمییەکانی جەنگی کوروش بەدوایانەوەن. خەڵکانێک ئاواتەخواز بوون ئەو دوو کەسە بگەڕێنەوە، چونکە خەڵکی خۆیان بەجێهێشتبوو. بەشێکیش لەمەڕ چارەنووسیان خەفەتبار و نیگەران بوون و لەوە دەترسان دووبارە دەستبەسەر بنەوە.

کوروش فەرماندەرەکانی هێزە یۆنانییەکانی کۆکردەوە و پێیگوتن:" کسینیاس و پاسیۆن ئێمەیان بەجێهێشت. هەڵبەت دەبێ باش بزانن کە ناتوانن خۆیان حەشار بدەن چونکە دەزانم لە کوێن. ناشتوانن لەدەست من ڕاکەن، لەبەر ئەوەی هەرکات بخوازم گەمییەکانی من گەمی ئەوان دەدۆزنەوە. بەڵام سوێند دەخۆم کە قەرار نییە ڕاویان بکەم، بۆیە کەسیش لە ئێوە ناڵێ کوروش ئەگەر مرۆڤێکی لە خزمەت‌دا بێ بەهرەی لێوەردەگرێ و ئەگەریش ئەو ئینسانە ویستی بڕوا ئەوە ئازاری دەدا و پارەکەی لێوەردەگرێتەوە. هەرکەس بخوازێ بۆ هەر شوێنێک بچێ، پێمخۆشە

---

٥٣- کسینیاسی ئارکادی، پاسیۆنی میغاریئا، ئەوانە گشتیان سواری گەمی بوون کە کەرستەی قیمەتی لێ بارکرابوو. نەگوتراوە ئاخۆ ئەو فەرماندەرانە سەربازەکانیشیان لەگەڵ خۆیان بردوە یاکوو هەر خۆیان ڕۆیشتوون. ویدەچی سەربازەکانیشیان بردبن.

ئەوەندە بزانێ کە ئەو هەڵسوکەوتی جوامێرانەی دەرهەق بە ئێمە ڕەچاونەکردوە نەک ئێمە بە خەراپی لەگەڵیدا جوڵابینەوە. ئەگەر ژن و منالّی ئەو دوو ڕاکردوە لە ناوچەی ترالی، لە خاکی ژێر حوکمی مندا بژین، ڕایان‌ناگرم و دەیان‌نێرمەوە وڵاتی خۆیان. ئەو چاکەیەش تەنیا لەبەر خاتری ئەو خزمەتەیە کە ئەو دوو کەسە تا ئێستا بە ئێمەیان کردوە".

کوروش بەو چەشنە دوا. ئەو هێزە یۆنانییانەی کە تا ئەو کاتە خوازیاری بەشداری لە لەشکرکێشی کوروش بۆ سەر پاشای فارس نەبوون، کاتێک ڕەفتاری جوامێرانەی ناوبراویان دیت، بە ورەیەکی بەرزتر و خواستێکی زیادترەوە وەدوای ئەو کەوتن.

دوای ئەو ڕووداوانە، کوروش بە چوار مەنزڵ، بیست فەرسەخ ڕێگا ڕۆیشت و گەیشتە چۆمی خالۆس بە بەرینایی یەک پلێترا. ئەو ڕووبارە پڕ لە ماسی خۆماڵی بوو کە وەک خواکان لەلایەن خەڵکی شامەوە پەرستیش دەکران و کەس بۆی نەبوو ئەزیەتیان بکا. ئەو ڕەشماڵانەی لە گوندەکانی دەڤەرەکە هەڵدرابوون، تەواویان مڵکی پەریزادی شاژن بوون و وەک تیول لەلایەن پاشای گەورەوە پێی بەخشرابوو بۆوەی بتوانێ مەخاریجی خۆی پێ‌دابین بکا.

کوروش لەو شوێنەڕا بە پێنج قۆناخ و سی فەرسەخ ڕێگا ڕۆیشتن گەیشتە سەرچاوەی چۆمی داردانۆس. ئەو چۆمە یەک پلێترا بەرین بوو. ڤلیسیئۆس حاکمی وڵاتی شام لەو شوێنە خاوەن قەسرێک و باغێکی گەلێک گەورە و جوان بوو کە هەموو چەشنە دار و گوڵ و گیایەکی تێدابوو و چوار وەرزی ساڵ میوەی دەست‌دەکەوت. کوروش دەستووری‌دا تەواوی ئەو باغە ببڕن و قەسرەکەش ئاور تێبەردەن. ناوبراو لێرەشەوە بە سێ مەنزڵ و پازدە فەرسەخ ڕێگاوە گەیشتە چۆمی فورات. بەرینایی چۆمی فورات دەگەیشتە چوار ستادیۆ. لێرە شارێکی گەورە و ئاوەدان و دەوڵەمەند بەناوی تاپساکوس هەڵکەوتبوو. کوروش پێنج ڕۆژ لەو شارە مایەوە و تەواوی ستراتێژەکانی یۆنانی بانگهێشت کرد. (ستراتێژ- سەرتیپی نیزامی) ناوبراو پێیگوتن کە گەرەکیەتی هێرش بکاتە سەر پاشای مەزن لە شاری بابێل. هەروەها ئەمری کرد کە فەرماندەکان ئەو دەستوورە بە هێزەکانیان ڕاگەیێنن و بەهەر شێوەیەک دەکرێ ڕازی بە بەشداریان لەو

پەلامارەدا بکەن. ستراتێژەکان کۆبوونەوەیەکیان بۆ خەڵکی نیزامی خۆیان پێکهێنا و باسی بڕیاراتی کوروش‌یان کرد. خەڵکەکە بە تێکڕا نارەزایەتییان بەرامبەر بە فەرماندەکانیان دەربڕی و پێیان گوتن کە ئێوە پێشتر بە مەبەستەکانتان زانیوە و تەنیا لە خەڵکتان شاردوەتەوە. هەروەها گوتیان لەوە زیادتر ناخوازن درێژە بەو ڕێگایە بدەن مەگەر ئەوە کە مووچەکەیان بدرێت و وەک ئەو وەجبە خەڵکە وەبەرچاوبگیرێن کە جاری پێشوو لەگەڵ کوروش چووبوونە لای داریوشی باوکی. هەڵبەت وەجبەی پێشوو بۆ شەڕکردن دژی پاشای گەورە بەکرێ نەگیرابوون، بەڵکوو باوکی کوروش داوای گەڕانەوەی کوڕەکەی کردبوو و بەس.

ستراتێژەکان کوروش‌یان لەو بارەوە ئاگادار کردەوە و ناوبراویش بڕیاری‌دا کاتێک گەیشتە بابێل، پێنج سکەی زێو بە هەرکام لە چەکدارەکان دەدا. هەروەها مووچەی تەواویش ئەو کاتە دەدا کە لە بابێلڕا بگەڕێنەوە یوونی. دوای ئەو بەڵێنانە زۆربەی قۆشەنی یۆنانی ڕەزامەندی خۆیان نیشان‌دا. بەڵام ستراتێژ مێنۆن پێش ئەوەی هێزەکانی‌تری یۆنانی لەمەر درێژەپێدانی ڕێگا خۆیان ساغ کردبێتەوە، واتە ڕەگەڵ کوروش بکەون یان‌نا، قۆشەنی ژێر فەرمانی خۆی کۆکردەوە و پێی‌گوتن: سەربازان ئەگەر خواستەکانی من جێبەجێ بکەن، کوروش ئێوەی بەلاوە عەزیزتر دەبێ تا هێزەکانی‌تری یۆنانی، بەبێ ئەوەی لەوان ماندووتر بن. کوروش ئێستا بۆ دژایەتی پاشای مەزن پێویستی بە یارمەتی هێزە یۆنانییەکان هەیە. من دەڵێم پێش ئەوەی وڵامی خەڵکانی‌تری یۆنانی بۆ ناوبراو ئاشکرا بێت، با لە چۆمی فورات بپەڕینەوە. چونکە، ئەگەر ئەوان قەناعەت بێنن و درێژە بەو ڕێگایە بدەن، ئەوە ئێوەن کە دەبنە پێشقەرەوڵی بڕیارێکی ئەوتۆ و وەک یەکەم کەسانێک لە ڕووبار پەڕیونەوە. سەبارەت بەو جوامێریەی ئێوە کوروش دەیندار دەبێ و لە داهاتوودا قەرەبووی چاکەکەتان دەکاتەوە. ناوبراو لە هەموو کەس پتر چاکەی لەچاودایە. ئەگەر هاتوو ئەوانی‌تر ڕێگای گەڕانەوەیان گرتە بەر ئێمەش دەتوانین وەدوایان کەوین و هەموو پێکەوە بگەڕێینەوە دواوە، کوروش پێیوایە تەنیا ئێوە بوونە کە پەسندی فەرمانەکەیتان کردوە، بۆیە وەک گاردی پارێزگاری و فەرماندەری کەڵک لە ئێوە وەردەگرێ و تەنیا باوەڕی بە ئێوە

دەبێ و لەوەشدا شکم نییە کە دەبنە خاوەن دۆستێکی بەوەفای وەک کورووش لەمەر هەر چەشنە پێداویستی و گیرگرفتێکدا.

وەختێک جەماوەری ژێر فەرمانی مێنۆن ئەو ئاخاوتنەی ناوبراویان بیست، بە قەناعەت گەیشتن و پێش ولامدانەوەی خەڵکانیتر لە چۆمی فورات پەڕینەوە. کورووش وەختێک هەواڵی پەڕینەوەی ئەو جەماوەرەی پێگەیشت، گەلێک خۆشحاڵ بوو و ڕاسپاردە غلۆی ناردە لای هێزەکانی مێنۆن و ئەو بەڵێنەی بۆ ڕەوانە کردن: " من شانازی بە ئێوە دەکەم، بەڵێن بێ چەندی لە توانامدا هەبێ و بە هەر ڕێگایەک بۆم بلوێ وەها دەگەڵ ئێوە بجوڵێمەوە کە لە داهاتوودا ستایشی من بکەن، غەیری ئەوە ناوم دەگۆڕم و پێم ناڵێن کورووش".

ئەندامانی ئەو هێزە نیزامییە بە هیوایەکی فرەوە ئاواتەخواز بوون کە هێرش بۆ سەر پاشای گەورە سەر بگرێت. هەڵبەت دیارییەکی بە نرخیش لە لایەن کورووشەوە بۆ مێنۆن ناردرابوو. کورووش دوای ئەو ڕووداوە، لەگەڵ هێزەکانیتر لە ڕووباری فورات پەڕیەوە. خەڵکی دەربازبوو لەو چۆمە خوڕێنە تەنیا تا سینگیان تەڕ ببوو. دانیشتووانی دەڤەری تاپساکوس دەیانگوت کەس تا ئێستا زاتی نەکردوە بەپێ لەو چۆمە بپەڕێتەوە و هەمیشە لۆتکەیان بەکار هێناوە. هەڵبەت لۆتکەکانیش پێشتر بەدەست پیاوانی ئاڤرۆکوماس سووتێندرابوون بۆوەی هێزەکانی کورووش کەڵکیان لێوەرنەگرن و نەتوانن بپەڕنەوە ئەوبەری چۆم. ویدەچوو خواستی خودایی لەوبەینەدا کاری خۆی کردبێ، چونکە کورووش گەرەکی بوو ببێتە پاشا، قووڵایی ئاوی ڕووبارەکە لەبەرامبەر ناوبراودا لەکەمیدابوو.

کورووش لەو شوێنەڕا بە نۆ مەنزڵ و پەنجا فەرسەخ ولاتی شامی جێهێشت و گەیشتە چۆمی ئاراکس[٥٥]. لەو دەڤەرە گەلێک گوندی دەوڵەمەندی خاوەن گەنم و شەڕاب هەبوون. کورووش و جەماوەری هاوڕێی سێ ڕۆژ لەو ناوچەیە مانەوە و لەباری خواردن و تفاقەوە تەواو خۆیان تەیار کرد.

---

٥٤- چۆمی ئاراکس (ئاراس)، لە میسۆپۆتامیا هەڵکەوتووە. کورووش کاتێک بە تاپساکۆدا تێپەڕیوە، چووەتە میسۆپۆتامیا. گزنفۆن باسی ئەو حەرەکەتەی کورووش ناکا و تەنیا ناوی سوریا دێنێ. بە واتایەک ئەو ولاتە تا چۆمی ئاراس بەربەرین دەکاتەوە. ناوبراو ولاتانی دوای چۆمی ئاراسیش، گشتیان ناودەنێ عەرەبیا (عەرەبستان).

## بەشی ٥

### ڕێپێوانی دژواری لەشکر لە سەحرا - گەیشتنە خارماندی - کێشەی نێوان دوو سەرباز

کوروش بەلای ڕاستی چۆمی فوراتدا ڕێگای بیابانی عەرەبستانی گرتەبەر و بە پێنج قۆناخ، سی‌وپێنج فەرسەخ پێشڕەوی کرد. لەو دەڤەرە ڕێگا تەواو دەشتایی بوو و وەک بەحر گوڕ و ساف و پڕ لە گژ و گیا. ئەو دەشتە تەواو بە گوڵ و گیای بۆنخۆش و قامیشەڵان ڕازابۆوە. تاقە دارێکی بۆ نیسیێ لێ‌نەبوو. ئاژەڵی دڕندە و کێوی و ڕەوەکی جۆراوجۆر چەشنی کەرەکێوی و وشترمرغی زەلام و ئۆتارد(مریشکە کێوی) و مەراڵ وەبەرچاو دەکەوتن. ئەو ئاژەڵە کێوییانە جاروبار لەلایەن سوارکارانەوە ڕاودەکران. کەرەکێوییەکان کاتی ڕاوکردنیان مەودایەک غاریان‌دەدا و پاشان دەوێستان چونکە لە ئەسپ توندتر هەڵدەهاتن. هەرکات ئەسپ لێیان نزیک دەبۆوە، ڕایان‌دەکردەوە و گرتنیان گەلێک دژوار بوو، مەگەر ئەوەی کە سوارکارەکان نێوەنێوە

ڕاوەستابان و بەردەوام درێژەیان بە ڕاوکردنیان دابا و نۆرەیان لەگەڵ یەکتر کردبا. گۆشتی کەرەکێوییەکانی ڕاوکراو وەک گۆشتی بزنە کێوی دەچوو و تۆزێک ناسکتر بوو. هەڵبەت کەس نەیدەتوانی وشترمرغەکانی باڵدار ڕاو بکا. ئەگەر ڕاوچییەک یا سوارکارێک ویستبای لەو وشترمرغانە بگرێ، خێرا لێی پەژیوان دەبۆوە چونکە زۆر زوو دوور دەکەوتنەوە و کاتی غاردان و ڕاکردن کەڵکیان لە قاچەکانیان وەردەگرت و باڵەکانیشیان فشدەکرد. مریشکە کێوییەکان واتە ئۆتارد، ئەگەر ڕاوچی توانیبای لە هێلانەکانیان دەریانپەڕێنێ، گرتنیان زۆر هاسان بوو چونکە تەنیا مەودایەکی کورت دەیانتوانی ڕابکەن و وەک کەو خێرا ماندوو دەبوون. گۆشتیشیان گەلێک بە تام و چێژ بوو.

کوروش و هێزەکانی دوای دەرباز بوون لەو ناوچەیە گەیشتنە چۆمی ماسکا کە یەک پلێترا بەرین بوو. لەو دەڤەرە شارێکی گەورە و چۆل هەبوو بەناوی کورسوت. لەو شارە سێ ڕۆژ مانەوە و لەباری ئازووقەوە خۆیان تەیار کردەوە. لە درێژەی ئەو ڕێگا پێوانەدا نەوەد فەرسەخ بە بیاباندا ڕۆیشتن و بەلای ڕاستی چۆمی فوراتدا گەیشتنە دەروازەی[٥٦] ئەو دەڤەرە. لە ڕێگادا ولاغ و مالاتێکی زۆر لە بەر بێ تفاقی و تینوویەتی هیلاک بوون. بەدرێژایی ڕێگا دارو دەوەنێک، کانیاو و شیناوەردێک وەبەر چاو نەکەوت. تەواوی سەحراکە بێ لەوەڕگە و ویشکارۆ بوو.

خەڵکی ئەو ناوچەیە بەو ڕۆژگارە لە قەراخ چۆم خەریکی تاشینی بەرد و دروست کردنی بەرداش و دەستاڕ بوون و بۆ شاری بابیلیان دەنارد و لەوێ دەیانفرۆشتن و بە داهاتی ئەو بەرداشانە بژیوی خۆیان دابین دەکرد. لە مۆلگەی هێزە یۆنانییەکاندا گەنم تەواو ببوو و لە هیچ شوێنێک جیا لە بازاڕی لیدیا وەگیر نەدەکەت، ئەویش لە نێوەندی هێزەکانی بەربەری ژێردەسەلاتی کوروشدا هەڵکەوتبوو. دەبوایە بۆ کڕینی گەنم سکەی زێڕ بدەن. هەر کاپیت (زەرفی دوو لیتری) ئاردی جۆ یا گەنم چوار سیغلۆسی تێدەچوو (هەر سیغلۆس تەقریبەن

---

٥٥- باسی شارەکە خۆی نیە، بەڵکوو مەبەست دەروازەکانی شاری بابیلی ئیمڕۆیە. وەک دەروازەکانی کیلیکیا، میدیا و سووریا. گوزەرێکی بەرتەسک لە نێوان سەحرای عەرەبستان بەرەو دەشتی پڕ حاسلاتی بابیلۆنە.

سی شاهی) و بەرابەری حەوت و نیو سکەی زێو یا دراخمی ئەو سەردەمی ناوچەی ئەتیکی (ئاتێن و حەومە) بوو. هەر کاپیت ئارد یا جۆ دەیکردە قەیاسی دوو خینیکۆسی ئەتیکی ( لە لیترێک زیادترە). هێزە یۆنانییەکان بۆوەی بژین ناچار بوون ئەو ماوەیە بە خواردنی گۆشت ڕازیبن.

ئەو شوێنانەی کە کورروش و هێزەکانی هاوڕێی گەرەکیان بوو لێیدامەزرێن و بحەسێنەوە و ئاو و ئازووقە و تفاقی ویشک بۆ وڵاغەکانیان دابین بکەن، لە یەکتر گەلێک دوور بوون. ناچاربوون ڕێگای پێشڕەوی بەردەوام بپێون. جاروبار لەشکر لە رووی ناچارییەوە بە دالآنێکی تەنگ و قوڕاویدا دەرباز دەبوو، فایتوونە جەنگییەکانیان زۆر بە سەختی تێدەپەڕین. بۆیە کورروش و گەورە پیاوانی و سەرکردە مەزنەکان فەرمانیان بە پەیکەکانیان واتە غلۆ و پیغریتادا نارد کە هێزەکانی نیزامی بەربەر یارمەتی دەرهێنانی فایتوونە جەنگییەکانیان بدەن کە لەنێو قوڕ و زەلدا چەقیبوون. لەبەر ئەوەی پێشرەوی هێزەکان تەواو شل ببۆوە، ناوبراو فەرمانی بە سەرکردەکانی فارسی ژێردەستی خۆیدا فایتوونە جەنگییەکان لەو قوڕ و چلپاوە دەرهێنن. بەو فەرمانە دەرکەوت کە ئیتاعەت و نەزمی هێزەکانی فارس چەند و چۆنە، چونکە خێرا جلە سوورە جەنگییەکانیان دەرهێنا و لەهەر شوێنێک بوون، وەک ئەوەی سەرکەوتنێکی مەزن چاوەڕێیان بێ، بەڕاکردن وەک لە بەرقەدی تەپۆلکە داگەڕێنەخوار، بە دەستبەند و ملوانکە و گۆرەوی دەستچنی ڕەنگاوڕەنگ و کراسی پڕقیمەتی بەریان، خۆیان لەنێو قوڕەکە داویشت و بە خیراییەکی بێوێنە فایتوونە جەنگییەکانیان دەردەهێنا.

هەموویان بەپانەوە دەیانزانی کە کورروش لەو لەشکرکێشی و ڕێپێوانەدا پەلەیەتی، بۆیە سستیان نەدەنواند، مەگەر پێویست بوایە لە شوێنێک لابدەن بۆوەی ئازووقە و ئاو و تفاقی وڵاغەکانیان دابین بکەن یا گرفتێکیتر خوڵقابێ، ئەوسا خۆیان تۆزێک دەگوێزراند. کورروش لەو باوەڕەدا بوو کە هەرچی خێراتر بگاتە پێتەخت، پاشا پتر لە بێخەبەری و سەر لێشێوایدا دەبێ و لە شەڕدا زووتر غافلگیر دەکرێ. بەڵام بەپێچەوانەوە ئەگەر وەدرەنگی بکەوێ، پاشا فرسەتی دەست دەکەوێ هێزی پتر کۆبکاتەوە. دیارە ئەوەش

بڵێم کە هەر سەرکردەیەکی لەشکریی وردبین دەیتوانی بە بەراوردکردنی پانتایی وڵات و ژمارەی دانیشتووان، لەوە تێبگا کە دەوڵەتی پاشایەتی فارس خاوەن هێزە یانەنا. پێویست بوو ئەوە بزانێ کە لەبەر مەودای درێژی ڕێگا و پەرش و بڵاوی هێزەکانی لەشکریی، گەلێک دژوار بوو پەلامارێکی خێرا و شەڕێکی لەنەکاو دژی پاشا ڕێکبخرێت.

پاش چەند جار مۆڵخواردن لە بیابان و بەلای ڕووباری فوراتدا، شارێکی گەورە و ئاوەدان بەناوی خارماندی[٥٧] لەسەر ڕێگا هەڵکەوتبوو. هێزە یۆنانییەکان ئازووقە و تفاقیان لەو شارە دابینکرد. ئەو هێزانە بۆ پەڕینەوە لە چۆم و خۆتەیار کردن دارێکی زۆریان لەپاڵ یەک بەست و ئەو کەوڵانەی لەجیات خێمە کەڵکیان لێوەردەگرتن، وەک جەواڵ پڕ لە کا و گیایان کردن و بەچەشنێک دووریانن کە تفاقی نێویان تەڕ نەبێ و لەسەر داربەستەکانیان دانان و مەحکەم لێکیان بەستن و وەک کەڵەکی سەر ئاو بۆ پەڕینەوە کەڵکیانلێوەرگرتن. بە سواری ئەو کەڵەکانە لە چۆم پەڕینەوە و هەرچی ئازووقەی کڕیبوویان، گواستیانەوە. شەڕابی خورما[٥٨] و نانی گەنمە شامی بە فراوانی لەو دەڤەرە وەدەست دەکەوت.

لەو شوێنە دمەقاڵەیەک لەنێوان دوو سەرباز لە دەستەی مێنۆن و لە جەماوەری کلێئارخۆس سازبوو. کلێئارخۆس پێیوابوو سەربازەکەی دەستەی مێنۆن تاوانبارە و سزایدا. ئەو سەربازە گەڕاوە نێو گوردانەکەی خۆی و چۆنییەتی ڕووداوەکەی باسکرد. هاوڕێیانی ئەو سەربازە کاتێک بەو بەسەرهاتەیان زانی، بڕیان لە تۆڵە ئەستاندنەوە لە ناوبراو کرد. کلێئارخۆس هەر ئەو ڕۆژە هاتە بازاڕ و چاوەدێری هێزەکانی نیزامی کرد کە لە چۆم پەڕیبوونەوە و بۆ کڕینی شتومەکی پێویستان ڕوویان لەو شوێنە کردبوو. ناوبراو پاش چاوەدێری کردن بەمەبەستی گەڕانەوە سواری ئەسپ بوو و بەنێو هێزەکانی سەر

---

٥٦- خارماندی، شارێکی دەوڵەمەند. دوور لە چۆمی فورات و لە دەشتاییدا هەڵکەوتبوو. گزنفۆن باسی شوێنی دەقیقی ئەو شارە ناکا. هێرۆدیت لە نووسراوەکانیدا بەناوی (ئیس) باسی دەکا. ئیمرۆکە لە وڵاتی عێراق هەڵکەوتووە و خەڵکی ناوچەکە پێیدەڵێن هیت (حیت).

٥٧- ئەو شەڕابە لە خورما دروستکراوە. دیۆسکۆریدیس لە نووسینەکانیدا باسی شێوەی دروستکردنی ئەو شەڕابەی کردوە و دەڵێ شیرین و بۆدارە و گەلێک توندە.

به مێتۆندا دەرباز بوو و هێزێکی پارێزەری ئەوتۆی لەگەڵ نەبوو. کوروش خۆی هێشتا نەگەیشتبوە ئەو شوێنە و لە ڕێگادا بوو. کاتێک کلیئارخۆس بە تەنیشت سەربازێکی مێتۆندا دەرباز بوو کە خەریکی بڕینی داری سوتەمەنی بوو، سەربازە هەرکە چاوی بە ناوبراو کەوت، بیورێکی ڕێهاڵاند بەڵام نەیگرت. سەربازێکیتر بەردێکی هاوێشتێ و خەڵکیتریش بەهەمان شێوە سەریان لەدوونا و هەراوهوریایەکی سەیر مۆڵگەی داگرت. کلیئارخۆس بەپەلە خۆی گەیاندەوە نێو هێزەکانی و فەرمانیدا ڕۆبنە چەکەکانیان. دەستووری ئامادەباشی تەواوی بە هێزەکانی خۆیدا. ئەوانیش قەڵغان لەبەر چۆکان چاوەڕوانی فەرمانی هێرش بوون. خۆیشی هێزی سوارە و هێزەکانی تراکی کە لەلای ئەو بوون و چل کەسێک دەبوون، پەلاماری جەماوەری مێتۆنیاندا. وەک دژکردەوە، مێتۆنیش ڕایکردە نێو هێزەکانی خۆی و گشتیان ڕۆبوونە چەکەکانیان. خەڵکانێکی زۆر لەو بەینەدا نیگەرانی بارودۆخی خولقاو بوون.

لەو نێوەدا پرۆکسێنۆس لەگەڵ چەکدارەکانی خۆی بەوێدا هات. ناوبراو دوای دیتنی بارودۆخەکە، خێرا هێزەکانی لەنێوان هەردوو لایەنی دژبەر دامەزراند و داوای لە کلیئارخۆس کرد هێرش دژی مێتۆن بوەستێنێ. کلیئارخۆس گەلێک توڕە بوو چونکە تاوێک پێشتر خەریک بوو بەهۆی بەردەباران تێدابچێ. پرۆکسێنۆس داوای لە ناوبراو کرد سێبووری خۆی بپارێزێ و دەستووری پێدا لە مەیدان بڕواتەدەر.

کوروش لەوکاتەدا گەیشتە شوێنی ڕووداوەکە و ئاگاداری بەردبارانەکە کرا. ناوبراو عەسای دەستدایە و خێرا خۆی گەیاندە نێوان هێزەکانی هەردوولا و گوتی: " کلیئارخۆس، پرۆکسێنۆس! ئێوە هیچ دەزانن یۆنانییەکانی حازر، خەریکی چنە؟ ئەگەر دەخوازن شەڕی هەڤدوو بکەن جیا لەوەی من ماڵوێران دەکەن خۆشتان هێدیهێدی تێدادەچن. ئەگەر لەنێو خۆماندا پێکەوە تەبا نەبین، ئەو هێزە بەربەرانەی دەیانبینن خەراپتر لە هێزەکانی بەربەری پاشا دەبنە دوژمنمان ".

کلیئارخۆس کاتێک گوێی لەو قسانە بوو هێور بۆوە و بەو شێوەیە لایەنەکانی دژبەر دەستیان لە ڕکەبەرایەتی هەڤدوو هەڵگرت و چەکەکانیان دانا.

# بەشی ٦

## خەیانەت و بە سزا گەیشتنی ئۆرۆنداس

وەختێک کورووش و هێزەکانی لەو شارەڕا وەڕێکەوتن، چاویان بە شوێنپێی ولاغ و ناڵی ئەسپان کەوت. لەو شوێنپێیانەڕا بۆیان دەرکەوت کە دەبێ ڕەوەیەکی دوو هەزار سەری ئەسپ دەرباز بووبێ. ئەو هێزە سوارەیەی پێشتر ڕۆیشتبوو، هەرچی مووچە و مەزرای سەر ڕێگا و کەرستەی بەکەڵکیان دیتبوو ئاوریان تێبەردابوو. ئۆرۆنداس لە بنەماڵەی پاشایەتی فارس و لەنێو لەشکردا بۆ شەڕکەری ناسراو،[٥٩] ڕاوێژکاری کورووش بوو، هەرچەند پێشتر دژایەتی ئەوی کردبوو.

ئەو ڕاوێژکارە داوای لە کورووش کرد کە هەزار شەڕکەری بداتێ تا بتوانێ بۆسەیەک بنێتەوە و ئەو هێزە سوارەیەی خەریکی ئاور تێبەردانی دەغڵ و دانە، تەفر و توونایان بکا یا بە زیندوویی بیناگرێ و نەهێڵێ لەبەردەم هێزەکانی کورووش ڕێگربن. ناوبراو هەروەها گوتی کە دەتوانێ وەها لەو

٥٨- ئۆرۆنتاس، ئەشرافزادەی فارس و دۆستی پاشا و زانا لە کاروباری شەڕ. ناوبراو سەرەتا دژایەتی کورووشی کرد و دواتر لەگەڵی پێکهاتبۆوە.

هێزە سوارەیە بکا قەت جارێکی‌تر نەتوانن ئەگەر هێزەکانی کورشیان دیت خەبەر بۆ پاشای گەورە بەرن.

کوروش بەوردی گوێی لە قسەکانی ناوبراو گرت و بۆچوونەکانی سەبارەت بە پێشوەچوونی نەخشەکان گەلێک بەلاوە گرینگ بوو. بۆیە فەرمانی‌دا هێزی سوارەی پێویست لە گوردانەکانی نیزامی بۆ ناوبراو کۆبکرێتەوە.

کاتێک ئۆرۆنداس خاترجەم بوو کە هێزی سوارەی بۆ ئامادە کراوە، نامەیەکی بۆ پاشای مەزن نووسی و پێی‌راگەیاند کە لە ماوەیەکی نیزیکدا دەخوازێ بێتە خزمەتی و هێزێکی سوارەی بەوەجیشی لەگەڵە. داوای لە پاشا کرد کە فەرمان بە هێزەکانی سوارەی خۆی بدا پێشوازی گەرمی لێبکەن. لە نامەکەدا هەروەها باسی وەفاداری و دۆستایەتی پێشووی خۆی وەبیر پاشا هێنایەوە.

ناوبراو نامەکەی دایە دەست یەکێک لە نیزامیانی باوەڕ پێکراوی خۆی. ئەویش هەرکە نامەکەی وەرگرت، خێرا خۆی گەیاندە لای کوروش و نامەی گۆرینی تەسلیمی ئەو کرد.

کوروش وەختێک نامەکەی خوێندەوە دەستووری گرتنی ئۆرۆنداسی‌دا و حەوت کەس لە سەرکردەکانی فارسی هاوڕێی خۆی بانگهێشت کردە[60] خێمەکەی. فەرمانی دەسەر سەرکردەکانی یۆنانیش کرد پاسەوانەکانیان بە چەکەوە لە دەوری خێمەکە دامەزرێنن. فەرماندەرەکانی نیزامی حوکمەکەیان بەجێهێنا و نیزیکەی سێ هەزار چەکداریان بۆ پاسەوانی لە دەوری خێمەی کوروش دامەزراند. کوروش داوای لە کلێئارخۆس کرد وەک باوەڕ پێکراو بێتە ژووری خێمە چونکە زیادتر لە فەرماندەرەکانی‌تری نیزامی یۆنانی و

---

٥٩- ژمارەی حەوت، نەخشی ئایینی جادوویی هەبووە. کوروش حەوت کەسی لە نەجیبزادەکان وەک ڕاوێژکار لەلای خۆی ڕاگرتبوو. حەوت قازیشی هەبوو. کاتێک خواستی پەلاماری تاج و تەختی براکەی هێنا بەرباس، کۆڕی ڕاوێژکار هەشت کەس لە دۆستانی فارسی ناوبراو لەوێ بوونە. بۆیە کاتی کوژرانی ناوبراو هەشت ڕاوێژکاری لەگەڵدا بووە. هەڵبەت دەبێ ئارتاپات لە کۆڕی ئەو حەوت نەجیبزادەیە هەڵاوێرین.

سەرکردەکانی فارس جێگای متمانەی ناوبراو بوو[61]. کلیئارخۆس کاتێک دوای کۆبوونەوەکە لە خێمە وەدەر کەوت، ڕەوتی دادگایی ئۆرۆنداسی بۆ هێزەکانی ژێر فەرمانی خۆی باس‌کرد چونکە قەومانێکی شاراوە نەبوو. ناوبراو سەبارەت بە چۆنییەتی دانیشتنەکە و قسەکان لە زمانی کوروشەوە بەو شێوەیە ئاخاوت: " دۆستان! بۆیە ئێوەم بانگهێشت کردوە ڕاوێژتان لەگەڵ بکەم و بڕیارێک کە بە لای خواکان و مرۆڤایەتی هەق بێ لەسەر ئۆرۆنداس بدەین. باوکم سەرەتا ئەو پیاوەی نارده لای من بۆوەی وەک باوەڕ پێکراوێک لەگەڵم بێ. دواتر ئەو کەسە بە قسەی براگەورەکەم دژی من شەڕی کرد و قەڵای شاری ساردی گرت و منیش بەردەوام دژی ئەو جەنگیم تا ناچارم کرد قەناعەت بێنێ و چیتر دوژمنایەتیم نەکا و ئاشت‌بووینەوە.

کوروش پاشان ڕووی لە ئۆرۆنداس کرد و پێی گوت: ئۆرۆندا! تا ئێستا هیچ ناهەقییەکت سەبارەت بە خۆت لەمن دیوە؟ ئۆرۆندا لەوڵامدا گوتی، نەخێر. کوروش دیسان پرسیاری لێکرد: بەڵام، هەروەک ددانت پێداهێنا، بێ ئەوەی هیچ خەراپییەکت لەمن دیتبێ کەوتییە بەرەی میزییەکان و ئەوەندەی بۆت کرا زەرەرت بە وڵاتی ژێرحوکمی من گەیاند. کاتێک هەستت بە بێ‌هێزی و کزی خۆت کرد هاتییە مەعبەدی ئێفێسیوس ئارتێمیس و پەژیوانی خۆت ڕاگەیاند، قەناعەتیشت بە من هێنا و بەڵێنت پێدام دۆستایەتی ڕەچاو بکەی و منیش لێت خۆش بووم. ئۆرۆنداس لێرەش قسەکانی کوروشی پەسندکرد.

کوروش ئەو جار پرسیاری کرد: کەوابوو لەکوێ ناهەقیت لێکراوە؟ ئێستا بۆ جاری سێهەم بەتاوانی کوشتنی من دەستگیر کراوی، بۆچی؟

ئۆرۆنداس گوتی: قازانجێک لە گۆڕێدا نییە.

کوروش پرسیاری کرد: ئەگەر وایە قبوڵدەکەی کە ناهەقیت کردوە؟

---

٦٠- کوروش جیا لە حەوت نەجیبزادەکان تەنیا داوای لە کلیئارخۆس کردوە کە بەشداری دانیشتنەکەیان بێ، بۆوەی بڕیاری کۆتایی لەسەر چارەنووسی ئۆرۆنتاس بدەن. کلیئارخۆس هەرچەند گەلێک جێگای باوەڕی کوروش بووە، بەلام سزای مەرگی ئۆرۆنتاس بڕیاری ئەوی لەگەڵ نەبووە.

ناوبراو وڵامی داوە: ناتوانم هیچ کارێکیتر بکەم جگە لەوەی قبوڵی تاوانەکان بکەم و ددانی پێدابنێم.

کوروش جارێکی دیکەش پرسیاری لە ناوبراو کرد: پێتوایە لەمەوبەدوا بتوانی دۆستایەتی من بکەی و دوژمنی براکەم بی؟

ئۆرۆنداس لە وڵامدا گوتی: ئەگەر ببمە دۆستی تۆ، دڵنیام قەت جارێکیتر باوەڕم پێ ناکەیەوە. دوای ئەو وڵامەی ئۆرۆنداس، کوروش رووی لە ڕاوێژکاران و بەشدارانی کۆبوونەوەکە کرد و گوتی: ئەو کابرایە ئەو کارانەی کردوە و ئێستاش بەو شێوەیە قسە دەکات، تۆ کلیئارخۆس تکایە ڕاو بۆچوونی خۆت لەو بارەوە بە من بڵێ.

کلیئارخۆس وڵامی داوە: من پێموایە هەرچی زووتر لە یەخەی خۆمانی بکەینەوە بۆوەی پێویست نەکا هەمیشە لە ترسی ئەو پاسەوانی لە خۆمان بکەین و لە دڵەڕاوکێدا بژین. ئەو کاتەی سەرفی پاسەوانی لەو کابرایەی دەکەین، باشترە بۆ پاراستنی دۆستانمان تەرخانی بکەین.

کلیئارخۆس لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: بە ئەمری کوروش هەموویان، تەنانەت خزمانی تاوانباریش هەستانە سەرپێ و نێوقەدی ئۆرۆنداس‌یان گرت[62] و ئەوەش بەو مانایە بوو کە سزای مەرگیان بۆ ناوبراو دەخواست. دەستەی جێبەجێ کردنی بڕیارەکە ئۆرۆنداس‌یان لە خێمەی کوروش بردەدەر. کاتێک خەڵکەکە ئۆرۆنداسیان دیت، هەروەک پێشتر ڕێزیان بۆ دادەنا حورمەتیان گرت هەرچەند دەیان زانی بەرەو مەرگ و نەمان دەچێ. دوای ئەوەی بە هۆی فەرماندەکانی کوروشەوە بردرایە خێمەی ئارتاپاتۆس کە یەکێک لە باوەڕپێکراوترین سەرکردەکانی کوروش بوو، لەو کاتەوە ئۆرۆنداس نە بە مردوویی و نە بە زیندویی وەبەرچاونەکەوتەوە و کەسیش نەیزانی چۆن کوژرا. هەرکەس بە گوێرەی خەیاڵاتی خۆی باسی مەرگی ناوبراوی دەکرد. هیچکەس بە شوێن و قەبری ناوبراویشی نەزانی.

---

٦١– لە هێندێک سەرچاوەدا هاتووە کە ئۆرۆنتاس سزای مەرگی بۆ دیاریکراوە و دەبوایە لەسێدارە بدرێت.

# بەشی ٧

## وەرێکەوتنی کورووش لە هەرێمی بابێل - بڕیاری کورووش بۆ شەڕکردن و بەڵێنی زیادکردنی مووچەی سەربازان

کورووش لەو شوێنەوە بە دەڤەری بابێلدا و بە سێ مەنزڵ، دوازدە فەرسەخی ڕێگا بڕی. ناوبراو لە قۆناخی سێهەمدا و کاتی نیوە شەو هێزە یۆنانی و بەربەرەکانی بەسەرکردەوە. ئەو دەیزانی کە ڕۆژی دواتر، لە بەرەبەیاندا دەگاتە شوێنی تێکهەڵچوون. فەرمانی بە کلێئارخۆسدا کە باڵی ڕاستی هێزە یۆنانییەکانی وەستۆ بگرێ و مێنۆنیش باڵی چەپ و بۆخۆشی فەرماندەری هێزەکانی بەربەری هەڵبژارد.

دوای ئەو بەسەرکردنەوەیەی، کورووش لە بەرەبەیاندا هێندێک لە سەربازەکانی لەشکری پاشا خۆیان ڕادەستی هێزەکانی کورووش کرد و زانیارییەکی فرەیان سەبارەت بە ئامادەکاری هێزەکانی پاشایەتی دایەدەست.

کورووش ستراتێژەکانی یۆنانی بانگهێشت کرد و باسیان لەوە کرد کە چۆن هێزەکانیان بۆ بەربەرەکانی لە بەرەکانی شەڕ دامەزرێنن. ناوبراو پێشنیاراتی خۆی بەیانکرد و پاش ورەبەخشین بە بەشداران گوتی: " یۆنانییەکان! داوای هاوکاریم لە ئێوە کرد و ئێوەشم کردە هاوپەیمانی خۆم، ئەوەش نەک لەبەر

کەمی هێزەکانی بەربەر، بەڵکوو زیادتر باوەڕم بە غیرەت و جوامێری ئێوە هەیە تاکوو هێزەکانی خۆم. تێبکۆشن پیاوانی بەوەج بۆ ڕزگاری بن، هەرچەند لەو بارەوە دڵنیام، بۆیە شانازیتان پێوە دەکەم. ئەو ئازادییەی من باسی لێوەدەکەم بزانن کە لە هەموو شتێک بەلامەوە گرینگترە. هەروەها بۆوەی بزانن تێکۆشانتان چۆن دەستپێبکەن و من لەبەر ئەوەی باشتر لە بارودۆخەکە تێدەگەم، زانیاری پێویستتان دەدەمێ. خەڵکی شەڕکەری بەرامبەرمان بە ژمارە زۆرن و بە هاوار و نەعرەتەی جۆراوجۆر پەلامار دەدەن. ئەگەر لەو دوو دیاردەیە نەترسن، بۆ باقی کردارەکانیتر پێموایە هەست بە شەرمەزاری دەکەم ئێستا باسیان لێوە بکەم، ئێوە بەڕاست نازانن خەڵکی ئەو دەڤەرە چ جۆرە بوونەوەرێکن. زۆر ناخایەنێ ئەوەشتان بۆ روون دەبێتەوە. ئەگەر جوامێرانە بجوڵێنەوە و لە شەڕەکاندا سەرکەوین، هەرکەس لە ئێوە بخوازێ بگەڕێتەوە وڵاتی خۆی، من تەواوی هەوڵ و هیممەتی خۆم وەگەڕ دەخەم بۆوەی بە قەدر و حورمەتەوە بچێتەوە وڵات و لای کەسوکارەکەی. هەرچەند لەو باوەڕەدام خەڵکانێکی زۆر خوازیاری مانەوە لە لای من دەبن و ناگەڕێنەوە شوێنی پێشوویان ".

لەو دانیشتنەدا دۆستێکی کوروش بەناوی سامیۆس، ئاوارە و خەڵکی غاڤلیتیس وڵامی قسەکانی ناوبراوی داوە[٦٢] و گوتی: " جەنابی کوروش! کەسانێک لەسەر ئەو باوەڕەن کە بە هۆی نیزیک بوونەوەی مەترسی شەڕ، تۆ بەڵێنێکی زۆر دەدەی، بەڵام دوای سەرکەوتنت لەو قەولانەت پاشگەز دەبیەوە. هێندێکیتر پێیانوایە کە ئەگەر بەڵێنەکانیشت لەبیر بێ و وەزعیشت باش بێ، ناتوانی ئەوانەی دەیانڵێی جێبەجێیان بکەی ".

کوروش کاتێک گوێی لەو قسانە بوو، لە وڵامدا گوتی: "پیاوەکان! هەروەک دەزانم فەرمانرەوایی باوکم لەلای باشوور تا ئەو جێگایە دەڕوا کە خەڵکی لەبەر گەرم بوونی دەڤەرەکە ناتوانن لێیبژین و هەروەها لەلای

---

٦٢- غاڤلیتیس خەڵکی دورگەی سامۆس و ئاوارە و دۆستی نیزیکی کوروش بووە. ناوبراو سەرەڕای دۆستایەتی گەرمی لەگەڵ کوروش، بەغیرەتەوە چی گوێی لێبووە، ئەوەی بۆ کوروش گێراوەتەوە.

باکووریشەوە تا ئەو شوێنە ساردەیە کە خەڵک لە سەرمان لێی هەڵناکەن. ناوچەکانی نێوەندی بە شێوەی ساتراپی لە ژێر دەسەڵاتی پیاوانی دۆستی براکەمن. ئەگەر ئێمە لەو شەڕەدا سەرکەوین، ناچارین کەسانی دۆستی خۆمان لەو شوێنانە دامەزرێنین. ئەو کاتە لەوە ناترسم دیاری فرەم نەبێ بۆ قەدر گرتن پێشکەشی دۆستانمی بکەم، بەڵکوو لەوە دەترسم ئەوەندەم دۆست نەبێ کە وڵامی چاکەیان بدەمەوە. هەڵبەت بیرم لەوە کردوەتەوە کە بە هەر یۆنانییەک تاجێکی زێڕ پێشکەش بکەم ".

بەشداران وەختێک گوێیان لەو قسە و بەڵێنانە بوو، هێندەی‌تر تامەزرۆی شەڕ بوون و لەدرێژەشدا نێوەرۆکی باسەکانی کۆبوونەوەیان بۆ نیزامییانی دیکە گواستەوە.

جیا لە ستراتێژەکان، خەڵکانی‌تریش کاتی ئاخاوتنی کورووش هاتبوونە ژووری خێمەکە و دەیانویست بزانن دوای سەرکەوتن لەو جەنگە چیان دەست دەکەوێ. کورووش پاش ئەوەی بە بەڵێنەکانی خۆی هەموویانی ڕازی کرد، ئەوجار تێیان‌ڕاما. تەواوی ئەوانەی قسەیان لەگەڵ ناوبراو کرد، داوایان ئەوە بوو خۆی بەشداری شەڕەکە نەکا و لە پاش هێزە یۆنانییەکان جێبگرێ. لەو نێوەدا کلێ‌ئارخۆس پرسیارێکی ئاراستەی کورووش کرد: " کورووش تۆ پێتوایە ئەوە براکەتە دەخوازێ دژی تۆ شەڕ بکا؟ ". کورووش لە وڵامدا گوتی: " بەڵێ، سوێند بە خواوەند دیا(ژوپیتێر)، ئەگەر ئەو کوڕی داریوش و پەریزاد و برای من بێ، بەبێ شەڕ بە خواستەکانم ناگەم ".

دوای بەسەرکردنەوە و چاوەدێری هێزەکانی نیزامی، سەرژمێری پیاوانی شەڕکەر بە ئەنجام گەیشت[٦٤]. هێزە یۆنانییەکان دە هەزار و چوارسەد

٦٣- کورووش لێرە سەرژمێری لەشکرەکەی دووپات کردوەتەوە، یونانییەکان ئەوانە بوونە: یازدە هەزار چەکداری قورس، دوو هەزار سووکە چەکدار. ئەگەر ئەو هەزار و سەت کەسەی هاتنە شاری ئیسۆ پێیانەوە زیاد بکرێن، ئەوسا ژمارەی لەشکر گەیشتووەتە چواردەهەزار و سەد کەس. بەڵام ئەگەر سەد سەربازی مێنۆن کەم بکەینەوە کە لە وڵاتی کیلیکیادا ونبوون، دەمێنێتەوە چواردە هەزار. لە سەرژمێری ئەوجاردا دەرکەوتووە کە دەهەزار و سێسەد چەکداری قورس و دوو هەزار و پێنج سەد سووکە چەکدار و سەرجەم دوازدە هەزار و نۆسەد کەس بوونە. لەوانە هەزار و سەد

چەكدار و دوو هەزار و پێنسەد سەربازی خاوەن چەكی سووك بوون. هێزەكانی بەربەریش لە دە میریاد (سەد هەزار) كەس و زیادتر لە بیست عارەبانەی جەنگی پڕ لە شەڕكەرەكانی داسوەشێن پێكهاتبوو. دەگوترا كە رادەی پیاوانی شەڕكەری لەشكری دوژمن خۆی لە سەد و بیست میریاد و دوو سەد فایتوونی پڕ لە داس وەشێنەكان دەدا. جیا لەوانەش شەش هەزار سواركاریش بە فەرماندەری ئەردەشیر خۆی ئامادەی جەنگ ببوون[٦٥]. ئەو هێزانەی دوایی لەپێش پاشاوە جێیان گرتبوو. سەركردەكانی نیزامی خانەدانی پاشایەتی تەنیا چوار كەس بوون. ئاڤرۆكۆماس، تیسافێرن، غۆڤریس و ئارواكیس و هەر كام لەوانە فەرماندەری سی میریاد خەڵكیان بەستووە بوو. هەڵبەت لەو هێزانە تەنیا نەوەد میریاد و سەد و پەنجا فایتوونی داس‌وەشێن گەیشتبوونە مەیدانی شەڕ. ئاڤرۆكۆماس وەدوا كەوتبوو و پێنج ڕۆژ دوای كۆتایی هاتنی تێكهەڵچوونەكە گەیشتەجێ و لە فینیقیڕا وەڕێكەوتبوو.

زانیاری ئەو كەسانەی خۆیان رادەستی كوروش كردبوو، لەگەڵ زانیاری بەدیل گیراوەكان یەكیان‌دەگرتەوە و وێكدەچوون.

كوروش لەو دەشتەڕا، بە مەنزڵێك سێ فەرسەخ پێشڕەوی كرد و تەواوی هێزە یۆنانی و بەربەرەكانی ڕێكخست. ناوبراو لەو باوەڕەدا بوو كە ڕەنگە نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە پاشا هێرش بكا. نیزیك لە نێوەڕاستی مەودای ئەو وێستگەیە خەندەكێكی قووڵ هەڵكەندرابوو كە قووڵایی و بەرینایيەكەی دەگەیشتە پێنج ئۆرغیا (هەشت میتر و دە سانتی میتر). بەلای ژووری دەشتەكەدا، ئەو خەندەكە دوازدە فەرسەخی‌تر ڕاكشابوو و دەگەیشتە دیواری وڵاتی میدیا، واتە ئەو جێگایەی كارێزەكان لە چۆمی دیجلەوە سەرچاوەیان

---

سەرباز لەگەڵ كسینیاس و پاسیۆن هەلاتوون و ژمارەیەكیش لە شەڕی جۆراوجۆردا مردوون و كوژراون.

٦٤- گزنفۆن چ لە زمانی سەربازان و چ لە ڕووی زانیاریی دیلەكانەوە دەڵێ: " لەشكری ئەردەشیر پاشا زۆر گەورە بوو ". نووسەرانی‌تر ئەو ژمارەیەیان بەلاوە دروست نیە. بەپێی زانیاریی گزنفۆن، لەشكری پاشا گەیشتوەتە یەك میلیۆن و سەد و بیست هەزار كەس. بەپێی زانیاریی دیۆدۆر ئەو لەشكرە بەگشتی لە چوارسەد هەزار كەس پێكهاتبوو ژمارەی یونانی و بەربەرەكان سەرجەم شێست هەزار كەس بووە.

دەگرت. ئەو چوار نەهرانە خاوەن بەرینایی یەک پلێترا و قووڵاییەکی ئەوتۆ بوون کە شەڕکەرەکان دەیانتوانی بە گەمی گەنمی پێدا راگوێزن. ئەو کاناڵانە دواتر تێکەڵاوی رووباری فورات دەبوونەوە. مەودای نێوانیان فەرسەخێک و پردیان لەسەر دروستکرابوو. لە نیزیک چۆمی فورات، داڵانێکی بەرتەسک لەنێوان چۆم و خەندەکی گۆرین هەبوو کە بەرینایییەکەی دەگەیشتە بیست پێ. پاشا ئەو خەندەکەی بە مەبەستی پارێزگاری و ڕاست لەو کاتەدا دروست کرد کە هەواڵی هێرشی کوروشی پێگەیشتبوو.

کوروش بەو داڵانەدا تێپەڕی و لەگەڵ هێزەکانی کەوتنە نێو خەندەکەکە. ئەو ڕۆژە پاشا هیچ شەڕێکی نەکرد، بەڵام شوێنپێی ئەسپەکان و هێزەکانی شەڕکەری پاشا بە روونی دیار بوو.

کوروش، ئەویش ئەو ڕۆژە بانگی تاڵەبین سیلانۆسی خەڵکی ئابراکیای کرد و سێ هەزار داریکی دایە دەست[66]، چونکە ئەو پیاوە یازدە ڕۆژ پێشتر، کاتێک قوربانی پێشکەشی خواکان کرد بە کوروشی گوتبوو کە پاشا وێناچێ لەو دە ڕۆژەدا هیچ شەڕێک بکا. کوروش لە وڵامدا گوتبووی: " ئەگەر قسەکەت ڕاست بێ و پاشا لەو دە ڕۆژەدا شەڕ نەکا، ئیتر چ جارێکیتر ئەو کارە ناکا. ئەگەر پێشگۆییەکەت وەڕاست گەڕێ، بەڵێن بێ دە تالانۆست پارە بدەمێ ". وەختێک دە ڕۆژکە تێپەڕی، کوروش ئەو بڕە پارەیەی دایە سیلانۆس.

لەبەر ئەوەی پاشا پێشی بە هێزەکانی کوروش نەگرتبوو کە خەندەکەکە دەرباز بکەن، ناوبراو و پیاوەکانی هاتنە سەر ئەو بڕوایە کە پاشا بیری شەڕی وەلاناوە. بۆیە کوروش ڕۆژی دوایی باری ئەمنی پێشوەچوونی هێزەکانی سووکتر کرد. ڕۆژی سێهەم کوروش بە سواری فایتوونی جەنگی وەپێش لەشکر کەوت و درێژەیان بە ڕێگادا. بەشی هەرە زۆری ئەو لەشکرە بەبێ نەزمی و بێ چەک وەڕێکەوتبوو و سیلاحەکانیان لە عارەبانە و وڵاغان بار کردبوو.

---

٦٥- سیلانۆس ئامفراکیۆتی، تاڵەبین بوو و ڕەگەڵ لەشکری کوروش کەوتبوو. سیلانۆس پێشگۆییەکی ڕاستی بۆ کوروش کرد. کوروش سێ هەزار داریکی دەستخۆشانە پێدا. سەبارەت بەو کابرایە زانیاری زۆر لەبەر دەستدا نیە.

## بەشی ٨

### شەڕی کوناکسا - کوژرانی کورروش

کاتی جموجۆڵی بازاڕ بوو، هێزەکانی کورروش لە نیزیک ئەو شوێنە سەرقاڵی پشوودان بوون. یەکێک لە باوەڕ پێکراوانی کورروش، پاتیغیئاس بە سواری ئەسپ چوار ناڵ غاریدەدا و تووشی هەر کەسێک دەبوو بە زمانی فارسی و یۆنانی پێیدەگوت کە پاشا بە لەشکریکی فرەوە خەریکە بۆ شەڕ نیزیک دەکەوێتەوە. هەروەک سروشتییە، ئەو هەواڵە بووە هۆی هەرا و هوریایەکی زێدە، چونکە هەم هێزە یۆنانییەکان و هەم قۆشەنەکانیتر لەو باوەڕەدا بوون کە پاشا بەسەر لەشکرێکی بێ ئامادەکاریدا دەکەوێ.

کورروش لە فایتوونە جەنگییەکەڕا خۆی فڕێدایە خوارەوە و جلی زرێی پۆشی و سواری ئەسپەکەی بوو و عەسای حوکمڕانی دەست دایە و فەرمانی بە هێزەکانیدا هەر کەسە جێی خۆی بگرێ و ئامادەی شەڕ بن. لەو کاتەدا کلیئارخۆس بە خێراییەکی بێوێنە لە لای ڕاست و لە نیزیک چۆمی فورات جێی گرت و پرۆکسێنۆس لەپاڵ کلیئارخۆس و ئەوانیتریش بەدوای ناوبراوەوە دامەزران. مێنۆن و سەربازەکانی یۆنانی ژێر فەرمانی، ئەوانیش بەرەی چەپی گۆڕەپانی جەنگیان گرت. هێزەکانی بەربەر، سوارە نیزامی

پاڤلاغۆنی کە نیزیک بە هەزار کەس دەبوون لە نیزیک کلیئارخۆس دامەزران. لە درێژەدا یۆنانییەکانی سووکە چەکداریش لەلای ڕاستی ناوبراو دامەزران.

لە بەرەی چەپی مەیدانی جەنگ، ئاریایۆس جێگری کورووش و باقی هێزەکان جێگیربوون. کورووش و سوارکارەکانی شەش سەد کەسێک دەبوون و لە نێوەڕاستی هێزەکانی شەڕکەر شوێنیان بۆ دیاری کرا. جیا لە کورووش هەر هەموویان بە چەک و زرێ و کڵاوی ئاسن تەیار کرابوون. کورووش لەکاتی شەڕدا هیچی لەسەر نەکردبوو و دەگوترا کە باقی هێزەکانی فارس بە سەری ڕووتەوە لە مەترسی و مەیداندا بوون. تەوای ئەسپەکانی کورووش لە پاش و پێشەوە جلی ئاسنیان لەبەردا بوو و سوارکارەکانیش شمشێری یۆنانییان بە دەستەوە گرتبوو.

نیوەڕۆ بوو و دوژمن وەدیار نەکەوت. لای ئێوارە تەپ و تۆزێکی وەک هەوری سپی لە دوورەوە پەیدا بوو و دواتر ڕەشایی قۆشەن تەواوی دەشتایی ناوچەکەی داگرت و تەواوێک نیزیک کەوتنەوە. پیاوانی کورووش بریقەی نێزە و کڵاو و مەتاڵی هێزەکانی پاشایان دیت. ئەو هێزە سوارەیەی لە باڵی چەپی قۆشەنی دوژمن بوو بە زرێی سپییەوە زاهیر بوو، دەگوترا کە تیسافێرن سەرکردایەتی دەکا. دوای ئەو هێزە ئەوجار جەنگاوەریتر هاتن. ئەوانیش خاوەن قەڵغانی چێوی بەرز بوون کە دەگەیشتنە عەرز و میسری بوون[٦٧]. پاشان هێزی سوارەی تیرهاوێژ بە ڕێژەی نەتەوەیی سازماندراو ڕاوەستابوون و هەر نەتەوەیەک خشتەیەکی چوارگۆشەی لە جەنگاوەرەکانی خۆی پێکهێنابوو. لە مەودایەکی کەم و لە ڕیزی پێشەوە، فایتوونەکانی جەنگی[٦٨] بەشێوەی لار و خێچ، لە ڕاست و چەپەوە دامەزرابوون و

---

٦٦- لە سەردەمی لەشکرکێشی کورووشدا، میسرییەکان خۆیان لەگەڵ فارسەکان لە شەڕدا بوون. ئەو سەربازانە وێدەچوو نەوەی داهاتووی ئەو کەسانە بن. لە شەڕی نێوان کراسۆس و کورووشی یەکەمدا، کراسۆس شکستی خوارد. دواتر کامبیز لە لەشکری خۆیدا جێی کردنەوە. بۆچوونیتر دەڵێ، ڕەنگە ئەو سەربازانەش وەک یونانییەکان مووچەخۆر بووبن.

٦٧- لە دوو لای چەرخەکانی ئەو فایتوونە جەنگییانە داسی تیژکراو بەسترابوون و کاتی ڕۆیشتن لە هەرکەسیان بدایە خێرا دەیانکوشت.

هێندێکیشیان لە نێوەڕاستەوە بۆ دابڕینی هێزەکانی دژبەر و کردنەوەی دالانێک ئامادە کرابوون.

شێوازی دامەزرانی ئەو فایتوونە جەنگییانە بە چەشنێک بوو کە بتوانن بە پلامارێکی خێرا و بەهێزەوە، دەستەی فایتوونە شەڕکەرەکانی کوروش لێک بلاوکەن. ئەوەی کە کوروش سەبارەت بە هەراوهوریای هێزەکانی دوژمن گوتبووی کە نابێ لێیان بترسن، بەپێچەوانەوە بوو و هیچ دەنگ و سەدایەک لە گۆڕێدا نەبوو و قۆشەنی دوژمن زۆر بێ هەست و لەسەرەخۆ بوو.

کوروش خێرا سواری ئەسپەکەی بوو و لەگەڵ دیلمانجەکەی بەناوی پیغریتا و سێ کەسیتر لە گەورە پیاوان بەپێش هێزەکانیدا ڕابرد و گوتی خێرا کلیئارخۆس تێبگەیێنن لەشکر بەرەو جەرگەی قۆشەنی دوژمن بەرێ کە ئەردەشیر خۆی لەوێیە و هەروەها گوتی ئەگەر لەوێدا سەرکەوین براوەی جەنگ ئێمەین.

کلیئارخۆس وڵامی بۆ کوروش ناردەوە کە پاشا ڕووبەڕووی قۆڵی چەپی هێزە یۆنانییەکانە، دیارە ژمارەی سپای دوژمن ئەوەندە زۆر بوو کە نێوەندی قۆشەنەکەیان لای چەپی هێزەکانی کوروشی تێپەڕاندبوو. کلیئارخۆس هەروەها ڕایگەیاند کە ناخوازێ قۆڵی راست و لای ڕووبار جێبهێڵێ بۆوەی مەبادا لە نێوان خەندەک و چۆمدا هێزەکانی لە دوو لاوە گەمارۆ بدرێن و ئەوەش بە مەسڵەحەتترە.

لەشکری دوژمن بە ئەسپایی بەرەو پێش دەهات و هێزە یۆنانییەکان لە شوێنی خۆیان دامەزرابوون و ئەوانەیتریش کە دەهاتن بە ڕێکوپێکی جێگای خۆیان دەگرت. کوروش بە سواری ئەسپ بە پێش هێزەکاندا تێپەڕی و بە مەودایەکی کەم لەولاتر ڕاوەستا و لە دوورەوە چاوی لەو دو لەشکرە دەکرد. جار چاوی لە هێزەکانی دوژمن بوو و جار لە هی خۆی، تا ئەو کاتەی سەربازێکی یۆنانی بەناوی "گزنفۆن"ی خەڵکی ئاتێن بە سواری ئەسپ وەرسوڕایەوە و لێی نیزیک کەوتەوە و پرسی، ئەگەر دەستوورێکی نوێ هەیە ئەو دەتوانێ بیگەیێنێتە جێ. کوروش ڕاوەستا و گوتی: " بە هەموولایەک ڕابگەیێنە قوربانی بۆ خودایان زۆرە(مەبەست سەرکەوتن چاوەڕوان دەکرێ)

". کاتێک ئەو قسەیەی کرد، گوێی لە دەنگێکی بەرز لەنێو ڕیزەکانی لەشکری یۆنانی بوو. پرسیاری لە گزنفۆن کرد، ئەو دەنگە چبوو؟ گزنفۆن لە وڵامدا گوتی ئەوە دەنگی فەرمانی دووهەم بوو. کوروش پێی سەیر بوو دەنگی فەرمانی دووهەم چیە؟ گزنفۆن لە وڵامدا گوتی کە دەنگی ژوپیتێر خواوەندی ئازادی و سەرکەوتنە. کوروش وەختێک گوێی لەو وڵامە بوو گوتی: قبوڵمە با وابێ. دوای ئەو قسانە بەرەو شوێنی دیاریکراوی خۆی ڕۆیشت کە تەنیا سێ چوار ستادیۆ دوور لە دوو لەشکرەکەی دوژمن بوو، لە ناکاو هێزە یۆنانییەکان دەستیان بە خوێندنی سروودی جەنگ کرد و یەکسەر بەرەو سپای دوژمن وەڕێکەوتن. بەشێک لە دەستەکانی قوشەنی سوارەی یۆنانی چەشنی مەوجی دەریا بەرەو پێش چوون. باقی هێزەکانیتر بەغاردان خۆیان گەیاندەجێ بۆوەی سەفەکان ڕێکخەنەوە و بەردەوام سروودیان دەگوتەوە کە بۆ ڕێز گرتن لە ئێنیئالیۆس (خواوەندی جەنگ) هۆنرابۆوە"[69]. لەگەڵ چڕینی سروود، نێزەکانیشیان لە قەڵغانەکانیان دەدا بۆوەی بەو دەنگانە ئەسپەکانی قوای دوژمن بترسێنن و ڕاکەن و پێویست بە تیرهاوێژی نەبێ. پێش ئەوەی بگەنە بەر مەیدانی تیر، هێزەکانی بەربەری سەر بە پاشا سەری وڵاغەکانیان باداوە و روویان لە فیرار کرد. لەو نێوەدا یۆنانییەکان ڕێیانکەوتن و هەر بابایە بە ئەوەیتری دەگوت بەبێ نەزمی مەڕۆن و تەرتیباتی نیزامی ڕەچاو بکەن. فایتوونەکانی جەنگی هێزەکانی دوژمن، هێندێکیان روویان لەلای هێزەکانی پەرش و بڵاوی خۆیان کردبوو و هێندێکیشیان بەرەو نێوەندی بەرەی لەشکری یۆنانی دەهاتن و گشتیان بێ فایتوونچی مابوونەوە. یۆنانییەکان کاتێک لە دوورەوە چاویان بەو فایتوونانە کەوت، ڕیزەکانی خۆیان بڕدا و تەنیا جارێک یەک لەوانە وەسەربازێکی یۆنانی کەوت کە بەسەر سوڕمانەوە چاوی لە مەیدانی شەڕ و فایتوونەکان دەکرد. دیارە ئەویش هیچ ئازارێکی پێنەگەیی. لەو ماوەیەدا جیا لە یەک سەرباز، هیچ جەنگاوەرێکی یۆنانی بریندار نەبوو و ئەویش لە قۆڵی چەپی هێزەکان تیرێکی وێکەوتبوو.

---

٦٨- ئێنیئالیۆس، ناسناوی خوای شەڕ و جەنگ واتە ئاری بووە.

کوروش کاتێک دیتی یۆنانییەکان سەرکەوتوون و هەرکەسێک لە بەرامبەریاندا ڕاوەستێ ڕاوی‌دەنێن، گەلێک خۆشحاڵ بوو و خەڵکی دەوروبەری کڕنۆشی شاهانەیان بەجێگەیاند. ناوبراو سەرەرای ڕازی بوونی لە وەزعەکە، بە مەبەستی ڕاودونانی هێزەکانی دژبەری، لە جێگای خۆی دوور نەکەوتەوە و هێزێکی سوارەی شەش سەد کەسی ڕاگرت و گەلێک بە لایەوە گرینگ بوو بزانێ دژکردەوەکانی پاشا چنە. تەواوی سەرکردەکانی لەشکریی فارس لە نێوەندی سپادا جێیان‌گرتبوو، چونکە لە هەموو شوێنێک ئەمنتر و فەرمان ناردن بۆ هەردوو لاوە هاسانتر بوو. پاشاش لە نێوەندی هێزەکانیدا دامەزرابوو، قۆڵی چەپی لەشکری کوروشی جێهێشتبوو و بۆیە نە لە بەرامبەر خۆی و نە لە ڕوبەڕووی هێزەکانیدا شەڕکەری دوژمن بەرچاونەدەکەوت. قۆڵێکی هێزی پاشا بە مەبەستی گەمارۆدانی هێزی کوروش واتە جەنگاوەرەکانی یۆنانی وەرسوڕایەوە. کوروش ترسی ڕێنیشت کە ڕەنگە پاشا بخوازێ لە پشتەوەڕا پەلاماربدا و لەشکری یۆنانی دوو لەت بکا، خۆی پێڕانەگیرا و ڕاستەوخۆ هروژمی بۆ پاشا برد. بە شەش سەد سوارەوە کەوتە سەر پاشا و هێزەکانی پاسەوانیی و ڕیزی پێشەوەی شکست‌دا و شەش هەزار سوارکاری شای ناچار بە فیرار کرد. دەگوترا کە کوروش بە دەستی خۆی ئەردەشیری فەرماندەی هێزەکانی سوارە نیزامی پاشای کوشت. هەر بە دوای فیراری ئەو سوارە نیزامە، ئەسپ سوارەکانی کوروش لەبەر ئەوەی سەریان لەدووی فیراریەکان نابوو، خۆشیان بڵاو ببوونەوە. تەنیا ژمارەیەکی کەم لە دەوری ئەو مابوونەوە، ئەوانەی پێیان دەگوترا هاوپیاڵە. کوروش لەنێو ئەو جەماوەرەدا، لەنەکاو چاوی بە پاشا و پاسەوانەکەی کەوت، خۆی پێڕانەگیرا و خێرا پەلاماری ئەوی‌دا و هاواری کرد: من لێرە پیاوێک دەبینم. لە ڕانی پاشای دا و برینداری کرد، حەکیم کتیسیاس کە برینەکەی سارێژ کردبوو گوتوویەتی: " ئەو کاتەی کوروش پاشای داگرتبوە بەر شمشێر، یەکێک لە جەنگاوەرەکانی لەشکری پاشا بە نێزە لە خوارەوەی چاوی(رووومەتی) کوروشی دا. بەپێی گوتەی کتیسیاس لەو نێوەدا خەڵکێکی زۆر لە هەردوو لایەن کوژران. کوروش خۆی و هەشت

کەس لە هاوڕێیانی وەفاداری کوژران و جەنازەی ئەو کەسانە کەوتنە سەر تەرمی ناوبراو.

ئارتاپاتیس باوەڕ پێکراوترین کەس لە نێو پاسەوانانی کوروش‌دا، کاتێک دیتی ناوبراو لە گیانەڵای مەرگدا، خۆی لە ئەسپەکەی فڕێدا خوارەوە و خۆی هاویشتە سەر کوروش. هێندێک کەس دەگێڕنەوە کە پاشا ئەو کاتە حوکمی کرد کە ناوبراو لەسەر جەنازەی کوروش سەر ببڕن. خەڵکانی‌تر دەڵێن ناوبراو خۆی هەڵی‌کێشایە شمشێر و لە سەر تەرمی کوروش خۆی کوشت. ئارتاپاتیس بە دابی ئەشرافی فارسەکان، هەمیشە شمشێرێکی دەسک زێڕین و ملوانکە و دەستبەندی بۆ جوانی هەبوو. هۆگرێکی وەفاداری کوروش بوو. کوروش، ئەویش بەنۆرەی خۆی حورمەتێکی زۆری ئارتاپاتیسی دەگرت و خۆشی دەویست. (ئەو شەڕە بەناوی کوناکسا، ساڵی ٤٥١ی پێش زایین بووە و کوروش کوژراوە).

# بەشی ٩

## سەبارەت بە گەورەیی کورووش و پێهەڵاکوتن بەو

کورووش بەو چەشنە کوژرا کە باسمانکرد. بە گوتەی زۆربەی ئەو کەسانەی لە نیزیکەوە و لەگەڵ ناوبراو ژیاون و بەباشی ناسیویانە، مرۆڤێکی بەتوانا بووە. لە هەڵسوکەوتدا شاهانە جوڵاوەتەوە. کەسایەتییەکی پایەبەرز و بە وەجتر لە تەواوی ئەو کەسانە بووە کە دوای کورووشی یەکەم واتە کورووشی مەزن پاشایەتییان کردوە.

ناوبراو کاتێک منداڵ بووە و لەگەڵ براکەی و زارۆکەکانیتر پەروەردە کراوە، لە هەموویان وریاتر وەبەرچاوکەوتووە. ئەو سەردەمە تەواوی منداڵانی پاشازادە و ئەشرافی فارس لە بارەگای پاشایەتیدا پەروەردە دەکران. ئەو منداڵانە فێری دوورئەندێشی و دروستکاری لە ژیاندا دەبوون، لە زۆربڵەیی و کاوێژکردن و دیتنی بابەتی ناحەز دووردەخرانەوە. منداڵەکان کەسانێکیان لە بارەگادا دەدیت و گوێیان لێڕادەگرتن کە لە بارەگای پاشایەتیدا جێگای ڕێز و حورمەت بوون و پێوەندیشیان بە خەڵکی بێزراو لە

لایەن پاشاوە نەبوو. ئەوان هەروەها لە تەمەنی منالّییەوە فێری حوکمڕانی و ئیتاعەت لە گەورەکانیان دەکران.

کوروش لەنێو منالانی بارەگادا، تەنانەت لە هەڵسەنگاندن لەگەڵ منالانی پلە نزمتر لە خۆی شەرمێون، فەرمانبەر و بەگوێترین منال بوو. سەرەڕای ئەو خوو و خدەیە، سوارچاکێکی بەتوانا و منالێکی عاشقی ئەسپ و سوارکاری بوو. هەموو لایەک لەو باوەڕەدا بوون کە ناوبراو لە یاساکانی شەڕ و بەربەرەکانی، بەتایبەت لە نێزەوەشێنی و تیرهاوێژیدا شارەزا و گەلێک چالاک بووە.

کاتێک گەیشتووەتە تەمەنی لاوەتی رووی لە ڕاو و شکار کردوە و حەزی لە گرتن و ڕامکردنی حەیواناتی درندە و وەحشی بووە. ڕۆژێکیان ورچێک هێرشی کردوەتە ناوبراو و لەسەر ئەسپڕا فڕێی داوەتە خوارەوە و برینداری کردوە، کوروش جوامێرانە ئامبازی ورچەکە بووە. ورچ تەواوی لەشی بریندار کردوە، بەوحالەش کوروش دەیکوژێ. ئەو کەسەی خێرا فریای دەکەوێ و برینەکانی بۆ دەرمان دەکا، گەلێک دیاری و خەلاتی بەنرخی لەو وەرگرتوە.

باوکی کوروش، ناوبراوی کردوەتە حاکمی لیدیا، فریژیای گەورە و کاپادۆکیا و سەرکردایەتی تەواوی هێزەکانی لەشکریی پێئەسپاردوە کە دەبوایە لە سەحرای کاستۆل کۆبنەوە. کوروش هەر لە منالّییەوە خۆی لە درۆ و بەڵێنی بێجێ پاراستوە. بەتایبەت لەگەڵ ئەو کەسانەی پەیمانی ئاشتی مۆر کردوە یا ئاگربەسی ڕاگەیاندوە. ئەو جوامێرانە جولاوەتەوە و بەواتایەک حازر نەبووە بەهیچ شێوەیەک قسە و بەڵێنی خۆی لەژێرپێ بنێ. لەبەر ئەو ڕەوشت و کردارانە، کاتێک شارەکانی خستووەتە ژێر فەرمانی خۆی، خەڵکەکە بەگشتی باوەڕێکی فرەیان بە ناوبراو هەبووە. ئەگەر کەسێکیش دوژمنی ناوبراو بووبێ، لەو کاتەوە کوروش ئاگربەسی لەگەڵ ڕاگەیاندوە، حەریفەکەی باوەڕی تەواوی هەبووە کە ناوبراو سنووری بڕیارەکان نابەزێنێ. بۆوێنە وەختێک لەگەڵ تیسافێرن کەوتە شەڕ، تەواوی گەورە پیاوانی شارەکان جیا لە خەڵکی میلیتۆس کڕنۆشیان بۆ ئەو بردوە نەک بۆ تیسافێرن. خەڵکی میلیتۆس تا ئەو کاتە بۆیە خۆیان لە ئیتاعەت پاراستبوو، چونکە لەوە ترساون کە کوروش دواتر دەستیان لەسەر هەڵنەگرێ و بۆ

هەمیشە لای خۆی رایانگرێ، تەنانەت ئەگەر رۆژبەرۆژ لێیان بمرێ و تووشی نەخۆشی بن و ژمارەیان لە کەمی بدا، دڵنیابوون دەستی لە یەخەیان ناکاتەوە.

ئەوەی روون و ئاشکرا بوو، کاتێک کەسێک چاکەیەک یا خەراپەیەکی دەرهەق بە کوروش کردبا، ناوبراو لە هەردوو بواردا جوامێرانە لەگەڵ ئەو کەسە هەڵسوکەوتی کردوە. دەگێڕنەوە کە ئاواتی ئەوە بووە تەمەنی ژینی مەودای پێبدە کە بتوانێ لەگەڵ دۆست و دوژمنی خۆی بە چاکە وڵام بداتەوە. خەڵکی ئەو سەردەمە ئەوەندەی باوەڕیان بە کەسایەتی کوروش و شارەکانی ژێر حوکمی هەبوو، بە کەسیتریان نەبوو و کەس نەبوو بڵێ کە کوروش فریوی شەڕخواز و بەدکارەکانی خواردوە. لە بەرامبەر تاقمی مرۆڤکوژ و چەتە و ڕێگر دڵڕەق بووە و بەتوندی سزای داون.

گەلێک جار لە شارێیەکان خەڵکی دەست و پێ براو و چاو دەرهێندراو دەدیترا، لە حاڵێکدا لە سەردەمی حوکمڕانی کوروشدا دانیشتووانی بەربەر و یۆنانی بەبێ هیچ مەترسییەک سەفەریان دەکرد و هەر شوێنێکیان گەرەک بوایە دەچوون. خەڵک چی خواستبای لەگەڵ خۆی دەیبرد بەبێ ئەوەی لە دز و جەردە بترسێ. کوروش حورمەتێکی فرەی بە تایبەت بۆ ئەو کەسانە هەبوو کە لە شەڕدا جوامێری و ڕەشادەتیان دەنواند.

یەکەم شەڕ کە ناوبراو کردی لەگەڵ پیسیدی و میسوسیەکان بوو و خۆی فەرماندەری شەڕەکەی وەستۆگرتبوو و هەرکام لە جەنگاوەرەکانی ژێردەستی دیتبا قارەمانانە شەڕ دەکا، ئەو شار یا ناوچەیەی کە کابرا داگیری کردبوو، لەجێوە دەیدا دەست ئەو شەڕکەرە و بە شێوە و ڕێگای جۆراوجۆرەوە قەدری دەگرت. ناوبراو لەو باوەڕەدا بوو کە غیرەت و جوامێری مایەی بەختەوەریە و ترسنۆکی بەلاوە عەبدایەتی بوو.

لەبەر ئەوەی خەڵک کوروشیان ئاوا جوامێر دەدی، فیداکارییان بۆ دەکرد. کوروش حەزی لەو کەسە بوو کە بە عەداڵەتەوە دەجوڵایەوە و پێیوابوو کە مرۆڤ دەبێ لە ڕێگای دادپەروەرییەوە ساماندار بێت، نەک بەهۆی زەخت و زۆری و چەوساندنەوە. ئەوەش بوو کە سیستەمی ژێر دەسەڵاتی ناوبراو بە

عەداڵەتەوە لەگەڵ خەڵک هەڵسووکەوتی دەکرد و بۆیەش ببووە خاوەن لەشکرێکی ڕاستەقینە نەک بە زۆر و بۆر. سەرکردەکانی هێزی دەریاییش بۆیە روویان لە ناوبراو کرد، چونکە دەیانزانی لەلای کورووش ڕێز و حورمەتیان زێدەترە و مووچەی مانگانەیان بە شێوەیەکی ڕێکوپێک و لە کاتی خۆیدا دەدرێت و کەس لەو بارەوە هەناسە سارد ناگەڕێتەوە.

هەروەها دەگوترا کە کورووش لە خەڵکیتر خۆش ڕەفتارتر بووە. وەختێک کەسێکی عادڵ و ماڵدار وەبەرچاوکەوتووە، حوکمڕانی و کاری گرینگی پێ ئەسپاردوە و قەت داخوازییەکی لەو کەسە نەکردوە و بە پێچەوانەوە زیادتری پێداوە و ئەوەش بووەتە هۆی دڵخۆشی کابرا بۆ بەڕێوەبردنی باشتری ئەرکەکانی. پیاو لەمەر باوەڕ پێکردن بە کورووش، هەر شتێکی وەدەست کەوتبا لە ناوبراوی نەدەشاردەوە. کەس پێیوانەبووە کورووش خوازیاری سەروەت و سامان بێ، هەرچەند خاوەن خەزێنەی نهێنی بووە، بەڵام هیچکات بەهرەی لێوەرنەگرتوە. دۆستانی نیزیکی خۆی لە گشت کارێکی گرینگدا بەشدارکردوە.

کورووش لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە بوونی دۆست لە هەموو شتێک گرینگترە. هەر کات دۆستێکی دۆزیوەتەوە، بە هەموو جۆرێک یارمەتی داوە بۆوەی تا سەر وەک ڕەفیق بمێنێتەوە. لە دنیادا پێموانییە کەس بەرادەی کورووش پیاوی خەڵات و بەخشین بووبێ. بە چەند هۆ کەس ئەوەندەی کورووش هەوڵی نەداوە خواستی دڵخوازی دۆستانی بەجێبگەیێنێ.

گەلێک جلوبەرگی خاوێنیان بۆ کورووش بەدیاری دەهێنا بۆوەی لە کاتی شەڕدا دەبەر خۆی بکا، بەڵام هەمیشە دەیگوت کە ناتوانێ ئەو هەموو جلوبەرگە دیاریە بپۆشێ، ئەو پێیوابوو دۆستی باش و ئاقڵ لە هەرچی دیارییە باشترە. ناوبراو لە هەڵسەنگاندن لەگەڵ دۆستانی ئازادیخوازیدا، ڕزگاریخوازتر لە هەر هەموویان بوو، چونکە خاوەن ئیمکان و توانایی پتریش بوو و ئەوەش سەیر نییە لەبەر ئەوەی لەوان بە دەسەڵاتتر بووە.

کوروش زۆرجار جامی نیوەپڕی شەرابی شیرینی بۆ دۆستانی دەنارد. خۆی نیوەی دەنۆشی و نیوەشی بۆ دۆستانی بەوەجی دەنارد و بێبەشی نەدەکردن.

گەلێک جار نیوەی گۆشتی برژاوی قازی بۆ دۆستانی دەنارد و بە راسپاردەی دەگوت: پێیان بڵێ من نەمویستووە بە تەنیا لەو خواردنە بەتامە بەهرە وەرگرم بەڵکوو ئێوەشم لەبیر بووە. کاتێک تفاقی ماڵات تەواو دەبوو، کوروش حەولی زۆری دەدا لە چیا و دۆڵەکان ئەو پێداویستییانە دابین بکا و بەدوای دۆستانیشیدا دەنارد چەندی دەخوازن بۆیان بنێرێ. بۆیەش ئەو کارەی دەکرد کە ئەسپەکانی دۆستانی هێز و توانای سواریی باشتریان هەبێ. کوروش رووی لە هەر شوێنێک کردبا خەڵکی دەڤەرەکە زۆر بە وردبینییەوە دەیانڕوانییە ئەو.

کوروش گەلێک خوازیاری پرس و ڕاوێژ لەگەڵ دۆستانی بوو. ئەو بەو شێوەیە دەیویست ڕێز لە خەڵک بگرێ. من لەسەر ئەو باوەڕەم لەنێو بەربەر و یۆنانییەکاندا کەس بە قەدەر کوروش جێگای ڕێز و خۆشەویستی نەبووە. هۆکاریش ئەوە بووە کە ناوبراو هەرچەند خۆی ڕەعیەتی ملکەچی پاشا بووە، بەڵام کەس ئەوی لەگەڵ ئەردەشیری برای نەدەگۆڕیوەتەوە. تەنیا یەک کەس ئەویش ئۆرۆنتاس وەختێک ویستی بە ناسەداقەتییەوە لەنێوان دوو برادا ئەردەشیر هەڵبژێرێ، خێرا لێی ئاشکرا بوو. کاتێک کێشەی نێوان ئەو دوو شازادەیە هاتە گۆڕێ، خەڵکێکی زۆر لە پیاوانی پاشا و خۆشەویست لەلای ئەو چوونە خزمەت کوروش. چونکە دەیانزانی کوروش پتر ڕێز لە غیرەت و جوامێری ئەوان دەگرێ.

کوژرانی کوروش گەورەیی و خۆشنێوی ئەوی دەرخست. ئەو خەڵکە بە وەفا و باش و سەربەخۆ و موخلیسەی کوروشیان دەناسی، کاتی کوژرانی ئەو گشتیان قارەمانانە شەڕیان کرد تا هەر هەموویان کوژران. تەنیا کەسێکی دوای مەرگی ناوبراو چەند ساڵێک ژیا، ئاریە بوو. ئەویش چونکە فەرماندەی هێزەکانی سوارەی قۆڵی چەپ بوو، کاتێک زانی کوروش کوژراوە لەگەڵ لەشکرەکەی رایکرد و بۆی دەرچوو.

## بەشی ١٠

### داگیرکردنی خێمەکانی کوروش لەلایەن ئەردەشیر پاشا – کۆکردنەوەی هێز، بەدژی یۆنانییەکان

هەر لەو شوێنەی کوروش کوژرا، بە حوکمی ئەردەشیر سەر و دەستی ڕاستی ناوبراویان بڕی. پاشا خۆی و هێزەکانی کەوتنە ڕاوی هەڵاتووەکان و گەیشتنە خێمەی کوروش. ئاریە و پیاوەکانی هێچ بەربەرەکانییەکیان نەنواند و بەرەو مۆڵگەی پێشوویان ڕایانکرد کە لە کوناکسارا چوار فەرسەخ دوور بوو. هێزەکانی پاشا دەستیان بە تاڵان کرد و فۆکایدا ئەو خاتوونەی مەعشووقەی کوروش بوو بە دیل گیرا کە لە جوانی و ئاقڵیدا گەلێک بەناوبانگ بوو. ئافرەتێکیتر، جوانتر و گەنجتر لە فۆکایدا خەڵکی دەڤەری میلیتۆس لە لایەن سەربازەکانی پاشاوە گیرا بەڵام سەرەڕای رووت بوونی توانی خۆی ڕزگار بکا و بگاتە بەرەی هێزە یۆنانییەکان کە خەریکی پاسەوانی بوون.

یۆنانییەکان لە بەرامبەر پەلاماری شەڕکەرەکانی پاشادا ڕاوەستان و گەلێکیان لە تاڵانچییەکان کوشت و چەند کەسێکیش لە خۆیان کوژرا. جیگا و مەکانی خۆیان پاراست و بۆ هێزەکانی دژبەریان چۆلنەکرد. ئەو یۆنانییانە

نەک ئەو ژنە بەڵکوو زۆر کەسی‌تریان جوامێرانە نەجات‌دا و ڕایان نەکرد و بە بەربەرەکانی خۆیان قەیاسێکی فرەی ئازووقە و تفاقیشیان نەهێشت بکەوێتە دەست هێزەکانی دوژمن.

مەودای نێوان جەنگاوەرەکانی یۆنانی لەگەڵ لەشکری پاشا نزیکەی سی ستادیۆ دەبوو. کاتێک یۆنانییەکان پەلاماری هێزەکانی بەربەریاندا و ڕاویان‌نان، پێیانوابوو بەسەر هێزەکانی پاشادا سەرکەوتوون، لەولاشەوە هێزەکانی بەربەر خەریکی تالانچییەتی بوون و پێیان وابوو براوەی مەیدانی جەنگن و ئێجگاری سەرکەوتوون.

لەو نێوەدا هێزە یۆنانییەکان هەستیان کرد کە قۆشەنی پاشا خەریکە هێرش دەکاتە سەر مۆڵگەی تەداروکات. تیسافێرن پێشتر پاشای تێگەیاندبوو کە یۆنانییەکان دوای شکستدانی هێزەکانی پێش خۆیان خەریکی ڕاوکردنیانن. بۆیە پاشا لەشکری خۆی کۆکردەوە. کلی‌ئارخۆس بەدوای پرۆکسێنۆس‌یدا نارد و کەوتنە ڕاوێژ بۆوەی دەستەیەک لە جەنگاوەران بۆ پاراستنی مۆڵگەکە بنێرن یا هەموویان پێکەوە روو لەوێ بکەن.

ڕاست لەو دەمەدا دەرکەوت کە شا دەخوازێ لە پشتەوەڕا پەلاماریان بدا. یۆنانییەکان خێرا وەرسوڕانەوە بۆوەی پارێزگاری لە ڕیزەکانی پاشەوەی لەشکرەکەیان بکەن. پاشا ناچاربوو ڕێگەیەکی دیکە بگرێتەبەر و گەڕاوە شوێنی پێشووی. ئەو ڕاکردوانەش کە بەرەو یۆنانییەکان دەچوون هاوڕێ لەگەڵ تیسافێرن و شەڕکەرەکانی ئەو، ناچاربەگەڕانەوە بوون.

تیسافێرن لە یەکەم پێکداداندا ڕای‌نەکردبوو. بە پێچەوانەوە، لە چۆم پەڕیبۆوە و بە تەنیشت هێزەکانی سووکە چەکداری یۆنانیدا دەرباز ببوو و هیچکەس لە هێزەکانی دژبەر خۆیان تێنەگەیاندبوو. دواتر هێزەکانی سوارەی یۆنانی بە نێزە و تیر و کەوان ناچاربوون بکەونە گیانیان.

فەرماندەی ئەو هێزە سووکە چەکدارە یۆنانییە، ئێپیس‌تێنیسی خەڵکی ئامفیپۆلی بوو. ناوبراو بۆ خۆپارێزیدا ناسراو بوو. تیسافێرن هەرکە گەیشتە ئۆردوی یۆنانییەکان و چاوی بە پاشا کەوت، لەگەڵی گەڕاوە. کاتێک پاشا و سپاکەی گەیشتنە لای چەپی هێزە یۆنانییەکان، یۆنانییەکان تووشی مەترسی

گەمارۆدان هاتن و بۆیە هەوڵیاندا بەرەی قۆڵی چەپ بەهێز کەن بۆوەی لە پشتەوەڕا رووباریان بەدەستەوە بێ. لەو کاتەدا کە خەریکی ڕاوێژ بۆ ئەو کارە بوون، قۆشەنی پاشا هەمان شوێنی پێشووی گرتەوە و لەڕاستیدا وەک سەرەتای دەست پێکردنی جەنگ لە بەرامبەر هێزە یۆنانییەکاندا دامەزران.

یۆنانییەکان وەختێک دیتیان هێزەکانی بەربەر نیزیک دەبنەوە، تێکڕا دەستیان بە خوێندنی سروودی جەنگ کرد و توندتر لە پێشوو پەلاماری دوژمنیاندا. لەشکری بەربەر ناحەزتر لە جاری پێشوو رووی لە هەلاتن کرد. یۆنانییەکان سەریان لەدوونان تا گەیشتنە نیزیک گوندێک کە هێزی دیکەی بەربەر لەوێ مۆڵیان خواردبوو.

گردێک دەیڕوانییە ئەو دێیە. لەلای ڕاستی گردەکە قۆشەنی پاشا ڕێگای بەرەو باسکی چەپی گۆڕی. لەشکری پیادە ژمارەیان زۆر نەبوو بەڵام هێزی سوارەی بەربەر گردەکەی بەتەواوی داپۆشیبوو و نەشیاندەزانی چقەوماوە.

یۆنانییەکان بەو باوەڕەی کە ئاڵاهەڵگری سپای پاشایان دیتوە کە هەڵۆیەکی زێڕینی باڵ فشکراوی بەسەر نێزەوە بوو. کاتێک پەلاماری ئەو شوێنەیاندا، هێزی سوارەی مۆڵخواردو لەوێ بەرەبەرە گردەکەیان جێهێشت و مەیدانەکە چۆلبوو. پاش فەترەیەک تەواوی ئەو هێزە لەبەر چاوان ونبوو. هەر بۆیە کلیئارخۆس خۆی نەچووە سەر گردەکە و لە داوێنی خوارێ مایەوە. لە جیات خۆی لیکیۆی خەڵکی سیراکۆسیۆی لەگەل سەرکردەیەکیتر ناردە سەرێ بۆوەی خەبەری بۆ بێننەوە. لیکیۆ وەسەر کەوت و پاش روانینی وردی دەوروبەر گەڕاوە و خەبەری هێنا کە سپای دوژمن لەوپەڕی بێ نەزمیدا خەریکی هەلاتنە.

ڕۆژ بەرەو ئاوابوون دەچوو کە ئەو رووداوەی دوایی قەوما. یۆنانییەکان مۆڵیان خوارد و چەک و سیلاحەکانیان لە خۆیان کردەوە بۆوەی پشوو بدەن. زۆریان بەلاوە سەیر بوو کە نە کوروش دەبینن و نە خەبەرێک لە ناوبراو دەبیسن و کەسیش لەلایەن ئەوڕا نەهاتووەتە لایان.

کەس نەیدەزانی کوروش کوژراوە. هەموویان پێیانوابوو کە ناوبراو خەریکی ڕاونانی قۆشەنی دوژمنە یا ئەوەندە چووەتە پێش کە ڕەنگە خەریکی داگیرکردنی شوێنێکی‌تر بێ.

خەریکی ڕاوێژبوون ئاخۆ سیلاح و کەرستەی جەنگ بۆ شوێنی نیشتەجێییان ڕاگوێزن یان‌نا، یا بگەڕێنەوە ئۆردوگای پێشوویان. لە کۆتاییدا بڕیاریان‌دا بگەڕێنەوە ئۆردوگا. شەو داهاتبوو کاتێک گەیشتنەوە ئۆردوگا. بەشی هەرەزۆری ئەرزاق و شەڕابیان بە تالان چووبوو. سپای پاشا سندوقەکانی پڕ لە ئارد و شەڕابیان لەگەڵ خۆیان بردبوو. پێش دەستپێکی شەڕ، کوروش ئەو پاشەکەوتەی بۆ هێزە یۆنانییەکان دانابوو بۆوەی لە کاتی قاتی و تەنگانەدا بیان‌داتێ.

سندوقەکانی ئەرزاق و شەڕاب نیزیکەی سێ‌سەد دانە دەبوون. لەبەر ئەو تالانە، یۆنانییەکان ئەو شەوە هیچیان نەبوو بخۆن و تەواوی ڕۆژێش هیچ خواردنێکیان دەست نەکەوت چونکە پێش ئەوەی بتوانن بەرکولێک بکەن، هێزەکانی پاشا وەدیار کەوتبوون. بەناچار ئەو شەوە بە برسییەتی ڕایانبوارد.

# کتێبی دووهەم

## بەشی ١

**یۆنانییەکان هەواڵی کوژرانی کوروشیان پێگەیشت - نەخشەی ئاریە بەمەبەستی گەڕانەوە بۆ وڵاتی یوونی - پێشنیاری گەڕانەوەی ئاریە لەلایەن کلیئارخۆس گرینگی پێدەدرێ - داوا و هەڕەشەی ئەردەشیر پاشا لە یۆنانییەکان سەبارەت بە چەکدانانیان - وەڵامی راسپاردەکانی ئەردەشیر پاشا**

کوروش چۆن توانی هێزە یۆنانییەکان لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە، چۆن دژی براکەی واتە ئەردەشیر لەشکرکێشی کرد، ئەو رووداوانەی لە درێژەی رێپێوان بەرەو ئاسیا قەومان، چۆن شەڕەکە دەستی پێکرد و کوروش چۆن کوژرا، هێزە یۆنانییەکان چۆن گەڕانەوە مۆڵگەکانیان و بەو هەستە کە لە هەموو بەرەکاندا سەرکەوتوون، خەوێکی قورس دایگرتن، بێخەبەر لەوە کە کوروش کوژراوە، ئەوانە و چەند بابەت گەلێکیتر لە کتێبی یەکەمدا هاتنەبەرباس.

ڕۆژی دوایی پاش ئەوەی سەرکردەکانی یۆنانی کۆبوونەوە، بۆیان پرسیار بوو کە بۆچی کوروش نە کەسێک لە پیاوانی خۆی دەنێرێ و نە بۆخۆشی وەدیار دەکەوێ تا ئەوان بزانن لەمەو بەدوا چیبکەن. بۆیە بڕیاریان‌دا دوای خۆ ئامادەکردن و کۆکردنەوەی شتوومەکیان، ئەوەندەی پاش تالان بەجێ مابوو، پێشڕەوی بکەن و خۆیان بگەیێننە کوروش.

کاتێک ئامادە بوون ڕۆژ بڵیند ببوو. پرۆکلیس[70] ئاغای تێفترانییاس و خەڵکی لاکۆنادێماراتۆ لەگەڵ غلووی خەڵکی ناوچەی تامۆس گەیشتنە لایان. ناوبراوان ڕایانگەیاند کە کوروش کوژراوە و ئاریەش لەگەڵ باقی هێزەکانی بەربەر مەیدانی جەنگییان چۆڵ کردوە و بەرەو ئەو شوێنەی ڕۆیشتوون کە ڕۆژێک پێشتر لێی بوون. هەروەها وڵامی ناردوە کە چاوەڕوانی ئێوە دەکا، ئەگەر نەچن خۆی و هێزەکانی ڕۆژی دواتر بەرەو ناوچەی لەدایک بوونی واتە یوونی دەگەڕێنەوە.

سەرکردەکانی نیزامی و خەڵکەکە کاتێک گوێیان لەو خەبەرە بوو گەلێک ناڕاحەت بوون. کلێئارخۆس ئەوکاتە ئاخاوتنێکی کرد و گوتی: خۆزگە کوروش نەکوژرابا، ئێستا کە نەماوە، بە فەرماندە ئاریە بڵێن کە ئێمە پاشامان شکستدا و وەک بە چاوی خۆتان دەبینن کەس لەخۆی ڕانابینێ هێرشمان بکاتە سەر. ئەگەر ئێوەش نەهاتبان، ئێمە دژی پاشا شەڕمان دەکرد. لێرەدا بەڵێن بە ئاریە دەدەین ئەگەر بێتەوە لامان، ناوبراو وەک پاشا ڕادەگەیێنین چونکە حوکمداری مافی ئەو کەسانەیە لە شەڕدا سەرکەوتوونە.

کلێئارخۆس دوای ئەو قسانە، خیریسۆفۆسی لاکیدێمۆنی و مێنۆنی تێسالی و چەند ڕاسپاردەیەکی‌تری ئامادەکرد بیان‌نێرێتە لای ئاریە. دیارە چوونی مێنۆن لەسەر خواستی خۆی بوو چونکە دۆستی نیزیک و میوانی ئاریە بوو. وەفدی دیاریکراو وەڕێکەوت و کلێئارخۆس چاوەڕوانی جواب مایەوە. هێزە یۆنانییەکانیش لەو نێوەدا بە تەواوی تواناوە حەولی دابین‌کردنی

---

٦٩- خەڵکی دیماراتۆ و پاشای سپارت بووە و بەهۆی کلێئۆمینیس لەسەر تەخت لابردراوە. ناوبراو دواتر چووەتە وڵاتی فارس بۆلای داریوش. داریوش شارەکانی پێرغامۆس، تێفرانییا و ئالیسارنای پێ‌بەخشیوە.

ئازووقەیان‌دا و چەند سەر گا و کەرەکێوییان کوشتەوە[71]. سووتەمەنی داریشیان لە شوێنێکی نیزیک ئۆردوگا دابین کرد کە پێشتر شەڕگە بوو. تیر و کەوان و قەڵغان و فایتوونێکی زۆر بەجێ مابوون، ئەوانەیان کۆکردەوە و گۆشتەکانیان پێبرژاند.

لەو کاتەدا کە بازاڕ پڕ لە حەشیمەت بوو، وەفدێک لە لایەن پاشا و تیسافێرن پێکهاتوو لە چەند بەربەر هاتنە لای سەرکردەکانی یۆنانی. لەنێو وەفدەکە کەسیکی یۆنانی بەناوی فالینۆس هەبوو کە یەکێک لە پیاوانی تیسافێرن بوو. ناوبراو لە زانستی جەنگ و چەک و سیلاحدا شارەزا بوو. وەفدی ناوبراو وەختێک نیزیک کەوتەوە داوای لە سەرکردەکانی یۆنانی کرد بێنە لایان و ڕاشیانگەیاند کە پاشا خۆی بە براوەی شەڕ دەزانێ چونکە کوروشی کوشتووە و حوکمیشی کردوە کە ئێوەش چەکەکانتان دانێن و بچنە بەردرگای بارەگای پاشا و ئیتاعەتی خۆتان ڕاگەیێنن، حەول بدەن و ئەو فرسەتە بەنرخە بقۆزنەوە.

ئەوە پوختەی قسەکانی وەفدەکە بۆ یۆنانییەکان بوو. یۆنانییەکان لەو شێوە ئاخاوتنە گەلێک عاجز بوون. کلیئارخۆس تەنیا ئەوەندەی گوت کە سەرکەوتوو و براوەی شەڕ یۆنانییەکانن و بۆیە چەکیش دانانێن. پاشان رووی لە سەرکردەکانی یۆنانی کرد و گوتی: ئێوە سەردارانی یۆنانی، ئەگەر وڵامێکی بەپێزتر و بەقازانجترتان هەیە پێیان‌بڵێن و منیش خێرا دەگەڕێمەوە لاتان. لەو کاتەدا یەکێک لە خزمەتکارەکانی ناوبراو پێی‌گوتبوو کە کاتی قوربانی‌دان بۆ خواکانە و پێویستە ئاژەڵە سەربڕاوەکان ببینێ[72].

کلیئانۆراسی ئارکادی، بەتەمەن‌تر لە زۆربەی فەرماندەرەکانی یۆنانی، دەستی بە ئاخاوتن کرد. ناوبراو گوتی باشتر وایە هەرچی زووتر بمرین نەک چەک دابنێین. پرۆکسێنۆسی خەڵکی تیڤیئۆس بە نۆرەی خۆی وەجواب هات

---

٧٠- توێژینەوەکان باس لەوەدەکەن کە سەربازەکانی لەشکر کەوتبوونە بارودۆخێک کە بۆ تینوویەتی شکاندن، ئاو و شیر و خوێنی مالاتی باربەریان دەخواردەوە.

٧١- ئەو قوربانییانەی پێشکەش بە خواکان دەکرا بۆوە بوو کە پەند و ئامۆژگاری ئەوان بزانن. ئەوەش بەهۆی خوێندنەوەی کۆمەڵێک هێمای لەشی مالاتی قوربانی‌کراو لەلایەن تاڵەبینەوە دەکرا.

و گوتی:" فالینۆس! بەڕاست بۆ من جێگای پرسیارە، پاشا ئەو چەکانەی ئێمەی بۆ چیە، داخوا وەک براوەی شەڕ دەیانخوازێ یا وەک دۆست. ئەگەریش دوای وتوویژ و ئاشتی وەریان بگرێتەوە با پێمان بڵێ بارتەقایی ئەو چەکانە بۆ سەربازەکانمان چدەبێ؟"

فالینۆس وڵامی ئەو پرسیارانەی داوە:" پاشا پێیوایە براوەی شەڕە چونکە کوروشی کوشتووە و کەسێکیتر نەماوە چاوی لە تاج و تەختی پاشایەتی بڕیبێ. ئەو پێیوایە ئێوە پیاوانی ژێر فەرمانی کوروشن و لەنێو خاکی بندەستی پاشادان و لە شوێنێکی ئاستەم و لە نێوان رووبارەکانی ڕژد و ناوچەکانی چڕ و سەختدا گیرتان خواردوە و ناوبراو دەتوانێ بۆ کوشتنتان هێزێکی فرەی چەکدار و بێچەکی دڕندەتان وەسەر گێڕێ و ئێوەش ناتوانن دەرەقەتی ئەو هەموو ڕەشاییە بێن."

تێئۆپۆمبۆسی ئاتێنی رووی لە فالینۆس کرد و گوتی:" تۆ دەبینی ئێمە جیا لە غیرەت و چەکەکانمان هیچ وەسیلەیەکیترمان نییە بۆوەی خۆمان لەو بارودۆخە ڕزگاربکەین. تا زەمانێک چەکمان پێبێ غیرەتیشمان لە جێی خۆیەتی، بەڵام ئەگەر ڕادەستی ئێوەی بکەین، ئەو کاتە بزانە کە خۆشمان بەدەستەوە داوە. بۆیە پێتوانەبێ لە هیچ کامیان، نە چەک و نە غیرەت دەست هەڵگرین و لەو چەکانە بە قازانجی پاراستنمان لە شەڕدا کەڵکوەردەگرین."

کاتێک فالینۆس گوێی لەو قسانە بوو بە پێکەنینەوە گوتی:" جوامێر! تۆ بە جۆرێک جوان قسەدەکەی کە پیاو وەبیر فەیلەسوفەکان دەخەیەوە، بەڵام ئەگەر تۆ پێتوایە غیرەتی تۆ بەسەر هێزی پاشادا زاڵە، دڵنیا بە تۆ شێت و نەفامی. هەڵبەت کەسانیتریش بەنەرمی قسەیان کرد، وەک ئەوەی کە هەم لە بەرامبەر کوروشدا بەڵێنەکانیان بردبێتە سەر و هەمیش بۆ پاشا بتوانن هێزێکی بەوەج بن، ئەگەر خوازیاری دۆستایەتی بێت. یا ئەگەر پاشا بخوازێ بۆ مەبەستێکیتر کەڵکیان لێوەرگرێ و گەرەکی بێ هێرش بکاتە سەر میسر، ئەوان دەتوانن یارمەتی بدەن[٧٢]."

---

٧٢- میسر ئەوکاتە لەژێر دەسەڵاتی فارسەکاندا نەمابوو.

لەو نێوەدا کلیئارخۆس گەڕاوە و پرسیاری کرد ئاخۆ وڵامێکیان بە وەفدی پاشا داوەتەوە یان‌نا. بەرلە هەرکەس فالینۆس وەجواب هات و گوتی:" کلیئارخۆس! هەر کەس لەبەر خۆیەوە قسەیەک دەکا، دەخوازین تۆ هەر ئێستا ڕاوبۆچوونی خۆت بڵێی. کلیئارخۆس لە وڵامدا گوتی:" فالینۆس! من تۆ و تەواوی ئەوانی‌ترم لێرە گەلێک ڕازی وەبەرچاو هات. لەبەر ئەوەی هەر هەمووومان یۆنانین، پێمخۆشە بیرو بۆچوونی خۆت بڵێی بابزانین ئێمە دەتوانین سەبارەت بەو داخوازیانەی تۆ کارێک بکەین یان‌نا. بە خواکان سوێند دەدەم کە ئەوەی لە بەرژەوەندی ئێمەدایە و قەدر و ڕێزی تۆ لە داهاتوودا دەباتە سەر پێمان‌بڵێی. چونکە سەردەمێک دادێ کە خەڵک دەڵێ فالینۆس سەرەڕای ئەوەی لەلایەن پاشاوە ڕاسپێردرابوو کە یۆنانییەکان ڕازی بە چەک‌دانان بکا، ئەو خواستی هاوڵاتییانی خۆی بەلاوە گرینگتر بوو و ڕێنوێنی پێویستی کردن و ئەو کارەشت لە یۆنان دەنگ دەداتەوە."

کلیئارخۆس زۆر زیرەکانە قسەی کرد، چونکە گەرەکی بوو ڕاسپاردەی پاشا بە چەشنێک قسە بکا کە ئەوان چەکەکانیان دانەنێن و هێزە یۆنانییەکان ورەیان دانەبەزێ.

کاتێک داوا لە فالینۆس کرا بیر و بۆچوونی خۆی بە سەداقەتەوە بڵێ، ئەو سەرەڕای جاشایەتی بۆ لایەنی بەرامبەر، کەوتبووە ژێر کارتێکەری گوتەکانی کلێئارخۆس و بەو شێوەیە وڵامی داوە:" من ئەگەر لەنێو هەزاران هومێددا تەنیا یەک دانەم شک‌بردبا کە توانیباتان بە شەڕکردن لەدەست قۆشەنی پاشا نەجاتیتان بێ، ئەوە پێم دەگوتن. بەڵام کاتێک هیچ ڕووناکییەک شک نابەم کە بتوانن بەبێ دابین کردنی خواستی پاشا ڕزگاریتان بێت، داواتان لێدەکەم هەر ڕێگایەک بۆ ڕزگاریتان مەسڵەحەتترە بیگرنە بەر."

کلیئارخۆس وەجواب هات و گوتی: " ئەوانە بیر و بۆچوونی تۆیە. بەڵام بە باوەڕی ئێمە ئەگەر پاشا وەک دۆست ئێمەی دەوێ، بە چەکەوە زیدەتر بە کەڵکی ئەو دێین، ئەگەریش مەبەستی شەڕکردن دژی ئێمەیە، بە چەکەوە جوامێرترین تا بێ سیلاح بین ".

فالینۆس وەقسە هات و گوتی: " کەوابوو ئەو بۆچوونانە بە پاشا ڕادەگەیێنم. دیارە پاشا فەرمانی دەرکردوە کە ئەو بڕیارانەش بە ئێوە ڕابگەیێنین. واتە ئەگەر بتانهەوێ لێرە بمێننەوە، ئاگربەس بەردەوام دەبێ، بەڵام بخوازن پێشڕەوی یا شوێنگۆڕکێ بکەن، ئەوە بە مانای شەڕ لێکدەدرێتەوە. تکایە وڵامی ئەو پرسانەش بدەنەوە. لێرە دەمێننەوە و ئاگر بەس درێژەی دەبێ، یا دەخوازن شەڕ دەست پێبکەنەوە! ".

کلێئارخۆس لە وڵامدا گوتی: " سەبارەت بەو پرسانە بە پاشا بڵێ کە ئێمەش وەک ئەو بیر دەکەینەوە ".

ئەوانەی ئێوە بیری لێدەکەنەوە چنە؟ فالینۆس پرسی.

ئەگەر لێرە بمێنینەوە واتای ئاگر بەس و ئەگەریش بڕۆین مانای شەڕە، کلێئارخۆس وڵامی داوە.

فالینۆس دیسان پرسیاری کرد، شەڕ یا ئاگربەس، کامیان بە پاشا بڵێم. کلێئارخۆس وڵامی داوە، ڕۆیشتن مانای شەڕ و مانەوە واتای ئاگربەس.

## بەشی ٢

# یەککگرتن لەگەڵ ئاریە حەرەکەتی ناوبراو و تێکەڵبوون بە سپای ئەردەشیر - ترس و بێ موبالاتی لەنێوان دوو لەشکردا

فالینۆس و وەفدەکەی ڕۆیشتن. پرۆکلیس و خیریسۆفۆسی ڕاسپاردە کە چووبوونە لای ئاریە لەو کاتەدا گەیشتنەوە. مێنۆن لەلای ئاریە مایەوە. ئەوانەی گەڕابوونەوە باسیان کرد کە ئاریە گوتوویەتی پیاوی خاوەن دەسەڵاتی فارس هەن کە ناوبراو وەک پاشا قبوڵ ناکەن. ئەو هەروەها ڕایگەیاندبوو ئەگەر خوازیاری گەڕانەوەی پێکەوە بۆ دوایەن، دەبێ هەر ئەو شەوە چاویان بەیەکتر بکەوێ ئەگینا خۆی بەیانی سەحەری دەڕوات.

کلێئارخۆس گوتی:" ئەگەر مەبەستمان ڕۆیشتنە دەبێ ئەوە بکەین کە ئاریە دەڵێ، جیا لەوە، سەرکردەکان چی گەرکیانە و پێیانوایە بە قازانجترە دەتوانن بیکەن." ناوبراو خۆی چی مەبەست بوو بۆ هیچ کەسی ئاشکرا نەکرد.

دوای ئەو ڕووداوانە، کاتی ڕۆژئاوابوون، کلێئارخۆس بانگی سەرکردە و فەرماندەکانی نیزامی کرد و پێیگوتن:" پیاوەکان! قوربانیم پێشکەش بە خواکان کرد، نیەتی خێر لەگەڵ ئەوە نەبوو شەڕ دژی پاشا بکەین و دەبوایە ئاواش بێت. هەروەک دەزانن چۆمی دیجلە لە نێوان ئێمە و پاشادا هەڵکەوتووە[٧٤]، ڕووبارێکی ڕژد و خۆڕێنە و بەبێ گەمی و لۆتکە پەڕینەوەی ئێمە گەلێک دژوارە. ئەوەش

-٧٣ لێرەدا چۆمەکە خۆی نیە، بەڵکوو لکێکی جیابۆوە لەو چۆمەیە و ڕەنگە ڕووباری لیسیر بێ.

دەزانن کە لۆتکە و گەمیمان نییە. دوای ئەوەش ئێمە ناتوانین هەروا لێرە بمێنینەوە، چونکە ناتوانین بژیو و تفاق دابین بکەین. بەپێچەوانەوە، نییەتی قوربانی لەگەڵ چوونمان بۆ لای دۆستانی کوروش دایە . بۆیە پێویستە هەر ئەو کارە بکەین. باشتر وایە ئێستا لەیەکتر جیا بینەوە و هەرکەس لەبەر خۆیەوە لەگەڵ کێ پێخۆشە خواردن بخواو دانیشێ. کاتێک شەپپوری یەکەم لێدرا بارەکان ببەستن. بە شەیپوری دووهەم وڵاغەکان بارکەن. وەختێک گوێتان لە شەیپوری سێهەم بوو دەستووری فەرماندەکانی خۆتان جێبەجێبکەن. بار و کەرستەی شەڕ دەبێ بە قەراخ چۆمدا بڕوات و سەربازەکانی خاوەن چەکی قورس ڕێگای دوور لە رووبار بگرنەبەر."

خەڵکەکە بە پانەوە گوێیان لە حوکمی سەرکردەکان گرت و خێرا گەڕانەوە و خەریکی خۆ ئامادەکردن بوون. لەو نێوەدا سەیر ئەوە بوو کە هەروەختێک کلێئارخۆس فەرمانی دەردەکرد، باقی هێزەکان بەگوێیان دەکرد بەبێ ئەوەی ناوبراو بۆ ئەو سەرکردایەتییە هەڵبژێردرابێت. خەڵکەکە دەیزانی کە ناوبراو لەوانیتر بۆ ئەو کارە شایستەتر و بە ئەزموونترە.

مەودای ڕێگای نێوان ئێفێسۆی یوونی تا شەڕگە واتە شوێنی حازرییان نەوەد و سێ قۆناخ بوو کە دەیکردە پێنسەد و سی و پێنج فەرسەخ یا شازدە هەزار و پەنجا ستادیۆ. مەودای نێوان مەیدانی شەڕ و شاری بابێلیش سێسەدوشێست ستادیۆ دەبوو.

کاتێک تاریکی شەو داهات میلتۆکیتیسی تراکی بە چل سوارکار و سێسەد سەربازەوە ڕیزەکانی کلێئارخۆسی جێهێشت و ڕایکرد و خۆی رادەستی هێزەکانی پاشا کرد. کلێئارخۆس وەپێش هێزەکانی کەوت و لای نیوە شەو گەیشتە ئەو مۆڵگە کۆنە کە پێشتر لەشکری یۆنانی لێیدامەزرابوو و ئاریە لەوێ چاوەڕوانی دەکردن. لەو ماوەیەدا لەشکری یۆنانی چەک بەدەست ڕاوەستا بوو و سەرکردە نیزامییەکان چوونە لای ئاریە.

یۆنانییەکان سوێندیان خوارد کە خەیانەت بە یەکتری نەکەن و بەربەرەکانیش سوێندیان خوارد کە ڕێگا بەو لەشکرەی ماوە نیشان بدەن. کاتی سوێند خواردنیان بەرازێک و گایەکی نێر و گورگێک و بەرانێکیان سەر

بڕی و خوێنەکەیان لەنێو مەتاڵێک کرد و یۆنانییەکان شمشێریان و بەربەرەکانیش نێزەکانیان بەنیشانەی سوێندخواردن لەو خوێنە هەڵکێشا.

پاش ئەو بەڵێنەی بەیەکتریان‌دا، کلیئارخۆس ڕووی لە ئاریە کرد و گوتی: " ئاریە! وەک دەزانی ڕێگای گەڕانەوەی هەردوولامان یەکە، تکایە بۆچوونی خۆت لەو بارەوە بڵێ، ئایا هەر بەو شوێنانەدا دەگەڕێینەوە کە پێیاندا هاتبووین یا ڕێگای باشترت لە زەیندا ".

ئاریە لە وڵامدا گوتی: " ئەگەر هەر ئەو ڕێگایەی پێیدا هاتین بگرینەبەر، مەترسی لەناوچوون و هیلاک بوونمان لە برسان بەتەواوی هەستپێدەکەم. ئێستا هەمووومان گرفتی ئازووقە و تفاقمان هەیە. کاتێک دەهاتین بە درێژایی حەڤدە مەنزڵ لێرەڕا بەرەو باکووری ڕۆژئاوا لە ناوچەدا هیچ شتێکمان دەست نەکەوت. ئەگەر بۆرە خواردنێکیش هەبوو، کاتی هاتنمان تەواومان کرد. من پێم باشترە ڕێگایەکی دوورتر بگرینەبەر بەڵام ئازووقە و تفاقی لێ مسۆگەر بکرێ. بۆیە بەباوەڕی من مەوداکانی سەرەتایی ئەوەندەی دەکرێ درێژتر و بەردەوامتر ببڕین بۆوەی زیادتر لە هێزەکانی پاشا دوور کەوینەوە. ئەگەر بە یەکەم هەنگاو ڕێگای دووسێ ڕۆژ لێیان فاسیلە بگرین، دواتر ناتوانن بمانگەنێ و لێمان نیزیک کەونەوە. ئەوەش بۆیە باشە کە پاشا بە هێزی کەمەوە ناوێرێ پەلامارمان بدات و ئەگەریش هێزی زۆرتر بێنێ، ناتوانێ خێرا ڕێگا بپێوێ چونکە تووشی گرفتی ئازووقە و تفاق دەبێ. ئەوە ڕاوبۆچوونی من لەو بارەوە بوو ".

ڕاوبۆچوونی ئەو زانایە لە بواری جەنگیدا هەموویانی بە گشتی هان‌دا یا ڕاکەن یاکوو پێکەوە بگەڕێنەوە. بەخت و ئیقباڵ لەو نێوەدا یارمەتی بەوەجی‌دان. بەیانی زوو، بەر لە خۆر هەڵاتن وەڕێکەوتن و ڕۆژ لە لای ڕاستیان بوو. بڕیاریان‌دا بۆ شەو بگەنە شارۆچکەی بابێل. لە ڕێگادا تووشی هیچ چەشنە هەتلە بوونێک نەهاتن. بەرەو پاش نیوەڕۆ وێدەچوو کە سوارەکانی دوژمنیان دیتوە. هێزی سوارە نیزامی یۆنانی کە تا ئەو دەم بە شەپرێوی دەڕۆیشت، خێرا خۆی ڕێکخستەوە و نەزمی عەسکەرییان ڕەچاوکردەوە. ئاریە لەبەر بریندارى سواری فایتوونی جەنگی ببوو. بەپەلە دابەزی و جلوبەرگی شەڕی لەبەر خۆی کرد و ئەو کەسانەی لەگەڵیشی بوون خۆیان ئامادەی

شەڕکرد. پێشقەرەوڵەکانی ناردرابوون بۆوەی بزانن چباسە. ئەوان گەڕانەوە و ڕایانگەیاند ئەو سوارانە هێزی دوژمن نەبوون و کاروانێک بوون کە باری ئازووقەیان پێبوو.

لەشکری یۆنانی لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە شا و هێزەکانی دەبێ لەو نیزیکانە ئۆردویان لێدابێ، چونکە لەلای گوندەکە دوکەڵێکی زۆر بەرەو عاسمان ڕادەکشا. کلێئارخۆس ڕووی لە هێزەکانی دوژمن نەکرد لەبەر ئەوەی سەربازەکانی گەلێک برسی و ماندوو بوون. بەردەوام پێشڕەوی بە لەشکرەکەی کرد و ئێوارە وەختێک لە دێیەکانی نیزیک ئۆردوی لێدا. هێزەکانی پاشا ئەو دەڤەرەیان بەپانەوە تالان کردبوو و تەنانەت دارو تەختەی ماڵەکانیشیان دەرهێنابوو.

وەک عادەتی خۆیان، قۆشەنی یەکەم بە نەزم و تەرتیباتەوە چوونە نێو دێ و دامەزران، قۆشەنی دووهەم لەبەر ئەوەی درەنگ گەیشتێ، هەر جێگایەکیان وەگیر کەوت باروبنەیان لێ بە عەرزی دادا. لەبەر بانگهێشتنی یەکتر بە دەنگی بەرز هەرا و هوریایەکی زۆر ساز ببوو.

هێزەکانی دوژمن کە لەو نیزیکانە خێمەیان لێدابوو، گوێیان لەو دەنگ و سەدایە ببوو. هەر هەموویان خێمەکانیان کۆکردبۆوە و ڕایانکردبوو. ئەوەش ڕۆژی دوایی دەرکەوت کە نە خەبەرێک لە ئۆردو هەبوو، نە ولاغێک و نە بارێک و نە دوکەڵێک مابوو. بەپێی زانیارییەکانیش، پاشا نەیوێرابوو خۆ لەو هێزە یۆنانییە بدا و لەوەڕا دەرکەوت کە شەوی پێشوو بە هێزەکانییەوە مۆڵگەکەیان چۆڵکردبوو.

لای نیوە شەو یۆنانییەکان چەشنی بەربەرەکان تەواوێک ترسابوون، چونکە هەراوهوریایەکی زۆر لەلایەن خەڵکێکی چالاکەوە دروست کرابوو، بە چەشنێک کە لەشکری تووشی مەترسی کردبوو. لەو کاتەدا کلێئارخۆس بانگی تومیدی خەڵکی ئیلیای کرد کە باشترین جارچی سەردەمی خۆی بوو. کلێئارخۆس پێیڕاگەیاند بە خەڵکەکە بڵێ هێمنی بپارێزن و دوایەش لەلایەن سەرکردەکانەوە هاوار بکا هەرکەسێک ئەو سەربازە بدۆزێتەوە کە هێسترەکەی لەنێو ئۆردوگادا بەڕەڵا کردوە پاداشی یەک داریکی دەدرێتێ. ئەو ڕاگەیاندراوە دەریخست ترسی خەڵکی نێو مۆڵگەکە لەخۆڕا بووە و هیچ گرفتێک بۆ سەرکردەکان لەگۆڕێدا نەبووە. بەیانی سەحەری کلێئارخۆس فەرمانی بە هێزەکانیدا وەک ڕۆژانی شەڕ لە ئامادە باشی تەواو دابن و چەک بەدەست ڕیزبن.

## بەشی ٣

### مەیلی پاشا بۆ پەیمان بەستن - وڵامی نەرێنی یۆنانییەکان و گرفتی ئازووقە - ڕێنوێنیکردنی یۆنانییەکان لەلایەن هێزەکانی پاشاوە بۆ وەدەستهێنانی ئازووقە - چاوپێکەوتنی تیسافێرن و کلیئارخۆس - یەکگرتن لەگەڵ پاشا

ئەوەی کە پێشتر نووسیبووم پاشا لە مەر حزووری یۆنانییەکان هەراسی پێهەڵگیرابوو، لەو ڕووداوانەی خوارەوە دەرکەوێ. پاشا ڕۆژی دوایی، بەیانی زوو وەفدێکی نارده لای یۆنانییەکان و حوکمی دەسەر کردن چەکەکانیان دانێن و پەیمانی ئاشتی پەسند بکەن.

کاتێک ئەندامانی وەفدەکە نیزیکی پاسەوانانی مۆڵگە کەوتنەوە، داوای دیتنی سەرکردەکانیان کرد. پاسەوانەکان خەبەری هاتنی وەفدی ناوبراویان گەیاندە کلیئارخۆس کە ڕاست لەو دەمەدا خەریکی چاوەدێری کردنی هێزەکانی نیزامی بوو. کلیئارخۆس وڵامی داوە کە بە ڕاسپاردەکان بڵێن جارێ چاوەڕوان بن.

ناوبراو لەشکرەکەی بە چەشنێک ڕێکوپێک دامەزراند کە پانتاییەکی زۆری دەشتەکەی داگرت و تەواو ڕێکیخستن، بۆوەی ژمارەیان پتر بەرچاوبکەوێ.

کەس بۆی نەبوو هێڵی ڕاکێشراوی نیزامی ببەزێنێ. ئەوسا بانگی وەفدەکەی کرد و خۆشی بە جلی رازاوەی نیزامی بەرەو شوێنی کۆبوونەوەکە چوو و ژمارەیەک لە فەرماندەرەکانی پۆشتە و ئامادەی ژێردەستیشی لەگەڵ خۆی برد. داواشی لە هێزە یۆنانییەکان کرد لەباری چەک و جلوبەرگەوە ئەوەندەی دەکرێ ڕێکوپێک بن. کاتێک گەیشتە نیزیکی وەفدی پاشا، بە دەنگی بەرز پرسیاری لێکردن بۆچی هاتوون. ڕاسپاردەکان وڵامیان داوە کە خاوەن دەسەڵاتن و لەلایەن پاشاوە ناردراون بۆوەی ئاشتی لە نێوان پاشا و یۆنانییەکان مسۆگەر دامەزرێنن.

کلیئارخۆس لە جوابدا گوتی: سەرەتا بە پاشا بڵێن دەبێ شەڕ بکەین چونکە هیچ ئازووقە و تفاقێک لە گۆڕێدا نییە. کەسیش ناتوانێ لەگەڵ یۆنانییەکان باسی ئاشتی بکا تا زەمانێک ئازووقە دابین نەکا.

کاتێک ئەندامانی ڕاسپاردە گوێیان لەو قسانە بوو، خێرا چوونەوە لای پاشا و دوای ماوەیەکی کورت گەڕانەوە لای یۆنانییەکان. لەوڕا دەرکەوت کە پاشا خۆی یا دەسەڵاتدارێکی ئەو دەبێ لەو نیزیکانە بووبێ بۆوەی ئەو گرفتە چارەسەر بکا. ڕاسپاردەکانی پاشا ڕایانگەیاند کە داخوازییەکان پەسندکراون و ئەگەر قبوڵی ئاگربەس بکرێ، ئەوە لەگەڵ دەستەیەکی چاوساغ بەرەو شوێنی ئازووقە و خواردەمەنی دەچن.

کلیئارخۆس پرسیاری کرد ئەو ئاگر بەسە تەنیا لەگەڵ وەفدی حازری و ناردراوی پاشایە یا باقی هێزەکانیش دەگرێتەوە. ئەندامانی کۆڕی ڕاسپاردە وڵامیان داوە کە ڕێککەوتنەکە هەموو لایەک دەگرێتەوە تا ئەو کاتەی پێشنیارەکان دەگەنە بەردەم پاشا.

دوای ئەو قسە و باسانە، کلیئارخۆس وەفدەکەی بردە لایەکیتر و خۆی چووە لای سەرکردەکانی یۆنانی بۆوەی لەسەر بڕیارێک لەگەڵیان ساغ بێتەوە. ئەوانیش لەو باوەڕدا بوون کە ئاگر بەس بکرێ و هەرچی خێراتر بەرەو شوێنی تفاق و ئەرزاق وەڕێکەون. کلیئارخۆس گوتی منیش لەگەڵ ئەو بۆچوونەم، بەڵام جارێ لە ڕاگەیاندنیدا پەلە ناکەین، خۆمان دەگوێزرێنین بۆوەی ڕاسپاردەکان تووشی مەترسی بکەم و پێیانوابێ لەسەر ئاگربەس بە

تەوافوق نەگەیشتووین. هەرچەند هێزەکانی خۆشمان لەو نێوەدا تووشی دڵەڕاوکە دەبن.

کاتێک هەست بەوە کرا کە وەختییەتی بڕیارەکە ڕاگەیێندرێ، ئەوسا کلیئارخۆس ڕاسپاردەکانی بانگ کرد و قبوڵی پێشنیارەکەی پێگوتن و داوای لێکردن وەپێش کەون و بەرەو شوێنی ئەرزاق بڕۆن. سەرەڕای پەیمانی ئاگر بەس و ڕاگەیاندنی بە وەفدەکە، کلیئارخۆس فەرمانی ئامادەباشی جەنگی بە هێزەکانیدا و خۆشی بە دوای لەشکردا دەڕۆیی.

لە ڕێگادا خەندەک و کارێزێکی فرە لە ئاو پڕکرابوون کە تەنیا بە لۆتکە و کەڵەک دەکرا بپەڕییەوە. خێرا دەستیان کرد بە دروست کردنی چەند پردێکی کاتی و بەردەست. دارخورمای ویشک و تەڕیان دەبڕی. ئەو وەختە جوان بوو کە پیاو سەیری کلیئارخۆس بکا. ناوبراو چاوەدێریی چۆنییەتی ئیشکردنی سەربازەکانی دەکرد. نێزەیەکی بە دەستی چەپییەوە گرتبوو و قوڵەدارێکیشی بەدەستی ڕاستی. ئەو سەربازانەی خەریکی دروستکردنی پردەکان بوون، هەرکەس خۆی لە کار دزیباوە، خێرا خوتورمەیەکی دەسرەواندێ و سزای دەدا و دەری دەکرد و کەسێکی چالاکتری لەجێی ئەو دادەنا.

کلیئارخۆس وێڕای سەربازەکان دە قوڕەشێلێ ڕۆچووبوو و کاری دەکرد بۆوەی هاوڵاتییانی دڵگەرم بکا خێراتر بجوڵێنەوە و تووشی شەرمەزاری نەبن. تەمەنی ناوبراو کەمتر لە سی ساڵ بوو. پیرەکانیش وەختێک هەڵسوکەوتی ناوبراویان دیت، کەوتنە نێو قوڕەشێلەوە.

کلیئارخۆس هەستی بەوە کردبوو کە ئەو کاناڵ و خەندەکانە هەموو ڕۆژێکی ساڵ پڕ ئاو نین. کاتێک ئاوی ڕووبارەکان بۆ ئاودێری سەحرا دابەش دەکرێ، ئیتر ئاو بەر نادرێتەوە نێو ئەو خەندەکانە. کلیئارخۆس لەو باوەڕەدا بوو کە بە ئانقەست کاناڵەکانیان پڕئاو کردوە بۆوەی یۆنانییەکان پێیانوابێ بەربەستی لەو چەشنە لەسەر ڕێگادا گەلێکن. دیارە پڕئاو کردنی ئەو خەندەکانە بڕیاری پاشا بوو.

دواتر گەیشتنە گوندێک کە چاوساغەکانی پاشا دیارییان کردبوو و هێزە یۆنانییەکان دەیانتوانی ئەرزاق و تفاق کۆکەنەوە. لەو دێیە گەنمێکی زۆر

دەست کەوت. هەروەها چەشنێک شەڕابی خورما و سرکەی ترشی خورمای کوڵاو لەوێ هەبوو. یۆنانییەکان لە وڵاتی خۆیان جۆرێک خورمای لەو چەشنەیان دیتبوو کە تەنیا لەسەر سفرەی پیاو ماقووڵانی یۆنانی دەبیندرا و گەلێک گەورە و جوان بوو. ڕەنگی وەک عەنبەری زەرد دەچوو و بۆ شەوچەلە ویشک دەکراوە. خورمای زەردی ڕمەکیش هەبوو کە بۆ خەڵکی دەستکورت و خزمەتکار دادەندرا و بە فراوانی لە یۆنان هەبوو. ئەوەی بۆ شەوچەلە ویشک دەکرایەوە فرە بە تام و خۆش بوو و دوای زیافەتی شەو دەخورا و تەنیا عەیبێکی کە هەیبوو، مرۆڤی تووشی سەرئێشە دەکرد.

لێرە بۆ یەکەمجار هێزە یۆنانییەکان شیرەی خورمایان خواردەوە و گەلێک شیرین بوو. وەک شەوچەلەی خورما، ئەو شیرەیەش ژانە سەری بەدواوە بوو. دارخورماکانی بۆ شیرەگرتن سەریان لێدەدرا پاش فەترەیەک ویشک هەڵدەگەڕان.

هێزە یۆنانییەکان سێ ڕۆژ لەو شوێنە مانەوە و لەلایەن پاشاوە، تیسافێرن و ژنبرای پاشا و سێ کەسایەتی فارس و جەماوەرێکیتر هاتنە لای یۆنانییەکان. کاتی چاوپێکەوتن، تیسافێرن قسەی کرد و لەلایەن دیلمانجەکەیەوە وەردەگێڕدراوە سەر زمانی یۆنانی. ئەو گوتی: " یۆنانییەکان! وەک دەزانن من خەڵکی وڵاتی جیرانی ئێوەم. دەزانم تووشی گرفتێکی زۆر هاتوون. بە شانازیم زانی داوا لە پاشا بکەم ئیزن بدا ئێوە بە سلامەتی بگەیێنمەوە وڵاتی خۆتان. لەو باوەڕەدام نە ئێوە و نە وڵاتی یۆنان نارەزایەتیتان لە هەمبەر ئەو پێشنیارە نییە. لەبەر ئەوەی بیرێکی ئەوتۆ لە مێشکمدا بوو، داوام لە پاشا کرد و پێمگوت خزمەتێک ئەوتۆ مافی ڕەوای منە. یەکەم، ئەوە من بووم کاتێک هەواڵم پێگەیشت کە کورووش خەریکی لەشکرکێشییە، خێرا خۆم و هێزەکانم خۆمان گەیاندە لای پاشا. دووهەم، لەنێو تەواوی هێزەکانی پاشادا کە دژی یۆنانییەکان شەڕیان کرد تەنیا من هەڵنەهاتم و لەگەڵ لەشکری سوارەی خۆم بە نێو ئێوەدا دەرباز بووم و چوومە لای پاشا و لە ئۆردوگا خۆمان رادەستی هێزەکانی ئەو کرد. جیا لەوانە، ئەوکاتەش کە پاشا بۆ کوشتنی کورووش هاتبوە ئەوێ، من هێشتا

لەگەڵ عەشیرەی موخلیسی خۆم سەرقاڵی ڕاوکردنی سپای بەربەری سەر بە کوروش بووم.

پاشا بەڵێنی پێدام، بەڵام سەرەتا ڕایسپاردم بێمە لاتان و پرسیارتان لێبکەم بۆچی دژی ئەو چەکتان هەڵگرتووە؟ ئامۆژگاری من ئەوەیە کە وڵامێکی بەجێ بدەنەوە. بۆوەی منیش بتوانم بە قازانجی ئێوە لە حزووری پاشادا بەچەشنێک بدوێم کە دەسکەوتێکی بە نرخی لێبکەوێتەوە.

یۆنانییەکان دوای ئاخاوتنی تیسافێرن بۆ ماوەیەکی کورت خەلوەتێکیان کرد و دەستیان بە ڕاوێژ کرد. لە لایەن سەرکردەکانی نیزامییەوە کلێئارخۆس دیاریکرا وڵام بداتەوە. ئەویش گوتی: " ئێمە هیچکات بۆ ئەوە نەهاتووین دژایەتی پاشا بکەین. بەمەبەستی شەڕیش دژی ئەو ڕەگەڵ کوروش نەکەوتووین. تۆش باش دەزانی کە کوروش چەندە فێڵبازی ڕەچاوکرد بۆوەی ئێوە لەکاتی پەلاماردا لەداوبخا. هەر بۆ ئەو ویستەش ئێمەی ڕاکێشایە ئێرە. ئێمە کاتێک دیتمان کوروش لە بەرامبەر چ مەترسیەک دایە، بۆوەی لە حزووری خەڵک و خواکانماندا تووشی شەرمەزاری نەبین، خەیانەتمان بە ناوبراو نەکرد چونکە ئەو چاکەیەکی زۆری دەرهەق بە ئێمە کردبوو. ئێستا کە کوروش کوژراوە و نەماوە، ئێمە شەڕ بۆ سەڵتەنەت لەگەڵ پاشا ناکەین و گەرەکیشمان نییە زیان و زەرەدێک بە وڵات بگەیێنین و خەڵک بکوژین. هەڵبەت ئەگەر ئەزیەتمان نەکەن، دەخوازین بگەڕێینەوە وڵاتی خۆمان. بەڵام ئەگەر لایەنێک بخوازێ پەلامارمان بداتێ، ئێمە بە هیممەتی خواکان پارێزگاری لە خۆمان دەکەین. بەپێچەوانەشەوە ئەگەر کەسێک گەرەکی بێ یارمەتیمان بدا، ئەوسا ئێمەش لەو کەمتر نین بۆوەی چاکەی بەوەجتری پێشکەش بکەینەوە ".

کلێئارخۆس بەو چەشنە ئاخاوتنەکەی کۆتایی پێهێنا. کاتێک تیسافێرن گوێی لەو قسانە بوو، وڵامی داوە: " تەواوی ئەو لێدوانەی تۆ لای پاشا باس دەکەم. لەمەر پێشنیارەکانتان چ وڵامێکی داوە بۆ ئێوەی دێنمەوە. بەڵام تا کاتی گەڕانەوەم، دەخوازم پەیمانی ئاگربەس لە نێوانماندا بەردەوام بێت. هەروەها یارمەتیتان دەدەین ئازووقە و تفاق بۆ خۆتان بکڕن."

رۆژی دواتر تیسافێرن نەگەڕاوە، ئەوە نیگەرانییەکی خستە نێو دڵی یۆنانییەکان. سێهەم ڕۆژ بەڵام، کاتێک ناوبراو گەڕاوە گوتی لەگەڵ پاشا چاوپێکەوتنی هەبووە. توانیویەتی ئەو ڕازی بکا کە ئیزنی پێبدا یۆنانییەکان لەو بارودۆخە نەجاتبدا، هەرچەند خەڵکانێکی زۆری دەروبەری پاشا دژی ئەو خواستە بوون. ئەوان پێیانوابوو کە دروست نییە پاشا بەبێ سزادانی یۆنانییەکانی دژبەری خۆی، ڕێگایان بدا سەربەست بگەڕێنەوە. تیسافێرن لە کۆتایی قسەکانیدا گوتی: " هەر لە ئێستاوە، ئەوەندە ڕێگایەی بە وڵاتی ئێمەدا دەرباز دەبن پێوەندی دۆستایەتی لەگەڵ یەکتر بپارێزن و ڕێنوێنیتان دەکەین بۆوەی بتوانن بەبێ گیروگرفت بگەڕێنەوە وڵاتی خۆتان و ئازووقە و تفاقیش بکڕن. ئەگەر لە شوێنێک تووشی گرفتی کڕینی ئەرزاق هاتن، ڕێگاتان پێدەدەین بتوانن لە خەڵکی وڵاتەکەمان یارمەتی وەرگرن.

ئێوەش دەبێ وەعدمان پێبدەن کە بە وڵاتی دۆستی خۆتاندا دەرباز بن. نابێ بەدرێژایی ڕێگا هیچ زەرەد و زیانێک بە خەڵک و وڵات بگەیێنن و لەمەر خواردەمەنی و خواردنەوە زۆری لە خەڵک بکەن. مەگەر ئەوەی کە ئێمە نەتوانین یارمەتیتان بدەین، یا لە بازاڕ وەگیر نەکەوێت. دیارە کاتێک خۆمان ئازوقە و تفاقمان بۆ فرۆشتن هەبێ دەبێ لە ئێمەی بکڕن."

یۆنانییەکان شەرتەکانیان قبوڵ کرد. هەردوو لایەن سوێندیان خوارد. تیسافێرن و ژنبرای پاشا دەستی ڕاستی خۆیان بۆ لای سەرکردەکانی یۆنانی ڕاداشت و پێکەوە تەوقەیان کرد. دوای ئەو ڕووداوە تیسافێرن گوتی: " ئێستا دەچمەوە لای پاشا. هەر کە کارەکانم جێبەجێ کرد دەگەڕێمەوە لاتان بۆوەی بتانگەڕێنمەوە یۆنان و منیش خۆم بچمەوە سەر حوکمڕانی ساتراپییەکەم ".

# بەشی ٤

## چاوەڕوانیی گەڕانەوەی تیسافێرن - شک و گومانی یۆنانییەکان سەبارەت بە ئاریە - گوماناوی بوونی گەڕانەوەی تیسافێرن - دەرێکەوتنی یۆنانییەکان و مۆڵخواردنیان لە چەند جێ و دوور لە یەکتر - گەیشتنە ژێر دیواری میدیا و خەیانەتی بەربەرەکان

دوای ئەو ڕووداوانە، هێزە یۆنانییەکان و پیاوانی ئاریە بۆ ماوەی بیست ڕۆژ لەپاڵ یەکتر ئۆردویان لێدا و چاوەڕوانی گەڕانەوەی تیسافێرن بوون. لەو فەترەیەدا برا و خزمەکانی ئاریە و خەڵکانێکی زۆر سەردانی ناوبراویان کرد. لەنێو خەڵکەکەدا هێندێک فارس هەبوون کە دیداری دۆستانی خۆیان کرد و بەردەوام دەوروبەریان خاترجەم دەکرد کە پاشا هیچکات لە فکری ئەوەدا نییە تۆڵە لەو کەسانە بستێنێتەوە کە کاتی خۆی دژ بەو ڕەگەڵ کوروش کەوتوون.

بەدوای ئەو چاوپێکەوتنانەدا یۆنانییەکان بۆیان دەرکەوت کە ئاریە و پیاوەکانی بایخێکی ئەوتۆ بە ئەوان نادەن. هەر بۆیە تەواوێک لە هەڵسوکەوتی ئاریە ناراحەت بوون و چوونە لای کلیئارخۆس و پێیانگوت: " چاوەڕوانی چی دەکەین، مەگەر نازانین پاشا حەول دەدا بە هەر ڕێگایەک بۆی بلوێ ئێمە قڕبکا و یۆنانییەکانی لای خۆی بترسێنێ بۆوەی لە داهاتوودا نەکا غیرەت

وەبەر خۆیان بێنن و دژی پاشا لەشکرکێشی بکەن. ئێستا پاشا دەخوازێ لێرە چاوەروان بمێنینەوە چونکە سپاکەی پەرشوبڵاو بووە. کاتێک هێزەکانی وەسەر یەک خستەوە، هیچکەس ناتوانێ پێش بە پەلاماری ناوبراو بۆ سەر ئێمە بگرێ. یا ڕەنگە لە شوێنێک خەریکی هەڵکەندنی خەندەک و بیناکردنی دیوار بێت. ئەو هیچکات ناخوازێ ئێمەی یۆنانی کە وەک لەشکرێکی بچووک لە خاک و نیزیک قەسر و بارەگاکانیدا تووشی شکستی گەورەمان کردوە، بە هاسانی و بێ تۆڵە ئەستاندنەوە ڕێگای گەڕانەوەی خۆمان بەرەو یۆنان بگرینەبەر.

کلیئارخۆس لە وڵامدا گوتی: " من بیرم لە هەمووی ئەو بابەتانە کردوەتەوە. کێشەکە لەوەدایە ئەگەر ئێمە هەر ئێستا بەبێ ئیزن و خواستی ئەو وەڕێکەوین مانای ئەوە دەدا کە لە داهاتوودا دەبێ شەڕ دژی ناوبراو بکەین و بەپێچەوانەی پەیمانەکان بجوڵێینەوە. بەرلە هەموو شتێک، ئەو وەختە هیچکەس ئامادە نابێ ئازووقە و تفاقمان پێبفرۆشێ یا پێمان بڵێ لە کوێ دەتوانین ئەو پێداویستییانە دابین بکەین. دووهەم، کەسمان دەستناکەوێ کە چاوساغیمان بکا و ڕێگای گەڕانەوەمان نیشانبدا. هاوکات بەڵام، ئەگەر بە خواستی ئێوە بکەین وەک تاوێک لەوە پێش باستان کرد، ئاریە خێرا خۆی دەگەیێنێتە ئۆردوگای دوژمن و لەو نێوەدا هیچ دۆستێکمان بۆ نامێنێتەوە. ئەوانەش کە تا ئێستا دۆستی ئێمە بوونە لێمان دەبن بە دوژمن. لەلایەکیترەوە نازانم جیا لە رووباری فورات چۆمێکیتر لەسەر ڕێگامان هەڵکەوتووە یانا کە ناچاربین لێی بپەڕینەوە.

هەروەها لەوە دڵنیاین کە ئەگەر هێزەکانی دوژمن پێش بە پەڕینەوەمان بگرن، ناتوانین لە ڕووباتی فورات بپەڕینەوە. کاتێک پێویست بە شەڕکردن بێت، خاوەن هێزی سوارەی پشتیوان نین و بەپێچەوانەوە زۆربەی هێزەکانی دژبەر سوارە نیزامی چالاکن. ئەوەش بڵێم ئەگەر سەرکەوین، ناتوانین هیچکەس بکوژین، ئەگەریش شکست بخۆین هیچکاممان نەجاتیمان نایە و ناتوانین هەڵێین. من تێناگەم ئەگەر پاشا دەخوازێ بە هەر وەسیلەیەک

بمانفەوتێنێ، بۆچی سوێند دەخوا و دەستی دۆستایەتی درێژ دەکا و خواکان بە شاهید دەگرێ کە یۆنانییەکان و فارسەکانی دژبەری ئەزیەت ناکا؟ ".

لەکاتی قسەکردنی کلێئارخۆس‌دا، تیسافێرن و هێزەکانی گەیشتنە ئەو شوێنە و هەروەک پێشتر گوتبووی، ڕایگەیاند کە دەخوازێ بگەڕێتەوە وڵاتەکەی. ئۆرۆنداسیش لەگەڵ هێزەکانی هاتبوون، بەو حیسابەی بەرەو ئەرمەنستان بڕۆن و ژنەکەشی، واتە کچی پاشای لەگەڵ خۆی هێنابوو.

بە ڕێنوێنی و چاوساغی تیسافێرن تەواوی هێزەکان ڕێگایان گرتەبەر. لەو نێوەدا تیسافێرن خەریکی ئازووقە دابینکردن بوو. ئاریە لەگەڵ لەشکری بەربەری سەر بە کورووش و هاوڕێیەتی تیسافێرن و ئۆرۆنتاس، پێکەوە ڕێگا دەڕۆیشتن و دواتریش لە تەنیشت ئەوان ئۆردوی لێدا.

یۆنانییەکان لە ترسی فێڵبازی پیاوانی سەر بە پاشا، هەمیشە خەریکی پاراستنی خۆیان بوون. بە ڕێگای‌تر و بەڕێز دەڕۆیشتن و تێکەڵاوی ئەوان نەدەبوون و چاویان لە ڕێنما و چاوساغی خۆیان بوو. بە جیا و مەودای یەک فەرسەخ دوور لە هێزەکانی دیکە ئۆردویان لێدا. بە واتایەک ئەو هێزانە خۆیان بە دوژمنی یەکتر دەزانی. هێندێک جار ئەو دڕدۆنگی و گومان لە یەکتر کردنە، بەتایبەت لەکاتی کۆکردنەوەی تفاق و سووتەمەنی و شتی‌تردا، دەبووە هۆی شەڕ و نێوان ناخۆشی.

دوای سێ قۆناخ ڕێگابڕین گەیشتنە دیواری میدیا و لێی دەرباز بوون[٧٥]. ئەو دیوارە بە خشتی سووری برژاو و ئاسفاڵت دروست کرابوو. خاوەن بەرینایی بیست پێ و بەرزایی سەد پێ بوو و دەگوترا درێژاییەکەی لە رووباری دیجلەڕا تا چۆمی فورات گەیشتووەتە بیست فەرسەخ و لە نیزیک شاری بابێل هەڵکەوتبوو.

---

٧٤- لەشکری یونانی بە دەروازەکانی وڵاتی میدیادا دەرباز بوو. ڕەنگە بەناو خودی دەروازەدا یا بە قەڵشت و شوێنێکی ڕووخاوی دیواردا تێپەڕیبن. ئەو دیوارە ساڵی ٥٨٠ی بەر لە زایین لەلایەن نەبوخودونۆسۆرا بنیات نراوە. مەبەست لە دروستکردنی دیوار، پاراستنی پاشایەتی بووە. لە چۆمی دیجلەڕا دەستی پێکردوە و گەیشتووەتە ڕووباری فورات، واتە لە باکووری ڕۆژهەڵات بەرەو باشووری ڕۆژئاوا. لە گۆڕەپانی سێ گۆشەی نێوان دیواری میدیا و خەندەک و چۆمی فورات، ئەردەشیر و کورووش کەوتوونەتە شەڕی هەڤدوو.

لەو شوێنەڕا بە دوو مەنزڵ، هەشت فەرسەخیتر ڕێگا ڕۆیشتن و لە دوو خەندەک پەڕینەوە. یەکێکیان پردی لەسەر بوو و بۆ دووهەمیشیان کەڵکیان لە کەڵەک و لۆتکە وەرگرت. ئەو خەندەکانە لە چۆمی دیجلەڕا سەرچاوەیان دەگرت و لکی جۆراوجۆریان لێدەبۆوە و ئاوێکی زۆریان بۆ ئاوەدێری وڵات دەگواستەوە. سەرەتا بەرین و دواتر باریک دەبوونەوە و لە کۆتاییدا وەک جۆگەلەکانی بچووکی یۆنانی دەچوون کە بۆ ئاودێری هەڵدەکەندرابوون.

جەماوەر گەیشتە رووباری دیجلە. لە پازدە ستادیۆیی ئەو رووبارە شارێکی گەورە و پڕ حەشیمەت بەناوی سیتاک هەڵکەوتبوو[٧٥]. یۆنانییەکان لە نیزیک باغێکی گەورە ئۆردویان لێدا کە هەموو جۆرە دارێکی تێدا بوو. هێزەکانی بەربەر لە چۆم پەڕینەوە و لەوبەر ئۆردویان لێدا و لە یۆنانییەکانڕا دیار نەبوون. پڕۆکسێنۆس و گزنفۆن لەپێش ئۆردو و لەشکرەکەدا، ڕاست لەو جێگایەی چەکەکانیان دانابوو قەدەمیان لێدەدا. یەکێکی ڕاسپاردە هاتە لای پاسەوانەکان و پرسیاری کرد کە چۆن دەتوانێ چاوی بە پڕۆکسێنۆس یا کلیئارخۆس بکەوێ. پرسیاری مێنۆنی نەکرد، هەرچەند لەلایەن هێزەکانی ئاریەوە هاتبوو کە دۆستی نیزیکی مێنۆن بوو. لەو نێوەدا پڕۆکسێنۆس خۆی بە کابرا ناساند و لێی پرسی کە چدەخوازێ. کابرا لە وڵامدا گوتی:" من لە لایەن ئاریە و ئارتائۆزۆسڕا هاتووم. ئەوانە لە پیاوان و دۆستانی موخلیسی تایفەی کوروشن. منیان بۆیە ناردوە چونکە ئێوەیان خۆش دەوێ، بۆوەی ئاگادارتان بکەمەوە لەسەر هەست بن و پارێزگاری لە خۆتان بکەن، مەبادا ئیمشەو هێرشتان بکرێتە سەر. قۆشەنێکی زۆر لە باغی تەنیشتەوە مۆڵی خواردوە. دەبێ قەرەوڵ لە پێش پردی سەر رووباری دیجلە دابنێن. تیسافێرن گەرەکییەتی پردەکە بڕوخێنێ و ئەگەر بۆی بلوێ پێش بە پەڕینەوەی ئێوە لەو رووبارە بگرێ و دەخوازێ هەمووتان لەنێو چۆم و خەندەکدا دەست بەسەر بکا."

یۆنانییەکان وەختێک گوێیان لە قسەکانی کابرای ڕاسپاردە بوو، ناردیانە لای کلیئارخۆس. کابرا دووبارە خەبەرەکەی بەتەواوی بۆ کلیئارخۆس گێڕایەوە. کلیئارخۆس ترسی ڕێنیشت. لەو نێوەدا پیاوێکی گەنج دوای تۆزێک

---

٧٥- به شوێنی دروستی هەڵکەوتنی شاری سیتاک نازانین. هێندێک کەس لەسەر ئەو باوەڕەن کە دەبێ شاری ئیمڕۆی شەریعەت ئەلبەیدحا لە باکووری بەغدا بێ.

تێفکرین وەقسەهات و گوتی لەنێوان پەلامار و رووخاندنی پرد، جیاوازیەک هەیە. ئاشکرا و روونە ئەگەر ئەوان پەلاماری ئێمە بدەن یا سەردەکەون یا تووشی شکست دێن. لە هەر حاڵدا پرد رووخاندن مانایەکی نییە و بەرهەمێکی لێناکەوێتەوە. چونکە ئەگەر ئەوان ئێمە شکست بدەن ڕێگای هەڵاتنیان بۆ ئێمە نەهێشتۆتەوە و ڕێگا و پردێکی دیکە پێنازانین و ناچارین بەربەرەکانی بکەین، ئەگەریش ئەوان تووشی شکان هاتن ڕێگای خۆدەرباز کردنیان بۆ خۆیان نەهێشتۆتەوە و لەشکری ئەوبەری چۆمیش ناتوانێ بە هانایانەوە بێت.

کلێئارخۆس لەو کاتەدا پرسیاری لە کابرا کرد کە بەرینایی نێوان رووباری دیجلە و خەندەک چەندە دەبێ. ڕاسپاردە لە وەڵامدا گوتی مەودایەکی گەلێک بەرینە و چەند شار و گوندی تێدا هەڵکەوتووە[٧٧]. دوای ئەوە بۆیان دەرکەوت کە هێزەکانی بەربەر بۆیە ئەو کەسەیان ناردوە مەبادا یۆنانییەکان پاش رووخانی پردەکە لە دوڕگەی هەڵکەوتووی نێوان چۆم و خەندەکدا دامەزرێن و دەغڵ و دانی ئەو شوێنە بە ساحێب بکەن. بەشێکی دوڕگەکە دەشتێکی بەرین و بە حاسڵات و پڕ لە خەڵکی جووتیار و پەناگایەکی مەحکەم بوو بۆ کەسانێک کە گەرەکیان بوایە پاشا تووشی ترس و دڵەڕاوکە بکەن. دوای ئەو خەبەرە قەرەوڵ و نیگابانیان ناردە سەر پرد. هیچ کەس پەلاماری نەدان و هیچ نەیارێکیش تخوونی پرد نەکەوت و پاسەوانانیش خەیاڵیان ئاسوودە بوو.

ڕۆژی دواتر، بەیانی سەحەری لە پرد پەڕینەوە. ئەو پردە خاوەن سی و حەوت زارک بوو و بۆیە یۆنانییەکان ئارام بە سەریدا دەرباز بوون، یۆنانییەکانی بەکرێگیراوی تیسافێرن لەو باوەڕەدا بوون کە پێویستە کاتی پەڕینەوەی هێزە یۆنانییەکان بەسەر پرددا هێرشیان بکەنەسەر. دیارە بۆچوونێکی نابەجێ و دوور لە عەقڵ بوو. دواتر، تەنیا "غلوو" و چەند کەسی دیکەی بەربەر لەو کاتەدا وەدیار کەوتن و چاویان لە پەڕینەوەی خەڵکەکە بوو کە ئەوانیش دوای ئەو چاوگێڕانە خێرا ڕایانکرد.

---

٧٦- ڕەنگە ئەو ناوچە چوارگۆشەیە بێ کە کەوتووەتە نێوان چۆمی دیجلە و خەندەکی نار- مەلی و ئەو سەردەمە دوو کاناڵی هاوسووی یەکتر کە لە چۆمی دیجلە و لە نارمەلیڕا سەرچاوەیان دەگرت.

جەماوەر بە تەنیشت چۆمی دیجلەدا بە چوار مەنزڵ، بیست فەرسەخ ڕێگایان پێوا و گەیشتنە رووباری فیسکۆس[78] کە خاوەن یەک پلێترا بەرینایی بوو. پردێکیش لەسەر ئەو رووبارە دروستکرابوو و شارێکی گەورەش بەناوی ئۆپیس لە قەراخ چۆمەکە هەڵکەوتبوو. یۆنانییەکان لەو شوێنە چاویان بە زڕبرای کورووش و ئەردەشیر کەوت. ئەویش لە شاری سیز و ئێکباتان قۆشەنێکی گەورەی بۆ یارمەتیدانی پاشا لەگەڵ خۆی هێنابوو. ئەو قۆشەنە ڕاوەستا و چاوی لە دەربازبوونی یۆنانییەکان کرد.

کلیئارخۆسی سەرلەشکر فەرمانی بە هێزەکانی ژێردەستی خۆیدا دوبەدوو تێپەڕن و جاروباریش بوێستن. هەر جارێک سەری ستوونی لەشکر ڕادەوەستا، باقی ستوونەکەش بە هەمان شێوە دەوێستا. بەو جۆرە ژمارەی نیزامییانی لەشکری یۆنانی ئێجگار زۆر وەبەر چاو دەهات و فارسەکان تەواوێک سەریان سووڕمابوو.

لەو شوێنەڕا بە شەش مەنزڵ، سێ فەرسەخیتر بە سەحرای میدیادا تێپەڕین و گەیشتنە گوندی پەریزاد واتە دایکی کورووش و ئەردەشیر. تیسافێرن فەرمانی بە یۆنانییەکاندا کە دەتوانن ئەو ئاواییە تالان بکەن چونکە دژی پاشا لەگەڵ کورووش هاوکاریان کردوە. ئەوەشی گوت کە مافی گرتنی دیل و یەخسیریان نییە. لەو گوندە گەنم و ئاژەڵی خۆماڵی و غەنیمێکی فرە کەوتە دەست یۆنانییەکان.

لەوێرا بە چوار قۆناخ و بیست فەرسەخ ڕێگا، بە بیابانێکی ویشکارۆدا دەرباز بوون. رووباری دیجلە لەلای دەستی چەپیان هەڵکەوتبوو. لە یەکەم مەنزڵدا و بەلای چۆمەوە شارێکی گەورە و بە رەونەقیان دیت کە پێی دەگوترا کێنێس[79]. خەڵکی ئەو شارە بە لۆتکە و کەڵەکی پێست، نان و پەنیر و شەڕابیان لەگەڵ خۆیان بۆ لەشکر هێنا.

---

٧٧- ماوەی ڕێگا ڕۆیشتن چوار ڕۆژی گرت. چۆمی فیسکۆس ئیمڕۆ پێی دەگوترێ عەدەم.

٧٨- زانیاری سەبارەت بە شوێنی دروستی ئەو شارە لەگۆڕیدا نیە. هێندێک توێژەر لەو باوەڕەدان کە شاری کێنێس لە جێگای شاری سێن بووە. بەشێکیتر پێیانوایە کەلاوەکانی ئەو شارە، وێرانەکانی بەجێ ماوی قەڵاتی سەرقات بووە.

## بەشی ٥

## گەیشتنە سەر چۆمی زاپاتا (زاب) - چاوپێکەوتنی کلی‌ئارخۆس و تیسافێرن - خەیانەت و دەستبەسەر کردنی سەرکردەکانی یۆنانی و تەسلیم کردنەوەیان بە پاشا

لە درێژەی ڕێگادا گەیشتنە چۆمی زاب (زاپاتا)[٨٠]. ئەو ڕووبارە خاوەن بەرینایی چوار پلێترا بوو. چوار ڕۆژی ڕێک لە قەراخ ئەو چۆمە مانەوە و لەو ماوەیەدا شک و نیگەرانییەکی فرە لەمەر بەسەردادانی هێزەکانی دژبەر لەگۆڕێدا بوو، هەرچەند هیچ گرفتێکی ئەوتۆ سازنەبوو. کلی‌ئارخۆس بە مەسڵەحەتی زانی دیدارێک لەگەڵ تیسافێرن پێکبێنێ و گفتوگۆیەکی سەرزارەکی لەگەڵدا بکا، بۆوەی کۆتایی بەو دڕدۆنگییە بێنێ، پێش ئەوەی تووشی پێکدادانێک بێن.

کلی‌ئارخۆس ڕاسپاردەیەکی بەڕێکردە لای تیسافێرن و وڵامی بۆ نارد کە دەخوازێ چاوی پێی‌بکەوێ. تیسافێرن لە وڵامدا داوای کرد کە هەرچی زووتر کلی‌ئارخۆس بۆ ئەو دیدارە بێت. کاتێک پێکەوە دانیشتن، کلی‌ئارخۆس بە تیسافێرنی گوت: " من دەزانم کە ئێمە پێکەوە سوێندمان خوارد و

---

٧٩- مەبەست هەمان چۆمی زابی گەورەی ئیمڕۆیە.

دەستمان لەنێو دەستی یەکتر نا، بەو مەبەستەی هیچکات خەیانەت بە هەڤدوو نەکەین و پەیمانمان بەست. بەڵام دەبینم تۆ بەردەوام خۆت لە ئێمە دەپارێزی، وەک ئەوەی خۆت لە دوژمن پاراستبێ. ئێمە کاتێک ئەو هەڵسوکەوتەی تۆ دەبینین، ناچارین وشیاری خۆمان بپارێزین. چونکە ناتوانم بیر لە کردەوەیەکی ئەوتۆ بکەمەوە کە جەنابت خەریکی زیانگەیاندن بە ئێمە بی. تەنیا دەتوانم لەلایەن خۆمانەوە بەڵێنی یەقین بدەم کە هیچکات مەبەستی دژایەتی ئێوەمان نەبووە.

من بۆیە داوای چاو پێکەوتنم کرد کە بتوانین پێکەوە ئەو شک و گومانە کۆتایی پێبێنین. ئەو کەسانەی لە یەکتر دڕدۆنگن و بوختان بۆ یەکتر هەڵدەبەستن و بەهانە بەیەکتردەگرن، لە ئەزیەت کردنی یەکتریشدا تووشی کێبەرکێ دێن. ئەوەش زەرەدی قەرەبوو نەکراو بەو کەسانە دەگەیێنێ کە نە خوازیاری ئازار و ئەزیەت کردنن و نە مەبەستێکی ئەوتۆیان هەیە. لەبەر ئەوەی من باوەڕی تەواوم بەوە هەیە کە گفتوگۆ و روونکردنەوە دەبێتە هۆی فەوتاندنی ئەو شک و گومانانە، ئێستا دەخوازم قەناعەتت پێبێنم کە ئێوە لە بێباوەڕی لە هەمبەر ئێمەدا تووشی زیادەڕۆیی هاتوون. زەمانەتی بەهێزی ئێمە سوێندەکەمانە کە لە حزوور خواکاندا خواردمان و ئەوانیشن کە ئێمە لە دوژمنایەتی کردن دەپارێزن و هەر کەسێک لەو سوێندە لابدا، بە باوەڕی من کلۆڵترین مرۆڤە و لە شەڕ و بەربەرەکانیشدا کەسێکم نەدیتووە توانیبێتی لە تاریکی و قەڵا و پەسیواندا خۆی لەوان وەشێرێ. خواکان دەسەڵاتیان بەسەر هەموو شتێک و جێگایەکدا زاڵە و خاوەن هێزی یەکسان لە گشت شوێنێکن. ئەوە باوەڕی منە سەبارەت بە خوا و سوێندەکانی خواردوومانە و دۆستایەتییەکی پێکمانهێناوە.

لە هەلومەرجی ئێستا و لەنێو تەواوی کەرستە ئینسانییەکاندا، تۆ بەلای منەوە گەورەتر لە هەموویانی. چونکە بە یارمەتی تۆ ڕێگای گەڕانەوەمان هاسان دەبێتەوە، رووبارەکان بۆ پەڕینەوە دەبن و لە ئەرزاق و تفاق کەم ناهێنین. بەڵام بەبێ هاوکاری تۆ تەواوی ڕێگاوبانەکان لەبەرمان سەخت و دژوار دەبن، چونکە ئەبەدا لێیان شارەزا نین و هەر چۆمێک لەمپەرێک دەبێ

و جەماوەرەکەمان تووشی مەترسی دێت و خەڵکانیتریش لێمان دەپرینگێنەوە و ئەوەش دەبێتە هۆی بەردەوامی کەمبوونی پێداویستیەکانی ژیانمان. ئەگەر ڕق و نەفامی ناچارمان بکا تۆ بکوژین، ئایا دوای نەمانی مرۆڤێکی مێرخاسی وەک تۆ کێ دەڵێ تووشی شەڕ و دوژمنایەتی لەگەڵ پاشا نابین. سەرەڕای ئەوانە بۆ دەبێ خۆم لە دۆستایەتی تۆ بێبەش بکەم یا خەریکی ئەزیەت و ئازاری تۆ بم. من بە ڕاشکاوی و لە حزووری تۆدا دەڵێم ئەگەر ئیمکانی هەبوایە لەنێوان ئەو خەڵکەدا من دۆستایەتی کوروشم هەڵدەبژارد، چونکە لەسەر ئەو باوەڕە بووم ئەو مرۆڤێکی بەتوانا و بەردەوام خوازیاری چاکە کردن بوو.

من ئێستا دەبینم کە تۆ دەسەڵات و لەشکر و وڵاتی کوروشت لەژێر فەرماندایە، هاوکات ساتراپی خۆشت پاراستووە و بە پێچەوانەی کوروش کە دوژمنایەتی پاشای دەکرد تۆ هێزی ناوبراوت هاوپەیمانە. کاتێک خاوەنی ئەو جێگا و پلە و پایەیەی، کێ ئەوەندە بێ عەقڵ دەبێ دۆستایەتیت نەکا. من بۆیە ئەو بابەتانەم لەگەڵ باس کردی چونکە دەبینم تۆش خوازیاری دۆستایەتی ئێمەی.

لە پێش هەموو شتێکدا دەزانم خەڵکی دانیشتووی میسیا دژایەتی ئێوە دەکەن[80]. بەو هێزەی لەژێر دەسەڵاتمدا، پێموایە دەتوانم بیانهێنمە ژێر فەرمان، بۆوەی سەری کڕنۆش بۆ جەنابت دانەوێنن. من زانیاریم لەلا هەیە کە پیسیدییەکان و کۆمەڵێکی زۆر لە گەلانیتر مایەی سەرئێشەی ئێوە دەبن. من دەتوانم ئەوانەش بە هێزی جەنگاوەرانم ناچار بە کڕنۆشی هەمیشەیی بکەم و تۆش خەیاڵت ڕاحەت بێ. سەبارەت بە میسرییەکان، دەزانم تۆ تەواوێک لێیان بێزاری، من هێزێک باشتر لە جەنگاوەرەکانی ژێر فەرمانی خۆم شک نابەم بۆوەی بتوانن بە توندترین شێوە سزایان بدەن.

ئەوەش بڵێم تۆ ئەگەر بخوازی لەنێو گەلانی دراوسێدا دۆست هەڵبژێری، لە ئێمە باشتر نادۆزیەوە. ئەگەر یەکێکیش لەوانە گەرەکی بێ ئەزیەتت بکا و

---

٨٠- میسییەکان، ئەوانە لە چیاکانی نێوان وڵاتی فریژیای گەورە و لیۆلیداس و میدیادا ژیاون. زۆرجار پەلاماری ئاسیای بچووکیان داوە و دەشتەکانی ئەو دەڤەرەیان تاڵان کردوە.

تۆش بتهەوێ سزای بدەی، لە هێزی ئێمەت باشتر بۆ یارمەتی‌دان دەست ناکەوێ. ئەو یارمەتی‌دانەش بۆ مووچە وەرگرتن نییە بەڵکوو بۆ خاتری دۆستایەتی و حەق شوناسییە کە پێت قەرزدار دەبین، چونکە تۆ ئێمە لەو بارودۆخە نەجات دەدەی.

کاتێک تەواوی ئەو لایەنانە لێکدەدەمەوە، بۆم جێگای سەرسوڕمانە بۆچی دەبێ باوەڕت بە ئێمە نەبێ و لەوە بترسی کە فریو بخۆی. من گەلێکم پێخۆش دەبوو ناوی ئەو کەسە بزانم کە ئەوەندە ڕاوێژی زاری خۆشە و توانیویەتی ڕازیت بکا کە ئێمە خەریکی پیلان‌گێڕی و خەراپەکاری دژی تۆین ".

کلێئارخۆس بەو چەشنە ئاخاوت و تیسافێرن لە وڵامیدا گوتی: " گەلێک شادم کلێئارخۆس، چونکە گوتەی هومێد بەخش لە زمانی تۆوە دەبیسم و سەبارەت بە من خاوەن بۆچوونی باشی. ئەگەر بیرت لە پیلان دژی من کردباوە، ئەو کاتە دەبوایە بیر لە خەراپەکاریش دەرهەق بە خۆت بکەیەوە. بۆوەی دەرکەوێ بە ناهەق بیرتان لە بێ متمانەیی بە پاشا و من کردوەتەوە، باش گوێ لەو قسانەم بگرە. ئەگەر ئێمە خوازیاری فەوتانی تۆ باین، بزانە کە هێزی پێویستی سوارە و پیادە و چەکدارمان کەم نەبوو. بێئەوەی زەرەدێک بە خۆمان گەیشتبا، دەمانتوانی تۆ شکست بدەین. ڕەنگە بیر لەوە بکەیەوە ناوچە و شوێنی لەبارمان لەبەر دەستدا نەبووە. تۆ دەزانی دەشت و سەحرایەکی بەرفراوان هەن و هەر چەند ملکی دۆستانی ئێوەن، بەڵام درباز بوونتان گەلێک دژوارە. ئەو هەموو کێوانە دەبینن، دەبێ پێیان هەڵگەڕێن و تەواویشیان لە ژێر دەسەڵاتی ئێمەدان. هەر کاتێک بخوازین دەتوانین بەر لە ئێوە داگیریان کەین و ڕێگای دەربازبوونتان لێبگرین. ئەو هەموو چۆم و رووبارانەتان دیتووە، هەرکات گەرەکمان بێ دەتوانین جەماوەری ئێوەی تێدا بخنکێنین. هێندێک لەو چۆمانە بۆ پەڕینەوە نابن، ئەگەر ئێمە ئەرکی دەربازبوونتان وەستۆ نەگرین.

سەرەڕای هەمووی ئەو بابەتانەی بۆم باس کردی، دەزانی ئاگرمان هەیە و دەتوانین هەرچی حاسڵاتی سەر زەوی هەیە بیان‌سووتێنین. هەڵبەت ئەوەش روونە کە بە سووتاندنی ئەو بەر و بوومە، ئێوە تووشی برسییەتی

دێن و هەرچەند جوامێر و جەنگاوەریش بن، ڕزگاریتان نایە. کەوابوو، کاتێک دەتوانین ئەو گشت پێشگیریانە بکەین و بێئەوەی زیانێک بە خۆمان گەیشتبێ و لە شەڕی دژی ئێوەدا سەرکەوتبین، ئەو ڕێوشوێنانەمان ڕەچاو نەکردوە چونکە بێ حورمەتی کردن بە خواکان و بێزراوی مرۆڤایەتی دەبووین. ئەوە کاری ئەو کەسانەیە کە موحتاجن و لەبەر دەست کورتی ناچار بە خەیانەت و حیللەگەری دەبن و بە سوێندی بەدرۆ و باوەڕی بێبنەما لە نیازپاکی خەڵک سوود وەردەگرن.

کلێئارخۆس ئێمە شێت و نەفام نین. بۆچی ئەو کاتەی لە تواناماندا بوو هەر هەمووتان بکوژین، ئەو کارەمان نەکرد. چونکە سلامەتی و ڕزگاری ئێوەمان گەرەک بوو و خۆیشم ویستم دڵپاکی خۆم بە یۆنانییەکان بسەلمێنم. ئێوە هێزێکی بێگانەی یۆنانین و کوروش لە بەرامبەر مووچە و پاداش، کاتی هێرش کردن بۆ سەر پاشا کەڵکی لێتان‌وەرگرت و هیچ باوەڕێکیشی بە ئێوە نەبوو. منیش گەرەکمە لە کاتی تەنگانەدا خزمەتتان پێبکەم و بتانکەمە وەسیلەی بەهێز بوونی سپاکەی خۆم.

هەڵبەت سەبارەت بەو بەهرە و سوودانەی ئێوە دەتوانن بە منی بگەیێنن، تۆ ئیشارەتت بە هێندێکیان کرد. بەڵام لە گشتیان گرینگتر ئەوەیە کە من دەیزانم. تەنیا پاشا بۆی هەیە تاج لە سەر سەری بنێ، هەرچەند ئێوەش لێرەن، ئایا کەسێکی‌تر بۆی هەیە ئەو تاجە لەسەر بکا! ".

کاتێک تیسافێرن بەو چەشنە دوا، کلێئارخۆس قسەکانی ئەوی پەسند کرد و گوتی: " لە حاڵێکدا ئەو گشتە دەلیلی ماقووڵ و بەهێز بۆ دۆستایەتی هەن، ئەوانەی هەوڵ دەدەن بە بوختان هەڵبەستن دوژمنایەتی لەنێوانماندا بخوڵقێنن، ئایا شایستەی کوشتن نین؟.

تیسافێرن وەڵامی‌داوە: " بێ شک. بۆیە پێمخۆشە سەرکردە و فەرماندەرەکانتان بێنە ئێرە. ئەوکات تەواوی ئەو کەسانەی ئێوە بە کوشتنی من و فەوتانی لەشکرەکەم تاوانبارتان دەکەن، پێتان بناسێنم ".

کلێئارخۆس لەجوابدا گوتی کە من تەواوی سەرکردە و فەرماندەرەکان لەگەڵ خۆم دێنم و بە نۆرەی خۆم بۆ ئێوە ڕوونی دەکەمەوە کە لە کوێوە

ئەو قسە و باسانەم گوێ لێبوە ". دوای ئەو دیدار و گفتوگۆیە تیسافێرن خوڵقێکی فرەی کلیئارخۆسی کرد بۆوەی شەوێ پێکەوە زیافەتێک بکەن.

ڕۆژی دوایی کاتێک کلیئارخۆس گەڕاوە ئۆردوگا، دیار بوو لە هێمنی و بەڵێنەکانی تیسافێرن ڕازییە و باوەڕی تەواوی بە ناوبراو هەیە. هەرچی تیسافێرن پێیگوتبوو، بۆ جەماوەری ژێر فەرمانی خۆی گێڕایەوە و گوتیشی کە سەرکردەکان لەلایەن تیسافێرنەوە بانگهێشت کراون. هەر کەسێک لەنێو یۆنانییەکاندا دەرکەوێ کە خەریکی بوختان هەڵبەستن و درۆ کردن بووە، وەک دوژمنی یۆنانییەکان سەیر دەکرێ و پێویستە سزا بدرێت.

کلیئارخۆس شکی لە مێنۆن بوو، چونکە ئەو و ئاریە لەگەڵ تیسافێرن گفتوگۆیان کردبوو و دژی کلیئارخۆس خەریکی پیلانگێڕی ببوون بۆوەی لەشکری ژێر فەرمانی ناوبراو بێننە ژێر ڕکێفی خۆیان و دۆستایەتی لەگەڵ تیسافێرن دامەزرێنن. کلیئارخۆس خۆیشی گەرەکی بوو لەشکرەکەی یەکدەست بکا و ئەوانەی خەریکی ئەزیەت و ئازاری بوون، وەلایان بنێ.

لەو نێوەدا هێندێک لە نیزامییەکان لەگەڵ ئەو بۆچوونە نەبوون کە تەواوی سەرکردە و کاربەدەستانی لەشکری بچنە لای تیسافێرن و گەرەک بوو لەو بارەوە پارێزڕاگرن. کلیئارخۆس تەواوێک پێیداگرت و لە ئاکامدا پێنج کەس ستراتێژ(سەرتیپ) و بیست لۆکاژ(سەرهەنگ) ٠ دووسەد سەربازی بێ چەکی هەڵبژارد و هێندێک پارەی هەڵگرت بۆوەی لە نیزیک ئۆردوگای تیسافێرن ئازووقە بکڕێ و ئەوسا گشتیان پێکەوە چوونە لای تیسافێرن.

سەرکردەکان، پرۆکسێنۆسی ڤیئۆتی، مێنۆنی تێسالی، ئایاسی ئارکادی، کلیئارخۆسی لاکۆنی و سوقڕاتی ئاخایی بوون. ئەوانە چوونە خێمەی تیسافێرن. باقی سەرکردە و فەرماندەرەکانی دیکە لە دەرەوەی خێمە چاوەڕوان مانەوە. دوای تاوێک تەواوی سەرکردەکانی نێو خێمە دەست بەسەر کران. بە هەمان دەستوور گشت ئەو کەسانەی لە دەرەوە وێستابوون، گیران و سەریان لێدرا. دوای ئەو رووداوە هێزەکانی بەربەر روویان لە سەحرا کرد و هەر یۆنانییەکی لەسەر ڕێگا دەستیانکەوت، نیزامی و نانیزامی لەجێوە کوشتیان.

پاشماوەی قۆشەنی یۆنانی کە لە ئۆردوگای خۆیان بوون، کاتێک چاویان بە پەلاماری سوارەکانی بەربەر کەوت، سەریان سوڕما و فکریان بۆ هیچ قەومانێک نەدەچوو. وەختێک نیکارخۆسی ئارکادی خۆی گەیاندە لایان، ئەویش زگی هەڵدڕابوو و ڕیخۆڵەکانی بە دەستەوە گرتبوو و باسی ڕەوتی ڕووداوەکەی بەتەواوی بۆ لەشکر کرد.

هێزە یۆنانییەکان ڕایانکردە لای سیلاحەکانیان و تووشی مەترسییەکی گەورە هاتن و لەو باوەڕەدا بوون کە زۆر ناخایەنێ هێزەکانی بەربەر پەلاماری ئۆردوگاکەیان دەدەن. هێرشکەرانی بەربەر هەموویان نەهاتن. تەنیا ئاریە و ئارتائۆزۆ و میتریداتیس کە ئەوانەش کاتی خۆی خەڵکی موخلیسی کوروش بوون، ڕوویان لە ئۆردوگای یۆنانییەکان کرد. دیلمانجی یۆنانییەکان گوتی کە تیسافێرنیش لەگەڵ ئەو جەماوەرە دەبینێ و دەیناسێ. ئەو ئاپۆڕەیە نیزیکەی سێ سەد کەس دەبوون و دەستەیەک لە هێزی زرێ پۆشیان پێکدێنا. کاتێک گەیشتنە روبەڕووی ئۆردوگا، داوایان کرد کە یەک ستراتێژ و یەک لۆکاژ لە ئۆردوگا بێنە دەرەوە بۆوەی گوێیان لە فەرمانی پاشا بێت. کلێئانۆری ئۆرخۆمێنی و سۆڤێنێتۆسی ستیمفالی بە پارێزی تەواوەوە لە خێمەکانیان هاتنە دەرێ. گزنفۆنی ئاتێنی بەدوای ئەواندا هات بۆوەی خەبەرێک لە چارەنووسی پرۆکسێنۆس بزانێ. خیریسۆفۆس ئەو کاتە لە ئۆردوگا نەبوو و لەگەڵ چەند کەسێکی‌تر چووبوە یەکێک لە گوندەکانی دەوروبەر بۆ ئازووقە کڕین.

یۆنانییەکان بە مەودایەکی ئاوا ڕاوەستان کە بتوانن گوێیان لە ڕاسپاردەکانی بەربەر بێت. ئاریە دەستی بە قسە کرد و گوتی: " یۆنانییەکان! کلێئارخۆس لەمەر ژێرپێنانی سوێند و شکاندنی پەیمانی ئاشتی، بە سزای کردەوەکانی خۆی گەیشت و کوژرا. پرۆکسێنۆس و مێنۆن دوای ئاشکرا کردنی خەیانەتی کلێئارخۆس کەوتنە بەر ڕەحمەت و بەخشین. بەڵام سەبارەت بە ئێوە دەبێ بڵێم کە پاشا داوای سیلاحەکانتان دەکا و بە سامانی خۆی دەزانێ چونکە دارایی کوروشی نۆکەری بووە ".

دوای ئەو ڕاگەیاندنە کلیئانۆری ئۆرخۆمێنی لەلایەن گشت یۆنانییەکانەوە وەجواب هات و گوتی: " ئاریەی مەلعوون ئێوە کە دۆستی کورووش بوون، ئایا لە حزووری خوا و خەڵکدا شەرمەزار نین. ئێوە سوێندتان خوارد لەگەڵ دۆستانی ئێمە دۆستایەتی بکەن و لەگەڵ دوژمنانیشمان بەربەرەکانی. ئێستاکە ئێوە خەریکن ئێمە بە تیسافێرنی خوانەناس و نمەک حەرام و خەیانەتکار دەسپێرن. ئێوە لەبەر بێ غیرەتی و ناجوامێریتان، خەڵکانێکتان کوشت کە باوەڕیان بە سوێندەکان هەبوو و خەیانەتیشتان بە پاشماوەی جەماوەر کرد و دژی ئێمە لەگەڵ دوژمن دەستتان تێکەڵ کرد ".

ئاریە خێرا وڵامی داوە: " کلیئارخۆس لەبەر ئەوەی پیلانی کوشتنی تیسافێرن و ئۆرۆنتاس و ئێمەی داڕشتبوو بۆیە کوژرا ".

گزنفۆن هاتە پێشەوە و گوتی: " ئەگەر کلیئارخۆس سوێندی لە ژێر پێ نا و پەیمانی ئاگربەس و ئاشتی شکاند، بە سزای خۆی گەیشت. ئەوە عەداڵەت و دادپەروەریە و مرۆڤی خائین دەبێ بکوژرێ، بەڵام "پرۆکسینۆس" و "مێنۆن" دۆستی ڕاست و دروستکاری ئێوە و سەرکردەی ئێمە بوون. ئەگەر ڕاست دەکەن ئەوانمان بۆ بنێرنەوە و خەیاڵتان ڕاحەت بێ چوون ئەوان دۆستی هەردووک لامان بوون، دەتوانن گشت لایەکمان لە ئامۆژگاری بەنرخ بەهرەمەند بکەن ".

جەماوەری بەربەر دوای ئەو بۆچوونەی گزنفۆن، ماوەیەکی زۆر لەنێو خۆیاندا ڕاوێژیانکرد و بێ هیچ وڵامدانەوەیەک، گەڕانەوە ئۆردوگاکەیان.

## بەشی ٦

### لێکدانەوەی گزنفۆن لەسەر کلیئارخۆس و ستراتیژەکانیتر

سەرکردەکانی یۆنانی بەو چەشنەی باسمان لێوەکردن، دەستبەسەر کران و بردرانە لای پاشا و بە حوکمی ئەو سەریان لێدرا. یەک لەوانە کلیئارخۆس بوو. بە باوەڕی هەمووی ئەو کەسانەی ناوبراویان دەناسی، ئەو سەربازێکی بە تەواو مانا لێهاتوو و مرۆڤێکی جەنگاوەر و لە تەکنیکی شەڕکردندا شارەزا بوو. لە سەردەمی شەڕی نێوەخۆیی نێوان ئاتێنی و لاکیدێمۆنییەکان، ناوبراو لە وڵاتی خۆی واتە یۆنان مایەوە و لەو شەڕەدا بەشداری کرد. کاتێک ئاگربەس و ئاشتی ڕاگەیاندرا ئەو دوای ڕازی کردنی هاوڵاتییەکانی جەنگاوەری لەمەر مەترسی پەلاماری تراکییەکان بۆ سەر خاکی یۆنان، ئیزنی لە دەسەڵاتدارانی سەردەم وەرگرت و سواری گەمی بوو و چووە شەڕی تراکییەکانی دامەزراو لە نیمچە دورگەی تراکی و پێرینتۆ[٨٢]. پاش فەترەیەک حوکمڕانانی یۆنانی لەمەر ئیزنپێدانی کلیئارخۆس پەشیمان بوونەوە، بەڵام ناوبراو ئەو کاتە لە دەرەوەی ناوچەی سپارت و لە ئیستمۆی کورینتۆ بوو و

---

٨١- پێرینتۆس شارێکی یونانی و ژێردەستەی سامییەکان بووە. لە باکووری کەنارئاوەکانی پرۆپۆندیدا هەڵکەوتووە و ساڵی ٦٠٠ی بەر لە زایین دروست کراوە.

هەرچەند هەوڵی گەڕانەوەی بۆ درا بەڵام ئەو نەگەڕاوە و خێراتر بەرەو ئێلیسپۆندۆ ڕۆیشت. ئەوەش بووە هۆی تاوانبار بە مەرگ بوونی ناوبراو لە لایەن قازییەکانی سپارتییەوە.

کلیئارخۆس لەو کاتەوە ئاوارە بوو و پەنای بۆ کوروش برد. ناوبراو بە چ زبانێک توانی کوروش ڕازی بکا، لە کتێبێکیتردا باسم لێوە کردوە. کوروش دە هەزار داریکی دایە کلیئارخۆس. نابراو کاتێک ئەو بڕە پارەیەی دەستکەوت، نەسەکنی و سەرفی ژیانی خۆی نەکرد بەڵکوو بە پێچەوانەوە لەشکرێکی دامەزراند و شەڕی تراکییەکانی پێکرد. لە یەکەم شەڕدا کلیئارخۆس سەرکەوت، تا ئەو کاتەی کوروش پێویستی بە لەشکری ناوبراو هەبوو، بەردەوام لەگەڵیان لە جەنگدا بوو و وڵاتی تراکییەکانی تاڵان کرد. دواتر چووە لای کوروش و یارمەتی ناوبراوی لە جەنگەکاندا.

هەڵبەت ئەوە کردار و ڕەفتاری مرۆڤێکی عاشقی شەڕە، لە جیات ئەوەی بە ئاشتی و هێمنی و بێ شەرمەزاری و زەرەر بژی، شەڕی بەلاوە گرینگترە. هەروەها وەختێک دەتوانێ ڕاحەت و بێ دەردی سەر بێ، خەریکی خۆ ماندوو کردنە. تەنیا ئەوەندە بەسە کە بکەوێتە کەش و هەوای شەڕ، ئیتر ناسەکنێ. مرۆڤێکی ئەوتۆ بەلاوە گرینگتر بوو و ئەگەر تەواوی دارایی و سامانەکەشی لەسەر دانابا، بۆی گرینگ نەبوو. ئەو مرۆڤە بەردەوام خوازیاری خەرج کردنی پارە بۆ شەڕ و ململانێ بوو نەک وەک خەڵکی ئاسایی کە پارەیان بۆ خواست و پێداویستییەکانی سەردەمی پیری یا مەبەستێکیتر پاشەکەوت دەکرد. کلیئارخۆس عاشقی شەڕ بوو. لە باری تەکنیکی جەنگەوە شارەزایی فرەی هەبوو، چونکە حەزی دەکرد بکەوێتە مەترسی و بە درێژایی شەو و ڕۆژ بەربەرەکانی لەگەڵ دوژمنەکانی دەکرد. بە شاهیدی ئەو کەسانەی لەگەڵی ژیابوون، ئەو مرۆڤێکی بە پارێز بوو. دەگوترا کە کلیئارخۆس فەرماندەیەکی بە توانای لەشکریی بوو و خاوەن شێوازی هەڵسوڕاندنی تایبەت بە خۆی بوو. ناوبراو زیادتر لە هەر شتێک گرینگی تەواوی بە دابین کردنی چەک و ئازووقە لە کاتی تەنگانەدا دەدا. کلیئارخۆس لەوەی کە بتوانێ سەربازەکانی ژێر فەرمانی ڕازی بکا بۆوەی

بەقسەی بکەن، گەلێک بە توانا بوو و ئەوەش دەگەڕاوە بۆ زاکوونی لە ڕادەبەدەری ئەو. کلیئارخۆس لە دەنگ و ڕووخساردا مرۆڤێکی مەحکەم و قورس و قایم بوو. ڕەفتارێکی توند و تیژی بەکار دەهێنا و خۆیشی گەلێک جار پەژیوان دەبۆوە. ناوبراو تاوانباری بە پێی یاسا و بەرهەقییەوە سزا دەدا. ئەو دەیزانی لەشکر و سپا بەبێ یاسا و ڕێسا هیچ بایخێکیان نییە. خەڵکی نیزیک لە کلیئارخۆس دەگێڕنەوە کە ناوبراو گوتوویەتی ترسی سەرباز لە فەرماندەکەی پێویستە پتر لە هی دوژمنەکەی بێ. بە تایبەت کاتێک ئەرکی پاراستنی شوێن و مەتەرێز یا پاسەوانی لەسەر بێ و دەبێ ئەو سەربازە خۆی لە مەترسی باوێ.

پیاوانی ژێر دەستی کلیئارخۆس لە هەلومەرجی دژواردا گوێ بە فەرمانی بوون و ئیتاعەتی هیچکام لە فەرماندەکانیتریان بەو چەشنە نەدەکرد، چونکە لەو باوەڕەدا بوون ڕەنگ و ڕوخساری ناوبراو هیوابەخش و توند و تیژیەکەشی لە بەرامبەر دوژمندا ورەبەخش بووە. لە ئاکامدا ئەو سەختگیریە زیادتر دەبووە خولقێنەری ڕزگاری نەک ترس و بێزاری.

کاتێک سەردەمی ترس و خۆف بەسەر دەچوو، سەربازەکانی ژێر فەرمانی کلیئارخۆس بۆیان هەبوو لە دەستەی ناوبراو بڕۆن و بچنە لای سەرکردەیەکیتر. زۆر جار ژمارەیەکی فرە لەو سەربازانە کلیئارخۆسیان بەجێدەهێشت. ناوبراو لە دیپلۆماسی نەدەزانی و لەگەڵ ژێردەستانی گرژ و توڕە و سەختگر و زاڵم بوو و وەک ماموستا لەگەڵ قوتابیان دەجوڵایەوە.

بۆخاتری ئەو خوو و ڕەوشتە، ئەوانەی لەگەڵ ناوبراو بوون هیچکامیان لە ڕووی دۆستایەتی و خۆشەویستی نەبوو بەڵکوو لە بەر ناچاری و حوکمی دەسەڵاتی وڵاتەکەیان بوو و دەبوایە ئیتاعەتی بە تەواو مانا لە کلیئارخۆس بکەن.

کاتێک بەسەر دوژمندا سەر دەکەوتن دوو هۆ ئەوانی دەکردە قارەمان، یەکەم غیرەت و جوامێری کلیئارخۆس و دووهەم ترسی سزا و تەمبێی توندی نیزامی. دەبێ بڵێم کلیئارخۆس سەرکردەیەکی ئەو جۆرە بوو. ئەوەش باس دەکەن کە ناوبراو حەزی نەدەکرد لەلایەن کەسانیترەوە فەرمانی پێبدرێ. کاتێکیش کە کوژرا تەمەنی نیزیک پەنجا ساڵ دەبوو.

پرۆکسێنۆسی ڤیئۆتی، دووهەمین سەرکردە، هەر لە سەردەمی منالّییەوە گەرەکی بوو ببێتە مرۆڤێکی مەزن. بۆ ئەو ئاوات و خۆزگەیە مامۆستایەکی بە پارە بەکرێگرت کە ناوی غۆرغیا لیئۆندینۆس بوو[٨٢]. پاش ئەوەی پەروەردەی پێویستی لە مامۆستاکەی وەرگرت و بە قەناعەتێک گەیشت، کەسایەتییەکی بە توانای لەباری حوکمڕانییەوە لێ هەڵکەوت. پرۆکسێنۆس لەبەر ئەوەی دۆستایەتی پیاوانی ناسراوی سەردەمی خۆی دەکرد و گەرەکی نەبوو لە سەرکردەکانیتر کەمتر بێت، بڕیاریدا لە لەشکرکێشی کوروشدا بەشداری بکا. ئەو لەو باوەڕەدا بوو لە ڕێگای لەشکرکێشی گۆریندا دەتوانێ هێز و پارە و پلەیەکی بەرز وەدەست بێنێ.

پرۆکسێنۆس هەرچەند خاوەن ئاواتێکی بەرز بوو، بەو حاڵەش هیچکات نەیدەویست لە ڕێگای ناهەقییەوە بە ئامانجەکانی خۆی بگات و بە پێچەوانەوە پێیوابوو دەبێ بە بەرهەق بوون و ڕاستگۆیی و گەورەیی خواستەکانی مسۆگەر بکا.

سەرکردەیەکی بە توانا بۆ ئیدارە کردنی جەنگاوەرانی بە غیرەت و ئازا بوو. ئەو کەسێک نەبوو کە بتوانێ ترس و نیگەرانی لە دڵی ژێردەستانی خۆیدا بخولقێنێ. لە ناچار کردنی فەرماندەکانی بەردەستیدا بۆ ڕێزلێنان و حورمەت گرتن و ترسان لە خۆی، مرۆڤێکی بێ هێز بوو. ئەو زیادتر ڕێزی لە سەربازەکانی لەشکر دەگرت بۆوەی ئەوانیش بە هەمان شێوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکەن. ئەوەندەی پرۆکسێنۆس دەترسا مەبادا پیاوەکانی لێهەڵگەڕێنەوە، هێندەش سەربازەکانی ئیتاعەتی دەستوراتی ئەویان نەدەکرد. ئەو لەو باوەڕەدا بوو ئەو کۆمەڵە سەربازەی ئەرکەکان بە چاکی بەڕێوە دەبەن کیفایەتە و ئەوانەی بە پێچەوانەوە دەجوڵێنەوە و هەڵسوکەوتی شیاویان نییە، پێویستە بە زمانی نەرم و ماقووڵ ڕەخنەیان لێبگیرێ.

---

٨٢- غۆرغیاس لیئۆندینۆس (٣٧٦ی پێش‌زایین - ٤٨٣ی پێش‌زایین) یەکێک لە ناسراوترین فەیلەسوفەکانی یونانی باستان بووە. ناوبراو لە ئیتالیای خوارو و ئاتین و تێسالی دەرسی گوتوەتەوە.

لەبەر ئەو خوو و خدەیە، خەڵکی جوامێر و باش خۆشەویستییەکی تایبەتیان سەبارەت بە ناوبراو هەبوو. بە پێچەوانەوە ئینسانی ناپاک خۆشیان لە پرۆکسێنۆس نەدەهات چونکە پێیانوابوو مرۆڤێکی متمانە بەخۆ نییە. کاتێک کوژرا تەمەنی سی ساڵان بوو.

سێهەم سەرکردە مێنۆن تێسالی بوو. ئەو زۆر بەپەلە بوو کە ببێتە سەرکردەیەکی ساماندار. پلەی بەرزی نیزامی گەرەک بوو بۆوەی ملک و ماڵی زۆرتر وەسەیەک بنێ و قازانج و بەرژەوەندی خۆی بەلاوە گرینگتر بوو. حەزی لە دۆستایەتی مرۆڤی بە دەسەڵات بوو، لەبەر ئەوەی ئەگەر خواستبای ناهەقییەک بکا تووشی سزایەک نەبێ.

مێنۆن لەو باوەڕەدا بوو خێراترین ڕێگا بۆ گەیشتن بە خواستەکانی، کەڵکوەرگرتن لە سوێندی بە درۆ، ژێر پێنانی بەڵێن و زوڵم و جینایەتە. سادەگی و ڕووڕاستی بەلای ناوبراوەوە مانایەکیان نەبوو. هەرچەند لافی دۆستایەتی لێدابا، کردەوەکانی بە پێچەوانەی هەڵسوکەوتی ئەو بوو و دوای ماوەیەکی کورت هەستی ناپاکیی ئاشکرا دەبوو. دوژمنی بەلاوە سووک نەبوو، بەڵام لەگەڵ ژێردەستانی خۆی فرە بەبێ حورمەتی دەجولایەوە. چاوی لە سەروەت و ملک و ماڵی دوژمنانی نەبوو لەبەرئەوەی دەیزانی پارێزگارییەکی توندیان لەسەرە. دەیتوانی ڕاحەتتر سامانی دۆستانی زەوت بکا چونکە چاوەدێرییەکی ئەوتۆیان لەسەر نەبوو. ئەگەر زانیبای کەسانێک پەیمان شکێن و درۆزن و ناهەقن، تەواوێک لێیان دەترسا و خۆی تێنەدەگەیاندن لەبەر ئەوەی لە خۆی بەهێزتری دەدیتن. ئەوانەش کە ڕاستگۆ و درووست کردار بوون، ئەو بە هەموو شێوەیەک هەوڵی دەدا ناجوامێرانە لەگەڵیان بجولێتەوە.

چەندەی مرۆڤی دروستکار بە پاراستنی حورمەتی خوا و ڕاستی و بەرهەقبوون شاد دەبێ، مێنۆنیش بە پێچەوانەوە، ئەوەندە بە خەیانەت و درۆ و دەسخەڕۆکردنی دۆستانی خۆشحاڵ و بە توانا دەبوو. ئینسانی بێ پاک و بێفێڵ بەلای ناوبراوەوە، بێ فەرهەنگ و دواکەوتوو بوو. مێنۆن کاتێک گەرەکی بوایە یەکەم جێگا لە دۆستایەتی کردنی کەسێکدا وەدەست بێنێ، دنیایەک درۆ و بوختانی بۆ دۆستانی دەوروبەری ئەو کەسە هەڵدەبەست. بۆ

گەیشتن بە مەبەست و جێگا کردنەوە بۆ خۆی، بەردەوام بەو شێوەیە رەفتاری دەکرد. کاتێک ویستبای ئیتاعەت بە سەربازەکانی ژێر دەستی بکا، لە هەموو خەراپەکارییەکدا یارمەتی دەدان. ئەو پێیوابوو مرۆڤێکی بە وەج و جێگای تەقدیر و پێهەڵاگوتنە، چونکە بە هەموو لایەکی نیشان دەدا خاوەن هێز و توانایی ئەزیەت کردنە و ئەگەر بخوازێ ئەو چەکەی بەکار بێنێ کەس تۆزی ناشکێنێ.

وەختێک سەربازێک لە لای ئەو رۆیشتبا، لەبەر ئەوەی سزای کوشتنی بۆ کابرای رۆیشتوو دیاری نەدەکرد، پێیوابوو گەورەییەکی فرەی نواندووە و چاکەی زۆری دەرهەق بە کابرا کردوە. هەڵبەت گەلێک لایەن و بابەتی‌تری ژیانی مێنۆن نادیارن و مرۆڤ خۆی دەتوانێ لە رووی کردارەکانییەوە ئەو دیوی سکەکەش ببینێ.

ئەوەی سەبارەت بە ژیانی ناوبراو دەزانین، دەبێ بڵێین کە کاتێک لاوێکی منداڵکار بووە، توانیویەتی بە شێوەی نایاسایی فەرماندەری هێزەکانی غەیرە یۆنانی وەستۆ بگرێ. ئاریە سەرکردەیەکی بەربەر بوو و حەزی لە کوڕی جحێڵ و جوان دەکرد و وەک مەعشووقە و سوگوولی کوڕێکی فارسی بەناوی تاریباس لەلای خۆی ڕاگرتبوو و بەو پێیەش گەلێک کەیفی بە مێنۆن‌یش دەهات.

ئەوکاتەی مێنۆن و سەرکردەکانی‌تری یۆنانی، بۆ یارمەتیدانی کوروش کەوتنە لەشکرکێشی دژی پاشا، ناوبراو هەرچەند وەک فەرماندەکانی‌تر تاوانبار بوو بەڵام سزای مەرگی بۆ دیاری نەکرا. پاشا دوای کوشتنی وەجبەی یەکەمی سەرکردەکان، ئەوسا ناوبراوی کوشت. ئەویش نەک بە سەر لێدانی چەشنی کلێئارخۆس و هاڤالانی، بەڵکوو ساڵێک دواتر گرتی و بە ئەشکەنجە و ئازارێکی فرەوە کوشتی.

هەر بە شێوەی سەرلێدان، ئایاسی ئارکادی و سوقراتی ئاخایی کوژران. دیارە دەبێ ئەوەش بگوترێ کە هیچکام لەوانە لەبەر بێ غیرەتی لە شەڕدا نەکوژران و لە دۆستایەتیشدا تووشی خەیانەتێک نەهاتن. کاتی کوژرانیان هەردووکیان سی و پێنج ساڵان بوون.

# کتێبی سێهەم

## بەشی ١

### ناهومێدی لەشکری یۆنانی - خەونی گزنفۆن

لە کتێبەکانی پێشوودا باسی تەواوی هەڵسووکەوتی یۆنانییەکان لە درێژایی لەشکرکێشی کوروش و گشت رووداو و بەسەرهاتەکان تا کوژرانی ناوبراو و تێداچوونی سەرکردەکانی یۆنانی لەو نێوەدا و باوەڕ کردن بە سوێند و پەیمانەکانیان لەگەڵ تیسافێرن کرا.

کاتێک ستراتێژ و لۆکاژ و سەربازەکانیان کەوتنە داو و گیران، هەر هەموویان کوژران. یۆنانییەکان کەوتبوونە بارودۆخێکی شێواو و نەیاندەزانی چبکەن. ئەوان لە پێتەختی پاشا واتە شاری بابێل نیزیک بوون، بەهۆی خەڵک و عەشیرەتی جۆراوجۆر و چەند شاری ژێر دەسەڵاتی دوژمنەوە کەوتبوونە گەمارۆ و کەس ئازووقەی پێنەدەفرۆشتن. لە یۆنان بە هەزاران ستادیۆ، نیزیکەی سێسەد و بیست فەرسەخ دوور بوون. خاوەن چاوساغ و دیلمانج نەبوون بۆوەی بتوانن بە ڕێگا سەخت و شاخاوییەکاندا دەرباز بن و لە رووبارە ڕژد و قووڵەکان بپەڕنەوە.

ئەو هێزە بەربەرانەی نێو لەشکری کوروش‌یش روویان لێوەرگێڕابوون و لە ئاکامدا بێ پشت و پەنا مابوونەوە و هیچ هێزێکی سوارەی هاوپەیمان لەگەڵیان نەمابوو. بۆیە لە بارودۆخێکی ئەوتۆدا ئەگەر سەرکەوتبان کەسیان نەدەکوشت، بەڵام بە پێچەوانەوە ئەگەر تووشی شکست هاتبان کەسیان بە زیندوویی ڕزگاری نەدەهات.

ئەو شەوە لەنێو خەیاڵات و نیگەرانییەکی زۆردا چەند سەربازێک توانیان نەختێک خواردن بخۆن و ئاگرێک بکەنەوە و بە دەورییەوە کۆزیلکە ببەستن. بەشێکی زۆریش لە سەربازەکانی یۆنانی ئەو شەوە لە ئۆردوگا نەبوون و هەر جێگایەکی وەگیریان کەوتبوو لێیدامەزرابوون. لەبەر حەسرەتی گەڕانەوە بۆ وڵات و خەمی دووری لە ماڵ و منداڵیان و بنەماڵە و کەس و کاریان، کەس نەیتوانی خەوی لێبکەوێ و لەسەر ئەو باوەڕە بوون جارێکی‌تر بە دیداریان شاد نابنەوە. بەو هەموو خەم و خەفەتەوە چاویان لەسەر یەک دانا بۆوەی سەرخەوێک بشکێنن.

لە نێو قۆشەندا یەکێک بە ناوی گزنفۆن، خەڵکی ئاتێن هەبوو. ناوبراو نە ستراتێژ و نە لۆکاژ بوو. ئەو لە لایەن پرۆکسێنۆس‌ڕا بانگهێشت کرابوو. دۆستی قەدیمی ئەو بوو. پرۆکسێنۆس بەڵێنی بە گزنفۆن دابوو ئەگەر ڕەگەڵ لەشکرەکەی ئەو بکەوێ ئەوە دەیکاتە دۆستی کوروش و لەلای ئەو بێ بە قازانجترە تاکوو لای خۆی بمێنێتەوە.

کاتێک گزنفۆن نامەی پرۆکسێنۆسی خوێندەوە، پرسێکی بە سوقڕاتی ئاتێنی کرد و خواستی سەفەر و دیداری پرۆکسێنۆسی لەلای ئەو باس کرد. سوقڕات لە ترسی ئەوەی مەبادا خەڵکی ئاتێن گزنفۆن تاوانبار بە دۆستایەتی لەگەڵ کوروش بکەن داوای لە ناوبراو کرد بچێتە لای خواکانی دێلفووس، چونکە ئەوکاتە کوروش  بەدژی ئاتێنییەکان یارمەتی لاکێدێمۆنییەکانی دەدا. گزنفۆن لەسەر پێشنیاری سوقڕات پێویست بوو بچێتە لای ئاپۆلۆن و سەبارەت بە سەفەر ڕاوێژ لەگەڵ ئەو بکا و ڕێنوێنی و بۆچوونەکانی وەرگرێ. گزنفۆن چووە لای ئاپۆلۆن و پرسیاری لێکرد کە دەبێ قوربانی بۆ

کام خوا بکا و لەبەری بپارێتەوە بۆوەی سەفەر بەخێر بێ و بێ گرفت و بە سلامەتی و ئازادی بگەڕێتەوە یۆنان.

خواوەند ئاپۆلۆن ڕێنوێنی گزنفۆنی کرد کە بۆ کامیەک لە خواکان دەبێ قوربانی بکا. گزنفۆن کاتێک گەڕاوە لای سوقرات لە ئاتین، باسی قوربانی بۆ خواوەندی پێشنیارکراوی ئاپۆلۆنی کرد. سوقرات دوای بیستنی قسەکانی گزنفۆن ڕەخنەی لێگرت. چونکە گزنفۆن لە خواوەندی نەپرسیبوو ئایا مەسلەحەتە ئەو سەفەرە بکا یان‌نا. لەپێشدا بڕیاری خۆی دابوو سەفەر بکا، دوایە لە خوای پرسیبوو چبکا بۆوەی تووشی هیچ گرفتێک نەبێ.

سوقرات پێیگوت، چوون بەو شێوەیە پرسیارت لە خوا کردوە، چی ڕێوشوێنی بۆی داناوی دەبێ ڕەچاوی بکەی و قوربانییەکان بەجێ بگەیێنی. گزنفۆن دوای جێبەجێ کردنی خواستی خوا، لە سەر داوای ئاپۆلۆن قوربانی پێشکەش کرد و پاشان چووە لای پرۆکسێنۆس و کوروش لە شاری سارد. ئەوانیش ئامادەی وەڕێخستنی هێز بۆ لەشکرکێشی بوون و هەر لەوێ ئاشنایەتی گزنفۆن و کوروش دەستی پێکرد، هەڵبەت لەسەر ناساندنی پرۆکسێنۆس. پرۆکسێنۆس گەلێک خوازیاری بوونی گزنفۆن لەو لەشکرەدا بوو و بۆیە کوروش بەڵێنی پێدا کاتێک شەڕەکە تەواو بوو لەمەر گەڕانەوە بۆ وڵاتەکەی یارمەتی بدا.

سەرەتا واڕاگەیاندرا لەشکرکێشی دژی پیسیدی‌یەکان بەڕێوە دەچێ. گزنفۆن‌یش هەر بەو حیسابە وەدوای ئەو لەشکرکێشییە کەوت و لەڕاستیدا فریوی خوارد، هەڵبەت نەک لە لایەن پرۆکسێنۆسەوە چونکە نە ئەو و نە باقی سەرکردەکانی یۆنانی جیا لە کلێئارخۆس بە مەبەستی ڕاستەقینەی ئەو هێرشەیان نەدەزانی. کاتێک گەیشتنە کیلیکیا ئەوجار مەبەستی کوروش بۆ هەموو لایەک ئاشکرا بوو. بەشێکی زۆر لە هێزە یۆنانییەکان سەرەڕای مەترسییان لەو ڕێگا دوور و درێژە، لە بەرامبەر کوروش‌دا تووشی شەرمێونی هاتن و لە ڕووی خەجاڵەتییەوە وەدوای ئەو کەوتن. ئەوان گەرەکیان نەبوو وەک ترسەنۆک سەیربکرێن. یەک لەوانەش گزنفۆن خۆی بوو.

لەبەر ئەوەی بارودۆخی یۆنانییەکان دوای کوژرانی سەرکردەکان تەواو شێوا بوو و گزنفۆنیش وەک خەڵکەکە خەم و خەفەت دایگرتبوو، ئەویش

نەیدەتوانی بخەوێ. تۆزێکی خەو لێکەوت و خەونێکی دیت. لە خەونەکەیدا بروسکەیەکی بەهێز لە ماڵی باوکیدا و ڕووناکی وڵاتی داگرت. لە خەو ڕاچەنی و خێرا هەستا سەرپێ و لەو باوەڕدا بوو کە خەونێکی عاقیبەت بە خێرە، چونکە لەو بارودۆخە نالەبار و پڕ مەترسییەدا ڕووناکییەکی ئەوتۆ بەهێز لەلایەن خواوەند (دیا)وە هومێدێک بوو. کاتێک بە بارێکیترەوە خەونەکەی لێکدایەوە، مەترسی دایگرت، چونکە لەو باوەڕەدا بوو خەونەکە لە خواوەند دیاوە سەرچاوە دەگرت. بەو مانایە کە ئەو ئاگرەی دەوری ماڵەکەی، واتای دژواری دەرباز بوون لە وڵاتی پاشایە و گەلێک بەربەست لەسەر ڕێگای نەجاتیان دروست دەبن.

خەونێکی ئەوتۆ چ مانایەکی دەبوو ئەگەر کەسێک سرنجی ڕووداوەکانی دوای خەونی بدایە. بەدوای ئەو خەونە گزنفۆن هەستا و یەکەم بیری بە مێشکیدا هات ئەوە بوو کە لەگەڵ خۆی ڕاوێژ بکا. بۆ چی دەبێ دەستەوەستان بم، شەو بەردەوام ڕێگا دەپێوێ، کاتێک ببێتە سەحەر شتێکی سروشتییە کە هێزەکانی دوژمن پەلامارمان بدەن. ئەگەر وەک دۆست بچینە لای پاشا، هیچ هێزێک ناتوانێ پێش بە مردنمان بگرێ، تووشی توندترین و زۆرترین ئازار و بێحورمەتی دەبین. باشە بۆچی کارێک نەکەین بۆوەی دیفاع لە خۆمان بکەین و کەسیش نابینم بیر لە ڕێگا چارەیەک بکاتەوە و لێرە پاڵمان لێداوەتەوە، وەک ئەوەی هیچ گرفتێکمان نەبێ. منیش بە نۆرەی خۆم دەبێ چاوەڕوانیم لە فەرماندەی کامیەک لە شارەکان هەبێ بۆوەی ڕێگا چارەیەکمان بۆ بدۆزێتەوە. من پێویستە بە کام تەمەن بگەم و خۆ لەوەش گەورەتر نابم، ئەگەر بخوازم خۆم بەدەست دوژمنەوە بدەم.

دوای ئەو خەڵوەت و تێفکرینانە، گزنفۆن هەستا سەرپێ و چووە لای لۆکاژەکانی نیزامی سەر بە لەشکری پرۆکسینۆس. کاتێک هەموویان کۆبوونەوە، گزنفۆن دەستی بە ئاخاوتن کرد. " لۆکاژەکان! من ناتوانم لێرە دەستەوەستان بمێنمەوە، ئێوەش پێموایە هەر بەو شێوەیە. کاتێک وەزعی خۆمان ئاوا دەبینم، ناتوانم ئارام بگرم. وەک ئاشکرا و ڕوونە، دوژمنەکانمان دژی ئێمە شەڕیان ڕانەگەیاندووە، ئەوان گەرەکیانە خۆیان ئامادە بکەن. ئێمە

به پێچەوانەوە هیچ چەشنە ئامادەکارییەک ناکەین بۆوەی بە شێوەیەکی گونجاو وڵامی پەلاماری دوژمن بدەینەوە. ئەگەر پاشەکشە بکەین و بچینە ژێر سایەی دەسەڵاتی پاشا، بە بڕوای ئێوە چیمان بەسەر دێت! چۆن دەتوانین لەلای کەسێک ئاسوودە بین کە برای خۆی دوای ئەوەی کوشتی ئەوجار سەر و دەستی بڕی و پاشان لە سێدارەیدا. ئەویش برای دایک و بابی کە تازە کوژرابوو و جێگای مەترسی نەبوو.

هیچ بیرتان لەوە کردوەتەوە کە کەس نەماوە بمانپارێزێ. کاتێک ئێمە دژی پاشا شەڕمان کرد، بۆوە بوو کە لە دەسەڵاتی بخەین و بیکەینە کۆیلە. ئەگەر سەرکەوتباین، حەتمەن دەمانکوشت. ئێستا دەزانین کە دوای سەرنەکەوتنمان چیمان بەسەر دێ. ئایا پێتانوانییە پاشا ڕەنگە کەڵک لە هەر چەشنە کەرستەیەک وەرگرێ بۆوەی بە توندترین شێوە سزامان بدا و خەڵکی پێ چاوترسێن بکا؟ بۆوەی کەس نەوێرێ لە داهاتوودا دژی ئەو لەشکرکێشی بکا. ئێمە پێویستە تەواوی ئیمکاناتمان وەگەڕ خەین بۆوەی نەکەوینە ژێر دەسەڵاتی ئەو.

هەڵبەت من لە پاراستنی قەرار و پەیمانەکان لەو ماوەیەدا، بەردەوام بۆ خەڵکی خۆمان بەپەرۆش بوومە و ئێرەییم بە پاشا و جەماوەرەکەی بردوە. من وەختێک بەدرێژایی ڕێگا بینیم ئەوان چەندە خاوەن زەوی و زاری بە حاسڵات، ئازووقەی زۆر، خزمەتکار، مەڕ و ماڵات، خشڵ و جل و بەرگ و گەلێک شتی دیکەن، خێرا لەگەڵ بارودۆخی سەربازەکانی خۆمانم بەراورد کردن. بەو ئاکامە گەیشتم کە هێزەکانمان چەندە بێبەری لە گشت ئەو نیعمەتانەن. ئێمە هیچمان نەبوو و دەبوایە بە پارە پێداویستییەکانمان دابینبکەین. ئەویش تەنیا جەماوەرێکی کەم لە سەربازەکانی ئێمە نەختێک پارەیان هەبوو کە بەهیچ شێوەیەک کیفایەتی کڕینی ئازووقەی نەدەکرد، چونکە لە ڕێککەوتنەکەدا ناهەقی لە ئێمە کرابوو.

وەختێک ئەو بارودۆخەم لێکدایەوە، زیادتر لە ئێستا کە لە حاڵی شەڕداین نیگەرانی دایگرتم. لەکۆتاییدا دەبێ بڵێم ئەوان بەو حاڵەش قەرارەکانیان بەجێنەگەیاند و بۆیە سەردەمی هەڵسوکەوتی جوامێرانە کۆتایی هاتووە. ئێستا بەربەست و گرفت لەبەر دەم ئێمەدا نەماوە. ئازووقە وەک خەڵات لە

گۆڕەپانی نێوان دوو پاڵەوانی دژبەردا هەڵکەوتووە و هەرکام بەغیرەت و پیاوتر بێ دەتوانێ وەدەستی بێنێ.
خواکان شاهید و دادوەری ئەو کێبەرکێیەن و لەگەڵ ئێمەن، چونکە فارسەکان درۆزن و پەیمانشکێنن. بە پێچەوانەوە ئێمە هەرچەند ئەو کەرستانەی باسم لێوەکردن لەبەر دەستمان دابوون، داگیرماننەکردن. ئەوەش لەبەر حورمەتی ئەو سوێندانە بوو کە بۆ خواکانمان خواردبوو. کەوابوو دێمە سەر ئەو باوەڕە، ئێمە دەتوانین خەبات و تێکۆشانمان بە شێوەیەکی ئارام و بەگوڕتر لە هی لایەنی دژبەر بەرەو پێش بەرین. دیارە لەباری لەش و جسمییەوە زیادتر لە سەربازەکانی دوژمن بارهاتووین و دەتوانین باشتر بەرگەی سەرما و سۆڵ و گەرما و سەختی بگرین. بە هیممەتی خواکانمان باری ڕوحی و دەروونیشمان لە هی ئەوان باشترە. ئەوان کەسانێکن کە فرە هاسان بریندار دەبن و بە دەست ئێمە دەکوژرێن. تەنیا ئەوەندەمان بەسە کە خواکانمان یارمەتیمان بدەن بۆوەی سەرکەوتوو بین، وەک چۆن لە یەکەم جەنگدا بە هانامانەوە هاتن. ڕەنگە کەسانێکیتریش لە نێو ئێمەدا هەبن کە بەو شێوەیە بیر بکەنەوە.
بۆ خاتری خوا، با لەوە زیادتر چاوەڕوان نەبین کە کەسانێک بێن و ئێمەی خاوەن ئەو ڕەوشتە باشانەی پێشتر گوتم، بە لاڕێماندا بەرن. ئێمە پێویستە حەولبدەین خەڵک لەو بێ هێزی و دەستەوەستانییە ڕزگار بکەین. دەی بۆ پێشەوە! نیشان بدەن ئێوە باشتر لە لۆکاژ و ستراتێژەکانن و بۆوەی دەبن خاوەنی ئەو پلە نیزامییە بن.
سەبارەت بە خۆم ئێستا، ئەگەر ئێوە بخوازن فەرماندەری ئەو پەلامارە وەستۆ بگرن، من بە هەموو هێز و توانامەوە لە خزمەتتاندا هەم. ئەگەریش پێتانوایە لێوەشاوەیی فەرماندەری ئەو هێرشەم هەیە، هیچ دژایەتییەکم نییە. بەپێی تەمەنێکی هەمە پێموایە هێزی ئەوەم هەیە بەرگەی دژوارترین بارودۆخ بگرم ".
گزنفۆن بەو چەشنە ئاخاوت. لۆکاژەکان دوای بیستنی قسەکانی ناوبراو تێکڕا بڕیاریاندا فەرماندەریەکە بەو بسپێرن. تەنیا یەک نەفەر لەو نێوەدا بە

ناوی ئاپۆلۆنیدیس دژبەر بوو و بە زاراوەی ڤیۆتیکی وەجواب هات و گوتی:" گەلێک نادروستە ئەگەر کەسێک بخوازێ بە شێوەیەکیتر جیا لە مەرحەمەتی پاشا لەو بارودۆخەدا ڕزگارمان بکا ". ناوبراو بە دوای ئەو گوتەیەدا کۆمەڵێک گرفتی دەست نیشان کرد کە ڕەنگە داوێنگیری یۆنانییەکان بێت.

گزنفۆن خێرا قسەکەی پێبڕی و وڵامی داوە: " کاکی سەر لێشێواو! ئەوانەی دەیانبیسی لێیان تێناگەی و ئەوانەش کە گوێت لێبوون وەبیرت نایەنەوە. وەختێک پاشا دوای کوشتنی کوروش شانازی بە جینایەتەکەی کرد و ڕاسپاردەی ناردە لای ئێمە، ئێمە نەک چەکمان دانەنا بەڵکوو پەرداختر لە جاران چووین لە تەنیشت هێزەکانی ئەوان ئۆردومان لێدا، بۆچی هیچ نەقەوما، بە پێچەوانەوە پاشا خێرا وەفدی ناردە لامان و داوای ئاگربەسی کرد و تەواوێکی ئازووقە بۆ دابینکردین تا ئەو کاتەی پەیمانی ئاشتی مۆر کرا.

کاتێک ستراتێژ و لۆکاژەکانی ئێمە لە سەر باوەڕ بە سوێند و بەڵێنەکانیان وەک ئەوەی ئێستا تۆ گەرەکتە، هەستان و بێ چەک، بۆ وتووێژ چوونە خێمەکانی دوژمن، لە جێوە لێیاندرا، ئەشکەنجە کران و سەر بڕان، بەبێ ئەوەی تاقە وەسیلەیەکی بەرگری لە خۆیان پێبێ تا لانیکەم خۆیانی پێبکوژن و لەوە زیادتر ئازار نەچێژن. ڕەنگە ئەو دوژمنەی، ئەو ناجوامێرییەی دەرهەق بە هاڤاڵانی ئێمە کرد، بە باوەڕی تۆ ئیتر جینایەتکار و خوێنرێژ نەمابێ.

تۆ هەرچەند ئاگاداری تەواوی ئەو ڕووداوانە هەی، بەو حاڵەش ئەو کەسانەی پێشنیاری دیفاع لە خۆیان دەکەن بەلای تۆوە نەفامن و پێمان دەڵێی بچینە لای پاشا و لەبەری بپاڕێینەوە. پیاوەکان! من پێموایە لە هەر شوێنێک بین ئەو کابرایە نابێ لێمان نیزیک بکەوێتەوە و دەبێ وەک هێستر باری بکەین. ئەو کابرایە خۆی و وڵاتەکەی مایەی شەرمەزاری یۆنانن و ئەگەر خۆشی بە یۆنانی بزانێ، بەلای منەوە خائین و جاشە".

دوای ئەو قسانە ئەوجار ئاغاسیاسی ستیمفالی دەستی بە قسان کرد:" ئەو کابرایە، ئاپۆلۆنیدیس، هیچ فری بەسەر یۆنان و ڤیئۆتییاوە نییە. من کاتی

خۆی ئەوەم دیتبوو کە وەک خەڵکی لیدیا گوێیەکانی کونکردبوو".[٨٤] کابرا بەڕاستیش گوێیەکانی کون کردبوو. ئیتر ئەو شەوە کابرایان لە ئۆردوگا دەرکرد. بەشدار بووانی‌تریش گەڕانەوە بۆ لای گوڕدانەکانی خۆیان و لە هەر کوێ ستراتێژی لێبوو، داوایان لێکرد ئەرکی بەڕێوەبەری وەستۆ بگرێ و لەو شوێنانەش ستراتێژەکە کوژرابوو، کەسێکی‌تریان لە جێگای دانا. ئەو دەستانەی خاوەن لۆکاژ بوون، داوایان لێکرا ئەرکەکانیان بەڕێوە بەرن. کاتێک تەواوی جەماوەرەکە کۆبۆوە و لە ڕیزەکانی پێشەوەی ئۆردوگا دامەزران، ژمارەی ستراتێژ و لۆکاژەکان گەیشتە نیزیکەی سەد کەس. ئەو ئاڵوگۆڕانە لە وەختێکدا پێکهاتن کە نیوەشەو باڵی بەسەر وڵاتدا کێشابوو.

"یێرۆنیمۆس"ی خەڵکی ئیلیۆس، پیاوێکی بە ساڵدا چوو لەو کاتەدا هاتە نێو باسەکە: " هاوڕێیانی ستراتێژ و لۆکاژ! بە دیتنی ئەو بارودۆخە بڕیارماندا هەموو لایەک کۆ بینەوە و ئێوەشمان بۆیە بانگ کرد بەڵکوو پێکەوە بتوانین بڕیارێکی گشتی و جێگای ڕەزامەندی هەموو لایەک بۆ دەربازبوون لەو بارودۆخە بدەین". ناوبراو ڕوو لە گزنفۆن، داوای کرد تەواوی بیر و بۆچوونەکانی پێشتر باسی لێوە کردبوون بۆ ئەو خەڵکەی دووپات بکاتەوە.

بە دوای ئەو داوایەدا گزنفۆن گوتی: " ئەوەی ڕوون و ئاشکرایە و هەموومان دەیزانین، پاشا و تیسافێرن دوای گرتنی ژمارەیەک لە خەڵکەکەمان و کوشتنیان، ئێستا خەریکن نەخشەی فەوتاندنی ئێمەش دارێژن. بە بڕوای من ئێمە بە هەر ڕێگایەکی مومکیندا نابێ بکەوینە داوی ئەو بەربەرانە، بەڵکوو بە پێچەوانەوە دەبێ ئەوان بکەونە بەردەستی ئێمە.

ئەوەش باش بزانن، فرسەتێکی گەلێک باشە کە ئێوەی نیزامی لێرە کۆبوونەتەوە، نیشان بدەن کە بە کەڵکی لەشکر دێن. چونکە تەواوی سەربازەکانمان چاویان لە ئێوەی سەرکردەیە. ئەگەر ئێوە ناهومێد بن، ئەوانیش ورەیان لە دەست دەدەن. بە پێچەوانەوە ئەگەر ئێوە نیشان بدەن

---

٨٣- لیدی‌یەکان، زۆربەی بەربەرەکان گوارەیان لە گوێیان کردوە و ئەوەش لەگەڵ داب و نەریتی یونانییەکانی باستان نەگونجاوە و پێیانوابووە گوارە لە پیاو ناوەشێتەوە.

ئامادەی شەڕن و خەریکی پەلامار بۆ سەر دوژمنن و بۆ ئەو مەبەستە خەڵکانی‌تریش هاندەدەن، دڵنیا بن ئەوانیش چاو لە ئێوە دەکەن.

هەڵبەت ڕەنگە دروست نەبێ ئێوە زیادتر لە سەربازان کار بکەن چونکە ئێوە ئەفسەری نیزامین، بەڵام ئێستا لە بارودۆخی شەڕداین. هەروەخت شەڕ تەواو بوو و ئاشتی و هێمنی جێی‌گرتەوە، ئەوکات جێگای ئێوە لە باری پلە و پارەوە بەرزترە. لە بارودۆخی ئێستادا بە هۆی پەشێوی و ئاڵۆزی هەلومەرج، ئێوە دەبێ لە سەربازەکان ماندووتر بن، ئاگاتان لێیان بێ و ئەگەر پێویست بێت لە ڕیزەکانی پێشەوەی بەرەی شەڕدا بن. یەکەم خاڵی گرینگ کە دەبێ وەبەر چاوی بگرن، دیاریکردنی جێگری فەرماندەکانە، تا لە کاتی کوژرانی کەسێک لەوان، خێرا جێگرەکەی بتوانێ ئەرکی لۆکاڵ یا ستراتێژی بەڕێوەبەرێ. ئەوەش بڵێم کە هیچ کارێکی دروست و بەرهەق بەبێ فەرماندە بەڕێوە ناچێ.

ئەوەی دەیڵێم سەبارەت بە هەموو خوێنیشاندانێکی مرۆڤە، بەتایبەت لە کاتی شەڕدا. نەزم و نیزام نەجاتمان دەدا، بێ نەزمی و هەرج و مەرجیش گشتمان دەفەوتێنێ. هەر دوای دیاریکردنی فەرماندەکان، چەندی پێویستە، سەربازەکانی پەرش و بڵاو کۆکەنەوە و ورەیان پێببەخشن. بە باوەڕی من بەو کارە گرینگترین ئەرکتان بەجێ گەیاندوە، چونکە بێ‌شک ئێوەش وەک من هەستتان بە دابەزینی ورە و باری ڕوحی جەماوەرەکەمان کردوە، بەتایبەت ئەو کاتەی بە چەکەوە هاتنە لامان. ئەو سەربازانەی پەرش و بڵاون، من نازانم بۆ هەڵسووکەوتی شەو و ڕۆژیان دەبێ چبکەن. ئەگەر کەسێک بتوانێ فکر و خەیاڵیان بگۆڕێ و تەنیا بیر لە ڕەنج و کوێرەوەری ئێستایان بکەنەوە و ئەرکەکانی خۆیان بەجێ بگەیێنن، دڵنیام خێرا ڕوحییە و غیرەتی پێشوویان وەدەست دێننەوە. ئێوەش باش دەزانن لە شەڕدا نە هێز و نە ژمارە بۆ سەرباز هۆی سەرەکی سەرکەوتن نین، بەڵکوو ئیمان بە خوا و ڕوحییەی قەوی هانی‌دەدا پەلاماری دوژمن بدا و کەم وایە کەسێک بتوانێ لە بەرامبەریدا خۆڕاگرێ.

دۆستانم! من دیتوومە ئەو کەسانەی لە شەڕدا تەنیا بیریان لە ڕزگاری گیانی خۆیان کردوەتەوە، ئەغڵەب تووشی بێ غیرەتی هاتوون و کوژراون.

بەپێچەوانەوە ئەو کەسانەی باوەڕیان بە مەرگ وەک دیاردەیەکی سرووشتی هەبووە و لێی نەترساون و لە شەڕدا کوژرانیان بە شانازی زانیوە، کەمتر تووشی کوژران هاتوون و نەجاتییان بووە. بە باوەڕی من کەسانی ئەوتۆ تەمەنێکی زۆر تێپەڕ دەکەن و لە ژیاندا گەلێک بەختەوەرن. کەوابوو با ئێمەش بڕیار بدەین جوامێرانە بجەنگین و تا دەکرێ ڕوحییەی بەهێزمان هەبێ و پاشماوەی هێزەکانمان وەجموجۆڵ خەین ".

گزنفۆن دوای ئەو قسانە بێدەنگ بوو و ئەوجار، خیریسۆفۆس[٨٥] دەستی بە قسان کرد و گوتی:" گزنفۆن! من پێشتر تۆم نەدەناسی، تەنیا ئەوەندەم دەزانی کە خەڵکی ئاتێنی. ئەوەی ئەوشۆ تۆ کردت و گوتت جێگای شانازییە و دەخوازم هاوڕێیانی‌تریش وەک تۆ بجوڵێنەوە و ڕەوشتی تۆ ڕەچاو بکەن، چونکە ئەوە هەڵسووکەوتی سەردارێکی خێرخوازە.

ئێستاش هاوڕێیان با لەوە زیادتر وەدرەنگی نەکەوین، بڵاوەی بکەین و هەرکام لە دەستەکانی ئێوە بێ فەرماندە ماوەتەوە خێرا کەسێکی بۆ دیاری بکەن. دوای هەڵبژاردنی ئەو کەسە، وەرنە نێوەندی ئۆردوگا. دواتر دەبێ هێزەکانی‌تریش بانگهێشت بکەین و پەیکەکەشمان "تۆڵمیدیس" پێویستە لەلای ئێمە بێت".

دوای ئەو باس و گفتوگۆیانە، خیریسۆفۆس هەستا سەرپێ، چونکە فرسەتێکی زۆری بە دەستەوە نەبوو و دەبوایە خێرا بە کارەکانی ڕابگا.

سەرکردەکان بەو شێوەیە هەڵبژێردران، واتە لەجیات کلێئارخۆس، تیماسیۆنی داردانی و لە جێی سوقرات، کسانتیکلیسی ئاخایی و بە جێگای ئایا، کلێئانۆری[٨٦] ئارکادی و لەباتی مێنۆن، فیلیسیۆسی ئاخایی و لە شوێن پرۆکسینۆس، گزنفۆنی ئاتێنی دیاریکران.

---

٨٤- خیریسۆفۆس وەک سەرکردەی گشتی لەشکر دەست بە ئاخاوتن دەکا، چونکە ناوبراو لاکیدێمۆنی بووە و ئەو سەردەمە ئەوان حوکمرانی یونان و سپارتیان کردوە.

٨٥- کلێئانۆر، ستراتێژی ئارکادی بووە و لەلایەن سەربازەکانی ژێر فەرمانی ستراتێژ (ئایا)، وەک جێگری ئەو، واتە ئایا دیاری کراوە.

## بەشی ٢

## ئاخاوتنی خیریسۆفۆس و کلیئانۆر و گزنفۆن

خەریک بوو ببێتە بەرەبەیان کاتێک هەڵبژاردن کۆتایی پێهات و فەرماندەران هاتنە گۆڕەپانی نێوەندی ئۆردوگا و بڕیاریان‌دا کێشکچییەکان لە شوێنەکانی حاستەم دامەزرێنن و باقی سەربازان کۆکەنەوە. پاش ئەوەی سەربازەکانی‌تر کۆبوونەوە، لەپێشدا خیریسۆفۆسی لاکیدیمۆنی هەستا سەر پێ و دەستی بە ئاخاوتن کرد: " هاوڕێیان! بارودۆخی ئێستامان گەلێک دژوارە چونکە ستراتێژ و لۆکاژ و سەربازی بە وەجمان لە دەست چوون. هەروەها پیاوەکانی ئاریە کە پێشتر هاوپەیمانی ئێمە بوون، خەیانەتیان پێکردین. کەوابوو لە هەلومەرجێکی ئەوتۆدا با جوامێری خۆمان بنوێنین و نەترسین و حەول بدەین تا دەکرێ بەسەر دوژمندا سەرکەوین و ڕزگاریمان بێت. ئەگەر قەراریش بێ بمرین با سەربەرزانە سەربنێینەوە و بەدەستی دوژمنەکانمان بەدیل نەگیرێین ".

دوای خیریسۆفۆس ئەوجار کلیئانوری خەڵکی ئۆرخۆمێنۆ دەستی بە قسان کرد: " هەڤالان! جینایەت و بێ حورمەتی پاشاتان بینی، هەروەها دیتتان تیسافێرن چەندە ناڕاست و درۆزن دەرچوو. کاتێک بە ئێمەی دەگوت

وەک دراوسێی یۆنان و دۆستی وڵاتەکەمان زیادتر لە هەر کاتێکیتر حەولی ڕزگاری ئێمە دەدات و سوێندی خوارد کە عەهد و پەیمانەکان ڕەچاو بکا و دەستی دۆستایەتی لەنێو دەستی ئێمە نا، بۆتان دەرکەوت چ خەیانەتێکی پێکردین. ستراتێژەکانی ئێمەی گرت و تەنانەت حورمەتی خوای گەورە دیا، خوای دۆستایەتی و میوانداری شکاند. کاتێک لەگەڵ کلیئارخۆس لەسەر یەک سفرە نانی خوارد، بە هەمان فێڵبازی پێشووی خەیانەتی بە پیاوەکانی ئێمە کرد و کوشتنی. ئاریە، ئەو کەسەی ئێمە گەرەکمان بوو بیکەینە پاشا و پەیمانمان بەست کە خەیانەت بە یەکتری نەکەین، ئەویش بێ ترس لە خواکان و بەبێ دانانی حورمەتێک بۆ کوروشی کوژراو، واتە ئەو کەسەی هەتا ژیا ڕێزی تایبەتی بۆ ئەو هەبوو، ئێستا ئێمەی بەجێ هێشتووە و چووەتە لای پیسترین دوژمنانی کوروش و بە هەموو شێوەیەک حەولی قڕکردنی ئێمەی دۆستانی کوروش دەدا. ئەوانە دەبێ ڕۆژی خۆی لە حزووری خواکاندا ڕوڕەش بکرێن. ئێمە دوای دیتنی هەمووی ئەو بەسەرهاتانە، نابێ ڕێگا بدەین جارێکیتر خەیانەتمان پێبکرێ و تا بۆمان دەکرێ بە باشترین شێوە بجەنگین و لەبیرمان نەچێ کە خواکانمان بڕیاردەرن ".

لە درێژەدا گزنفۆن جوانترین جلوبەرگی نیزامی لەبەر خۆی کرد[٨٧]، وەک ئەوەی ئامادەی شەڕ بێ، ئەوجار هەستا سەر پێ و بەو باوەڕەی ئەگەر خواکان یارمەتی سەرکەوتنی هێزەکانی سەربازی یۆنانی بدەن ئەویش ئەو جلوبەرگەی لێ حەڵاڵە و بەلایەوە پیرۆزترین بەرگ و پۆشاکە و ئەگەریش قەرارە بمرێ واباشترە پۆشتە و پەرداخ و بە ڕازاوەترین لیباسەوە ئەمری خواکان بەجێبگەیێنێ.

ناوبراو دەستی بە قسە کرد و گوتی: "سەبارەت بە بێ باوەڕی و جینایەتی بەربەرەکان، هاوڕێمان کلیئانور بە تێر و تەسەلی دوا و ئێوە لەو بارەوە زانیاری پێویستتان هەیە. ئەگەر قەرار بێ جارێکیتریش ناچار بە دۆستایەتی بەربەرەکان بین، ڕەنگە دووبارە ورە و غیرەتمان لەدەست بدەین

---

٨٦- گزنفۆن جلوبەرگی ڕۆشن لەبەرخۆی دەکات و لەو باوەڕەدایە ئەو شێوە لیباسە دەبێتە هۆی چوونەسەری قەدر و حورمەتی ئاخاوتنەکانی.

و پێویستە وەبیری چارەنووسی ناخۆشی سەرکردەکانمان بکەوینەوە کە چیان بەسەر هات و تووشی چ ئەشکەنجە و ئازارێک هاتن، تەنیا لەبەر ئەوەی گیانی خۆیان خستە بەردەستی ئەو بەربەرانە و باوەڕیان بە سوێند و بەڵێنەکانی ئەوان کرد.

ئەگەر قەرار بێ لە تۆڵەی ئەو چارەڕەشییانەی تا ئێستا بەسەرمان هاتوون ئەوان بە زەبری چەک سزا بدەین و لە داهاتووشدا جوامێرانە دژیان بجەنگین، ئەو کاتە هومێدی بنەڕەتی و زۆرمان دەبێ بۆوەی بە هیممەتی خواکانمان لەو وەزعە ڕزگاریمان بێت ".

کاتێک گزنفۆن قسەی دەکرد، یەکێک لە بەشدارانی کۆبوونەوەکە پشمی. فەرماندەکان بە پشمینی کابرا ڕاچڵەکین. گشتیان بە یەکەوە سەری کڕنۆشیان لە بەرامبەر خوادا دانەواند و گزنفۆن لەو پێوەندییەدا گوتی:" پیاوەکان! پێموایە خێری لێدەکەوێتەوە چونکە ئێستا کە ئێمە باس لە ڕزگاری خۆمان دەکەین، ئەو پشمینە وەک دوعای خێر لەلایەن خواوەند دیاوە بوو. دەبێ بۆ پیرۆز کردنی سەرکەوتنمان بە پێی توانا قوربانی پێشکەشی بارەگای خواکان بکەین. هەر کەس لە ئێوە لەگەڵ بۆچوونەکانی تا ئێستای منە تکایە دەستی بەرز بکاتەوە ".

تەواوی بەشداران تێکڕا دەستیان هەڵێنا. پاشان پاڕانەوە لە خواکان دەستی پێکرد و سروودی ئایینی لەلایەن گشت بەشدارانەوە خوێندرایەوە. دوای ئەو ڕێوڕەسمە و بەجێگەیاندنی ئەرکی ئایینی، گزنفۆن دووبارە دەستی بە قسە کردەوە و گوتی:" جەنگاوەران! ئەوەم دەگوت کە هومێدێکی فرە بە ڕزگاریمان لە گۆڕێدا. چونکە لە پێش هەر شتێکدا ئێمە لە بەردەم خواکاندا سوێند دەخۆین و قەتیش بەڵێنەکانمان لە ژێر پێ نانێین. بەپێچەوانەوە دوژمنەکانمان سەرەڕای پاشگەز بوونەوە لە سوێندەکانیان، پەیمانەکانیشیان شکاند و هەرچی بەڵێنی دابوویان، فەرامۆشیان کرد. کاتێک ڕەوتەکە بەو شێوەیەیە، گەلێک سرووشتییە کە خواکان شێوازی سزادان لە هەمبەر دوژمندا بگرنە بەر و بە بەزەییەوە لەگەڵ مرۆڤ دۆستان بجوڵێنەوە و یارمەتیمان بدەن.

خواکان خاوەن هێزن و ئەگەر بخوازن خێرا دەتوانن دەسەڵاتداران بێ حوکم بکەن و هەژارانیش هەر چەند تووشی ئازارێکی زۆر هاتبن، بە هاسانی نەجات بدەن. جیا لەوانەی گوتم، پێویستە وەبیر ئێوەی بێنمەوە کە باب و باپیرانی ئێمە کاتی خۆی چەندە کوێرەوەری و چەرمەسەریان دیتووە. ئەوەش بزانن کە ئێوە جوامێر و بە غیرەتن و مرۆڤی خاوەن ئەو چەشنە سیفەتە بە یارمەتی خواکان هەمیشە ڕزگاریان دێت و مەترسیدارترین بارودۆخ دەرباز دەکەن.

کاتێک فارسەکان لەگەڵ خەڵکانی بەربەریتر بە لەشکرێکی تەیار و بە هێزی دەریاییەوە پەلاماری یۆنانیاندا بۆوەی شاری ئاتێن وێرانبکەن، ئاتێنییەکان تەنیا خاوەن چەکی غیرەت بوون. توانیان بە بەربەرەکانییەکی جوامێرانە لە بەرامبەر دەوڵەتێکدا ڕاوەستن. ئاتێنییەکان لە بارەگای خواوەند ئارتێمیسدا سوێندیان خوارد بە قەیاسی ژمارەی کوژراوانی دوژمن، بزن قوربانی بکەن. چوون ئەو کاتە ئەوەندە بزنەیان نەبوو، بڕیاریاندا هەر ساڵە پێنج سەد سەر بزن سەر ببڕن و بیانکەنە قوربانی. ئەو ڕەسمە تا ئێمڕۆش بەردەوامە.[88]

کاتێک ئەردەشیر پاشا لەشکری گەورەی خۆی دژی یۆنان کۆکردەوە، ئەو وەختیش باب و باپیرانی ئێمە فارسەکانیان لە دەریا و ویشکایی شکستدا. ئاکامی ئەو شکستەش بە وەدەست هێنانی غەنیمەتەکانەوە دیارە. بەڵام بە نرخترین بەڵگە بۆ سەلماندنی سەرکەوتنەکان، ئازادی شارەکانمانە کە ئێوە لێیان لە دایک بوون و تێیاندا گەورە بوون. ئێستاشی لەگەڵ بێ، ئێوە سەری کڕنۆش بۆ هیچ کەس دانانەوێنن و وەک ئاغای خۆتانی قبوڵ ناکەن و تەنیا خواکانتان بەلاوە قبوڵە. ئێوە لە ڕەگەزێکی ئەوتۆ وەپاش کەوتوون. ناخوازم بڵێم ئەو جیلە شەرمەزار دەکەن بەڵکوو بە پێچەوانەوە سەربەرزیان ڕادەگرن.

---

٨٧- گزنفۆن باسی شەڕی ماراتۆن لە ساڵی ٤٩٠ی پێش زاییندا دەکا. لەو شەڕەدا یونانییەکان لەشکری گەورەی بەربەرەکان شکست دەدەن و تەواوی وڵاتەکەیان لەژێر نیری یەخسیری دەردێنن و ئەو تابۆیە دەشکێنن کە لەشکری فارس لەشکان نەهاتووە.

چەند ڕۆژ لەوە پێش هەڵسوکەوتی نەوەی فارسەکانتان بینی و بە یارمەتی خواکان سەرەڕای کەمی ژمارەی جەنگاوەرانمان توانیتان بە سەریاندا زاڵبن. ئەوکات ئێوە جوامێرانە بۆ پاشایەتی کوروش تێکۆشان، ئێستا دەبێ بۆ ڕزگاری خۆتان حەول بدەن. پێویستە بە غیرەت و مەرد و ڕەندتر لە پێشوو بن. ئێستا دەبێ بەرگری و لەخۆبوردوویی پتر لە بەرامبەر دوژمندا بنوێنن. ئەوکات هەرچەند ئەزموونێکی زۆرتان نەبوو، ناچار بوون بەربەرەکانی لەگەڵ لەشکرێکی ئێجگار گەورەدا بکەن، توانیتان بوێرانە و هێمنانە و بە ڕوحێکی ئارامەوە لە هەمبەر دوژمندا بوێستن. ئێستا هێزەکانی دوژمن سەرەڕای ژمارەی زۆریان ناتوانن لەگەڵ ئێوە بجەنگن و تەجرەبەی جەنگاوەریتان ئەوەی دەرخستووە. کەوابوو بۆچی دەبێ لێیان بترسین؟

ئەوەش وەک خاڵێکی لاواز وەرمەگرن کە هێزەکانی بەربەری پێشوو کاتی خۆی لەگەڵ کوروش بوون و ئێستا ڕەگەڵ بەرەی دوژمن کەوتوون. ئەوانە لە ڕاستیدا ترسەنۆکتر لەو لەشکرەن کە ئێمە پێشتر شکستمان پێدان، ئەوانە پتر دیل و یەخسیرن و لە ترسان ئێمەیان جێهێشتووە و ڕوویان لەلای ئەوان کردوە. بە باوەڕی من باشتر وایە ئەوانەی تەنیا کاریان دۆزینەوەی ڕێگای هەڵاتنە و ترسەنۆکن، باشترە ڕەگەڵ ئەوان بکەون و لە نێو ڕیزکانی ئەواندا بن.

ئەگەر کەسێک لە ئێوە نیگەرانە کە هێزی سوارەمان نییە و دوژمن لەو بارەوە تەیارە، دەبێ بڵێم کە دە هەزار سوارە بە مانای دە هەزار نیزامی نییە. چونکە هەتا ئێستا هیچکەس بە قەپاڵ لێدان و گەزین و لووشک و لەقە هاویشتنی ئەسپ لە شەڕدا نەکوژراوە. کەوابوو ئەسپەکان شەڕ ناکەن بەڵکوو سوارکارەکانن دەبێ لە جەنگدا غیرەت و جوامێری لە خۆیان نیشان بدەن. ئێمە لە شەڕی سەر عەرزدا ڕاستە ئەمنییەتمان لە سوارکار کەمترە بەڵام ئەوان زێدەتر لە ئێمە دەترسن چونکە جیا لە ترسی ئێمە نیگەرانی کەوتنیشن.

بە پێچەوانەوە ئێمە قورس و قایم پێمان بە عەرزەوەیە، دەتوانین بەهێزتر و هاسانتر لە شەڕکەری دوژمن بدەین، کاتێک لێمان نیزیک دەبێتەوە. تەنیا لە یەک جێگادا سوارکارەکان لە ئێمە زیرەکتر دەبن، ئەویش کاتی شکست خواردن دەتوانن خێراتر و ئەمنتر ڕابکەن. ئەگەر ئێوە بە جەرگ بن و ورە

بەر نەدەن، چاوەڕوانی ئەوە ناکەین جارێکیتر تیسافێرن چاوساغی ئێمە بێ یا پاشا ئازووقەمان بۆ دابین بکا.

دەزانین و دیتمان تیسافێرن چی بەسەر هێناین. ئێستا بیر لەو دوو خاڵە بکەنەوە، ئەگەر کەسانێک وەک چاوساغ بۆ خۆمان هەڵبژێرین و بخوازن فریومان بدەن و سزای ئەشکەنجە و مەرگیان بۆ دیاری بکەین باشترە یا فریوی بەڵێنەکانی تیسافێرن بخۆین؟ سەبارەت بە ئازووقەش، ئایا بۆ بژیوی خۆمان ناچار بین بە پارەیەکی زۆر بیکڕین، ئەویش لە دوژمنێک کە ئازووقەیەکی کەم بە پارەیەکی زۆرمان دەداتێ و هەرچەند پارە و مواجبێک و قەرارێکیش وەک پێشوو لە گۆڕێدا نەماوە، یا باشترە بەسەر دوژمندا زاڵ بین و هەر کەس لە ئێوە ئەوەندەی دڵی دەخوازێ ئازووقەی هەبێ؟ هەڵبژێرن کامیان باشترە!

ئایا لەگەڵ بۆچوونەکانی من هەن یا ئێستاش پێتانوایە ڕووبارەکان بۆ پەڕینەوە نابن و ئەگەریش پێشتر خۆمان لێداوە مایەی نەفامیمان بووە. پێویستە دڵنیاتان بکەم کاتێک هێزەکانی بەربەر پەڕینەوە زیادتر لە ئێوە تووشی سەرلێ شێواوی هاتن. من دەڵێم ئەگەر پەڕینەوە لە چۆم و دوور لە سەرچاوەکەی سەختە، دەتوانین ئەوەندەی پێدا هەڵگەڕێین تا دەگاتە بوارێک کە ئاو ئەژنۆمان تەڕ نەکات.

با ئاوای دابنێین کە ناتوانین لە چۆمەکان بپەڕینەوە. هیچ کەسیش نابێتە چاو ساغمان بۆوەی بمانباتەوە وڵاتی خۆمان، دەبێ بڵێم ئەوکاتیش بۆمان نییە ناڕاحەت بین و هومێد لەدەست بدەین. چونکە باش دەزانین دانیشتووانی میسیا کە ئیمکانی نییە لە ئێمە بە غیرەت و بە جەرگتر بن، لە نێو وڵاتێکدا بەبێ خواستی پاشا دەژین و لە گەلێک شار و دێهاتی دەوڵەمەندی ژێر حوکمی ئەودا نیشتەجێن. ئەو وەزعە خەڵکی پیسیدییش دەگرێتەوە.

ئەوەندەی دەگەڕێتەوە سەر لیکائۆنییەکان، ئەوانیش چی زەوی و زاری بە حاسڵاتی ژێر دەسەڵاتی پاشایە داگیریان کردوە و دەیچێنن و ناوچە حاستەم و ئەمنەکانی دەشتاییشیان خستووەتە ژێر دەستی خۆیان. بۆیە واباشترە ئێمەش بە بەربەرەکان ئاوا نیشان نەدەین کە هەست بکەن خەریکی گەڕانەوە

بۆ ولاتی خۆمانین و پاشەکشەیەکمان کردوە. دەبێ کارێکی ئەوتۆ بکەین کە ئەوان پێیانوابێ ئیمە خەریکی دامەزراندنی هەمیشەیی خۆمان لێرەین. چونکە من ئاگادارم پاشا بۆ گرفتی میسیایەکانیش حازر بوو چاوساغیان وەپێشخا و گەلێکیش لە یەخسیرەکان ئەوانی ئازاد کرد و مەبەستی لەداو خستنی ئەوانیشی گەرەک نەبوو و تەنیا دەیویست ولاتەکە بەجێهێڵن. پاشا تەنانەت حازر بوو ڕێگا و پردیشیان بۆ دروست بکا تا فایتوونەکانیان بتوانن دەرباز بن. من دەزانم ئەو گەڕانەوەی ئێمەی لە خوای دەوێ و ڕەنگە ئەو کارەش بۆ ئێمە بکا ئەگەر لێی مسۆگەر بێ کە ئێمە مەبەستمانە لێرە نیشتەجێ بین.

من لەوە دەترسم خوو بە خواردن بگرین بەبێ ئەوەی کارێک بکەین، ژیانێکی پڕ لە عەیش و نۆش تێپەڕبکەین و لەگەڵ ژنان و کچانی جوانی میدیایی و فارسەکان خەریکی ڕابواردن بین و ڕێگای گەڕانەوە بۆ ولاتمان لەبیر بچێتەوە. بە باوەڕی من ئەوە ڕاستە کە سەرەتا دەبێ بگەڕێینەوە یۆنان بۆ لای کەسوکارمان و پێیان بسەلمێنین کە ئەوان فەقیر دەژین و دەخوازن فەقیریش بمێننەوە، بۆیە هاولاتیانی خۆیان دەنێرنە ئێرە تا لە سەختی و هەژاری ئەوێ ڕزگاریان بێت و لێرە بە سەروەت و سامانێک بگەن. پیاوەکان! پێویستە ئەوەتان لەبەر چاو بێ کە ساماندار بوون بۆ قارەمانانی شەڕ دەبێ نەک شکستخواردووان. دەبێ ئێمە حەول بدەین ڕێگای ئەمن و دوور لە مەترسی بدۆزینەوە و ئەگەریش پێویست بێ، ئەوە ناچارین بە باشترین شێوە بەرگری لە خۆمان بکەین ".

گزنفۆن لە درێژەی قسەکانیدا هەروەها گوتی: " سەرەتا، دەبێ فایتوونەکانی جەنگی بسووتێنین تا بتوانین هەر شوێنێک گەرەکمان بێ رووی تێبکەین و گرفتی ڕێگا دەربازبوونمان نەبێ. هەروەها ناچارین چادرەکانیشمان بسووتێنین چونکە لە گواستنەوەدا سەر ئێشەمان بۆ دروست دەکەن و لە کاتی جەنگدا تەنانەت بە کەڵکی حەمبار کردنی خواردەمەنی و ئەرزاقیش نایەن. هەروەها دەبێ کەرستەکانمان بپشکنین و چی بە پێویستی نازانین، کۆیان بکەینەوە و بیانفەوتێنین. تەنیا ئەو کەرستانە لەگەڵ خۆمان بەرین کە لە شەڕ و کاتی خواردندا پێویستە. تا دەکرێ جەماوەری چەکدار

زۆر کەین و ژمارەی ئەندامانی بەشی تەداروکات بۆ ڕاگواستنی کەلوپەل کەم کەینەوە. لە بیرتان نەچێت سامانی دۆڕاوی جەنگ هەمیشە غەنیمی براوەی شەڕن. ئەگەر ئێمە سەرکەوین ماڵ و ئەسپابی دوژمن دەبێتە هی ئێمە و دەتوانین وەک غەنیمەت کەڵکیان لێوەرگرین.

هەروەها پێویستە باسی گرفتێکی دیکە بکەم و بە لامەوە گرینگە، ئێوە باش دەزانن کە دوژمنانمان تا ئەو کاتەی سەرکردەکانی ئێمەیان نەگرت لە خۆیان ڕانەدی لەگەڵمان شەڕ رابگەیێنن، چونکە لەو باوەڕەدا بوون تا زەمانێک سەرکردەکان بژین نەزم و نیزامێک لە گۆڕێدا هەیە و ئێمە فەرمانەکانیان جێبەجێ‌دەکەین و دوژمن دەبەزێنین. بەڵام بە گیرانیان تووشی قەیرانی بێ فەرماندەری دەبین و دەفەوتێین. بۆیە فەرماندەکانی نوێی ئێمە پێویستە زیادتر لە سەرکردەکانی پێشوو وشیار بن و وریاتر لە جاران هەستیار بوونی بارودۆخەکە لەبەرچاوبگرن. سەربازەکانیشمان گەرەکە فرەتر گوێ لە فەرمانی سەرکردەکان بگرن. ئەگەر کەسێک نافەرمانی بکا، دەبێ بە دەنگ وەرگرتن بڕیار بدەین و سزای بۆ دیاری بکەین و ئەگەر تاوانباریش فەرماندەکە خۆی بێ، ئەوە هەر بەو چەشنە لەگەڵیدا بجوڵێینەوە.

ئەگەر ئەو ڕەوشە ڕەچاو بکەین دوژمنانمان بە تەواوی لە بۆچوون و نەخشەکانیاندا بە هەڵە دەچن. چونکە دەبینن ئیمڕۆ ڕێژەیەکی بەرچاو کلیئارخۆس دێنە مەیدان و بە هیچ کەس ئیزن نادەن لەوە زیادتر جینایەت بخوڵقێنن. ئێستا کاتی ئەوە هاتووە قسەکانمان عەمەلی بکەین لەبەر ئەوەی هەرکات و ساتێک ڕەنگە هێزەکانی دوژمن وەدیار کەون. ئەگەر کەسێک لە ئێوە قسەکانی منی بەلاوە دروستە، خێرا دەستبەکار بێ و ئەرکی پێسپێردراوی جێبەجێ‌بکا. هەڵبەت ئەگەر کەسێکیش بۆچوونی باشتر لە فکرەکانی منی هەیە، دەتوانێ بەڕاشکاوی و بە زمانێکی سادە بیڵێ، تەنانەت ئەگەر سەربازێکی بێ پلە و نیشانیش بێ، چونکە گشتمان پێویستیمان بە ڕزگاری هەیە ".

دوای گزنفۆن، خیریسۆفۆسی لاکیدێمۆنی دەستی بە قسان کرد و گوتی: " ئەگەر پێویست بێ کەسێک شتێک بە وتەکانی گزنفۆنەوە زیاد بکا، دواتریش

دەتوانێ و فرسەتمان دەبێ. ئێستا هەر کەسێک لەگەڵ ئەو ڕاوبۆچوونانەیە، تکایە دەستی بەرز کاتەوە ". جەماوەرە بە گشتی دەستیان هەڵێنا.

دوای ئەو، گزنفۆن دووبارە هەستا سەر پێ و گوتی: " پیاوەکان! ئێستا گوێ لە چەند بۆچوونی‌تر ڕابگرن. ئێمە دەبێ بە ناوچەی ئەوتودا تێپەڕین کە ئازووقەی لێوەگیر کەوێ. زانیاریم هەیە کە لە مەودای کەمتر لە بیست ستادیۆ، دێهاتی گەورە و دەوڵەمەند هەن. نابێ بە لامانەوە سەیر بێ کە دوژمنانمان دوای جێگۆڕکێمان هەنگاو بە هەنگاو وەدوامان کەون و وەک سەگی ترسەنۆک هەرچی وەگیریان کەوێ ڕاوی کەن و قەپاڵی لێبگرن و هەرکە دارت لێ هەڵێنان و هەستیان بە مەترسی کرد، تێی‌قووچێنن.

ڕەنگە زیادتر بە قازانجمان بێ کە سەربازەکانمان بە شێوەی چوارخان دامەزرێنین و نێوەندەکەی دەتوانێ لە دەستەکانی تەداروکاتی و خەڵکی بێ چەک پێکبێ. ئەگەر لە ئێستاوە ستوونەکانی پاش و پێشەوە دامەزرێن و فەرماندەکانیان دیاری بکرێن، ئیتر پێویست ناکات بەردەوام خەریکی فەرمان و دەستوردان بن و سەربازەکان خۆیان دەزانن چبکەن. ئێستا ئەگەر کەسێک بۆچوونێکی لەو بارەوە هەیە تکایە خێرا بەیانی بکا بۆوەی بە ئەنجامێک بگەین. ئەگەر هیچ پێشنیارێکی دیکە لەگۆڕێدا نییە، بەمەسڵەحەتی دەزانم وەک سەرکردەی ستوونی پێشەوە، خیریسۆفۆسی لاکیدێمۆنی دیاری‌بکرێت و بۆ ئیدارەی ستوونەکانی تەنیشتەوە لە فەرماندەکانی پێشوو کەڵک وەرگرین. هەروەها پێویستە ئیدارەی ستوونی پشتەوە بۆ کاتی ئێستا بە دوو کەس لە فەرماندەکانی نوێ واتە خۆم گزنفۆن و تیماسیۆن بسپێردرێ.

لەمەو بەدوا دەبێ ئەو شێوە ئیدارییە بەڕێوە بچێ. هەر جارێ دیتمان پێویستی بە ئاڵوگۆڕێکی باشتر هەیە، بڕیاری بۆ وەردەگرین و جێبەجێی‌دەکەین. ئەگەر کەسێک بۆچونێکی بەجێتری هەیە، دەتوانێ باسی بکا. ئەگەریش کەس ناخوازێ بە دژایەتی قسەکانی من بدوێ، ئەوا دەست بەرزکەنەوە و بڕیاری ئەرێنی لەسەر بدەن ". جەماوەر بەپانەوە دەستیان بەرز کردەوە و بەو چەشنە بڕیار لەسەر ئەو شێوە ئیدارییەش درا.

گزنفۆن ئەوجار داوای کرد کە دەبێ وەخۆکەوین و ئەو بڕیارانەی دەنگمان بۆ وەرگرتوون، بە ئەنجامیان بگەیێنین. هەر کام لە ئێوە کاتێک دەچنەوە لای هێزەکانتان، پێویستە تێیان‌بگەیێنن کە هیچ ڕێگا چارەیەک جیا لە سەرکەوتن لە گۆڕێدا نەماوە و دەبێ ئەوپەڕی فیداکاری و جوامێری خۆتان بنوێنن بۆوەی ڕزگاری مسۆگەر کەین. هەر کەس بخوازێ بژی دەبێ حەولیشی بۆ بدا. چونکە تایبەتمەندی براوەی شەڕ مانای کوشتنی دوژمنە و تایبەتمەندی دۆڕاویش مەرگە. ئەگەر کەسێک گەرەکی بێ ساماندار و دەوڵەمەند بێ، لێیگەڕێن ببێتە ئاغای ویستەکانی خۆی. ئەوەشمان لێ‌ڕوونە کە پارە و دارایی براوەی شەڕ مسۆگەر و پارێزراوە، بەڵام سامان و سەروەتی دۆڕاو دەبێتە غەنیمەت.

## بەشی ٣

### ئامادەکاری بۆ ڕێگا - هاتنی میتریداتیس - شک و گومانی یۆنانییەکان لە میتریداتیس- ئەگەری پەلاماری میتریداتیس بۆسەر لەشکر - ناهومێدی سەربازان - پێکهێنانی دەستەی قۆچەقانیهاوێژ

دوای ئاخاوتن گشتیان هەستان و بەرەو شوێنی کارەکانیان ڕۆیشتن. خێمە و عارەبانە و فایتوونەکانیان ئاگر تێبەردا و ئەسپابی بەکەڵکیش ئەوەندەی زیادی بوو و دەستەکانیتر پێویستیان بوو، بەسەریاندا دابەشکرا. دوای ئەوەی لەو کارە بوونەوە، تێکڕا ژەمی شەویان کرد. کاتی خواردن، میتریداتیس بە نیزیکەی سی سوارکارەوە هاتە لایان و داوای کرد ستراتێژەکان بێنە پێشەوە و گوێ لە قسەکانی ئەو ڕاگرن. ناوبراو گوتی: " یۆنانییەکان! وەک دەزانن من دۆستێکی باوەڕ پێکراوی کوروش بووم، بۆیە دۆستانە لەگەڵ ئێوە دەجوڵێمەوە. ئێستا لێرە ڕاوەستاوم، زۆر نیگەرانم ئێوە بە چاوی شک و گومانەوە بڕواننە دۆستایەتی پێشووم لەگەڵ کوروش. ئەگەر بمزانیبایە بڕیارێکی لێبراوەنەتان سەبارەت بە ڕزگاری خۆتان داوە،

منیش بە تەواوی هێزەکانمەوە یارمەتیم دەدان. من دۆستی ئێوەم و خۆشم دەوێن و دەخوازم دۆستایەتیتان بکەم، تکایە پێم بڵێن گەرەکتانە چبکەن؟ ".

ستراتیژەکان دوای ڕاوێژ کردن پێکەوە، بڕیاریاندا بەو شێوەیە وڵامی میتریداتیس بدەنەوە. لەلایەن یۆنانییەکانەوە خیریسۆفۆس گوتی: " بڕیارمان داوە ئەگەر ڕێگامان بدەن دەگەڕێینەوە وڵاتی خۆمان. بەو مەملەکەتەدا بە چەشنێک دەرباز دەبین کە کەمترین زەرەری ویکەوێ. بەڵام ئەگەر پێشمانپێبگرن، ئەو کات بە هەموو هێزمانەوە لەو کەسانە دەدەین کە ڕێگربن".

دوای ئەو وڵامە میتریداتیس حەولیدا ڕازییان بکا کە بەبێ یارمەتی و ئیزنی پاشا ئیمکانی دەربازبوون لە گۆڕێدا نییە. ئا لێرەدا دەرکەوت کە میتریداتیس وەک سیخوڕ هاتووەتە لایان. چونکە جیا لە جەماوەری خۆی یەکێک لە پیاوانی نیزیکی تیسافێرنی لەگەڵدا بوو. ئەو کەسە بۆیە ڕەگەڵ کەوتبوو تا بزانێ میتریداتیس ئەرکی پێئەسپێردراوی بەباشی جێبەجێدەکا یاننا. دوای ئەو باسە ستراتیژەکان بڕیاریاندا ئەوەندەی لە خاکی دوژمندا بن، لەگەڵ دژبەرانیان شەڕ بکەن و گوێ نەدەنە ئەو شێوە داخوازییانە. هەڵبەت ڕاسپاردەکانی تیسافێرن هێزی سەربازیان بۆ دابەزاندنی ورەی یۆنانییەکان نیزیک کردبۆوە و ئۆردویان لێدابوو. هەر ئەو شەوە لۆکاژێکیان بەناوی نیکارخۆس، خەڵکی ئارکادی هەڵفریواندبوو و ناوبراو بە بیست سەربازەوە چووبووە لای هێزەکانی دوژمن.

لە درێژەدا، دوای خواردنی ژەمی شەو لە چۆمی زاپاتا (زاب) پەڕینەوە و خەڵکی بێ چەک وماڵاتی باربەریان لە نێوەڕاستی خۆیاندا جێکردبۆوە. ئەوەندە دوور نەکەوتبوونەوە کە دیسان میتریداتیس لەگەڵ دوو سەد سوار و چوار سەد کەماندار و قۆچەقانی هاوێژ و چەکداری سووک بە ئەسپایی هاتنە سەریان. زۆر بە هێمنی و پێبەپێی یۆنانییەکان وەک دۆستی ئەوان هەنگاویان دەنایەوە. کاتێک گەیشتنە نیزیکی یۆنانییەکان بێ هیچ ڕاگەیاندنێکی پێشوو تەواوی کەماندار و قۆچەقانی هاوێژ و سووکە چەکدارەکان دەستیان بە هاویشتنی تیر و بەردەکانیان دژی یۆنانییەکان کرد. هێزی پاشەوەی یۆنانییەکان هێندێک برینداریان لێکەوتەوە و نەیاندەتوانی وڵامی ئەو پەلامارەی فارسەکان بدەنەوە، چونکە کریتیەکان هەرچەند تیری

دەیانهاویشت نەدەگەیشتنە هێزەکانی فارس. لەلایەکیترەوە چوون چەکداری سووکیش بوون دەبوایە بە پارێزەوە و لە چوارچێوەی چوارخانی لەشکریدا بەرگری لە خۆیان بکەن. نێزەدارەکانیش لە مەودایەکی زۆر کەمتر لەوەی پێویست بوو نێزەکانیان دەهاویشتە لەشکری فارس.

دوای ئەو ڕووداوە گزنفۆن بڕیاریدا فارسەکان ڕاوبنێ. لەو ڕاونانەدا نەیانتوانی هیچ کەس لە فارسەکان بگرن، چونکە بە سواری ئەسپی خێرا ڕایاندەکرد و خۆیان بە دەستەوە نەدەدا. هێزە یۆنانییەکانیش پیادە بوون و نەیاندەگەیشتنێ و لەلایەکیتریشەوە گەرەکیان نەبوو لە لەشکری خۆیان دوور کەونەوە.

دیارە سوارەکانی بەرىەر کاتێک لە هێزە یۆنانییەکان دوور دەکەوتنەوە، لەسەر ئەسپەکانیانڕا وەردەسوڕانەوە و دژی یۆنانییەکان تیریان دەهاویشت و بەو شێوەیەش ژمارەیەکیان بریندار کرد. یۆنانییەکان ناچار بوون هەم هێزەکانی دوژمن ڕاوبنێن و هەم کاتی گەڕانەوە بۆ لای لەشکر شەڕ بکەن. لە بارودۆخێکی ئەوتۆدا نەیاندەتوانی پتر لە بیست و پێنج ستادیۆ ڕێگا بپێون. کاتێک شەویان بەسەر داهات، تازە گەیشتبوونە گوندێک. لەبەر ئەو هەلومەرجەی بە درێژایی ڕۆژ تووشی هاتبوون، ماتەمین تەواوی ئۆردوگای داگرتبوو. خیریسۆفۆس و چەند ستراتێژی بەتەمەن، گزنفۆنیان دایە بەر ڕەخنە و گازندە، چونکە ناوبراو دوژمنی ڕاونابوو و لە لەشکر دوور کەوتبۆوە و سەرەڕای خۆ لە مەترسی هاویشتن نەیتوانیبوو کەس لە هێزەکانی دوژمن بکوژێ. کاتێک گزنفۆن گوێی لەو گلەییانە بوو قبوڵی کرد کە بەجێن، چونکە ئاکامی ڕاونانەکە و نەبوونی دەستکەوتێک ڕاستی قسە و ڕەخنەکانی دەردەخست.

گزنفۆن لە وڵامدا گوتی: " من ناچار بووم دوژمن ڕاو بنێم، لەبەر ئەوەی مانەوەمان لە شوێنەکانمان دەبووە هۆی کوژراونی سەربازەکانمان و نەماندەتوانی گورزێکیش لە دوژمن بدەین. کاتێک ڕاونانی دوژمنم دەست پێکرد، ئەودەم بۆم دەرکەوت قسەکانی ئێوە ڕاستن. چونکە نەماندەتوانی دەستیان لێبووەشێنین و دواییش زۆر بە سەختی و دژواری گەڕاینەوە شوێنەکانی خۆمان. دەبێ سپاسی خوا بکەین کە دوژمن بە ژمارەیەکی کەمەوە پەلاماری داین. بەبێ ئەوەی زەرەرێکمان پێبگەیێنێ، پێیان نیشاندایان خاڵە لاوازەکانمان کامانەن و کەموکوڕیمان لەکوێدا. ئێستا بۆمان دەرکەوتووە هێزەکانی دوژمن کەماندار و قۆچەقانی هاوێژی بە تەجرەبەن و لە مەودایەکڕا ئەو کارە دەکەن کە نە هێزەکانی کرێتی و نە نێزەدارەکانمان ناتوانن

وڵامیان بدەنەوە و دەستیان لێبووەشێنن. کاتێکیش راویان دەنێن، ناتوانین مەودایەکی فرە لە لەشکر دوور کەوینەوە. لە مەودای کورتیشدا، خێراترین سەربازی ئێمە ناتوانێ پیادەی دوژمن ڕاو بنێ و بە دیلی بگرێ. تەنانەت ئەگەر لە دووری کەوانەکردنی تیرێکیشدا بێ. کەوابوو ئەگەر دەخوازین پێش بە نیزیک بوونەوەی هێزەکانی دوژمن بگرین و نەهێڵین تخوونی لەشکرەکەمان بکەون و لە ڕێگادا تووشی زیان و زەرەر نەبین، پێویستیمان بە سوارکار و قۆچەقانی هاوێژ هەیە.

بیستوومە ژمارەیەک لە پیاوانی دورگەی رۆدۆس لەنێو لەشکرەکەماندا خزمەت دەکەن و لە قۆچەقانی هاوێژیدا شارەزان و ئەو جۆرەی باسیاندەکەن، گۆیا ئەوانە دەتوانن قۆچەقانییەکانیان ئەوەندە باش بهاوێن کە دوو قات زیادتر لەهی فارسەکان دوورتر بڕوا. ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە فارسەکان بەردی گەورە دەهاوێن و تەنیا لە مەودایەکی کورت پیاو دەنگێوێ، بەڵام رۆدۆسییەکان دەزانن لە جیاتی بەرد تۆپەڵە مز بەکار بێنن.

پێشەکی دەبێ بزانین کامیەک لە سەربازەکانمان قۆچەقانییان هەیە، دوایە کەسانیتریش بۆ ئەو کارە تەرخان بکەین. هەروەها، ئەوانەی شارەزا لە دروست کردنی قۆچەقانیین و ئەوانەش کە دەخوازن لە تاقمی قۆچەقانی هاوێژاندا خزمەت بکەن،بێنە مەیدان. بەو کارەیان یارمەتیمان دەدن لە دەست خەڵکی بێکارە و زیادی نەجاتیمان بێ و هێزی شتیوانی لەشکر بن.

جیا لەوانەی باسم لێوە کردن، لە نێو هێزدکانماندا هێندیک ئەسپ دەبینم. بەشێک لەلای جەماوەری منن و ئەوەیتریش لەلای پیاوەکانی کلێئارخۆسی کوژراون، لەگەڵ ئەوانەی لە دوژمن گرتوومانن و بۆ بارکردن کەڵکیان لێوەردەگرین، تەواوێکن. ئەژمارێکین ئەگەر ئەوانە کۆکەینەوە و بۆ بارکێشی لە ماڵاتی دیکە کەڵکوەرگرین، دەتوانین هێزی سوارە دامەزرێنین. ئەو کات ئەو هێزە ڕەنگە بتوانێ کاتی ڕاونانی دوژمن گورزێکی باش بووەشێنێ ".

پاش ڕاوێژ بڕیار بۆ جێبەجێ کردنی ئەو کارە وەرگیرا.

هەر ئەو شەوە دەستەیەکی دووسەد کەسی لە قۆچەقانی هاوێژان پێکهات و ڕۆژی دوایی پاش تاقیکاری دەستەیەکی پەنجا کەسی سوارە نیزام ئامادە بوو. کڵاو و جلی چەرم بۆ گشتیان ئامادە کرا و فەرماندەش لیکیۆس کوڕی پۆلیستراتۆسی ئاتێنی هەڵبژێردرا.

# بەشی ٤

## پەلاماری میتریداتیس - بەرپەرچدانەوەی هێرش - گەیشتنە سەر چۆمی دیجلە - پەلاماری بێبەرهەمی تیسافێرن - ئاڵوگۆڕ لە قەوارەی لەشکردا - هێرشی دووبارەی دوژمن - وەغیرەت کەوتنی یۆنانییەکان بەهۆی تێکۆشانی گزنفۆنەوە

ڕۆژێک لەو شوێنە مانەوە و بۆ سبەینەکەی، بەیانی سەحەری وەڕێکەوتن. دەبوایە بە دۆڵێکدا تێپەڕن و لەوە دەترسان لەو گەلییەدا تووشی پەلاماری دوژمن بێن. بەڕاستیش هەروا بوو، کاتێک بە دۆڵەکەدا دەرباز بوون میتریداتیس بە هەزار سوار و چوار هەزار کەمانداری تیرهاوێژ و قۆچەقانی هاوێژ لێیان وەدیار کەوت. میتریداتیس داوای ئەو هێزە زۆرەی لە تیسافێرن کردبوو. تیسافێرن بەو شەرتە ئەو هێزەی دابووە ناوبراو کە بتوانێ یۆنانییەکان لە بۆسە هاوێ و ئەویش بەڵێنی دابوو هێزە یۆنانییەکان بە یەخسیری ڕادەستی ئەو بکا. میتریداتیس بەو شێوەیە حیسابی کردبوو کە لە کەمینی پێشوودا بە ڕێژەیەکی کەم لە هێزەکانی، توانیبووی ژمارەیەکی زۆر

له سەربازەکانی دوژمن بریندار بکا، کەواتە ئەوجار دەبێ سەرکەوتووتر بگەڕێتەوە.

کاتێک هێزە یۆنانییەکان بە گەڵیدا تێپەڕین و هەشت ستادیۆ دوور کەوتنەوە، تازە میتریداتیس و هێزەکانی بە دۆڵێدا دەرباز دەبوون. ستراتێژەکانی یۆنانی پێشتر ژمارەیەکیان چەکداری قورس دیاری کردبوو کە لەو هێزەی دوژمن بدەن و سوارەکانیش بە غیرەت و فیداکارییەوە ڕاویان بنێن و لەشکرێکی بە هێزیش بۆ پشتیوانییان تەرخان کرابوو.

وەختێک هێزەکانی میتریداتیس گەیشتنە لەشکری یۆنانی دەستیان بە تیرهاوێژی کرد و قۆچەقانییەکانیان هەڵسووڕاند. ڕاست لەو کاتەدا شەیپوڕی یۆنانییەکان لێدرا و فەرمانی شەڕ درا. یۆنانییەکانی دیاریکراو هێرشیان کردە سەر دوژمن و بە دوای ئەوانیشەوە سوارە نیزام پەلاماری دەست پێکرد. هێزەکانی دوژمن خۆیان نەگرت و بە دۆڵێدا ڕایانکرد. لەو هێرشەدا ژمارەیەکی زۆر پیادە نیزامی بەربەر کوژرا و لەنێو گەڵیشدا حەڤدە سوارکار بەدیل گیران. یۆنانییەکان لەجێوە و بەبێ حوکمی سەرکردەکانیان ئەو دیلانەیان بۆ چاو ترساندنی دوژمن کوشت.

باقی هێزەکانی دوژمن دوای ئەو شکستە دوور کەوتنەوە. یۆنانییەکان پاشماوەی ئەو ڕۆژە بەبێ مەترسی ڕێگایان بڕی و گەیشتنە چۆمی دیجلە. بە سەر شارێکی چۆلدا کەوتن کە ناوی لاریسا بوو. میدیاکان پێشتر لەو شارە ژیابوون. بەرینایی دیواری لاریسا بیست و پێنج پێ بوو. بەرزییەکەی دەگەیشتە سەد پێ. مەودای درێژایی دوو فەرسەخ بوو و بناخەکەی بە بڵیندایی بیست پێ لە بەرد دروستکرابوو و باقی دیوار لە خشت پێکهاتبوو. کاتێک فارسەکان شەڕی دەسەڵاتیان دژی میدیاکان دەست پێکرد، پاشای فارس ئەو شارەی گەمارۆ دا. ئەو نەیتوانی بە هیچ شێوەیەک لاریسا بگرێ. جارێکیان لە سەردەمی گەمارۆدا بە هەڵکەوت هەور بەری ڕۆژێ گرتبوو و تاریکی بەتەواوی شارەکەی داپۆشیبوو. دانیشتووانی شار ترسابوون و شاریان چۆل کردبوو. ئەو ڕووداوە بووە هۆی وێرانی و شکستی لاریسا. لە

نیزیک ئەو شارە (پیرامید)ێک[٨٩] لە بەرد بە بەرینایی یەک پلێترا و بەرزایی دوو پلێترا وەبەرچاو کەوت. جەماوەرێکی زۆری بەربەری دانیشتووی گوندەکانی دەوربەر ڕایانکردبوو و چوبوونە سەر ئەو پیرامیدە.

قۆشەنی یۆنانی لەو شوێنەڕا قۆناخێکی‌تری ڕێگای بە درێژایی شەش فەرسەخ پێوا و گەیشتە دیوارێکی گەورە و وێران لە نیزیک شارێک. دانیشتووانی ئەو جێگایەش میدیایی بوون و ناوی مێسپیلا بوو[٩٠]. بناخەی ئەو دیوارە لە بەردی تاشراو و چندراو بوو و خاوەن بەرینایی و بەرزایی یەکسان بوو و دەگەیشتە پەنجا پێ. سەبارەت بە گیرانی ئەو شارە بەسەرهاتێک دەگێڕنەوە. وەختێک فارسەکان پەلاماری وڵاتی میدیایان داوە، شاژنی میدیا پەنای بۆ ئەو شارە بردوە. پاشای فارس دەرەقەتی خۆڕاگری خەڵکەکە نەهاتووە و نە بە قەوەتی هێزەکانی و نە بە تێپەڕینی زەمان هیچی بۆ نەکراوە. خواوەند ژوپیتێر بە هەورە برووسکە دانیشتووانی تۆقاندوە و لە ئاکامدا شار چۆل بووە و ئیمکانی گیران بۆ هێزەکانی فارس پێکهێناوە.

لەشکری یۆنانی لەو شارەڕا بە مەنزڵێک چوار فەرسەخی‌تر ڕۆیشتن. لە قۆناخی نوێدا تیسافێرن خۆی و سوارەنیزام و پیاوانی ئۆرۆنتاسی تازە زاوای پاشا و ئەو لەشکرەی پێشتر لەگەڵ کورۆش بوو و هێزەکانی ژێر فەرمانی برای پاشا و جەماوەرێکی زۆری‌تر کە پاشا لە خزمەتی نابوو بۆوەی لەشکرەکەیان زۆرتر دیار بکا، بەپانەوە هێرشیان هێنابوو. کاتێک نیزیکی یۆنانییەکان کەوتنەوە، تیسافێرن بەشێک لە هێزەکانی بۆ پەلاماری دەستەکانی پێشەوەی لەشکری یۆنانی و بەشێکیشی بو دەستەکانی تەنیشتەوە تەرخان کرد. بەو حاڵەش نەیدەوێرا پەلامار بدا و نەیدەویست تووشی خەسارێک بێ. تەنیا بە هێرشی کەماندار و قۆچەقانی هاوێژان کیفایەتی کرد. لەو کاتەدا قۆچەقانی هاوێژەکانی ڕۆدۆسی لێک جیا بوونەوە و

---

٨٨- پیرامیدی بنیات‌نراو لە بەرد، نەخشی گرد و تەپۆلکەی لە دەشتایی ناوچەدا هەیە. شوێنەوارەکانی تا ئیمرۆش ماون و گۆڕی سارداناپالوسی لەژێردایە و پێیدەگوترێ ئاشوور.

٨٩- مێسپیلا، بەشێکی شاری نەینەوا بووە و ئەو ناوە دەگەڕێتەوە بۆ وشەیەکی میدیایی واتە ماسپیل (وێرانە).

دەستیان بە بەردبارانی هێزەکانی تیسافێرن کرد. هاوکات لەگەڵ ئەوان کەماندارەکانی سیتی بە سیلاحەکانیان تیریان بە خەتا نەڕۆیشت. تیسافێرن و هێزەکانی مەسافەیەک، تا ئەو جێگایەی تیریان نەگاتێ پاشەکشەیان کرد. تیسافێرن فەرمانی بە گشت هێزەکانیدا پاشەکشە بکەن.

ئەو ڕۆژە یۆنانییەکان درێژەیان بە ڕێگادا و بەربەرەکانیش بەدوایانەوە بوون. دیارە لەو بۆسەیەشدا نەیانتوانی زەرەدێک بە لەشکری یۆنانی بگەیێنن. قۆچەقانی هاوێژەکانی ڕۆدۆسی بەردیان زۆر دوورتر لە تیر و بەردی فارسەکان دەهاویشت. کەوانی فارسەکان گەورە بوو و هەرچی تیری دەیانهاویشت کرێتی‌یەکان کۆیان‌دەکردەوە و دواتر دژی دوژمن و بۆ مەشقی خۆیان کەڵکیان لێوەردەگرت. ئەوەش بۆیە بوو کە زیادتر لەو کارە شارەزا بن و تیرەکانیان پتر کەوانە بکا. ئەوان قەیاسێکی زۆر تەناف و مزیان بۆ دروست کردنی کەوان و تۆپەڵەی قۆچەقانی لە گوندەکانی سەر ڕێگا کۆکردبۆوە. هێزە یۆنانییەکان هەر ئەو ڕۆژە لە قەراخ ئاواییەکانی سەر ڕێگا ئۆردویان لێدا و بەربەرەکانیش دوای ئەو شکستە دوور کەوتنەوە. یۆنانییەکان ڕۆژێک دواتر گەنمێکی فرەیان بۆ ئازووقە لەو گوندە دەوڵەمەندانە کۆکردەوە.

ڕۆژی سێهەم بە دەشتاییدا تێپەڕین. تیسافێرن بەردەوام بە دوایانەوە بوو و تووشی گەلێک گیروگرفتی کردن. یۆنانییەکان دوای ئەو ڕووداوانە بەو قەناعەتە گەیشتن کە چوار گۆشە بوونی لەشکریی لەباری ئەمنییەوە سەرکەوتوو نییە، چونکە دوژمن بەردەوام بە دوایانەوە بوو. کاتێک بە ڕێگا و دۆڵی تەنگ و پردی سەر ڕووبارەکاندا دەرباز دەبوون قۆڵەکانی چەپ و ڕاست وێکدەهاتن و چەکدارە قورسەکانیان ناچار دەکرد پاڵ بە هێزەکانی پێشەوە بنێن. کاتێکیش هێزەکانی پاش و پێشەوە بە هۆی ئەو تەوژمە لە یەکتر دوور دەکەوتنەوە، بێ نەزمی سازدەبۆوە. هەروەها کاتی شەڕ، چەکدارە قورسەکان دەبوایە لە یەکتر دووربکەونەوە و ئەوەش بۆشایی لە نێوەندی لەشکردا ساز دەکرد و هێزەکانی پاش لەشکری تەریک دەخستەوە و لە مەترسی دەکەوتن و توانایی و کارایی ئەو بەشە لە بارودۆخی دژوار و

پڕمەترسییەدا بێبەهرە بوو. پاش دەرباز بوون بە دۆڵ و ڕێگای باریک و سەر پردەکاندا، کاتێک دەگەیشتنە دەشتایی ئەوجار هێزەکان لەباڵیەک دەکشانەوە و بەتالایی دەکەوتە نێوەندی چوارگۆشەی لەشکری. لە ئاکامدا پاش لەشکر ئاشکرا تەریک دەکەوتەوە و دەکەوتە بەر پەلاماری هێرشی دوژمن کە بەدوایانەوە بوو و تەنیا چەند پێیەک لێیان دوور بوو. هەڵبەت کاتی دەربازبوونی لشکر بە شوێنە حاستەم و تەنگەکاندا، هەر کەس لە حەولی ئەوەدا بوو زووتر خۆی دەرباز بکا کە ئەوەش خۆی دەبووە هۆی پێکهاتنی نێوان ناخۆشی و دڕدۆنگی لە نێو لەشکردا.

کاتێک ستراتێژەکان ئەو کەموکوڕیانەیان بەرچاو کەوت، شەش دەستەی سەد کەسیان دامەزراند. هەر دەستەیە یەک لۆکاژ فەرماندەری دەکرد. کاتی ڕۆیشتن باڵەکانی چەپ و ڕاست لە یەکتر نیزیک دەکەوتنەوە، ئەو لۆکاژانە بە دەستەکانیانەوە لە دواوە دەمانەوە بۆوەی پاڵپەستۆیی بۆ باڵەکانی تەنیشتەوە دروست نەبێ. دوای ئەوان وەدوای لەشکر دەکەوتن. باڵەکانی تەنیشت کاتێک لە گۆڕاییدا لێک جیا دەبوونەوە، بۆشایی پێکهاتوو بەو دەستانە پڕ دەبۆوە. ئەگەریش بەشی نەکردبا، ئەوەندەی پێویست بوایە لە هێزەکانیتر کەڵک وەردەگیرا. لە حاڵەتێکی ئەوتۆدا نێوەندی لەشکر هەمیشە پڕ دەبۆوە و کاتی دەرباز بوون بەسەر پردەکانیشدا بێ نەزمی نەدەخوڵقا. لۆکاژەکان بە دەستەکانیانەوە بەدوای یەکتردا دەڕۆیشتن و کاتی کۆبوونەوەکانیش، دەستەکان هەر یەکە شوێنی خۆی پێدەزانی.

چوار ڕۆژ بەو شێوەیە پێشڕەوییان کرد. ڕۆژی پێنجەم تووشی قەسرێک هاتن و چەند گوندێک لە دەوری هەڵکەوتبوون. ڕێگای ئەو قەسرە بە گرد و تەپۆڵکە و داوێنی چیادا تێدەپەڕی و لە داوێنی کێوەکەش دێیەک هەبوو. کاتێک یۆنانییەکان چاویان بە بەرزاییەکان کەوت، گەلێک خۆشحاڵ بوون. پێیانهەڵگەڕان و ناهەقیش نەبوون چونکە دوژمن بە سواری ئەسپ وەدوایان کەوتبوون. کاتێک لە یەکەم بەرزایی وەسەر کەوتن و لەوێوە بۆ گرتنی دووهەمین بەرزایی دابەزین، تووشی هێزەکانی بەربەر هاتن کە لە دووهەم گرد دامەزرابوون. هێزەکانی دوژمن لە تەواوی بەرزاییەکانی دەوروبەرڕا

هێرشیان کردە سەر یۆنانییەکان کە لە خوارەوەتری ئەوان بەڕێوە بوون. بە هەموو جۆرە چەکێک، بە نێزە، تیروکەوان و قۆچەقانی وەریانگەڕانی و لە لایەن فەرماندەکانیانەوە بە زەبری قەمچی شەڕیان دەکرد. لەو پێکدادانەدا دەستەی سووکە چەکداری یۆنانی تووشی شکست هات و برینداریکی فرەیان لێکەوتەوە. کاتی پاشەکشە، بەسەر هێزەکانی چەکداری قورسدا کەوتن، نە ئەوان و نە کەماندار و نە قۆچەقانی هاوێژەکان ئەو ڕۆژە هیچیان بۆ نەکرا و لەگەڵ لەشکری بێ چەک تێکەڵببوون.

یۆنانییەکان ناڕاحەت لەو شکستە بڕیاری پەلاماری نوێیاندا. کاتی هێرشی دووهەم، دەستەی چەکداری قورس بە سەختی و زەحمەتەوە لە بەرزایی دووهەم وەسەر کەوت. هێزەکانی سوارەی بەربەر خێرا پاشەکشەیان کرد و ئەو گردەیان بەجێهێشت. یۆنانییەکان وەختێک گەڕانەوە بۆوەی پاڵ وەپاشماوەی لەشکرەکەیان بدەنەوە، دیسان کەوتنەوە بەر پەلاماری کەماندار و قۆچەقانی هاوێژەکانی دوژمن. لەبەر ئەوەی لە سەر گردی دووهەم تووشی ئەو گرفتە هاتبوون، بڕیاریاندا بۆ گرتنی بەرزایی سێهەم چەکداری سووک وەڕێکەوێ و چەکداری قورس لە شوێنی خۆی بمێنێتەوە. قۆڵی ڕاستی لەشکر دوو لەت بوو و ڕێگای کردەوە هێزی چەکداری سووک بێتە دەر و بەرەو چیا بچێ. کاتێک ئەو هێزە گەیشتە بەرزایی سێهەم، سەیتەرەیان بەسەر هێزەکانی بەربەردا مسۆگەر کرد. بەربەرەکان ڕوویان لە تەپۆڵکەکانی خوارەوە کرد و وازیان لە پەلاماردان هێنا و لەوە دەترسان لە لەشکری دایک دابڕێن و بکەونە گەمارۆی هێزە یۆنانییەکان.

یۆنانییەکان باقی ڕۆژەکە هێندێک لە ڕێگای تەپۆڵکەکان و بەشێکیش بە پێهەڵگەڕانی چیاکان، ڕێگایان پێوا و گەیشتنە چەند گوندێک. لەو شوێنە چەند حەکیمیان بۆ چارەسەر کردنی بریندارەکانیان تەرخان کرد. بۆ خاتری ئەو بریندارانە سێ ڕۆژ لەو دەڤەرە مانەوە. ئازووقە، گەنم و شەڕاب بە فراوانی دەست دەکەوت و جۆیەکی زۆریان بۆ وڵاغەکانیان دابینکرد.

ڕۆژی چوارەم بەرەو دەشتایی داگەڕان. لەبەر ئەوەی تیسافێرن و هێزەکانی گەیشتبوونە سەریان، ناچار بوون لە یەکەم گوند خێمە لێبدەن و

لەوێ بمێننەوە و گەرەکیان نەبوو بە دەم ڕێگا ڕۆیشتنەوە لەگەڵ هێزەکانی بەربەر بکەونە شەڕ و پێکدادان. چونکە هەم برینداریان پێبوو و هەم خەڵکێکی زۆریش شەڕی پێنەدەکرا و سەرقاڵی ڕاگواستنی بریندار و چەکەکانیان بوو.

کاتێک ئۆردویان لێدا، هێزەکانی بەربەر بەردەوام پەلاماریان دەدانێ و هێدی هێدی لە گوندەکە نیزیک دەکەوتنەوە. هێزە یۆنانییەکان چوون شوێنەکەیان قایم و مەحکەمتر بوو، گورزێکی باشیان وەشاند. هەڵبەت جیاوازییەکی گەلێک زۆر لە نێوان شەڕێکدا هەیە کە لە شوێنی مەحکەم و سەقامگیردا دەکرێ لەگەڵ ئەوەی بە دەم ڕێگا ڕۆیشتنەوە بێ. کاتێک شەو داهات هێزەکانی بەربەر گەڕانەوە. ئەوان قەت نەیاندەویست کەمتر لە شێست ستادیۆ لە لەشکرەکەیان دوور کەونەوە و دەبوایە خێرا تێکەڵ بە قۆشەنەکەیان ببنەوە و لە پەلاماری هێزە یۆنانییەکان دەترسان.

بەربەرەکان عادەتیان بوو ئەسپەکانیان بە شەوانە ببەستنەوە. گەلێک جار گوریسیان لە پاشووەکانیان دەخست بۆوەی نەتوانن ڕابکەن. کاتێک تووشی مەترسییەکی چاوەڕوان نەکراو دەهاتن، سوارکارەکانیان دەبوایە خێرا ئەسپەکانیان زین و لغاو بکەن و جلی شەڕی بپۆشن. بەڕێوەچوونی مەشقێکی عەسکەری ئەوتۆ لە شەودا دژوار بوو. بە تایبەت ئەو کاتە کە هەلاوبگر ساز دەبوو. هەر لەبەر ئەو هۆیە بوو کە هێزەکانی بەربەر دوور لە سپای یۆنانی ئۆردویان لێدەدا.

وەختێک یۆنانییەکان دیتیان لەشکری بەربەر خەریکی پاشەکشەیە، فەرمانی ئامادەباشی تەواویان‌دا و بە دەنگی بەرز ئەو حوکمەیان بە هێزەکانیان ڕاگەیاند بۆوەی قۆشەنی پەلاماردەر گوێی لێبێ. لەشکری بەربەر بۆ ماوەیەک پاشەکشەکەی خۆی وەدواخست. کاتێک شەویان بەسەردا هات، ترسی گەڕانەوە بۆ ئۆردوگای نێوەندی دایگرتن. یۆنانییەکان وەختێک گەڕانەوەی بەربەرەکانیان دیت و خاترجەم بوون، خێرا بار و بنەیان تێکنا و وەڕێکەوتن و مەودایەکی نیزیک بە شێست ستادیۆ دوور کەوتنەوە. ئیتر

فاسیلەی نێوانیان ئەوجار بە ڕادەیەک بوو کە بۆ سێ ڕۆژ هیچ پەلامارێک ڕووی نەدا.

ڕۆژی چوارەم بەڵام، لەبەر ئەوەی هێزەکانی بەربەر بە شەو وەڕێکەوتبوون، بەرزاییەکیان گرتبوو کە هێزە یۆنانییەکان دەبوایە پێیدا دەرباز بن. ئەو چیایە لە سەر ڕێگایەک هەڵکەوتبوو کە بەرەو دەشتایی دەڕۆیی. خیریسۆفۆس کاتێک دیتی ئەو کێوە بە دەست هێزەکانی دوژمنەوەیە، خێرا وڵامی بۆ گزنفۆن نارد کە لەگەڵ دەستەکانی قەرەوڵی پاشەوە بوو. ئەو دەبوایە دەستەی سووکە چەکداری خۆی بێنێ و لە پێش لەشکرەوە جێبگرێ. گزنفۆن ئیتاعەتی ئەو دەستوورەی نەکرد و گەرەکی بوو تیسافێرن و هێزەکانی بە چاوی خۆی ببینێ. خێرا بە سواری ئەسپ خۆی گەیاندە خیریسۆفۆس و لێی پرسی بۆچی داوای منت کردوە. خیریسۆفۆس لە وڵامدا گوتی، تۆ پێش هەر جوڵەیەک چاو لە هێزەکانی دوژمن بکە چۆن چیای پێشەوەمانیان گرتووە. هیچ چارەیەک نییە مەگەر بە هێزی چەکداری سووک ئەو لەشکرە لەوێ هەڵقەنین. بۆچی هێزەکانت لەگەڵ خۆت نەهێنا. گزنفۆن لە وڵامدا گوتی من چۆلکردنی پشتی لەشکرم لەبەر چاوی دوژمن بە مەسڵەحەت نەزانی. هەرچەند پێویستە چارەیەک بۆ دەرپەڕاندنی ئەو حەشیمەتە لە سەر ئەو چیایە بدۆزینەوە.

ڕاست لەو کاتەدا، گزنفۆن چاوی بە چیایەکی‌تر کەوت کە هێزەکانی خۆیان گرتبوویان و لەوێوە ڕێگایەک هەبوو کە بەرەو شاخێکی بەرزتر دەچوو و بە سەر هێزەکانی دوژمندا سەیتەرەی دەبوو. گزنفۆن بە خیریسۆفۆسی گوت کە پێویستە خێرا ئەو کێوە بگرین. ئەگەر ئەوێمان دەست کەوێ ئیتر دوژمن بە سەرماندا زاڵ نابێ. لە درێژەدا گوتی، تۆ لێرە بمێنەوە، من دەڕۆمە پێشەوە. ئەگەریش تۆ دەخوازی ئەو شاخە بگری من لێرە دەمێنمەوە. خیریسۆفۆس لە وڵامدا گوتی بڕیار بە دەست تۆیە. هەر چۆنێک تۆ گەرەکتە ئاوا دەکەین. گزنفۆن گوتی من گەنجترم و باشترە من بچم. داوای لە خیریسۆفۆس کرد ژمارەیەک لە پیاوانی هێزەکەی پێشەوەی بداتێ چونکە تا بگەڕێتەوە و سووکە چەکدارەکانی پاشقەرەوڵ لەگەڵ خۆی بێنێ، وەختێکی زۆری دەویست. خیریسۆفۆس ژمارەیەک سەربازی چەکداری

سووکی دایە گزنفۆن و جێگای ئەوانی بە هێزەکانی نیوەڕاست پڕکردەوە. خیریسۆفۆس سێ سەد پیاوی چالاک و شەڕکەری لەگەڵ گزنفۆن نارد و داوای لێکردن دەستوراتی فەرماندەی نوێ جێبەجێ بکەن. ئەو دەستەیە بە خێراییەکی تەواوەوە بەرەو پێش ڕۆیی. هێزەکانی دوژمن لە سەر چیای داگیرکراو وێستا بوون. ئەوان جوڵەی ئەو دەستە نوێیەیان نەدەدیت بۆوەی وەدوایان کەون. دەنگ و هەرایەکی بڵیند لە هێزە یۆنانییەکان بەرز بۆوە. سروودی نیشتمانی بوو. یەکتریان هاندا و لەو لاشەوە هێزەکانی تیسافێرن بەهەمان شێوە هێزەکانی خۆیان بە خوێندنەوەی سروود وەخۆخست.

گزنفۆن چوار ناڵ بە سواری ئەسپ خۆی گەیاندە هێزی دیاریکراو و بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد ئەی سەربازەکان بیر لەوە بکەنەوە کە شەڕ بۆ دیداری دووبارەی یۆنان دەکەین و چاومان بە ماڵ و منداڵمان دەکەوێتەوە. بە نەختێک زەحمەت و هیممەتەوە دەتوانین باقی ڕێگا بێ شەڕ و کێشە بپێوین. ڕاست لەو کاتەدا سوتیریداسی خەڵکی سیکۆنیۆ گوتی: گزنفۆن ئێمە گشتمان وەک یەک زەحمەتکێش نین. تۆ بە سواری ئەسپ دەڕۆی بەڵام من پیادە و بە کوێرەوەری فرەوە ناچار بە هەڵگرتنی ئەو قەڵغانە قورسەم. گزنفۆن کاتێک گوێی لەو قسەیە بوو لە ئەسپ دابەزی و سەربازەکەی لە دەستە جیاکردەوە و قەڵغانەکەی لێوەرگرت و خێرا وەپێشکەوت. لەبەر ئەوەی جلی زرێی جەنگی لەبەردا بوو و دەبوایە مەتاڵیش بە دەستەوە بگرێ، تەواوێک تووشی چەرمەسەری هات.

بەو حاڵەش پێشقەرەوڵەکانی وەپێشدا و پاشقەرەوڵەکانیشی وەڕێخست و ڕەگەڵ خۆیدان. کاتێک سەربازەکانی دیکە گزنفۆنیان بەو حاڵە دیت، سوتیریداسیان بەردباران کرد و لێدانیکی خەستیان لیدا. ئەوەندەیان جنێو پێدا تا ناوبراو وایلێهات مەتاڵەکەی وەرگرێتەوە و وەڕێکەوێ. گزنفۆن دووبارە سوار بۆوە و ئەوەندەی ڕێگا خۆش بوو بە سواری ڕۆیی و باقی بە پێیان. کاتێک ڕێگا ڕژد و هەڵدێر دەبوو لە ئەسپەکەی دادەبەزی و بە پیادە و بە خێرایی هەنگاوی دەنایەوە. لە ئاکامدا گزنفۆن خۆی و هێزەکانی پێش دوژمن گەیشتنە سەر لووتکەی بەرزی چیاکە و گرتیان.

## بەشی ٥

### ئاورتێبەردانی دێهات بەهۆی تیسافێرن - بەربەست دروست کردن لەسەر ڕێگای دەربازبوونی یۆنانییەکان لەنێو چیاکانی وڵاتی کاردوخ و دیجلەدا - گرفتی پەڕینەوە لە ڕووباری دیجلە - پێشنیاری سەربازی ڕۆدۆسی لەمەر شێوەی پەڕینەوە - بڕیار لەسەر ڕۆیشتن بە کێوەکانی وڵاتی کاردوخەکاندا

هێزەکانی بەربەر وەختێک پشتیان لە یۆنانییەکان کرد و هەر بابایە بە لایەکدا هەڵات، یۆنانییەکان خێرا کێوە بەرزەکەیان گرت. تیسافێرن و ئاریە ڕێگایەکی دیکەیان گرتەبەر. خیریسۆفۆس و هێزەکانی، لە شوێنی خۆیان، لە چیا دابەزین و بەرەو دەشتایی وەڕێکەوتن. لە نیزیک گوندێکی گەورەی دەوڵەمەند ئۆردویان لێدا. لە قەراخ چۆمی دیجلە و لەو دەشتە دێهاتێکی زۆری پڕ ئازووقە هەبوون. کاتی شەو هێزەکانی دوژمن لە پڕا لەو دەشتە پەیدا بوون. ئەوان هێندێک لەو یۆنانییانەی بۆ تاڵان روویان لە ئاواییەکانی ئەو دەشتە کردبوو، گرتبوو و لە جێوە سەریان لێدابوون. لەو کاتەدا مێگەل و گارانێکی زۆری مەڕ و ماڵات بە

قەراخ چۆمدا دەڕۆیشتن. یۆنانییەکان کە هێشتا نەپەڕیبوونەوە دەستیان بەسەر ئەو مەڕ و ماڵاتە داگرت. دوای ئەوانە تیسافێرن و پیاوەکانی بڕیاریاندا ئەو گوندانە ئاور تێبەردەن بۆوەی یۆنانییەکان ئازووقەیان دەست نەکەوێ. خیریسۆفۆس و هێزەکەی کە بە هاواری یۆنانییەکانی لە داوکەوتووە چوبوون، گەڕانەوە. گزنفۆن لە چیا دابەزی و لە دەشتایی تێکەڵ بە لەشکر بۆوە. ناوبراو بە سواری ئەسپ بە پێش ئەو جەماوەرە یۆنانییەدا تێپەڕی کە لەگەڵ خیریسۆفۆس دەگەڕانەوە ئۆردوگا.

گزنفۆن لە ئاخاوتنەکەیدا گوتی: " یۆنانییەکان! بڕوانن، دوژمنانی ئێمە دەیانگوت دێهاتەکان بۆ ئێمە بەجێ دەهێڵن. چونکە لە قەرارەکانماندا بڕیار وابوو هیچ شوێنێک لە وڵاتی ژێر حوکمی پاشا نابێ ئاگر تێبەردەین، ئێستا ئەوان خۆیان ئەو کارە دەکەن. وەک ئەوە دەچێ کە وڵاتێکی بێگانەیان دەست کەوتبێ. ئەگەر ئەوان لە شوێنێک ئازووقە بۆ خۆیان دابنێن، دەزانن ئێمەش بەرەو ئەوێ دەچین.

خیریسۆفۆس! بە باوەڕی من باشتر وایە ئێمە یارمەتی ئەو خەڵکە لێقەوماوە بدەین کە ماڵ و مڵک و مووچە و مەزرایان ئاگری تێبەردەدرێ و بە چەشنێک هەڵسوکەوت بکەین وەک ئەوە کە پارێزگاری لە وڵاتی خۆمان دەکەین ".

خیریسۆفۆس لە وڵامدا گوتی: " من لەسەر ئەو باوەڕە نیم. من پێموایە ئێمەش لەگەڵ ئەوان دەست بە ئاگر تێبەردانی وڵات بکەین، بەڵکوو هێزەکانی دوژمن لە داخی ئێمە دەست لەو کارە هەڵگرن و کۆتایی بەو بارودۆخە بێت".

وەختێک گشتیان گەڕانەوە خێمەکانیان، جەماوەرێک لە یۆنانییەکان بەردەوام بەدوای کۆکردنەوەی ئازووقەوە بوون. ستراتێژ و لۆکاژەکان لەو نێوەدا کۆبوونەوەیەکیان سازدا و بە پانەوە تووشی سەرلێشێواوی هاتبوون و نەیاندەزانی لەوە بەدواوە چبکەن. لەلایەک چیای زۆر بڵێند دەوری دابوون و لە لایەکیتریشەوە ڕووبارێکی قووڵیان لەپێش بوو. چەند کەسێک حەولیاندا قووڵاییەکەی بە نێزەکانیانەوە بپێون، بەو ئاکامە گەیشتن کە زۆر لەوە قووڵترە کە ئەوان بیریان لێکردبۆوە. لەو سەرگەردانییەدا بوون کە نیزامییەکی خەڵکی ڕۆدۆس لێیان وەنیزیک کەوت و گوتی: " هاوڕێیان! من دەتوانم چوار هەزار چەکدار بپەڕێنمەوە ئەوبەری چۆم، بەو شەرتەی کەرستەی پێویستم بۆ دابینبکەن و

پاداشێکی بەوەجیش بۆ ئەو کارەم وەرگرم ". لە کابرایان پرسی چ کەرستەیەک پێویستە. ناوبراو وڵامی داوە: " دوو هەزار هەمبانەی پێستم دەوێ. بۆ ئەو هەمبانانە دەتوانم کەوڵی ئەو مەڕ و بزن و کەر و گا و ماڵاتە کە ئێستا لێرە هەمانە، فوودەم و سەریان ببەستم و بۆ پرد دروست کردن کەڵکیان لێوەرگرم. ئەوانە زۆر هاسان یارمەتی پەڕینەوەمان دەدەن. پێویستیم بە گوریس و تەناف بۆ ڕاکێشانی ماڵاتی بارکێش هەیە. کاتێک ئەو هەمبانانەم بە گوریس لە یەکتری بەست، بەردی قورسیان پێوە هەڵداوەسم. بەردەکان دەگەنە تەختی ژێر ئاو و هەمبانەکان بە چۆمدا ناچن. هەر دوو سەری ئەو ڕیزە هەمبانانە لەوبەر و ئەمبەری قەراخی چۆم مەحکەم دەبەستمەوە. ئەوسا مەترسی قوومبوون بۆ هیچکەس لە گۆڕێدا نامینێ. لە سەر هەمبانەکان چرپی و ئاڵاش ڕادەخەم و گڵی لەسەر ڕۆدەکەم و مەترسی نوقمبوون دەبڕێتەوە. ئەو کارەش هەر ئێستا بە چاوی خۆتان دەبینن. دیارە هەر هەمبانەیەک دەتوانێ بەبێ مەترسی قومبوون بەرگەی قورسایی دوو کەس بگرێ. چرپی و دەوەن و گڵەکەش بۆوەیە کە مرۆڤ و ئاژەڵەکان لاقیان هەڵنەخلیسکێ و بە ڕاحەتی بەسەریدا دەرباز بن ". نەخشەی کابرای ڕۆدۆسی بە لای ستراتێژەکانەوە ماقووڵانە بوو، بەڵام جێبەجێ کردنی دژاور. چونکە لەو بەری چۆم هێزێکی گەورەی سوارە نیزامی دوژمن چاوەڕوان بوو و ڕێگای بە هیچکەس نەدەدا خەریکی دروست کردنی پردێکی هەمبانەیی بێ و کەسیشیان نەدەهێشت پێ بنێتە ویشکایی ئەوبەری چۆم و لە جێوە دەیانکوشت.

ڕۆژی دوایی هێزە یۆنانییەکان پاش ئاگر تێبەردانی ئەو گوندانەی لێیبوون، ڕێگای پاشەکشەی بەرەو دێهاتی نەسوتێندراوی دەورووبەری بابێلیان گرتە بەر. هێزەکانی دوژمن لێیان وەنیزیک نەکەوتنەوە و لەمەودایەکی دوورەوە چاوەدێریان دەکردن و بۆیان پرسیار بوو کە یۆنانییەکان بەرەو کوێ دەڕۆن و گەرەکیانە چبکەن.

یۆنانییەکان لە دێهاتی دەوروبەری بابێل، بە دوای ئازووقەدا دەگەڕان و لەو ماوەیەشدا ستراتێژەکان کۆبوونەوەیەکیان پێکهێنا. دیلەکانی شەڕیان هێنا و وردەکاری ڕێگا و بانی دەورووبەریان لێپرسین. ئەو دیلانە گوتیان کە ڕێگای بەرەو باشوور دەچێتە بابێل و وڵاتی میدیا، واتە ئەو شوێنەی پێشتر

بەجێیان هێشتبوو. بەرەو ڕۆژهەڵات ڕێگایەک هەبوو کە دەچووە شوش و ئێکباتان و هەوارگەی پاشا بوو. بەرەو ڕۆژئاوا ڕێگایەکی دیکە بە قەراخ چۆمی دیجلەدا تێدەپەڕی و دەچووە وڵاتی لیدیا و یوونی. بەڵام ئەو ڕێگایەی بە چیاکاندا دەرباز دەبوو، بەرەو باکوور بوو و دەگەیشتە وڵاتی کاردوخەکان[٩١]. دیلەکان سەبارەت بە کاردوخەکان گوتیان کە گەلێکی چیا نشین و شەڕکەر و بە غیرەتن. ئەوان سەربەخۆ دەژین و ژێردەستەی پاشای فارسیش نین. پاشای فارس کاتی خۆی بە لەشکرێکی سەد و بیست هەزار کەسی هێرشی کردنە سەر. ئەو لەشکرە لەبەر تووش بوون بە گیروگرفتی جۆراوجۆر، یەک کەسیشی بە زیندوویی نەگەڕاوە وڵاتی خۆی. کاردوخەکان دواتر پەیمانی ساتراپیان لەگەڵ حاکمی فارسی سەحرا مۆر کرد و پێوەندی بنەماڵەییان دامەزراند و ئاشتی و هێمنی هاتە ئاراوە.

ستراتێژەکان دوای گوێ ڕاگرتن لە دیلەکان و یەقین حاسڵ کردن لە ڕاستی زانیارییەکان، بە پێی شوناسیان لە ناوچەکان، دیلەکانیان لەیەکتر جیا کردەوە بەبێ ئەوەی ئاشکرای بکەن بە چ ڕێگایەکدا دەڕۆن.

لە کۆتاییدا ستراتێژەکان بەو ئاکامە گەیشتن کە پێویستە بە ناوچە شاخاوییەکانی وڵاتی کاردوخدا تێپەڕن چونکە دوای دەربازبوون بەوێدا دەگەیشتنە ئەرمێنیا (ئەرمەنستان). ئەو سەردەمە ئەرمێنیا وڵاتێکی دەوڵەمەند و گەورە و لە ژێر دەسەڵاتی ئۆرونتاس‌دا بوو. دەگوترا لەوێ بەولاوە، ڕێگا بۆ گشت لایەک کراوەیە و مرۆڤ دەتوانێ بۆ گشت شوێنێک کە بخوازێ بچێ. یۆنانییەکان بە هومێدی کات و ساتی ڕەخساو بۆ ڕۆیشتن، قوربانییان لە مەر خێر و بێری ڕێگا پێشکەشی خواکانیان کرد. لە ترسی ئەوەی نەکا دوژمن پێش ئەوان بەرزاییەکان داگیر بکا، دەستوریان‌دا دوای نانی شێوان بارەکانیان ببەستن و ئامادەی ڕۆیشتن بن و بە فەرمانی یەکەم وەڕێکەون.

---

٩٠- کاردوخەکان لە ناوچەیەک نیشتەجێ بوون کە ئیمڕۆ پێی دەگوترێ بۆتان. بەپێی بۆچوونەکانی پاندازیدیس ئەوانە هەمان کوردەکانی ئیمڕۆن.

# کتێبی چوارەم

## بەشی ١

### چوونە نێو وڵاتی کاردوخەکان - چاوەڕوانی و ترسی یۆنانییەکان - ترس و بێهێزی لەشکری یۆنانی لەبەرامبەر کاردوخەکاندا - چاوساغی کردن
### بە دیلێک بۆ دۆزینەوەی ڕێگای دەربازبوون

گشت ئەو ڕووداوانەی لە کاتی هاتنە سەر کاری میری‌یەکان تا شەڕی کوناکسا، بەسەرهاتەکانی دوای شەڕ لە ماوەی ئاگربەسی نێوان یۆنانییەکانی ژێر فەرمانی کوروش و هێزەکانی پاشا، تەواوی ئەو پەلامارانەی دژی یۆنانییەکان بەڕێوەچوون، ژێرپێنانی پەیمانی ئاشتی و ئاگربەس لە لایەن پاشا و تیسافێرنەوە، هەر هەموویان لە کتێبی پێشوودا باسیان لێوەکرا.

وەختێک یۆنانییەکان گەیشتنە قەراخ چۆمی دیجلە، بە هیچ شێوەیەک مەجال و بواری پەڕینەوە لە گۆڕێدا نەبوو. لەبەر قووڵایی و بەرینی چۆم و نەبوونی پرد بۆ پەڕینەوە و سەیتەرەی چیاکانی وڵاتی کاردوخ، سەرکردەکانی یۆنانی بەو ئاکامە گەیشتن کە بە ناوچە شاخاوییەکاندا

دەربازبن. ئەوان لە دیلەکانیان بیستبوو کە ئەگەر بە چیاکانی وڵاتی کاردوخەکاندا تێپەڕن، دەگەنە وڵاتی ئەرمێنیا و سەرچاوەی چۆمی دیجلە و لەو شوێنەڕا دەکرا بپەڕنەوە، ئەگینا پێویست بوو ڕێگایەکی‌تر بگرنە بەر. دەگوترا کە سەرچاوەی ڕووباری فوراتیش مەودایەکی زۆر لە سەرچاوەی چۆمی دیجلە دوور نییە. ئەوانە کۆمەڵە زانیارییەک بوون کە تا ئەو کاتە دەست هێزە یۆنانییەکان کەوتبوون.

پەلامار و هێرشەکان بۆ سەر وڵاتی کاردوخەکان بەو شێوەیە دەستیان پێکرد. لەلایەک حەولیان دەدا بە نهێنی و دوور لە چاوی خەڵکی ناوچەکە دەرباز بن و لە لایەکی‌تریشەوە تێدەکۆشان بەر لە هێزەکانی دوژمن دووندی چیاکان بگرن. نۆرەی دوایین وەجبەی پاسەوانی بوو، شەو تەواوێکی بە بەرەوە مابوو، وەختێکی لەبار کە بە دەشتاییدا تێپەڕن. دوای ئامادەکاری و وەڕێکەوتن، لەگەڵ سپێدەی بەیانی گەیشتنە چیا. خیریسۆفۆس پێشقەرەوڵی لەشکر بوو و جیا لە هێزەکانی ژێر فەرمانی خۆی، گشت خەڵکی سووکە چەکدار و بێ چەکی لەگەڵ بوو. گزنفۆن پاشقەرەوڵی لەشکر و هێزەکانی چەکداری قورسی پێبوو و لە جەماوەری بێ‌چەک کەسی لەلای خۆی ڕانەگرتبوو.

هەڵبەت نیشانێک لە پەلاماری دوژمن لە پشت لەشکرەوە لەگۆڕێدا نەبوو. تەنیا ئەو وەختە جێگای مەترسی بوو کە بەدەم چیا وەسەرکەوتنەوە بکەونە بەر هێرش. خیریسۆفۆس پێش ئەوەی هێزەکانی دوژمن هەست بە بوونی بکەن ، بەرزایی پێشەوەی گرت و بەشی هەرە زۆری قۆشەنی لەگەڵدا بوو. ناوبراو دوای دەربازبوون لە کێوەکانی بەردەمی گەیشتە دیهاتی نێو دۆڵ و دڵی شاخەکان. خەڵکی کاردوخ ماڵەکانیان چۆلکرد و لەگەڵ ژن و منداڵیان ڕوویان لە شوێنە حاستەمەکان کرد. ئازووقەی جێماو لە نێو ماڵەکاندا گەلێک زۆر بوو. یۆنانییەکان ئەو کاتە چەندی بۆیان کرا ئازووقەیان بارکرد. لەو ماڵانە کەلوپەلی زۆری مسی هەبوو و یۆنانییەکان دەستیان لێنەدان. ئەوان بەو هیوایە کە کاتێک کاردوخەکان گەڕانەوە سەر ماڵ و مڵکیان و دیتیان دەست لەو کەرستانە نەدراوە، ڕەنگە هەست بەوە بکەن کە لەشکری یۆنانی دەخوازێ دۆستانە بەوێدا دەرباز بێ. دیارە کاردوخەکان خۆشیان دوژمنی

پاشای فارس بوون. یۆنانییەکان لە هەر جێگایەک ئازووقە و خواردەمەنی‌یان گیر بکەوتایە، هەڵیان دەگرت چونکە زۆریان پێویستی پێبوو. کاردوخەکان لەو نێوەدا نە جوابی ئەو هێرشەیان دایەوە و نە رووی خۆشی دۆستایەتیان نیشاندا.

بەڵام کاتێک دوایین دەستەی هێزەکانی پاشقەرەوڵی یۆنانی لە شاخەکانەوە بەرەو گوندەکان داگەڕا خوارێ، هەوا تاریک ببوو (چونکە سەرکەوتن و داکەوتن لە چیاکان تەواوی ئەو ڕۆژەی بەخۆوە گرت و ڕێگای دەرباز بوونیش گەلێک تەنگ و باریک بوو)، لەوکاتەدا هێندێک لە کاردوخەکان کۆبوونەوە و پەلاماری جەماوەری پاش لەشکریاندا. هەر چەند ژمارەی پەلاماردەران کەم بوو بەو حاڵەش چەند کەسێکیان لە یۆنانییەکان کوشت و هێندێکیشیان بە تیر و بەرد بریندار کرد. هەڵبەت ئەو جەماوەرە یۆنانییە بە هەتڵە بەسەر کاردوخەکاندا کەوتبوون. ئەگەر ژمارەی کاردوخەکان زۆر بوایە، بێگومان خەڵکێکی زۆر لە هێزە یۆنانییەکان تێدا دەچوون. یۆنانییەکان ئەو شەوەیان لە گوندەکان دەرباز کرد. کاردوخەکان لە دوندی چیاکان ئاگریان هەڵکردبوو و بەو شێوەیە هەر کۆمەڵێک بە شوێنی ئەوەی‌تری دەزانی.

کاتێک ڕۆژ بۆوە، ستراتێژ و لۆکاژەکانی یۆنانی کۆبوونەوە و بڕیاریان‌دا لە ماڵاتی باربەر تەنیا ئەوانەی بەهێز و بەکەڵک بوون ڕاگرن و ئەوانی دیکە جێبهێڵن و درێژە بە ڕێگاکەیان بدەن. هەروەها بڕیاریان‌دا تەواوی یەخسیرەکان ئازاد بکەن کە پێشتر گرتبوویانن چونکە لەبەر زۆری ژمارەی ماڵات و دیلەکان ڕەوتی ڕێپێوان گەلێک شل ببۆوە و ژمارەیەکی زۆر سەرباز سەرقاڵی پارێزگاری لەوانە بوو و نەیاندەتوانی بەشداری شەڕ بکەن. لەلایەکی‌ترەوە لەبەر زۆری یەخسیر و ئاژەڵ ناچار بوون دووقات پتر لەوەی پێویست بوو ئازووقە لە خۆیان بار بکەن.

کاتێک ئەو بڕیارە پەسند کرا فەرمان بە لەشکر درا هەرچی زووتر جێبەجێی بکا. پاش ئەو کارە زیافەتیان کرد و ڕێگایان گرتەبەر. فەرماندەران چەند کەسێکیان بە نهێنی دیاریکرد و لە بازگەیەکی تەنگی دۆڵدا

دایانمەزراندن بۆوەی هەرکەس لە لەشکری یۆنانی بەوێدا ڕابرد و کەرستەی زیادی لە خۆی بار کردبێ، لێیبستێننەوە، مەگەر ئەوانەی بە گریانەوە ویستبایان منالێک یا ژنێکی جوان کە دڵیان پێوەبوو لەگەڵ خۆیان ببەن، ئەوسا ڕێگایان پێدەدرا.

ئەو ڕۆژە هێندێک بە شەڕ و تاوێک بە حەسانەوە درێژەیان بە ڕێگادا. ڕۆژی دوایی ڕەوشی هەوا بەجارێک گۆڕا و ناچار بوون تەواوی ڕۆژ ڕێگا بپێون، چونکە ئازووقە بەشی لەشکری نەدەکرد. خیریسۆفۆس فەرماندەی پێشقەرەوڵ بوو و گزنفۆنیش پاشقەرەوڵ.

کاردوخەکان بێپسانەوە پەلاماریاندەدا. ئەو شوێنانەی یۆنانییەکانیان دەبوایە پێیاندا دەربازبن، پتر دۆڵ و تەنگە بەرایی بوون، بەردەوام بە تیر و قۆچەقانی دەیانکوتان. یۆنانییەکان ناچار بوون نیوەنیوە وەدوای کاردوخەکان بکەون و خێراش بگەڕێنەوە لای لەشکر و هێدی هێدی ڕێگا بپێون. هەرکات هێزەکانی دوژمن هێرشیان دەهێناوە، گزنفۆن دووبارە و بە نهێنی فەرمانی بە لەشکر دەدا بۆ تاوێک بوێستن. خیریسۆفۆس بە گەیشتنی فەرمان خێرا ڕادەوەستا. لە درێژایی ئەو پەلامارانەدا، جارێکیان گزنفۆن فەرمانی وێستانیدا، خیریسۆفۆس لەجیاتی ڕاوەستێ یەکسەر دەستووری حەڕەکەتی خێراتری بە هێزەکانیدا. هێزەکانی گزنفۆنیش ناچار بوون بەدوایدا بڕۆن. وێدەچوو ڕووداوێک قەوماوبێ. گزنفۆن ئەوەندەی وەخت نەبوو خێرا بچێتە پێشەوە و بزانێ چبووە و خیریسۆفۆس بۆچی پەلە دەکات و دوایەش بگەڕێتەوە لای دەستەکەی خۆی. ڕێگا ڕۆیشتنی هێزەکانی پاشقەرەوڵ زیادتر وەک هەڵاتن دەچوو. لەو پەلامارەی دواییدا یەکێک لە جەنگاوەرەکانی لاکیدێمۆنی بە ناوی لیئۆنیمۆس بە تیرێک کە قەڵغان و جلە چەرمییەکەی بەری کون کردبوو کوژرا و لە هێزەکانی تەنیشتەوەش یەکێکی دیکە بە ناوی ڤاسیاس، خەڵکی ئارکادی تیر وەسەری کەوت و لە پشتسەری هاتەدەر و لەجێوە کوژرا.

کاتێک هێزە یۆنانییەکان بە مەبەستی ئۆردو لێدان گەیشتنە گوڕایی، گزنفۆن خێرا ڕووی لە خیریسۆفۆس کرد و بەوە تاوانباری کرد کە سەرەڕای فەرمانی

ویستان، ئەو ڕانەوەستاوە و پاشقەرەوڵەکان ناچار بوونە بە قوونە شەڕ و ڕاکردن خۆیان بگەیێننەوە لەشکر. ناوبراو ڕوو لە خیریسۆفۆس و لە درێژەدا گوتی" ئەوەش ئاکامی کارەکەت!"، دوو کەس لە باشترین سەربازەکانمان بە ناهەق کوژران، بەبێ ئەوەی بتوانین تەنانەت جەنازەکانیشیان بستێنینەوە و بیاننێژین". خیریسۆفۆس لە وڵامدا گوتی: " چاوێک لەو چیا بەرزانە بکە دەبینی بۆ دەرباز بوون چەندە دژوارن. تەنیا یەک ڕێگای هەورازمان لەبەرە و ئەویش لەلایەن کۆمەڵێک خەڵکی دژبەر گیراوە و پارێزگاری لێدەکرێ. بۆیە گوێم نەدایە فەرمانی تۆ، گەرەکم بوو پێش ئەوەی هێزەکانی دوژمن ئەو ڕێگەیە بگرن من بە هێزەکانمەوە بگەمە ئەوێ. چاوساغەکانمان دەڵێن جیا لەو ڕێگایە هیچ دەربازگەیەکیتر لەگۆڕێدا نیە ".

گزنفۆن وەجواب هات و گوتی:" من تەنیا دوو کەسم لە خەڵکی ئەو ناوچەیە بەدیل گرتووە. چەند کەسێکیشم لێ کوشتن چونکە زۆریان ئەزیەت کردین. ئەوەش لە کاتێکدا بوو کە خەریکی پشوودان بووین. ئەو دوو کەسەشم بۆیە زیندوو ڕاگرتووە، بۆوەی وەک چاوساغ کەڵکیان لێوەرگرین و زۆر باش شارەزای ناوچەکەن ".

دیلەکانیان خێرا هێنایە پێشەوە. غەیری ئەو ڕێگایەی لەبەر دەمیان بوو، پرسیاری ڕێگاوبانی دیکەیان بە جیا لە هەریەک لەو دوو گیراوە کرد. یەکێکیان بە شێوەی جۆراوجۆر خۆی لە وڵامدانەوە دەپاراست. یۆنانییەکان لەبەر چاوی ئەوەی دیکە سەری ئەمەیان بە شمشێر پەڕاند. ئەوەی مابۆوە کاتێک پرسیاری لێکرا، گوتی کەسی یەکەم بۆیە نەیویست وڵام بداتەوە چونکە ماڵی کچەکەی لەو شوێنەیە کە بۆ دەربازبوونی ئێوە گونجاوە. ئەو کابرایە هەڵبەت بە ڕێگایەکی باشی دەزانی و دەکرا وڵاغ و بارهەڵگریش پێیدا برۆن. کاتێک لێیان پرسی شوێنی سەخت و چڕ بۆ تێپەڕین لەسەر ئەو ڕێگا پێشنیارکراوە هەیە. کابرا لە وڵامدا گوتی شاخێک لەبەر دەمیان هەڵکەوتووە، ئەگەر خێرا نەیگرن ئەوسا ئیمکانی ڕۆیشتن بەوێدا زۆر کەمە.

گزنفۆن و خیریسۆفۆس لەو نێوەدا بڕیاریاندا لۆکاژەکانی فەرماندەی چەکدارانی قورس و سووک کۆکەنەوە و وەزعی ڕێگاوبانیان لەگەڵ باس

بکەن. لە کۆتایی ئەو کۆبوونەوەیدا پرسیاریان کرد کە کێ غیرەتی ئەوەی هەیە بە خواستی خۆی ڕێگای شەڕ دژی دوژمن بگرێتە بەر. لە نێو سەربازەکانی سووکە چەکداردا، ئاریستۆنیمۆسی خەڵکی مێتیدریۆی ناوچەی ئارکادی و ئاغاسیاسی ستێمفالی سەر بە ناوچەی ئارکادی ئامادەیی خۆیان دەربڕی.

بۆ کێبەرکێ کردن لەگەڵ ئەوانە کلیماخۆسی خەڵکی پەراسیۆ و ئارکاداس حازر بە جەنگین دژی دوژمن بوون، بەو شەرتەی بتوانن خەڵکی خۆبەخش لە نێو لەشکردا لەگەڵ خۆیان بەرن. ئارکاداس گوتی: " دڵنیام لاوێکی زۆر وەدوام دەکەون و بە قسەشم دەکەن، کاتێک بزانن من فەرماندەریان دەکەم ". دوایە داوایان لێکرد کە بە خواستی خۆی سەردەستەیەکیش لە سووکە چەکدارەکان لەگەڵ خۆی بەرێت. ئاریستێئاسی خەڵکی خیۆس ئەو کەسە بوو کە هاتە پێشەوە و هەروەک لە زۆر هەلومەرجی دژواردا جوامێری نواندبوو، ئەو جاریش سەردەستەیی سووکە چەکدارەکانی وەستۆ گرت.

## بەشی ٢

### ناردنی دوو هەزار جەنگاوەری یۆنانی بە مەبەستی داگیرکردنی بەرزاییەکان - کۆبوونەوەی یۆنانییەکان لەو شوێنە گوزەرێکی بەرتەسک

کاتێک شەو داهات ستراتێژەکان (گزنفۆن و خیریسۆفۆس) دەستوریان بە شەڕکەرە خۆبەخشەکاندا نانی شەو بخۆن و وەڕێکەون. کابرای چاوساغ بە دەست بەستراوی ڕادەستی ئەو کۆمەڵە خۆبەخشە درا و بڕیار وابوو دوای گرتنی دوندی چیاکەش، تەواوی شەو ناوبراو لای خۆیان ڕاگرن و ئەگەریش ڕۆژ بۆوە، بە شەپیوڕ لەشکری نێوەندی ئاگادار بکەنەوە. هەروەها قەرارياندا خۆبەخشەکان لەسەر چیاکەڕا بەرەو ڕێگای ژێر دەستی دوژمن داگەڕێنە خوارەوە و هێزەکانی خیریسۆفۆس‌یش خێرا بۆ یارمەتیدان خۆیان بگەیێننە ئەو شوێنە.

پاش ڕێککەوتن لەسەر ئەو خاڵانە، ژمارەی خۆبەخشەکان گەیشتە دوو هەزار کەس و لە ژێر بارانێکی بەخوڕدا وەڕێکەوتن. گزنفۆن بە هێزەکانی پاشقەرەوڵەوە بەرەو ڕێگای ئەسڵی وەسەرکەوت و مەبەستی لەو کارە ئەوە بوو سرنجی دوژمن بۆ لای خۆی ڕاکێشێ و دەست و باڵی هێزی خۆبەخش بۆ بەڕێوەبردنی نەخشەکانی تەواو ئاواڵە بێت. کاتێک هێزەکانی پاشقەرەوڵ گەیشتنە زارکی ئەو دۆڵەی دەبوایە پێیدا دەرباز بن و ویستیان بەرەو شوێنی

مەبەستی ئەسڵییان بڕۆن، کاردوخەکان دەستیان بە خلۆر کردنەوەی گاشەبەردان کرد. ئەو بەردانە کاتێک دەکەوتنە سەر ڕەوزەکان پارچە پارچە دەبوون و پانتاییەکی زۆری دادەگرت. بەو وەزعە نیزیکبوونەوە لەو دۆڵە تەواو دژواربوو. هێندێک لە لۆکاژەکان لەبەر ئەوەی نەیانتوانی لەو شوێنە نیزیک بکەونەوە، ناچار بوون شوێنێکیتر بگرن. تا شەو داهات ئەو بارودۆخە بەردەوام بوو. هێزە یۆنانییەکان وەختێک هەستیان بەوە کرد کە دەتوانن پێشڕەوی بکەن، دوور لە چاوی دوژمن روویان لە جێگایەک بۆ حەسانەوە و زیافەت کرد. دەستەی پاشقەرەوڵ لە ڕۆژی بەرێوە زەوادیان نەبڕیبوو. هێزەکانی دوژمنیش بەردەوام و بە درێژایی شەو خەریکی خلۆرکردنەوەی گاشە بەردان بوون. خلۆربوونەوەی بەردەکان تەواوی دۆڵەکەی داگرتبوو و دەنگی دەدایەوە.

لەو بەینەدا هێزەکانی خۆبەخش بە یارمەتی چاوساغ دەوریان لێدابوو و توانیبوویان بە ڕێگایەکی باریکتردا بڕۆنە پێشەوە و پاسەوانەکانی دوژمن لە کاتێکدا بگرن کە لە سەرمان ئاگریان کردبۆوە و خۆیان گەرم دەکردەوە. خۆبەخشەکان پەلاماری پاسەوانەکانیان دابوو و چەند کەسیان کوشتبوو و ئەوەیتریشیان ڕاونابوو. یۆنانییەکان لەو شوێنە مابوونەوە و پێیانوابوو کە بڵیندایی مەبەستیان گرتووە و بەسەر دوژمندا زاڵن. ئەوان نەیانزانیبوو کە ئەو جێگایەی گرتبوویان چیای مەبەست نەبوو و شاخێکی بەرزتر لە شوێنی ئەوان بەدەست قەرەوڵەکانی دوژمنەوەیە بوو و ڕێگا باریک و تەنگەبەرەکەش بەوێدا دەچوو. بەهەر حاڵ لەو جێگایە مانەوە. دیارە لەو بەرزاییەشڕا دەکرا پەلاماری ئەو هێزانەی دوژمن بدەن کە ڕێگاکەیان خستبوە ژێر دەسەڵاتی خۆیان و بە بوونیان نەیاندەهێشت هێزە یۆنانییەکان بەوێدا تێپەڕن.

ئەو شەوە لەوێ مانەوە. کاتێک ڕۆژ بۆوە، بە نەزم و بەبێ دەنگی دژی هێزەکانی دوژمن وەڕێکەوتن. تەم و مژ تەواوی ناوچەکەی داگرتبوو، نیزیکی هێزەکانی دوژمن کەوتنەوە بەبێ ئەوەی کەس هەستیان پێبکا. کاتێک یۆنانییەکان چاویان بە کاردوخەکان کەوت، شەیپوڕ لێدرا و لەشکر بە هەراوهوریا و سرود خوێندنەوە پەلاماری دوژمنیاندا. ئەوان خۆیان

پێرانەگیرا و بەرزاییەکەیان جێهێشت و هەڵاتن. لەبەر ئەوەی سووکە چەکدار بوون، توانیان بێگرفت ڕابکەن و تەنیا چەند کەسێکیان لێکوژرا. خیریسۆفۆس لەگەڵ بەشەکەی خۆی کاتێک گوێی لە شەیپور بوو خێرا پەلاماری بەرزایی پێشەوەی‌دا. ستراتێژەکانی‌تریش هەر یەکە لەلایەکەوە خێرا ڕوویان لەو دەوروبەرە کرد. هەرکامیان لەبەر خۆیەوە شوێنێکی گرت و وەسەرکەوت و بە چیا هەڵگەڕا و هەر کەس ئەوەی‌تری بە نێزە ڕایەڵکردن و ڕاکێشان یارمەتی دەدا کە وەسەرکەوێ. پیاوانی خیریسۆفۆس یەکەم کەس بوون کە گەیشتنە لای شەڕکەرە خۆبەخشەکان کە دوندی چیاکەیان گرتبوو.

گزنفۆن، ئەویش بە هەمان شێوە، نیوەی لەشکری پاشقەرەوڵی لەگەڵ خۆی هێنابوو و بەرەو ئەو شوێنە ڕۆیی کە پێشتر خۆبەخشەکانی خاوەن کابرای چاوساغ دەبوایە گرتبایان. بە ڕێگایەکدا بەرەو ئەوان چوو کە ڕاحەتتر بوو و دەکرا وڵاغەکانیش بەوێدا دەرباز بکەن. پاشماوەی هێزەکانی پاش قەرەوڵیش بە دوای وڵاغ و بارهەڵگرەکاندا وەڕێکەوتن. کاتی پێشڕەوی، تووشی بەرزاییەک لەسەر ڕێگا هاتن کە لە لایەن هێزەکانی کاردوخەوە گیرابوو. ناچار بوون ئەوان لەو سەرە هەڵقەنن بۆوەی بتوانن بگەنە باقی هێزەکانی لەشکری یۆنانی ئەگینا بە پانەوە تێدادەچوون. هەڵبەت ئەو جەماوەرەی دواییش دەکرا ڕاست بەو ڕێگایەدا بڕۆن کە پێشتر خۆبەخشەکان پێیدا چووبوون، بەڵام نەیاندەتوانی وڵاغ و بارهەڵگرەکان بەوێدا دەربازکەن.

هێزەکانی پاشقەرەوڵی خاوەن وڵاغ و بارهەڵگر لەپڕێکا دەستیان بە هەراوهوریا و هاندانی یەکتر کرد و دەستە دەستە بە شێوەی بازنەیەک بەرەو بەرزایی گۆرین ڕۆیشتن و تەنیا ڕێگایەکی هەڵاتنیان بۆ هێزەکانی دژبەر هێشتبۆوە. یۆنانییەکان هەر هەنگاوێک وەسەر دەکەوتن و وەنیزیک دەکەوتنەوە، هێزەکانی دوژمن خەستتر بە تیر و بەرد لێیان‌دەدان. کاتێک یۆنانییەکان نیزیکی دوندی چیاکە بوونەوە، هێزەکانی دژبەر شوێنەکەیان چۆلکرد و ڕایانکرد. یۆنانییەکان ئەو شاخەیان گرت و لەنەکاو چاویان بە کێوێکی‌تر کەوت کە ئەویش لەلایەن دوژمنەوە گیرابوو. بڕیاریان‌دا پەلاماری ئەو شاخەش بدەن. بۆ گرتنی ئەو بەرزاییەش، شێوازی پێشوویان ڕەچاوکرد.

گزنفۆن بیری لەوە کردەوە ئەگەر ئەو شاخەی پێشتر گرتوویانە چۆڵی بکەن و بچنە چیاکەی پێشەوە، ڕەنگە هێزەکانی دوژمن دووبارە ئەوێ داگیربکەنەوە بۆوەی پلاماری بارهەڵگرەکان بدەن کە لەبەر تەنگی دۆڵەکە بە خەتێکی باریکدا پێشڕەوییان دەکرد. گزنفۆن دەستووریدا لۆکاژ کیفیسیۆدۆرۆسی ئاتێنی کوڕی کیفیسیۆندا و هەروەها ئەمفیکراتیسی ئاتێنی کوڕی ئامفیدیمۆ و ئارخاغۆرای ئارغۆسی کە لە ویلایەتی خۆی دوور خرابۆوە، لەسەر ئەو شاخە بمێننەوە. خۆی لەگەڵ باقی هێزەکان پەلاماری بەرزایی دووهەمیدا و ئەویشی بە شێوازی پێشوو گرت.

بەرزایی سێهەم مابوو کە تۆزێک بەرزتر و نەدیوتر لەو دوو شاخەی پێشوو بوو و بەسەر کێوێکدا دەیڕوانی کە شەوی پێشتر خۆبەخشەکان ڕوویان تێکردبوو و توانیبوویان پاسەوانانی دوژمن لە کاتی خۆگەرمکردنەوەدا بگرن. کاتێک یۆنانییەکان نیزیکی ئەو چیایە کەوتنەوە، کاردوخەکان بەبێ شەڕ چۆلیان کرد و ئەوەش خۆی جێگای پرسیار بوو.

یۆنانییەکان پێیانوابوو کە کاردوخەکان لە ترسی لە گەمارۆکەوتن ئەو کارەیان کردبێ. بەڵام دواتر دەرکەوت کە ئەوان لە سەرەوەڕا چاویان لە هێزەکانی پاشقەرەوڵ ببوو کە چەندە کەم ببوونەوە و هێرشیان کردبوە سەر ئەوان. گزنفۆن خۆی لەگەڵ هێزەکانی لاوی پێشقەرەوڵ خەریکی وەسەر کەوتنی چیای پێش خۆیان بوون، هەر لەو کاتەدا دەستووریدا بە نەزم و ئارامتر بڕۆن تا هێزەکانی پاشەوە بەجێ نەمێنن. ڕایگەیاند کە ڕێگای سەرەکی بگرنەبەر و لە شوێنێکی گۆڕ و بەر ئاوەڵا چاوەڕوان بن.

کاتێک خەریکی ئەو دەستووراتە بوو، ئارخاغۆراسی ئارغایی بە غاردان خۆی گەیاندە گزنفۆن و گوتی لە لایەن دوژمنەوە کەوتوونە بەر پەلامار و شاخەکەیان لە دەست چووە و کیفیسیۆدۆرۆس و ئامفیکراتیس و تەواوی جەنگاوەرە پاشقەرەوڵەکان کە نەیانتوانیوە خۆیان لە چیاکە هەڵدێرن، کوژران.

کاردوخەکان دوای ئەو سەرکەوتنە، چیایەکیتریان گرت کە لە پێش شاخی سێهەم هەڵکەوتبوو و پێشتر لەبەر دەستی هێزە یۆنانییەکاندا بوو. گزنفۆن کاتێک چاوی بە کاردوخەکان کەوت لەگەڵیان کەوتە ڕاوێژ بۆوەی ئاگر بەس ڕاگەیێنن

و جەنازەی کوژراوەکان وەرگرنەوە. کاردوخەکان گوتیان کە بەو شەرتە جەنازەکان دەدەنەوە، یۆنانییەکان بەڵێن بدەن دێهات و ماڵ و ملکیان نەسووتێنن. گزنفۆن ئەو شەرتەی قبوڵ کرد. کاتێک پیاوانی پاشقەرەوڵ و ولاغ و بارهەڵگرەکان بە ڕێگاوە بوون و دانوستان سەبارەت بە ئاشتی درێژەی بوو، کاردوخەکان گشتیان لە سەر شاخێکی کۆبوونەوە کە پێشتر گرتبوویان. یۆنانییەکان کاتی دابەزین لە چیاکان بۆوەی تێکەڵ بە هێزەکانی پاشقەرەوڵ بنەوە، تەواو پەرشوبڵاو چاوەڕوانی دەستووری نوێ بوون. ڕاست لەو وەختەدا جەماوەرێکی ئێجگار زۆری کاردوخەکان بە دەنگی نەعرەتە پەلاماری یۆنانییەکانیاندا. ئەو هێزە کاتێک گەیشتە سەر چیای پێش خۆیان، دەستیانکرد بە خلۆرکردنەوەی دووبارەی گاشەبەردەکان دژی گزنفۆن کە لەو کاتەدا لە شاخەکە دادەگەڕا خوارەوە. یەکێک لە هێزەکانی پاشقەرەوڵ بەردی وەلاقی کەوت و بریندار بوو و نۆکەر و مەتاڵهەڵگری گزنفۆنیش بەناوی ئێڤریلۆغۆسی خەڵکی دەڤەری لسۆسی سەر بە ناوچەی ئارکادی خۆی گەیاندە ناوبراو و بە مەتاڵەکەی داپۆشی و هەردووکیان لەژێر سایەی مەتاڵ لە شوێنەکە دوور کەوتنەوە. باقی هێزەکانی پاشقەرەوڵیش بەرەو لەشکری ئەسڵی کە لە حاڵی شەڕدا بوو ڕێگایان گرتەبەر.

دوای ئەو ڕووداوانە تەواوی لەشکری یۆنانی لە شوێنێک کۆبۆوە و ئۆردویان لەنێو ماڵەکاندا لێدا و جێگایەک بوو کە خانووی ڕێکوپێک و جوانی هەبوو و ئازووقەیەکی فرەی لێ دەست دەکەوت. شەڕاب ئەوەندە زۆر بوو کە لە چاڵی سواغ کراو بە قسڵدا پاشەکەوت دەکرا. گزنفۆن و خیریسۆفۆس لەو بەینەدا توانیان کوژراوەکان لە بەرامبەر چاوساغەکە لە کاردوخەکان وەرگرنەوە. ڕێوڕەسمی قەدر و ڕێزلێنانی قارەمانییەتی بۆ کوژراوەکان بەڕێوە چوو و جەنازەکان نێژران.

ڕۆژی دوایی بە بێ چاوساغ ڕێگایان گرتەبەر. هێزەکانی دوژمن بەلام، خێرا ڕێگا و دۆڵەکانی پێشەوەیان گرت و حەولیاندا بەر بە پێشڕەوی هێزە یۆنانییەکان بگرن. هەر جارێ کە کاردوخەکان پێشی پێشڕەوی پێشقەرەوڵەکانیان دەگرت، گزنفۆن بە خۆی و پیاوەکانی پاشقەرەوڵ لە ڕێگا

دەچووە دەر و بەرزاییەکی دەگرت و بەسەر هێزەکانی کاردوخیدا زاڵ دەبوو. ئەوسا کاردوخەکان دووبارە پەلاماری هێزەکانی پاشلەشکریان دەدا. خیریسۆفۆس‌یش بە نۆرەی خۆی لەگەڵ هێندێک لە هێزەکانی لە ڕێگا لایدەدا و بەرزاییەکی دەگرت کە پێشتر لە دەست کاردوخەکان‌دا بوو و بەو شێوەیە ڕێگای بۆ هێزەکانی پاش لەشکر خۆش دەکرد. بەو چەشنە و بە یارمەتی یەکتر هەر لایەنە بە نۆرەی خۆی پارێزگاری لەوەی‌تر دەکرد.

یۆنانییەکان تا ڕادەیەکی زۆر لەلایەن کاردوخەکانەوە تووشی ئازار هاتن، بە تایبەت ئەو کاتەی کە لە چیاکان دەهاتنە خوارەوە. چونکە هێزەکانی کاردوخ سووکە چەکدار بوون و بەردەوام و خێرا دەیانتوانی خۆیان لە مەترسی ڕزگار بکەن، تەنانەت ئەگەر زۆر نیزیک لە هێزەکانی دژبەریش بان. کاردوخەکان کەمانداری گەلێک چالاک بوون. کەمانەکانیان سێ زەرع درێژ بوو و تیرەکانیشیان زیادتر لە دوو زەرع دەبوو[٩٢]. کاتێک بە تیر و کەوان نیشانەیان دەگرت، بۆ کێشانەوەی ژێی کەوان، عادەتیان بوو سەرێکی کەوانەکە بە پێی چەپیان ڕاگرن. تیرەکان لەبەر شیدەت و توندی کە لە سێرەگرتنێکی بەو چەشنە سەرچاوەی دەگرت، قەڵغان و زرێی کون‌دەکرد. کاتێک ئەو تیرانە دەکەوتنە دەست یۆنانییەکان، ئەوان وەک نێزە کەڵکیان لێوەردەگرتن و بە چەرم لە نێوەڕاستی نێزەکە جێگای دەستیان دروست دەکرد[٩٣] تا بتوانن لە کاتی شەڕدا مەحکەم ڕایگرن. بۆ کاری لەو چەشنە، خەڵکی دورگەی کرێت بە فەرماندەری "ستراتۆکلی" خزمەتێکی بەرچاویان بە لەشکری یۆنانی کرد.

---

٩١- کەوانی جەنگاوەرانی بەربەر گەلێک گەورە و درێژ و بەقەرایی بەژنی پیاوێک دەبوو. کەواندار کاتی هاویشتنی تیر دەبوایە سەرێکی کەوان لەسەر عەرز و لەژێر پێی چەپی دابنێ، بۆوەی بتوانێ بێ جووڵە ڕایگرێ.

٩٢- لە نێوەڕاستی بەژنی نێزەدا دەستگرێکی چەرم هەبووە. نێزەدار دەبوایە دوو پەنجەی دەستی لەنێو بنێ بۆوەی باشتر بتوانێ نێزەکە بوەشێنێ و نیشانەی پێبگرێ.

## بەشی ٣

## گەیشتنە نیزیک ئاوایی کێندریت - گرفتی نوێ - خەونی گزنفۆن

هەمان ڕۆژ لە گوندێکی هەڵکەوتوو لە سەرووی سەحرای نیزیک چۆمی کێندریت(سانتریت) مانەوە و ئۆردویان لێدا. بەرینایی ئەو چۆمە دوو پلێترا بوو و وڵاتی کاردوخەکانی لە ئەرمێنیا جیا دەکردەوە. کاتێک یۆنانییەکان چاویان بەو دەشتە کەوت، هەستیان بە حەسانەوەیەک کرد. مەودای نێوان ئەو چۆمە و چیاکانی وڵاتی کاردوخ شەش تا حەوت ستادیۆ دەبوو. ئۆردو لێدان لە نێوان گوندەکانی ئەو دەڤەرە بووە مایەی دڵخۆشی یۆنانییەکان. حەوت ڕۆژ ڕێپێوان بەناو گوندەکانی وڵاتی کاردوخدا، زەرەد و زیانێکی فرەی پێگەیاندبوون و زیادتر لە ڕەنج و ئازاری پاشا و تیسافێرن بوو و لێرە توانیبوویان ئازووقەیەکی فراوان وەدست بێنن و خەیاڵیان ئاسودە بێت و بە ڕاحەتی پاڵی لێبدەنەوە. بە دوور لەو هەموو ناخۆشیانە، بە ڕەزایەتەوە خەویان لێکەوت.

کاتێک ڕۆژ بۆوە و وەخەبەر هاتن، چاویان بە هێزێکی سوارە نیزام لەو بەری چۆمی کەوت کە مەبەستیان پێشگیری لە پەڕینەوەی هێزە یۆنانییەکان

بۆ ئەوبەری رووبارەکە بوو. لەلایەکیتریشەوە قۆشەنێکی گەورەی پیادەیان دیت کە بەرزاییەکانی نیزیک چۆمیان گرتبوو و ئاشکرا بوو کە ڕێگای چوونی نێو وڵاتی ئەرمێنیایان بەربەست کردبوو. ئەوانە ئەرمەنی، خالدی، ماردی و سەرجەمیان پیاوانی بەکرێگیراوی ئۆرۆنتاس و ئارتوخا[94] بوون.

سەبارەت بە خالدییەکان دەگوترا کە جوامێر و شەڕکەر و خاوەن قەڵغانی چندراوی گەورە و نێزەی درێژ بوون. مەودای نێوان بەرزاییەکانی ژێردەستی ئەو هێزانە تا چۆم دەگەیشتە سێچوار پلێتر. ڕێگایەک بەرەو ئەو بەرزاییانە وەبەر چاو دەکەوت کە وێدەچوو دروست کراو بێت. یۆنانییەکان گەرەکیان بوو بەو ڕێگایەدا تێپەڕن. کاتێک یۆنانییەکان ویستیان لەو ئاوە بپەڕنەوە، دەرکەوت کە قووڵایی چۆم دەگاتە سینگی مرۆڤ و ئاوەکەشی زۆر خوڕێن و ژێرەکەشی تەواو خڕکەبەردە و پیاو لەسەریان هەڵدەخلیسەکێ. ئەوان نەیاندەتوانی چەکەکانیشیان لەنێو ئاو بنێن و تەڕیان بکەن، ئەگەر بە دەستەکانیشیان بەرزیان کردبانەوە ئەوجار خوڕێنی ئاو دەیبردن و بە ڕووتی و بێ چەک دەکەوتنە بەر پەلاماری تیر و نێزەی دوژمن. لەڕووی ناچاری گەڕانەوە دواوە و لە نیزیک چۆم ئۆردویان لێدا. یۆنانییەکان وەبیریان هاتەوە کە شەوی پێشوو کاتێک لەسەر چیا ئۆردویان لێدابوو، هێزێکی زۆری کاردوخەکانیان دیتبوو کۆدەبنەوە و خۆیان بۆ پەلامار ئامادە دەکەن.

یۆنانییەکان لەوپەڕی ناهومێدیدا بوون چونکە لە لایەکەوە بیریان لە رووباری بێ بوار و هێزەکانی ئەوبەری چۆم دەکردەوە کە ڕێگای پەڕینەوەیانی بەربەست کردبوو. لەلایەکیتریشەوە و ناخۆشتر لە هەر شتێک، بوونی هێزەکانی کاردوخ لە حاڵی ئامادەباشی تەواودا، بەمەبەستی پەلاماردان

---

٩٣- ڕێبەری ئەرمەنییەکان ناوی ئۆرۆنتاس و هی ماردییەکانیش بە ئیحتیمالی زۆر ئارتووخاس بووە. گزنفۆن لە کتێبی پەروەردەی کوروشدا ناوی ئارتووخاس وەک سەرۆکی گرکانییەکانیش دێنێ. ئەوانە دراوسێی ماردییەکان بوونە. گرکانی یا غرکانی خەڵکێکی شەڕکەر و لە شاخەکانی وڵاتی ئەرمەنستان ژیاون. خالدییەکان عەشیرەتێکی سەربەخۆی ئەرمەنستان و بەبۆچوونی گزنفۆن خزمی خالیفییەکان بوونە. ستراڤۆن دەڵێ کە خالدییەکان لە زەمانی زوودا پێیان گوتراوە خالیفی.

له باشووره‌وه و ڕاست له کاتی په‌ڕینه‌وه له چۆم بوو. ئه‌و نیگه‌رانییانه سه‌ریان له یۆنانییه‌کان شێواندبوو.

له‌به‌ر گشت ئه‌و گیروگرفتانه، ئه‌و شه‌و و ڕۆژه بێ نه‌زمییه‌کی فره به‌سه‌رياندا زاڵ ببوو. گزنفۆن خه‌ونێکی بینی. له خه‌ونه‌که‌يدا پابه‌ندی له قاچه‌کانی کرابوو. پاش فه‌تره‌یه‌ک پابه‌نده‌کان له‌خۆڕا کرابوونه‌وه و گزنفۆن دووباره ده‌ستی به ڕۆیشتن کردبۆوه و ئازادی وه‌ده‌ست هێنابۆوه. ناوبراو کاتی خۆرگزینگدان هاته لای خیریسۆفۆس و پێیگوت هومێدێکی باشی هه‌یه چونکه خه‌ونێکی به‌خێری دیتووه و هێزه یۆنانییه‌کان تووشی ڕۆژانی خۆش دێن.

خیریسۆفۆس گه‌لێک خۆشحاڵ بوو. هه‌رکه گزینگی خۆر ده‌رکه‌وت گشت ستراتێژه‌کانی یۆنانی هاتن و قوربانییان پێشکه‌ش کرد و له کاتی یه‌که‌م قوربانیدا نیشان و هێماکانی موقه‌دده‌س و به خێروبێر ده‌رکه‌وتن. ستراتێژه‌کان شوێنی قوربانییان جێهێشت و ده‌ستووری میوانداری سه‌ربازه‌کانیان به لۆکاژه‌کاندا.

گزنفۆن کاتێک خه‌ریکی خواردن بوو، دوو لاوی گه‌نج لێی وه‌نیزیک که‌وتن. هه‌ڵبه‌ت گشت لایه‌ک ده‌یانزانی که کاتی خواردن ده‌توانن بچنه لای گزنفۆن و له‌گه‌ڵی بدوێن و ئه‌ویش خۆی ئه‌و ئیزنه‌ی دابوو که له وه‌ختی زیافه‌تدا سه‌رقاڵی بکه‌ن. گه‌نجه‌کان به گزنفۆنیان گوت، کاتێک خه‌ریکی ئاوردوو کۆکردنه‌وه بۆ ئاگر بووین، له قه‌راخی ئه‌وبه‌ری چۆم و له‌سه‌ر ڕه‌وه‌زه‌کان که تا سه‌رچاوه‌ی چۆم ڕاکشا بوون، پیاوێکی پیر و ژنێک و چه‌ند کچی جحێڵ خه‌ریکی شاردنه‌وه‌ی بوخچه و پرێسکه‌ی جلوبه‌رگ له قه‌ڵشتی ڕه‌وه‌زێکدا بوون. گه‌نجه‌کان له‌وه‌ی دیتبوویان بۆیان ده‌رکه‌وتبوو که ئه‌و شوێنه بۆ ده‌ربازبوونی به‌بێ مه‌ترسی ده‌بێ.

هێزه‌کانی سواره‌ی دوژمن نه‌یانده‌توانی تخوونی ئه‌و جێگایه بکه‌ون، چونکه ڕه‌وه‌ز و هه‌ڵدێر بوو. گه‌نجه‌کان گێڕایانه‌وه که خۆیان ڕووت کردوه‌ته‌وه و جله‌کانیان به ده‌سته‌وه گرتووه و به ڕووتی له‌و چۆمه په‌ڕیونه‌وه و گه‌ره‌کیان بووه مه‌له بکه‌ن. کاتێک به‌ره‌و پێش چوونه، دیتوویانه بواری ئاوه‌که ئه‌وه‌نده ته‌نک بووه که ئاو نه‌گه‌یشتووه‌ته نێوگه‌ڵیان. کاتێک

پەڕیونەوە بووخچەکانیان لەگەڵ خۆیان هێناوە و هاتوونەوە ئەوبەرەی ڕووبار. گزنفۆن خێرا قوربانییەکی پێشکەش کرد و جامی گەنجەکانیشی لە شەڕاب پڕکرد و تێکڕا دەستیان بە دوعا و پاڕانەوە لە خواکان کرد، چونکە خەونەکە وەڕاست گەڕابوو و ڕێگای پەڕینەوەیان دۆزیبۆوە و خەریک بوو کۆتایی بە گیروگرفتەکانیان بێ.

وەختێک ڕێوڕەسمی قوربانی بەڕێوەچوو، گەنجەکانیان بردنە لای خیریسۆفۆس. ئەوان ڕەوتی ڕووداوەکەیان بۆ ناوبراو گێڕایەوە و ئەویش خێرا قوربانییەکی پێشکەشی بارەگای خواوەندەکان کرد. دوای قوربانی فەرمان بە لەشکردرا باروبنە تێکبنێ و دوایەش دوو گەنجەکە بانگهێشتی کۆبوونەوە کران. لەوێدا دەبوایە بڕیار بدەن کە چۆن دەکرێ بە باشترین و بێ مەترسیترین شێوە لە چۆم بپەڕنەوە و بەسەر دوژمنی جێگیر لەوبەری چۆمدا زاڵبن و لە لایەن هێزەکانی دژبەری پشت سەریان(کاردوخەکانی ئامادەی پەلامار) تووشی زەرەد و زیان نەبێن. بڕیاریان‌دا خیریسۆفۆس لە پێشەوە بە نیوەی لەشکرەوە لە چۆم بپەڕێتەوە و نیوەکەی‌تریش لە پشتەوە لەگەڵ گزنفۆن بێت و وڵاغ و بارهەڵگر و خەڵکی بێ چەکیش لە نێوەڕاست بن.

کاتێک هەموو کارەکان وەک چاوەڕوان دەکرا جێبەجێ بوون، ئەوسا بە چاوساغی ئەو دوو گەنجە وەڕێکەوتن و ڕووباریش لەلای چەپیان هەڵکەوتبوو. مەودای ڕێگا تا زارکی ڕەوەزەکە نیزیکەی چوار ستادیۆ دەبوو. لەبەر ئەوەی بە قەراخ چۆمدا هەڵدەکشان، لەوبەر چۆمەوە هێزەکانی دوژمن بەرەو بەرزایی ڕوبەڕوو وەڕێکەوتن. وەختێک یۆنانییەکان گەیشتنە بەرامبەری قەڵشتی ڕەوزەکەی ئەوبەر چۆم، فەرمانی ئامادەباشی بۆ شەڕ درا و سەرەتا خیریسۆفۆس تاجی سەری هەڵگرت[95] و جلەکانی داکەند و دەستی دایە چەک و دەستووری بە تەواوی سەربازەکانیشی‌دا هەمان کار بکەن و داواشی لە لۆکاژەکان کرد پیاوانی ژێر دەستیان بە شێوەی ستوونی نیزامی ڕیزبن و هێندێکیان بە لای ڕاستدا و بەشێکیش بە لای چەپدا

---

٩٤- بەپێی نەریتی سپارتی‌یەکان، سەربازەکانیان پێش دەستپێکی شەڕ تاجیان لەسەر ناوە و بزنیان کردوەتە قوربانی و بلوێرژەنان مۆسیقایان لێداوە.

وەڕێکەوون. تاڵەبینەکانیش لەو نێوەدا قوربانییان پێشکەش بە خواوەندی چۆم و بەحران کرد[٩٦] و هێزەکانی دوژمنیش بەردەوام خەریکی تیر و بەرد هاویشتن بوون. نە تیرەکان و نە بەردەکانیان نەدەگەیشتنە هێزە یۆنانییەکان. قوربانییەکان نیشانەی سەرکەوتنیان پێوە دیاربوو. تەواوی جەماوەری لەشکر دەستیان بە خوێندنەوەی سرووودی نەتەوایەتی کرد و هاواریان لێ بەرز بۆوە. ژنەکانیش گشتیان لەگەڵ ئەو جەماوەرە روویان لە شایی و خۆشی کرد[٩٧] و ژمارەشیان لە نێو لەشکردا قەیاسێک بوو[٩٨].

خیریسۆفۆس کاتێک لەگەڵ هێزەکانی خۆی لە چۆم دەپەڕییەوە، هێزەکانی سووکە چەکدار و پاشقەرەوڵ لەگەڵ گزنفۆن بوون. ئەوانە بە هەموو توانایانەوە و بە سواری ئەسپ بەرەو بواری چڕ و ناخۆشی چۆم ڕۆیشتن و گەرەکیان بوو ئەو ڕێگایە بگرن کە رووی لە چیاکانی ئەرمێنیا بوو و بەو شێوەیە دوای پەڕینەوەیان بکەونە پشتی هێزەکانی سوارەی دوژمن کە لەوبەری چۆم جێگیرببوون.

هێزەکانی دوژمن وەختێک چاویان بە خیریسۆفۆس و پیاوەکانی کەوت کە ئاوا بە ڕاحەتی خەریکی پەڕینەوە لە چۆمن، گزنفۆن‌یشیان دیت بەرەو ڕێگای سەختی پشتەوە بە خێرایی دەڕوا، لەوە ترسان تووشی گەمارۆ بن. بۆیە بەپەلە بەرەو ڕێگای کراوەی سەرەوەتری دەڤەرەکە ڕایانکرد و کاتێک گەیشتنە ئەو شوێنە بە بەرزاییەک هەڵگەڕان.

---

٩٥- یونانییەکانی باستان بەردەوام قوربانییان بۆ ئەو خوایانە کردوە کە لە قەراخ چۆمەکان ژیاون، بۆوەی ئارام ببنەوە. ئاریانۆس باس‌دەکات کە ئەسکەندەری مەزن قوربانی پێشکەش بە چۆمی ئیلیس‌پۆندۆ و چەند چۆمێکی دیکەی ئاسیا کردبوو.

٩٦- سەربازەکانی یونانی باستان کاتێک پەلاماری دوژمنیان دەدا، سەرەتا سرووودی ئایینی و نیشتیمانی‌یان دەچڕی و زۆر جاریش هەر بەدوای ئەو سرووودانە هاوار و نەعرەتەیان لێ‌بەرزدەبۆوە.

٩٧- لەنێو لەشکرەکانی مواجب بگیر و بەکرێگیراو لە سەدەی پێنجی پێش زاییندا، فەرماندەران و سەربازان بۆیان هەبوو ژنەکانیان یا مەعشووقەکانیان لەگەڵ خۆیان بەرن. ئەوە بە پێچەوانەی لەشکری ڕمەکی دانیشتووان بوو.

"لیکۆس" فەرماندەی سوارە نیزام و "ئێسخی‌نیس"ی سەردەستەی قۆچەقانی هاوێژەکان لە بەشی خیریسۆفۆس، کاتێک چاویان بە ڕاکردنی سوارەی دوژمن کەوت سەریان لە دوونان. سەربازەکانی لەشکری خیریسۆفۆس‌یش بە دەنگی بەرز هاواریان کرد کە ئێمەش وێڕای ئێوە پەلاماری بەرزاییەکە دەدەین[99].

خیریسۆفۆس هەرکە لە رووبار پەڕییەوە، خۆی لە ڕاونانی دوژمن پاراست و تەنیا ڕووی لە چیاکانی قەراخ چۆم کرد و پەلاماری باقی هێزەکانی دوژمنی لە سەر چیاکاندا. ئەو هێزانەش کاتێک دیتیان سوارکارەکانیان ڕوویان لە هەڵاتن کردوە و لەلایەکی‌تریشەوە لەشکری یۆنانی بۆیان‌دێن، خێرا بەرزاییەکانیان بەجێ هێشت.

گزنفۆن وەختێک دیتی بارودۆخی ئەوبەری چۆم بەپێی لێکدانەوەکانی خۆیان دەچێتە پێشەوە، گەڕاوە لای ئەو هێزانەی خەریکی پەڕینەوە لە چۆم بوون. دیار بوو کاردوخەکانیش بە مەبەستی پەلامارێکی دیکە لە چیاکانەوە بەرەو دەشتایی دادەگەڕێن. خیریسۆفۆس لەو نێوەدا توانیبووی بەرزاییەکان بگرێ و "لیکۆس"یش بە ژمارەیەکی کەمەوە سەری لە دووی هێزەکانی دوژمن نابوو و چەند بارێکی پارچە و زەرفی شەڕابی دەستکەوتبوو.

پەڕینەوەی بار و هێزەکان لە چۆم بەردەوا بوو. گزنفۆن و سەربازەکانی بە چەکەوە گەڕانەوە و ڕوویان لە کاردوخەکان کرد. دەستووری بە لۆکاژەکان‌دا هێزەکانیان بەسەر دەستەی بچووکدا دابەش بن و هەر دەستەیەک لە بەرامبەر تاقمێک لە سوارەکانی کاردوخی لەلای چەپ دامەزرێ. هەروەها جێگیربوونەکەش بە چەشنێک بێ کە لۆکاژ و سەردەستەکان لە ڕوبەڕووی هێزەکانی کاردوخیدا دامەزرێن و فەرماندەکانی پاشقەرەوڵیش لە ڕیزێکدا چاوەدێری لای چۆمەکە بکەن.

---

٩٨- ئەو سەربازانەی پیادە بوون، داوایان لە سوارەکانی یونانی کرد بوێستن و ڕاوی هێزەکانی سوارەی دوژمن نەکەن. بووەی هێزەکانی چەکداری قورسی پاشقەرەوڵ لەکاتی خەتەردا بێ یارمەتی و پشتیوان نەمێننەوە.

کاردوخەکان وەختێک دیتیان پاشقەرەوڵەکان لە لشکر جیا بوونەتەوە و ژمارەشیان زۆر نییە، خێرا پەلاماریان دانێ و سروودێکیان دەخوێند کە پیاو لێیان حاڵی نەدەبوو. خیریسۆفۆس لەبەر ئەوەی خۆی لە شوێنێکی مەحکەم بوو، چەکدارە قورسەکان و قۆچەقانی هاوێژ و تیرهاوێژەکانی ناردە لای گزنفۆن و دەستووری پێدان هەرچی گزنفۆن گوتی بە قسەی بکەن. گزنفۆن داگەڕانی ئەو هێزانەی دیت. یەکێک لە گەورە پیاوەکانی ناردە لایان و ڕایگەیاند جارێ لە قەراخ چۆم بمێننەوە و وەڕێنەکەون. کاتێک گزنفۆن خۆی وەنێو رووبار کەوت، هێزە یۆنانییەکانیش وەنێو چۆم کەوتن. خێرا لای چەپ و ڕاستی گزنفۆنیان گرت و وایان نیشاندا کە بۆ شەڕی کاردوخەکان گەڕاونەوە و گشتیان دەستیان لەسەر تیری بەر ژێی کەوان و ئامادەی هاویشتن بوون، بەبێ ئەوەی لە چۆمەکە دوور کەونەوە. گزنفۆن دەستووریدا کاتێک بەردەباران دەکرێن و کوچکە بەرد وە مەتاڵەکانیان دەکەوێ، تەقەیەکی بڵێندیان لێهەڵدەستێ، بۆیە باشتر وایە لەو وەختەدا تێکڕا سروودی نەتەوایەتی بچڕن و پێکەوە پەلاماری دوژمن بدەن. ئەگەر دوژمنیش ڕووی لە هەڵاتن بەرەو چیاکان کرد و لە چۆمیشڕا شەیپورچی تێیتوراند، ئەو وەختە تێکڕا بەرەو لای ڕاست داگەڕێن و گوێ لە فەرمانی سەردەستەکان بگرن و چەشنی پەلامار بە لای ڕاستدا و بەبێ تێکدانی ڕیزەکانیان پێشڕەوی بکەن و یەکتریش ئەزیەت نەکەن. باشترین سەربازیش ئەو کەسەیە کە پێشتر لە هەر کەس بگاتە ئەوبەری چۆم.

کاردوخەکان دیتیان ژمارەیەکی کەم لە پاشقەرەوڵەکان ماون(لەبەر ئەوەی جەماوەرێکی زۆر لە بێ چەکەکان کە بۆیان نەبوو لەگەڵ هێزەکانی لەشکر بپەڕنەوە و دەبوایە چاوەڕوان بن و لەو بەرەی چۆم بوون، بەشێکیان خەریکی باری وڵاغەکان بوون و هێندێکیشیان کەرستە و شتوومەکیان پێبوو و چەندێکیشیان لەگەڵ مەعشووقەکانیان بوون) بە تەواوی هێزیانەوە پەلاماری ئەو جەماوەرەیاندا و بە تیر و بەرد وەریانگەڕانێ. یۆنانییەکان بە سروود چڕین بەرسیوی ئەو هێرشەیان داوە و کاردوخەکان لە بەرامبەر ئەو دژکردەوەیە خۆیان ڕانەگرت. هێزەکانی پەلاماردەری کاردوخی زیادتر

سووکە چەکداری شەڕکەری شاخ و چیاکان بوون. لە لێدانی خێرای دوژمن و پاشەکشەی دەسبەجێ لە کێوەکاندا گەلێک شارەزا بوون بەڵام شەڕی جەبهەیی‌یان بۆ نەدەکرا.

لەو کاتەدا وەک قەراری پێشوو شەیپوڕ لێدرا و هێزەکانی دوژمنیش بەردەوام خەریکی ڕاکردن بوون. یۆنانییەکان بە پەلە بەرەو چۆم گەڕانەوە و خێراتر دەستیان بە پەڕینەوە کرد. هێندێک لە کاردوخەکان لە نەخشەی یۆنانییەکان گەیشتن و دووبارە بۆیان هاتنەوە و بە تیر و کەوان چەند کەسێکیان لە یۆنانییەکانی پشتەوە بریندار کرد. هەڵبەت زۆربەی زۆری کاردوخەکان کاتێک دیتیان یۆنانییەکان بە گشتی لە چۆم پەڕیونەوە، ئیتر ڕوویان لە چیاکانی خۆیان کردوە. تەنیا ئەوانەی پەلاماری گزنفۆن و پیاوەکانی خیریسۆفۆس‌یان دابوو، چوون خۆیان بە غیرەت‌تر و بە جەرگتر دیبۆوە و زیادتر لە مەودای پێویست هاتبوونە پێشەوە و ئەوەش لە کاتێکدا بوو کە یۆنانییەکان پەڕیبوونەوە و ئەوانیش تازە دەگەیشتنە قەراخ چۆم، چەند کەسێکیان بەدەست یۆنانییەکان بریندار کران.

# بەشی ٤

## چوونە نێو وڵاتی ئەرمێنیا(ئەرمەنستان) - ئاگربەسی یۆنانییەکان لەگەڵ تیریڤازۆس - خەیانەتی تیریڤازۆس - بارینی بەفر

پاش ئەوەی تەواوی هێزە یۆنانییەکان لە چۆم پەڕینەوە، لای نیوەڕۆ خۆیان سازکرد و بە وڵاتی ئەرمێنیادا پێشڕەوی‌یان دەستپێکرد. دەشتێکی پان و بەرین و خاوەن کۆمەڵێک گردی خاکی نزم بوو. زیادتر لە پێنج فەرسەخ نەڕۆیشتن. بۆخاتری شەڕی بەردەوام لەنێوان کاردوخ و ئەرمەنییەکان، هیچ گوندێک لەو دەڤەرە و لە قەراخ چۆم دروست نەکرابوو. یەکەم گوندی کە یۆنانییەکان ڕوویان تێکرد، گەورە و خاوەن قەسری ساتراپی بوو. زۆربەی خانوەکانی ئەو گوندە خاوەن بورجی پاسەوانی بوون و ئازووقە و تفاقێکی زۆریشی لێ دەست دەکەوت.

لەو دێ‌یەڕا بە دوو مەنزڵ، دە فەرسەخی‌تر ڕێگا ڕۆیشتن و لە سەرچاوەی ئاوەکانی ڕووباری دیجلە تێپەڕین. لە درێژەدا بە سێ قۆناخ پازدە فەرسەخی دیکە

پێشڕەوییان کرد و گەیشتنە چۆمی تیلەبۆئا[100] کە ڕووبارێکی چووک بوو و بە هاسانی دەکرا لێی بپەڕییەوە. ژمارەیەکی زۆر گوند لە قەراخ ئەو ڕووبارە هەڵکەوتبوون. ئەو ناوچەیە پێی دەگوترا ئەرمێنیای ڕۆژئاوا و حاکمەکەشی ناوی تیریڤازۆس بوو. تیریڤازۆسی دۆستی پاشا، هەرکات لە خزمەت ناوبراودا بوایە کەس بۆی نەبوو یارمەتی شا لە کاتی سواربوونی ئەسپ بدا.

تیریڤازۆس بە سواری ئەسپ هات و گەلێک سوارکاری لەگەڵدا بوو. سەرەتا دیلمانجەکەی نارده پێشەوە و داوای کرد لەگەڵ سەرکردەکانی یۆنانی قسە بکا. ستراتێژەکان بڕیاریان‌دا گوێ لە قسەکانی ڕاگرن. یۆنانییەکان لە مەودا و شوێنێک ڕاوەستان کە دەیانتوانی گوێ لە ئاخاوتنی تیریڤازۆس ڕاگرن و پرسیاری لێبکەن کە بۆچی هاتووە و چدەخوازێ! تیریڤازۆس ڕایگەیاند بۆ ئاشتی هاتووەتە لایان، بەو شەرتەی کە نە ئەو یۆنانییەکان ئەزیەت بکا و نە لەشکری یۆنانیش ماڵ و ملکی خەڵک ئاگر تێبەردەن و چەندی پێویستیش بێ دەتوانن ئازووقە و تفاق کۆکەنەوە. ستراتێژەکان بەو شەرتانە ڕازی بوون و قەراری ئاشتی درا.

هێزە یۆنانییەکان لەو شوێنەڕا بە سێ قۆناخ، پازدە فەرسەخی‌تر ڕێگای دەشتاییان بڕی. لە تەواوی ڕێگادا تیریڤازۆس بە هێزی نیزامییەوە بە مەودای دە ستادیۆ دوورتر بەدوایانەوە بوو. یۆنانییەکان گەیشتنە عیمارەت و خانووی گەورە کە ئاواییەکی زۆریان بە دەورەوە دروست کرابوون و خاوەن ئازووقە و تفاقێکی فرە بوون. کاتێک لەو شوێنە ئۆردویان لێدا، بۆ شەوێ بەفرێکی قورس باری. بڕیاریان‌دا بەسەر گوندەکاندا دابەش بن. چوون لە هێرشی دوژمن هیچ باس و خواسێک نەبوو، ستراتێژەکان و سەربازەکانیان دەیانتوانی خێمە لێبدەن. لەو بڕوایەش‌دا بوون کە بەفری زۆر مایەی ئەمنییەتی پترە. لەو گوندانە هەموو چەشنە کەرستەیەک، ماڵات بۆ قوربانی، گەنم، شەڕابی کۆن و نوێ، مێوژ و سەوزیجاتی جۆراوجۆر دەست دەکەوت.

---

٩٩- تیلی‌ڤۆئاس بەپێی هێندێک بۆچوون دەبێ لقێکی ڕۆژهەڵاتی چۆمی فورات بێ کە ئێستا پێیدەگوترێ قەرەسوو و لە شوێنی‌تریش بەناوی بیتلی‌سوور ناودێر کراوە.

هێندێک لەو کەسانەی لە ئۆردوگا دوور کەوتبوونەوە، باسیانکرد کە بە درێژایی شەو ئاگریان لە دەوروبەری خۆیان دیتووە. ستراتێژەکان ئەوکات هەستیان بەوە کرد کە ئەمنییەتێکی ئەوتۆ لەگۆڕێدا نییە، بەتایبەت ئەگەر بەسەر گوندەکاندا دابەش بووبن، بۆیە خێرا لەشکرەکەیان کۆکردەوە یەک شوێن. مۆڵگەکانیان وەسەر یەک خستەوە. لەو نێوەدا ئاسمانیش روون ببۆوە. بەڵام بەو حاڵەش بەدرێژایی شەو بەفرێکی قورس باری، بە چەشنێک کە تەواوی چەک و سەربازەکانی نوستووی داپۆشی. سەرمای زۆر قاچ و قولی وڵاغەکانی تەزاندبوو. هیچکەس لە سەربازەکان گەرەکی نەبوو لە جێگای خۆی بێتە دەر و هەرکەسە بە بارینی بەفر و هەوای سارد لەبەر خۆیەوە خۆی گەرم داپۆشیبوو. بەفریش لەبەر بێ جموجۆڵی جەماوەرەکە وێنەدەچوو بەو زووانە بتوێتەوە.

گزنفۆن بە ڕووتی هەستا سەرپێ و دەستی بە شکاندنی دار و چرپی کرد و خەڵکانیتریش لە خەو هەستان و وێڕای ئەو سەرقاڵ بوون. ئاگرێکی زۆر هەڵکرا و مەرهەمیان لە لەشیان هەڵسووت و خۆیان لەبەر ئاگر گەرم کردەوە. لەو ناوچەیە لە جیاتی ڕۆنی زەیتوون بۆ چەورکردنی لەش، لە مەرهەمێکی تایبەت کەڵک وەردەگیرا و بە فراوانیش دەست دەکەوت. ئەو مەرهەمە لە چەوری بەراز و کونجی و بادامی تاڵ و شیرەی داربنێشت دروست دەکرا و بۆن و بەرامەیەکی خۆشی هەبوو. هەڵبەت عەترێکی زۆریش لەو کەرستانەی باسمانکرد دەگیرا.

لە درێژەدا دووبارە بڕیاریاندا بە سەر گوندەکاندا دابەش بنەوە و لە ماڵەکانی ئەو گوندانەی دەوروبەری ئۆردوگا بژین. سەربازەکانی یۆنانی لەو شوێنە بە ڕەزامەندی تەواو و هاوارێکی پڕ لە شایی و خۆشحاڵی وەدوای ئازووقە و جێگای حەسانەوە کەوتن. ئەو کەسانەش کە لەبەر بێ عەقڵی خۆیان و لەبەر خەراپی و وێرانی ماڵەکان ئاگریان لەو شوێنانە بەردابوو، بەگشتی سزادران.

ستراتێژەکان شەو، دیموکراتیسی خەڵکی تیمنۆیان لەگەڵ سەربازەکانی ژێر فەرمانی خۆی نادرە کێوەکانی دەوروبەر بۆوەی وەدوای پێوشوێنی ئەو ئاگرانە بکەون کە پێشتر دیترابوون. دیموکراتیس پێشتر چاوی بەو ئاگرانە کەوتبوو و ڕووداوی لەو چەشنەی گەلێک جار دیتبوو. هەموو جارێکیش دوای پشکنین و وەدوا کەوتن، دەرکەوتبوو کە ناوبراو ڕاست دەکات و جاری واش هەبوو کە

زانیارییەکانی وەڕاست نەگەڕابوون. دیموکراتیس وەختێک سەیری دەڤەرەکەی کرد، هیچ ئاگرێکی نەدۆزییەوە و ناچار گەڕاوە. لە ڕێگادا کابرایەکی گرت کە تیر و کەوانی فارسی پێبوو و تیردان و تەوەرزینەکەی وەک هی ئامازۆنییەکان دەچوو. کاتێک لێی پرسی چکارەیە، دەرکەوت فارسە و لە ئۆردوگای تیریڤازۆس ڕا هاتووە بۆوەی ئازووقە بەرێتەوە. پاشان لێی پرسی کە سەربازەکانی لەشکری تیریڤازۆس چەند و چۆنن و بۆچی کۆبوونەتەوە. کابرا لە وڵامدا گوتی کە تیریڤازۆس لەگەڵ تەواوی سەربازەکانی خۆی و بەکرێگیراوانی خالیڤی و تائووخی گەرەکیانە هێرشێکی لەنەکاو بکەنە سەر یۆنانییەکان. هەڵبەت ئەو پەلامارە لە کاتێکدا بە ئەنجام دەگات کە یۆنانییەکان خەریکی دەربازبوون بە تەنیا گەڵییەکدا بن کە تاکە ڕێگایە و بەنێو شاخەکاندا تێدەپەڕێ.

کاتێک ستراتیژەکان گوێیان لەو قسانە بوو، بڕیاریاندا لەشکرەکەیان کۆکەنەوە. پاسەوانیان دانا و سۆڤێنێتۆسی ستیمفالی وەک فەرماندەی ئەو هێزانەی دەمانەوە، دیاریکرا. باقی هێزە یۆنانییەکان کابرای فارسیان وەک چاوساغ وەپێشەخۆیاندا و وەڕێکەوتن. کاتێک وەشاخ هەڵگەڕان، سەربازەکانی سووکە چەکدار لە پێشەوە دەڕۆیشتن و لەپڕا چاویان بە مۆڵگەی تیریڤازۆس کەوت. چاوەڕوانی چەکدارە قورسەکان نەبوون کە لە پشتەوەڕا دەهاتن و یەکسەر بە نەعرەتەی بەسام پەلاماری دوژمنیاندا. بەربەرەکان هەرکە گوێیان لەو هاتووهاوارە بوو، خۆیان پێڕانەگیرا و بەپانەوە ڕایانکرد. لەو پەلامارەدا جەماوەرێک لە بەربەرەکان کوژران و نیزیکەی بیست و پێنج ئەسپیش کەوتە دەست هێزە یۆنانییەکان و خێمەی (تیریڤازۆس)یش دەستی بەسەردا گیرا. لەو خێمەیەدا قەرەوێڵەی دروستکراو لە زێو، زەرفی شەڕابی ڕەنگاوڕەنگ و چەند کەسێک وەک ساقی و نانەوا کەوتنە دەست یۆنانییەکان.

ستراتیژەکانی فەرماندەی هێزەکانی چەکداری قورس خەبەری ئەو سەرکەوتنیان پێگەیشت، لەجێوە بڕیاریاندا بگەڕێنەوە ئۆردوگا. ئەوان لەوە دەترسان مەبادا هێزەکانی دوژمن پەلاماری مۆڵگەکانیان بدەن. وەختێک شەیپوڕ لێدرا تەواوی هێزەکان کۆبوونەوە و هەر ئەو ڕۆژە تێکڕایان گەڕانەوە شوێنی حەسانەوەیان.

# بەشی ٥

## کاریگەری دلگیرانەی بەفر - سەهۆڵبەندان - قاتی و برسییەتی - پەلاماری دوژمن - چارەسەری نەخۆش و سەرمابردووان

ڕۆژی دوایی بەباشیان زانی کە پێش ئەوەی هێزەکانی دوژمن تەنگەبەرایی دۆڵەکەی سەر ڕێگایان بگرن، هەرچی زووتر وەڕێکەون. دوای ئەوەی بارەکانیان بەست، بەنێو بەفرێکی قورسدا و بە یارمەتی چەند چاوساغێک وەڕێکەوتن. ئەو ڕۆژە گەیشتنە سەر ئەو چیایەی کە تیریڤازۆس مەبەستی بوو داگیری بکا. لەوێ مۆڵگەیان دامەزراند.

دواتر لەو شاخەڕا بە سێ قۆناخ سەحرایەکی چۆلیان تێپەڕکرد و پازدە فەرسەخ ڕێگا ڕۆیشتن و گەیشتنە چۆمی فورات[١٠٠]. لەو چۆمە پەڕینەوە و قووڵایی ئاوەکەی زۆر نەبوو و دەگەیشتە نێوقەدیان. دەگوترا کە سەرچاوەی ئاوەکانی ئەو چۆمە لێیان دوور نییە. لەوێوە ڕوویان لە دەشتێک کرد، بەردەوام بەفر دەباری و بە سێ مەنزڵ پازدە فەرسەخیتر ڕۆیشتن. لە قۆناخی سێهەمدا تووشی گرفتێکی زۆر هاتن، چونکە کرێوەی بای شەماڵ

---

١٠٠- گزنفۆن باسی قۆلی ڕۆژهەلاتی چۆمی فورات دەکا کە ئیمڕۆ پێیدەگوترێ ڕووباری مورات.

بێبەزەییانە لە ڕوخساری سەربازەکانی ڕادەکێشا و فرە سارد بوو و جەماوەری تووشی سڕ و بەستن هاتبوون. لەو کاتەدا یەکێک لە تاڵەبینەکان داوای کرد قوربانییەک پێشکەش بە خواوەندی باو و تۆفان بکرێ. خێرا قوربانییەک پێشکەش کرا و خەڵکەکە هەستی بە دامرکان و هێوربوونەوەی بایەکە کرد. بەژنی بەفر دەگەیشتە یەک ئۆرغیا[102].

لەبەر تەوژمی سەرما ژمارەیەک لە وڵاغ و یەخسیرەکان و سێ چەکدارێک لە ڕێگادا مردن. شەو ئاگرێکی زۆریان داگیرساند بۆوەی گەرم بنەوە. لەو شوێنەی لایاندابوو دار و چرپییەکی زۆری لێدەستدەکەوت. هەر دەستەیەکی درەنگ دەگەیشتە جێ، بێ داری ویشک دەماوە، ئەگەریش تخوونی ئاگری ئەوانیتر کەوتبا دەبوایە قەیاسێک گەنم یا خواردەمەنیتر بە دەستەی خاوەن ئاگر بدا. بەو چەشنە هەر دەستەیە لەبەرخۆیەوە چی لە خواردەمەنی ویشککراوی هەبوایە، ناچاربوو لەگەڵ ئەوانیتر بەشی بکا. لەو شوێنانەی ئاگر دایسا، بەفر دەتوایەوە و قووڵکەیەکی دروست دەکرد و دەگەیشتە عەرزی ڕووت. ئەوسا دەکرا پیاو بەژنی بفرەکە بپێوێ.

هێزە یۆنانییەکان لەو شوێنەڕا تەواوی ڕۆژ بەنێو بەفردا ڕێگا ڕۆیشتن و لە برسان هیلاک ببوون. گزنفۆن، فەرماندەی هێزەکانی پاشقەرەوڵ یارمەتی ئەو سەربازانەی دەدا کە لەبەر بێ هێزی دەکەوتنە خوار و نەیاندەزانی تووشی چ نەخۆشییەک هاتوون. کاتێک یەکێک لە سەربازەکان کە هۆکاری نەخۆشییەکەی دەزانی، بە گزنفۆنی گوت کە برسییەتی بڕستی لێبڕیون و ئەگەر ئەوانەی دەکەون و بەجێ دەمێنن شتێک هەبێ بیخۆن، گشتیان هەڵدەستنەوە. گزنفۆن خێرا ڕایکردە لای بارەکانی ئازووقە بۆوەی خواردەمەنییەکیان بۆ دابینبکا. خواردەمەنی بەسەر پەککەوتەکاندا دابەش کرد و چەند سەربازێکیشی نارد کە بگەڕێن و چی دەستیان کەوت بۆ خەڵککەکە بێنن و بیاندەنێ. برسییەکان پاش خواردن، هەستیان بە هێزێک لە دەرونیاندا کرد و یەکڕاست هەستانە سەرپێ و وەڕێکەوتن.

---

١٠١- ئۆرغیا بۆ پێوانی مەودا بەکار هاتووە و بەرابەری ٦ پێ واتە یەک میتر و هەشتاوپێنج سانتیمیتر بووە.

کاتی شێوان بوو کە خیریسۆفۆس گەیشتە گوندێکی ئەو دەڤەرە. لە دەرەوەی دیوارەکانی گوند چاوی بە چەند ئافرەت کەوت کە لە سەر کانی دێ خەریکی ئاو هێنان بوون. ئافرەتەکان پرسیاریان کرد کە ئێوە کێن. کابرای دیلمانج بە فارسی وڵامی دانەوە و گوتی لە لایەن پاشاوە بۆ ئەو ساتراپی‌یە هاتوون. ئافرەتەکان لە وڵامدا گوتیان کە حاکمی ساتراپ لە ماڵ نییە و فەرسەخێک دوورە. یۆنانییەکان کاتێک هەستیان بە درەنگی شەو کرد، لەگەڵ ئافرەتەکان چوونە نێو گوند و بەدوای کوێخای دێدا گەڕان.

خیریسۆفۆس و ئەوانەی گەیشتبوونە دێ خێرا خێمەیان لێدا بەڵام ئەوانی دیکە کە نەیانتوانیبوو لەبەر ماندوویەتی بگەنە ئەو دێیە، شەو بە برسییەتی و بێ ئاگری مانەوە. بۆیە هەر ئەو شەوە ژمارەیەک لە سەربازەکان مردن. هێزەکانی پاشەوەش بەردەوام چەکدارەکانی بەربەریان لە خۆیان دوور دەکردەوە کە وڵاغەکانی لە پێ و هێز کەوتوویان ڕەپێچەک دەدا و لە سەر دەسکەوتەکانیان لێیان دەبووە شەڕ.

کۆمەڵێک لە سەربازەکانی یۆنانی لە دواوە مابوونەوە، چونکە سۆمای چاوەکانیان لەبەر سپیای بەفر لەدەست دابوو و پەنجەی پێیەکانیان سەرما بردبووی. بۆوەی چاویان لە هەمبەر سپیایی بەفر بپارێزن، ناچار بوون کەرستەیەکی ڕەش بەردەوام لەپێش خۆیان ڕاگرن و تێی‌بڕوانن. بۆ پاراستنی پێیەکانیشیان، بەردەوام دەجوڵانەوە و شەو کاتی خەوتن پێڵاوەکانیان دادەکەند چونکە لەبەر سەرما دەیبەست و کاتی خەوتن پێیان هەڵدەمسا ․و قەیتانی کەوش دەبووە هۆی بریندار بوونی قاچەکانیان. سەربازەکانی یۆنانی لەجیات پێڵاوە ڕزیوەکانی پێشوویان، بۆ ڕێگای گەڕانەوەی ئەوجارەیان کاڵەی چەرمی دروست کراو لە پێستی گایان لەپێ کرد.

کۆمەڵێک لەوانەی لەبەر ناخۆشی و چەرمەسەرییەکانی ڕێگا وەدواکەوتبوون، وەختێک چاویان بە شوێنێکی ڕەشانگ کەوت کە بەفری نەگرتبوو، پێیانوابوو بەفرەکە تواوەتەوە. لە ڕاستیدا بەفری ئەو شوێنە توابۆوە چونکە کانیاوی ئاوی گەرم لەوێ، لەنێو مێشەیەکدا هەڵدەقوولی. سەربازەکان ڕوویان لەو کانیاوە کرد و تاقەتیان نەبوو لەوە زیادتر ڕێگا

برۆن. گزنفۆن فەرماندەی هێزەکانی پاشقەرەوڵ سەرەڕای پاڕانەوە لەبەریان، نەیتوانی سەربازەکان ڕازی بە ڕۆیشتن بکا. ناوبراو ناچار بوو کە پێیان بڵێ ئەگەر وەڕێنەکەون، دەکەونە بەر پەلاماری دوژمن کە بە ژمارەیەکی زۆر کۆبوونەتەوە. لەکۆتاییدا کە دیتی هەر بە قسەی ناکەن، بە ڕووگرژی لەلایان مایەوە. سەربازەکان لەبەر گزنفۆن دەپاڕانەوە کە بیانکوژێ، چونکە توانای ڕێگا ڕۆیشتنی پتریان نەبوو. گزنفۆن هەستی پێکرد کە باشترە هێزەکانی بەربەر بە چەشنێک بترسێنێ کە نەوێرن تخوونی ئەو سەربازە نەخۆشانە بکەون و پەلاماریان بدەن. شەو تاریک ببوو کاتێک هێزەکانی دوژمن بە نەعرەتە و هاتوهاواری بەرز نیزیک کەوتنەوە و لەسەر ئەو بار و کەرستەیەی تالانیان کردبوو کێشەیان بوو. ئەو وەختە سەربازەکانی سلامەتی پاشقەرەوڵ هەستان و تێکڕا پەلاماری دوژمنیاندا. نەخۆشەکانیش یەکدەنگ و سەدا نەعرەتەیان دەکێشا و بە نێزە لە قەڵغانەکانیان دەدا. هێزەکانی دوژمن ترسیان ڕێنیشت و بەنێو بەفر و بەرەو دۆڵ هەڵاتن و ئیتر وەدیار نەکەوتنەوە.

گزنفۆن و سەربازەکان پاش ئەو ڕووداوە دوعای شفایان بۆ نەخۆشەکان کرد و بەڵێنیاندا ڕۆژی دوایی بێنەوە لایان و وەڕێکەوتن. ئەوان هێشتا چوار ستادیۆ دوور نەکەوتبوونەوە، تووشی دەستەیەکی دیکە لە سەربازەکان هاتن کە لەسەر ڕێگا و لەنێو بەفردا کەوتبوون و خۆیان داپۆشیبوو و بێ نیگابان خەویان لێکەوتبوو. یەکیەک ڕایانچڵەکاندن بۆوەی هەستن و وەڕێکەون. سەربازەکان گوتیان کە هێزەکانی پێشەوەش لە بەفردا چەقیون. گزنفۆن بەرەو پێشتر ڕۆیی و چەند کەسێکی لە بەهێزترین سەربازەکانی سووکە چەکدار ناردە پێشەوە بۆوەی بزانن چقەوماوە و چی بووەتە هۆی ڕاوەستانی پێشڕەوی لەشکر. پاش فەترەیەک ئەو سەربازانە گەڕانەوە و باسی حەسانەوەی لەشکریان کرد. هەر بەو چەشنە سەربازەکانی گزنفۆنیش لە شوێنی خۆیان بێ ئاگر و خواردن مۆڵیان خوارد و پاسەوانیان دانان. کاتێک ڕۆژ بۆوە، گزنفۆن چەند کەس لە سەربازەکانی لاوی ناردە لای

نەخۆشەکان بۆوەی یارمەتییان بدەن و هەڵیان‌بستێنن و لەگەڵ خۆیان بیانهێننەوە.

لەو بەینەدا خیریسۆفۆس هێندێک لە سەربازەکانی کە لەنێو دێدا دامەزرابوون، بۆ لێکۆڵینەوەی بارودۆخی هێزەکانی پاشقەرەوڵ بەڕێکرد. ئەو سەربازانەی گزنفۆن پێشتر بۆ یارمەتیدانی نەخۆشەکانی ناردبوو تووشی جەماوەری ناردراوی خیریسۆفۆس هاتن و گەلێک خۆشحاڵ بوون. نەخۆشەکانیان ڕادەستی ئەو کۆمەڵەی دوایی کرد بۆوەی بیانگەیێننە ئۆردوگا. گشتیان پێکەوە وەڕێکەوتن. ڕێگاکە تا ئەو گوندەی خیریسۆفۆس ئۆردوی لێدابوو کەمتر لە بیست ستادیۆ دەبوو.

کاتێک تەواوی هێزەکانی لەشکری یۆنانی کۆبوونەوە سەریەک، دووبارە بڕیاریان‌دا کە بە شێوەی دەستەی جیاجیا بەسەر گوندەکاندا دابەش بن. خیریسۆفۆس لە شوێنی خۆی مایەوە. ئەوانی دیکە پاش ئەوەی بەسەر گوندەکانی نیزیکی دەوروبەردا بڵاوەیان کرد، هەرکەس لەگەڵ دەستەی خۆی بەرەو گوندی دیاریکراو ڕۆیشت. لەو کاتەدا لۆکاژ پۆلیکراتیسی ئاتێنی داوای کرد کە ئیزنی وەڕێکەوتنی پێبدەن. ناوبراو هێزەکانی سووکە چەکداری هەڵگرت و ڕووی لەو دێیە کرد کە بۆ گزنفۆن دیاریکرابوو. خەڵکی گوند گشتیان لە ماڵەکانیان بوون و پۆلیکراتیس کوێخای دێ و کچەکەی دەستبەسەر کرد. ئەو کیژە تەنیا نۆ ڕۆژ بوو گوێزرابۆوە و مێردەکەی چووبووە ڕاوی کەروێشک و لەدەست ئەو ڕەشبگیرییە نەجاتی هاتبوو. پازدە جوانوو ئەسپی ڕاهاتوو[١٠٢] بۆ پاشای لەلای کوێخا بوون، پۆلیکراتیس ئەوانیشی بەتاڵان هێنا.

ماڵەکانی ئەو گوندە ژێرعەرد بوون و درگای چوونە ژووریان بە کوونێکدا بوو کە وەک بیری ئاو دەچوو. درگای چوونە ژووری ئاژەڵانیش

---

١٠٢- ولاتانی ئەرمێنیا و میدیا لەسەریان واجب کرابوو کە وەک ماڵیاتی سالانە ئەسپ بۆ دەرباری پاشا بنێرن. بەشێک لەو ئەسپانە بۆ خوای ڕۆژ واتە میترا قوربانی دەکران. بەپێی زانیارییەکانی سترابۆن، ژمارەی ئەو ئەسپانەی ئەرمەنییەکان سالانە دەیان‌دا بە پاشا، دەگەیشتنە بیست هەزار.

چەشنی خەندەک بوو، بەو جیاوازییە کە ئەندامانی بنەماڵە بە پێپلەکان بە کوونەکەدا دەچوونە خوارەوە. ژووری ماڵەکان تەواوێک بەرفرە بوو. لەنێو ماڵدا بزن و مەڕ و مانگا و گامێش و پەلەوەر و بێچووەکانیان ڕادەگیران. تەواوی ئەو ئاژەڵ و پەلەوەرانە تفاقی ویشک و دانەوێڵەیان دەدرایە. گەنم و جۆ و دەغڵ و دان بە فراوانی دەست دەکەوت. شەڕابی جۆ (ئاویجۆ) لە خومرەدا ڕادەگیرا و لە عەرز گیرابوون. ئاوجۆ تا لێواری خومرەکان دەهات. مرۆڤ بە قامیشی گەورە و درێژ و بەبێ هیچ گرفتێک دەیتوانی ئاوجۆ لە خومرە هەڵمژێ. ئەو ئاوجۆیە فرە توند بوو و دەبوایە تێکەڵ بە ئاو بکرێ. بۆ کەسێک کە خووی بە خواردنەوەی نەگرتبا ئێجگار شیرین بوو. گزنفۆن بەدوای کوێخای گونددا نارد و پێکەوە ژەمیانکرد و دڵنیای کردن کە بە زوویی لەو ناوچەیە دەڕۆن و کەسیش مناڵەکانی ئەزیەت ناکا و بەرلە ڕۆیشتن پارەی ئازووقە و مەخاریجی گشت لایەک دەدرێتەوە و هەروەها داوای ڕێنوێنی بۆ گەیشتن بە مەنزڵی داهاتووی لە کوێخا کرد. کوێخا تۆزێک هێور بۆوە و بە لەسەرەخۆیی شوێنی خومرەکانی شەڕابی بە گزنفۆن نیشاندا کە لە عەرزی گیرابوون.

سەربازەکانی یۆنانی ئەو شەوە بەسەر گوندەکاندا دابەشبوون و بە ڕاحەتی خەوتن و هەرچەشنە پێداویستییەکیان بە فراوانی دەست کەوت. کوێخا و مناڵەکانیشی بە درێژایی شەو لەلایەن پاسەوانانی لەشکرەوە لەژێر چاوەدێریدا بوون.

ڕۆژی دوایی گزنفۆن کوێخای گوندی بردە لای خیریسۆفۆس. بەهەر گوندێکدا دەرباز دەبوون، سەربازەکانی یۆنانی خەریکی زیافەت و بەزم و شایی بوون و کاتێک چاویان بە گزنفۆن و کوێخا دەکەوت پێشیان پێدەگرتن و تا ژەمێکیشیان لەگەڵ ئەوان نەخواردبا، ڕێگای ڕۆیشتنیان پێنەدەدان. بۆ هەر لایەک چووبان گۆشتی گیسک و کاوڕ و بەراز و گوێلک و پەلەوەر بە فراوانی لەسەر مێزەکان دەست دەکەوت و شەڕاب بەردەوام دەخوراوە. هەروەخت یەکێک گەرەکی بوایە بە سلامەتی ئەوەی دیکە شەڕاب بخواتەوە، دەچووە سەر خومرە و دادەهاتەوە و چەشنی گامێش شەڕابی هەڵدەلووشی.

داوایان لە کوێخای گوندیش کرد چی دڵی دەخوازێ بخوا. ناوبراو دەستی لە هیچ شتێک نەدەدا، بەڵام هەرکات چاوی بە خزمێک یا ئاشنایەکی خۆی دەکەوت داوای لێدەکرد بێ و تێکەڵ بە مەجلیسەکە بێت.

وەختێک گەیشتنە لای خیریسۆفۆس دیتیان کە سەربازەکان بە گیای ویشک تاجیان بۆ خۆیان دروست کردوە و لەسەر خۆیان ناوە و منالانی ئەرمەنیش بە جلوبەرگی بەربەرییەوە خزمەتیان دەکەن. بە ئیشارە و ئیما ئەو منالانەیان تێدەگەیاند کە پێویستە چبکەن. پاش ئەوەی گزنفۆن و خیریسۆفۆس چاکوخۆشیان کرد، بە یارمەتی دیلمانجەکەیان کە بە زمانی فارسی دەدوا، لە کوێخایان پرسی ئەو وڵاتەی لێی نیشتەجێن ناوی چییە. کوێخا وڵامی داوە کە ئێرە پێیدەگوترێ وڵاتی ئەرمێنیا(ئەرمەنستان). ئەوجار سەبارەت بە جوانوو ئەسپەکان لێیان پرسی کە بۆ کێ پەروەردەیان دەکەن. کوێخا گوتی کە ئەوە بەشێک لە خەراجی ساڵانەیە و بە پاشا دەدرێ. ئەو هەروەها گوتی کە وڵاتی جیران هی خالیفییەکانە و ڕێگاکەی پێ نیشاندان.

گزنفۆن لە کۆتاییدا کوێخای لەگەڵ خۆی هێناوە ماڵەکەی و ئەسپی خۆشی کە پێشتر دەستی کەوتبوو پێشکەش بەو کرد و ڕایسپارد کە ئەگەر پاش فەترەیەک قەڵەو بۆوە دەتوانێ بیکاتە قوربانی، چونکە گزنفۆن بیستبووی ئەو ئەسپە پێشکەش بە خواوەندی ڕۆژ کراوە و لەوە دەترسا بەر لە قوربانی کردنی لە ڕێگادا بتۆپێ.

گزنفۆن یەکێک لە جوانوو ئەسپەکانی پەروەردەکراو بۆ پاشای بۆخۆی هەڵگرت و ئەوانی دیکەشی بەسەر ستراتێژ و لۆکاژەکاندا دابەش کرد. ئەسپەکانی ئەو ناوچەیە لە ئەسپەکانی فارسی بچووکتر، بەڵام زیندوو و سەری حاڵتر بوون. کوێخا پاشان بە یۆنانییەکانی گوت کە دەبێ دەست و پێی وڵاغەکانیان لە لبادی ئەستوور وەرپێچن بۆوەی بتوانن لەسەر بەفر خۆڕاگرن و تێڕۆنەچن، ئەگینا تا بەرزگیان لە بەفر ڕۆنەچن.

# بەشی ٦

## ڕاکردنی چاوساغ بەهۆی کەمتەرخەمی خیریسۆفۆس - چوونە نێو
## چۆمی فاسی - تێپەڕین بە وڵاتی تاووک و کالیپسۆس‌دا

ڕۆژی هەشتەمی مانەوە لە گوندەکان بوو. گزنفۆن کوێخای دێی ڕادەستی خیریسۆفۆس کرد بۆوەی چاوساغی ڕێگا بکا و کەسوکاری کابراشی جیا لە کوڕەکەی کە تازە باڵغ ببوو ئازادکرد. ئەو کوڕەشی دایەدەست پلیستێنیسی خەڵکی ئامفیپۆلیت‌دا کە چاوەدێری لێبکا و بڕیاردرا ئەگەر باوکەکەی ئەرکی خۆی بەباشی بەڕێوە برد، ئەوسا بۆی هەیە کوڕەکەی وەرگرێتەوە و پێکەوە بگەڕێنەوە دێ. هەروەها ئازووقەیەکی زۆریشیان هێنایە ماڵی کوێخا بۆوەی جێگای ئەو خواردەمەنییانە پڕکەنەوە کە لەو ماوەیەدا خوورابوون. دوای ئەو کارەیان وڵاغەکانیان بارکرد و وەڕێکەوتن.

کوێخا بێ ئەوەی دەستەکانی بەسترابن، لە پێشەوە بەسەر بەفردا دەڕۆیی. تەقریبەن گەیشتبووە مەنزڵی سێهەم، کاتێک خیریسۆفۆس لەگەڵی بە کێشە هات، لەسەر ئەوەی بەرەو دێهات و ئاوەدانی ڕێنوێنی نەکردبوون. کوێخا بەهانەی هێنابۆوە کە هیچ ئاوەدانییەک لەسەر ڕێگا بەدی‌ناکرێت.

خیریسۆفۆس لێیدابوو بەڵام دەستەکانی نەبەستبوو. دوای ئەو ڕووداوە کوێخا هەرکە فرسەتی دەست کەوتبوو، ڕایکردبوو و کوڕەکەشی جێهێشتبوو. ئەو ڕووداوە واتە توندوتیژییە لەگەڵ چاوساغ و ڕاکردنی ناوبراو بووە هۆی نێوان ناخۆشی مابەینی خیریسۆفۆس و گزنفۆن بە درێژایی تەواوی ڕێگا. "پۆلیس‌تێنیس" ئەوەندە خۆشی لە کوڕەکەی کوێخا هاتبوو کە لەگەڵ خۆی بردیە یۆنان و تەواوی ژیانی لەگەڵ کوڕە بە وەفاداری مایەوە.

لە درێژەدا بە حەوت مەنزڵ، هەر ڕۆژ پێنج فەرسەخ ڕێگایان بڕی و گەیشتنە ڕووباری فاسی کە یەک پلێترا بەرین بوو[104]. لەو چۆمەڕا بە دوو قۆناخ، دە فەرسەخی دیکە ڕۆیشتن. لەو شوێنەی کە لە ناوچەی شاخاویڕا بەرەو دەشتایی دادەگەڕان، گەیشتنە وڵاتی خالیڤی و تائووخی و فاسیانی‌یەکان.[105] مەودای سێ ستادیۆ بەرلەوەی بەسەر دوژمندا بکەوێ، چاوی پێیان‌کەوت و بۆیە خێرا هێزەکانی خۆی ڕاگرت. ئەو کارەی بۆیە کرد تا لە دوژمن نیزیک نەکەوێتەوە و لەشکری لە دەستەی بچووکدا کردە چەند لکی جیاواز. فەرمانی بە هێزەکانی‌تریشدا کە بە هەمان دەستوور خۆیان سازمان بدەن. بەو شێوەیە گەرەکی بوو لەشکر حاڵەتی جەبهەیی و ئامادەیی جەنگی بەخۆوە بگرێ.

---

١٠٣- مەبەست چۆمی ئاراکسە (ئاراس) کە دەڕژێتە بەحری کاسپین، نەک چۆمی فاسی لە کۆلخیدا. ئەوەی دوایی لە کێوەکانی قەفقازیا سەرچاوە دەگرێ و دەڕژێتە دەریای ڕەش.

١٠٤- خالیڤی‌یەکان گەلیکی چیانشین بوونە و لە بەرزاییەکانی قەراخ بەحری ڕەش ژیاون. ئەوانە بەردەوام خەریکی کارکردن لەسەر ئاسن و چۆدەن بوونە. هەربۆیەش یونانییەکان ناوی چۆدەن (خالیڤا)یان لەسەر ئەو خەڵکە داناوە. گزنفۆن دەڵێ کە ئەوانە خزمی خالدی‌یەکان بوونە، چونکە ستراڤۆن گوتوویەتی کە خالیڤی ناوی قەدیمی خالدی‌یەکان بووە. لە سەردەمی بیزانس‌دا نیوەندی ئەسڵی لەشکری نیزامی لە شاری ترابزۆن بووە و ناوی خالدی لەسەر داندراوە. تائووخی‌یەکان ئەوانەش گەلێکی میدیایی چیانشین بوونە و لە باکووری ئەرمەنستان لە دۆڵەکانی باشووری چۆمەکانی جیابۆوە لە ئارپاسوودا ژیاون. ئەوانە وەک گەلێکی سەربەخۆ، بەردەوام ناوچەکانی دەوروبەری خۆیان تالان‌کردوە. لە باشووری ڕۆژئاوای وڵاتی تائووخی‌یەکان و لە نیزیک چۆمی ئاراس، فاسیانی‌یەکان ژیاون. ناوی فاسیانۆس لەوێڕا هاتووە. وڵاتی باڵندەی فاسیانۆس، گرکانیا و میدیا بووە. ناوی ئەو باڵندەیە لەوێوە گەیشتووەتە قەراخەکانی دەریای ڕەش و دواتریش ئورووپا.

کاتێک هێزەکانی پاشقەرەوڵ گەیشتنە جێ، ستراتێژ و لۆکاژەکانی کۆکردەوە و بەو چەشنە قسەی بۆیانکرد: " وەک دەبینن هێزەکانی دوژمن ڕێگای نێو چیاکانی گرتووە. کاتی ئەوە هاتووە بیر لەوە بکەینەوە چۆن دەکرێ بە باشترین شێوە شەڕ بکەین. بە بڕوای من تا ئێمە کۆبوونەوەکەمان تەواو دەبێ و بە قەناعەتێک دەگەین کە ئیمڕۆ یا سبەینێ چیای پێشەوەمان دەرباز بکەین، باشترە سەربازەکانمان پشوو بدەن و نانێک بخۆن ".

کلێئانۆراس لەو نێوەدا وەجواب هات و گوتی: " بە بڕوای من پاش ئەو پشوودانە، چەکەکانمان دەست دەینێ و خێرا پەلاماری دوژمن بدەین. چونکە ئەگەر ئیمڕۆمان بە بەتاڵی تێپەڕێ و هێزەکانی دوژمن کە ئێستا دەمانبینن، غیرەتیان وەبەردێ و وەختێک خەڵکیش ورەی ئەوان بەرز ببینن، زیادتر تێکەڵاویان دەبن و ژمارەیان زیادتر دەکا ".

دوای کلێئانۆراس ئەوجار نۆرەی گزنفۆن هات. ناوبراو گوتی: " من لەو بڕوایەدام ئەگەر قەرار بێ شەڕ بکەین باشترە بیر لەوە بکەینەوە چۆن بە باشترین شێوە بیکەین. ئەگەر گەرەکمانە بە ڕاحەتترین و هاسانترین شێواز چیاکە دەرباز بکەین، دەبێ لە فکری ئەوەدا بین بە کەمترین زەرەر نەخشەکانمان بەڕێوەبەرین. ئەو چیایەی پێویستە پێیدا دەرباز بین، لە بەرانبەرمان هەڵکەوتووە و تیرەگێکە کە مەوداکەی پتر لە شێست ستادیۆ دەبێ. لە هیچ شوێنێکی ئەو چیایە وێناچێ هێزەکانی دوژمن دامەزرابن. تەنیا شوێن، زاری گەڵێیە کە گیراوە. باشتر وایە خێرا بەرزاییەکانی ئازادی ئەو ڕیزەکێوە بە نهێنی و بێ ئاشکرابوون داگیرکەین. ئەوە باشترە هەتا بەرەوڕووی دوژمنێکی دامەزراو لە شوێنی سەخت و قایم و ئامادەی جەنگ بینەوە. بە بڕوای من زۆر هاسانە ڕێگایەکی بێ شەڕ و سەرەولێژ بگرینە بەر بێ ئەوەی دژبەرێک لە بەرامبەر خۆماندا بەدی بکەین. پێویست نییە بە دۆڵێکدا بڕۆین کە چەپ و ڕاستمان بە دەست دوژمنەوە بێ. ماقووڵتر ئەوەیە کە پیاو بەبێ شەڕ و بێ دەنگ شەو بۆی دەرباز بێ، لەجیات ئەوەی بە ڕۆژی ڕووناک تووشی بەربەرەکانی بێ. ئەوەش بڵێم کە دەرباز بوون بە ناخۆشترین ڕێگادا بۆ سەربازەکانمان، خۆشترە لە ڕێگەیەکی کە هەتا ملان

له شەڕدا بن. هەڵبەت گەلێک دژوارە بە نهێنی بەشێک لەو چیایە بگرین، بەڵام ئەگەر بەشەو بێ و نەمانبینن، دەتوانین بە مەبەستەکانمان بگەین. ئەوەش بڵێم کە بەرەو پێش بردنی پلانێکی ئەوتۆ بۆ بەشێکی زۆر لەو ڕیزە چیایە کە جارێ داگیر نەکراوە هاسانترە. چونکە هێزەکانی دوژمن بە پرانی لەو شوێنەی ئێستایان دەمێننەوە کە لێی دامەزراون.

دەبێ بڵێم مەبەستی من دزینی ئەو ڕیزە کێوەیە. خیریسۆفۆس! لەگەڵ تۆمە. بیستوومە ئێوە سپارتییەکان و ئەوانەی سەر بە کۆمەڵگای ئەشرافی نین، هەر لە منالییەوە دەرسی دزیکردن دەخوێنن و نەک هەر جێگای شەرمەزاری نییە بەڵکوو بە پێچەوانەوە ئەگەر پیاو بتوانێ شتێک بدزێ کە قانوون و یاساغی نەکردبێ، وەک زیرەکی و هوشیاری لێکدەدرێتەوە. بۆوەی حەول بدەن کە دزیەکەتان بە باشترین شێوە ئەنجام بدەن و دەگیر نەکەون، قانوونی سزای قەمچی بۆ ئەو کەسانە دیاریکراوە کە لە کاتی دزیکردندا ئاشکرا دەبن و تووشی گیران دێن. ئێستا باشتر لە هەر کاتێکیترە کە هونەرەکەتان نیشان بدەن. تکایە گشت لایەنێکی خۆپارێزی ڕەچاو بکەن بۆوەی کەس نەتوانێ کێوەکەتان لە دەست دەربێنێ ئەگینا تووشی سزا و لێدانێکی بێ ئەندازە لە لایەن دوژمنەوە دەبن ".

خیریسۆفۆس لە وڵامی گزنفۆندا گوتی: " دیارە ئێوەش خەڵکی ئاتین لە دزی کردنی پارەی خەزێنەی حکوومیدا گەلێک توند و تۆڵن. لەبەر ئەوەی سزای دزییەکەش زۆر قورسە، زۆرجار بە تواناترین دزەکان گەورە پیاوانی حکوومین. کاتێک کۆمەڵێک لە زیرەکترین دزەکان، حکوومەت بەسەر ئێوەدا دەکەن ئێستا باشترین فرسەتە جەنابیشت وەک سەرکردەی خەڵکەکەت ئەو دزیە بکەی و خۆت نیشان بدەی ".

گزنفۆن وەجواب هات و گوتی: " من ئامادەم هەرچی زووتر نانبخۆین و جەنگاوەرە پاشقەرەوڵەکان وەڕێخەم و ئەو ڕیزە چیایە بگرم. دیارە بۆ ئاگاداریشتان من چاوساغم هەیە، چونکە پیاوەکانی من چەند کەسێکیان چەتە و ڕێگر گرتووە کە وەدوای لەشکر کەوتبوون. ئەوان گوتوویانە کە ئەو چیایە بۆ پێهەڵگەڕان و دەربازبوون دەبێ و تەنیا گاڕانی ماڵات و مێگەلە مەڕی

لێدەلەوەڕێن. جیا لەوەش ئەگەر ئێمە بەشێکی ئەو چیایە بگرین خێرا ولاغ و بارەکانمان دەتوانن پێیدا دەرباز بن و بۆ پێشەوە بڕۆن. هیوادارم کاتێک هێزەکانی دوژمن، ئێمە لەسەر دوندی چیاکە دەبینن کە وەک شوێنی خۆیان بەرزە، غیرەت نەکەن لە بەرامبەرماندا خۆیان بگرن. هەرچەند هەر ئێستاش ناوێرن لە بەرزاییەکانی خۆیان دابەزن و دژمان شەڕ بکەن ".

خیریسۆفۆس وڵامی داوە: " هۆی چییە کە جەنابت دەبێ ئەو کێوە بگری، یا هێزی پاشقەرەولیش لەژێر دەستی تۆ دابێ. ئەگەر خەڵکی خۆبەخش ئامادەی جێبەجێکردنی ئەو کارە نەبوون ئەوسا جەماوەرێکی دیکە بنێرە ".

دوای ئەو گفتوگۆیە، ئاریستۆنیمۆس و مێتیدریێئاس و جەنگاوەرەکانیان و هەروەها ئاریستێئاسی خەڵکی دورگەی خیۆس و ئێتێئۆس کوڕی نیکۆماخۆس گشتیان لەگەڵ سەربازەکانی ژێردەستی خۆیان خۆبەخشییان ڕاگەیاند. ئەوانە لەگەڵ بۆچوونەکانی خیریسۆفۆس و گزنفۆن بوون کە کاتێک دوندی چیایان گرت، ئاگرێکی زۆر بکەنەوە بۆوەی جەماوەری لەشکر ئاگاداری سەرکەوتنەکەیان بن. دوای ئەو بڕیارانە ژەمیان کرد. پاش پشوو و حەسانەوە، خیریسۆفۆس هێزەکانی پێشقەرەوڵی تا مەودای دە ستادیۆ دوور لە هێزەکانی دوژمن بەرەو پێشەوە وەڕێخست، بەو ئامانجەی کە دوژمن تەنیا بیر لە پەلاماری سەر ڕێگای بەردەمیان بکاتەوە.

نانخواردنی شەو تەواو بوو و تاریکی داهات، ئەوانەی دیاریکرابوون دوندی چیا بگرن، بە نهێنی وەڕێکەوتن و شوێنەکانی مەبەستیان گرت و ئاگرێکی زۆریان کردەوە و تەواوی شەو وەخەبەر بوون. کاتێک ڕۆژ بۆوە دوای ئەوەی قوربانی پێشکەش بە خواکان کرا، باقی سەربازەکانی لەشکر ڕێگای سەرەکی بەرەو هێزەکانی دوژمنیان گرتە بەر. ئەوانەش کە چیایان گرتبوو لەگەڵ دوژمن کەوتنە شەڕ. بەشی هەرە زۆری سپای دوژمن لە زارکی گەڵی جێی گرتبوو، تەنیا بەشێک لە جەنگاوەرەکانیان دژی یۆنانییەکان وەشاخ گەڕابوون. ئەوانیش پێش ئەوەی شەڕی لەشکرەکانی سەرەکی لە خوارەوە دەست پێبکا، لە داوێنی چیاکە کەوتنە بەر پەلاماری هێزە یۆنانییەکان. لە ئاکامدا یۆنانییەکان سەرکەوتن و سەریان لەدوونان.

لەلایەکی‌ترەوە سووکە چەکدارەکانی یۆنانی کە لە دەشتاییڕا دەهاتن، یەکسەر پەلاماری ئەو بەشەی دوژمنیان‌دا کە ڕێگای زارکی گەڵییەکەیان گرتبوو و خیریسۆفۆس‌یش بە یارمەتی چەکدارە قورسەکان بەپەلە هێرشی بۆ سەر دوژمن دەست پێکرد. شەڕکەرەکانی دوژمن ئەوانەی لەسەر ڕێگا جێگیر ببوون، کاتێک دیتیان جەماوەرەکەیان لەسەر چیا تووشی شکست هاتووە، یەکسەر ڕوویان لە هەڵاتن کرد. چەند کەسێک لەوانە کوژران و هێندێکیش بە دیل گیران. ژمارەیەکی زۆر قەڵغانی دەستچن دەستی بەسەر داگیرا و یۆنانییەکان جێبەجێ بە شمشێرەکانیان لەتوپەتیان کردن. دوای ئەو سەرکەوتنە، تەواوی هێزە یۆنانییەکان وەسەر کێوەکە کەوتن و قوربانییان پێشکەشی خواکانیان کرد و بەرەو دەشتایی داگەڕان و لە گوندەکان خێمەیان لێدا و چی کەرستەی گەرەکیان بوو دەستیان کەوت.

# بەشی ٧

## چوونە لای خەڵکی تائووخی - گرفتی وەڕێکەوتن - دەربازکردنی وڵاتی کالیپسی‌یەکان - تێپەڕین بە هارپاسو و گەیشتنە چیای تێکێسی

لە درێژەی ڕێگادا، بەرەو وڵاتی تائووخی‌یەکان وەڕێکەوتن و بە پێنج قۆناخ سی فەرسەخی‌تریان بڕی. ئازووقە لە کەمی‌دابوو چونکە خەڵکی تائووخی لە شوێنی حاستەم و چڕدا دەژیان و ئازووقەکەشیان لەو جۆرە شوێنانە حەمبار کردبوو. کاتێک نیزیکی ناوچەکە کەوتنەوە[١٠٦]، هیچ شار و ئاواییەک وەبەر چاو نەکەوت. بەڵام لەو شوێنە سەخت و قایمە کە وەک قەڵایەک دەچوو، ژن و پیاو و ئاژەڵەکانیان دەژیان. خیریسۆفۆس کاتێک گەیشتەجێ پەلاماری ئەو شوێنەی‌دا. سەرەتا یەکەم وەجبەی هێزەکانی دامەزراند و دوایە بەشێکی‌تر بە دوایاندا ڕۆیی و پاشان کەرتی سێهەم وەڕێکەوت. ئەوەش بۆیە بوو کە خیریسۆفۆس نەیدەتوانی تەواوی هێزەکانی خۆی بۆ گەمارۆدانی ئەو جێگا سەخت و شاراوەیە تەرخان بکا.

---

١٠٥- هێندێک توێژەر لەو باوەڕەدان کە ئەو شوێنە ئێمرۆ پێیدەگوترێ " ئۆلتی ".

گزنفۆن کاتێک لەگەڵ هێزەکانی پاشقەرەوڵ، بە چەکداری قورس و سووکەوە گەیشتە جێ، خیریسۆفۆس خێرا پێیگوت: " وەختێکی باش هاتن، چونکە بە هەر وەسیلەیەک بکرێ ئەو مەکانە دەبێ داگیر بکەین بۆوەی لەشکرەکەمان لەوە زیادتر تووشی بێ ئازووقەیی نەبێت ". پێکەوە تەکبیرێکیان لەو بارەوە کرد. گزنفۆن پرسیاری ئەوە بوو کە چ گرفتێک بووە مایەی پێشوەچوون. خیریسۆفۆس لە وڵامدا گوتی: " هەروەک دەبینی تەنیا یەک ڕێگامان لەپێشە. ئەگەر کەسێک بخوازێ بەو ڕێگایەدا دەرباز بێ، لەو ڕەوەزە گەورەیەڕا بەردی بەسەردا دەبارێ و هەر کەسیش لەو کەورانەی وێکەوێ لە جێوە دەمرێ ". ئەو هەروەها چەند کەس لە پیاوانی خۆی بە گزنفۆن نیشان‌دا کە چۆن دەست و لاقیان بەو بەردانە بریندار ببوو.

گزنفۆن بیری لەوە کردەوە باشە ئەگەر بەردەکانیان تەواو بوو ئایا شتێکی‌تر هەیە خلۆری بکەنەوە و پێشگیری لە دەربازبوونی ئێمە بکەن. خۆ لەو سەرە جەماوەرێکی زۆر کەمی لێیە و لە نێویشیاندا تەنیا دوو سێ کەسیان چەکدارن. ئەو ڕێگایەش کە قەرارە ئێمە پێیدا دەرباز بین و ئەوان گەرەکیانە لێمان بدەن و نەهێڵن، مەوداکەی دەگاتە یەک پلێترا و نیو. لەوەش یەک پلێترا بە داری پەڵک بە تەنکی داپۆشراوە. ئەگەر پیاوەکانمان لە پشت ئەو پەڵکانە دامەزرێنین ئیدی ئەو بەردانە چدەتوانن بکەن. لەوی‌بەولاوە تەنیا نیو پلێترا دەمێنێتەوە. کاتێک بەردەکان لە کەمی بدەن ئێمە دەبێ خێرا دەرباز بین.

خیریسۆفۆس لە وڵامدا گوتی: " هەڵبەت ئەو وەختەی ئێمە بە ژێر دارەکاندا دەڕۆین، ئەو کاتە ڕێژنەی بەردباران بەتەوژمتر دەبێ ".

گزنفۆن گوتی: " هەر بەو خاترە ئەو کارە دەکەین. چونکە ئەوان خێرا هەرچی بەردی لە شوێنە حاستەمەکان کۆیان کردوەتەوە، خلۆری دەکەنەوە، بۆیە باشترە بەرەو دار پەڵکەکان وەڕێ کەوین و ئەگەر سەرکەوتوو بووین لەوێڕا مەسافەیەکی ئەوتۆ نامێنێ و دەتوانین درێژە بە ڕێگامان بدەین، ئەگینا دەتوانین بە ڕاحەتی بەرەو دواوە بگەڕێینەوە ".

دوای ئەو باسوخواسە، خیریسۆفۆس، گزنفۆن، کالیماخۆسی خەڵکی پەراسیۆس کە ئەویش لۆکاژ بوو، بەرەو پێشەوە وەڕێکەوتن. ئەو ڕۆژە

یەکێک لە لۆکاژەکان فەرماندەیی هێزەکانی پاشقەرەوڵی وەستۆ گرتبوو. لۆکاژەکانیتر لە شوێنی خۆیان جارێ لە چاوەڕوانیدا بوون. نیزیک بە حەفتا کەس لە جەماوەری کالیماخۆس یەک یەک و بە پارێزەوە بە ژێر دارپەڵکەکاندا تێپەڕین.

ئاغاسیاسی ستێمفالی و ئاریستۆنیمۆسی مێتیدرێئاس هەردووکیان لۆکاژی سەر بە هێزەکانی پاشقەرەوڵ بوون و ئەوانیش لەگەڵ جەماوەری دیکە دوور لە دار پەڵکەکان ڕاوەستابوون. لەبەر ئەوەی تێپەڕینی زیادتر لە یەک دەستە بە ژێر دارەکاندا مەترسیدار بوو، کالیماخۆس فێڵێکی بەزەیندا هات. ناوبراو لە ژێر ئەو دارەی خۆی حاشاردابوو، دووسێ هەنگاوێک بۆ پێشەوە هەڵدەهات، هەرکە بەردەباران دەستی پێدەکرد خێرا بەرەو دواوە بۆ ژێر دارەکە دەگەڕاوە. بەو چەشنە، هەرچەند جارێک ئەو کارەی دەکرد هێزەکانی دوژمن بە قەیاسی عارەبانەیەک لە بەردەکانیان کەمدەبۆوە.

ئاغاسیاس کاتێک دیتی کالیماخۆس بە غیرەتەوە ئەو کارە دەکا و هێزەکانیشی لاسایی دەکەنەوە، لەوە ترسا کە ناوبراو یەکەم کەس بێ سەنگەرەکانی دوژمن بگرێ. بۆیە خێرا بێ ئەوەی داوای یارمەتی لە ئاریستۆنیمۆس بکا کە لە تەنیشتی جێیگرتبوو یاکوو لەگەڵ "ئێڤریلۆخۆسی خەڵکی لووسیا بیروڕایەک بگۆڕێتەوە، کە هەردووکیان دۆستی نیزیکی خۆی بوون، بە تەنیا پەلاماری بۆ پێشەوە دەست پێکرد و گەرەکی بوو وەپێش گشتیان بکەوێ.

کالیماخۆس چاوی بە ئاغاسیاس کەوت کە خەریکە وەپێشی دەکەوێتەوە، توند ڕۆبووە گوێچکەی قەڵغانی ناوبراو و مەحکەمڕایگرت. لەو بەینەدا ئاریستۆنیمۆسی مێتیدرێئاس و ئێڤریلۆخۆسی خەڵکی لوسیێئاس وەپێشیان کەوتنەوە. لە نێوان ئەو لۆکاژانەدا بەردەوام کێبەرکێی جوامێری لەگۆڕێدا بوو. ئەو جاریش کێبەرکێی نێوانیان دەستی پێکردەوە و لە ئاکامدا شوێنە حاستەمەکەی دوژمنیان گرت. هەڵبەت کاتێک چوونە سەر، بەردبارانێک لە گۆڕێدا نەمابوو. لەوێ تووشی دیتنی دیمەنێکی دڵتەزێن هاتن. ژنان منداڵەکانیان لەو سەرەڕا فڕێدەدایە خوارەوە. پاشان خۆیان و پیاو پێکەوە

خۆیان هەڵدەداشت. لەو وەختەدا لۆکاژ ئێنیاسی خەڵکی ستێمفالی دیتی کە یەکێک بە جلوبەرگی ڕازاوە بەرەو هەڵدێر ڕادەکات بۆوەی خۆی فڕێداتە خوارەوە، توند گرتی و گەرەکی بوو پێش بە خۆکوشتنی کابرا بگرێ. کابرا خۆی ڕاپسکاند و بە ڕاکێشانی ئێنیاس، هەردووکیان هەڵدێران و کوژران. لەو شوێنە چەند کەسێک بەدیلگیران و ژمارەیەکی زۆریش ئاژەڵ و مەڕومالات کەوتە دەست یۆنانییەکان.

یۆنانییەکان لە وڵاتی خالیڤیەکانڕا بە حەوت مەنزڵ، پەنجا فەرسەخ ڕێگا ڕۆیشتن. بە بڕوای یۆنانییەکان لە کاتی تێپەڕین بە نێو گەلانی ئەو ناوچەیەدا، خالیڤییەکان شەڕکەرترین خەڵک وەبەر چاو هاتن و بەرگری توندیان لە خۆیان نواند. ئەوانە زرێی سووکی ئاوریشمیان لەبەردا بوو و تاسەر سمتیان شۆڕ ببۆوە و لەوێشڕا بۆ خوارتر، بە تەنافی چندراوی مەحکەم، چەشنی تۆڕ داوێنیان دروستکردبوو. ئەوانە هەروەها کڵاو و پشتێندیان هەبوو و لەجیات شمشێر، بە خەنجەر شەڕیان دەکرد و کاتێک دژبەریان دەگرت لەجێوە سەریان دەبڕی و پاشان سەری براویان بە دەستەوە دەگرت و بەرزیان دەکردەوە و گۆرانییان دەچڕی و هەڵدەپەڕین و بەبەر چاوی نەیاری خۆیاندا تێدەپەڕین. ئەوانە خاوەن نێزەیەکی نووک تیژ بە درێژایی نیزیک بە پازدە پیخیس(پازدە زەرع) بوون[106]. "خالیڤی"یەکان گەرەکیان بوو یۆنانییەکان لەنێو ئاواییەکانیاندا بدەنە بەر پەلامار. هەرکات یۆنانییەکان بەرەو پێشەوە دەچوون، ئەوان لە پشتەوەڕا بۆیان دەهاتن و بەردەوام وەدوایان دەکەوتن. لەنێو دژ و قەڵاکانیاندا دەژیان و هەرچی ئازووقە و تفاقی هەیانبوو لەوێدا کۆیان کردبۆوە. بۆیە یۆنانییەکان نەیاندەتوانی هیچ ڕسقێکیان دەستکەوێ و تەنیا بە گۆشتی ئەو ماڵاتە بەڕێدەچوون کە لە تائووخیەکان گرتبوویان.

---

١٠٦- پیخیس پێوانەی مەودا و بەرابەری ٤٦ سانتیمیتر بووە.

هەرچۆنێک بێ، یۆنانییەکان لەو شوێنەڕا پاش فەترەیەک گەیشتنە چۆمی " ئارپاسۆ"[١٠٨]. بەرینایی ئەو ڕووبارە دەگەیشتە چوار پلێترا. یۆنانییەکان لەو چۆمەڕا بە چوار قۆناخ، بیست فەرسەخیان ڕێگابڕی و گەیشتنە وڵاتی "سکیتی"یەکان کە دەشتێکی پڕ لە ئاوەدانی بوو. لەو شوێنە سێ ڕۆژ مانەوە و ئازووقە و تفاقێکی زۆریان دستکەوت. پاش چوار مەنزڵیتر، بیست فەرسەخ بەرەو پێش ڕۆیشتن و گەیشتنە شارێکی گەورە بەناوی یمنیادا[١٠٩]. باژێڕێکی تا دڵ دخوازێ پڕ حەشیمەت و بە ڕەونەق بوو. حاکمی شارەکە چاوساغێکی ناردە لای یۆنانییەکان بۆوەی بەرەو وڵاتانی دژبەری خۆی ڕێنوێنیان بکا. کاتێک چاو ساغەکە گەیشتە لای یۆنانییەکان، بەڵێنی پێدان پاش پێنج ڕۆژ ڕێپێوان بیانگەیێنێتە شوێنێک کە چاویان بە بەحر بکەوێ و شەرتیشی لەگەڵیان بەست ئەگەر درۆی کردبێ، لەجێوە بیکوژن.

کابرا سپای یۆنانی ڕێنوێنی کرد و کاتێک چوونە نێو خاکی دوژمن، پێشنیاری بە لەشکر کرد کە ئەوەندەی پێیان دەکرێ ئاواییەکان بسووتێنن و وێرانیان بکەن. لەوەڕا دەرکەوت کە تەنیا بەو نییەتە چاوساغی کردوە نەک بۆ خۆشەویستی و خزمەت کردنی یۆنانییەکان.

ڕۆژی پێنجەم بوو و گەیشتنە کێوێک بەناوی تیخیس. کاتێک یەکەم وەجبەی یۆنانییەکان گەیشتنە سەر کێوەکە و چاویان بە بەحر کەوت، بە دەنگێکی بڵیند هاواریان کرد. گزنفۆن و هێزەکانی پاشقەرەوڵ بە بیستنی ئەو دەنگە پێیانوابوو کە دەستەی پێشقەرەوڵ تووشی شەڕ لەگەڵ دوژمنێکی نوێ هاتووە، چونکە خەڵکی ناوچەکە بەردەوام پەلاماری هێزەکانی پاشلەشکریان

---

١٠٧- بۆچوونی جیاواز لەنێوان توێژەرانی نوێدا سەبارەت بە ئارپاسۆس هەیە کە ئایا لقێک لە چۆمی ئاراس بووە کە ئێمڕۆ پێیدەگوترێ ئارپاچای یا چورووک یا ڕووبارێکی جیابۆوە لە فورات بووە.

١٠٨- لە پێوەندی لەگەڵ شوێنی هەڵکەوتەیی ئەو شارە بۆچوونی جیاواز هەیە. هێندێک توێژەری نوێ دەڵێن شاری یمنیاس لە ئەرزەڕۆم بووە. بەشێکیش پێیانوایە هەمان ئارتانوج و چەندێکیش لەو باوەڕەدان کە دەبێ گیومووشخانە بووبێ.

دەدا. لەو هێرشانەدا کەوتبوونە بۆسەی لەشکرەوە و چەند کەسێکیان کوژرابوو و هێندێکیشیان یەخسیر ببوون و نیزیکەی بە بیست قەڵگانی دروستکراو لە چەرمی خاو و نەتاشراوی گا کەوتنە دەست یۆنانییەکان.

لەبەر ئەوەی ئەو دەنگ و هەرایە بە زیادبوونی سەربازەکان و نیزیک بوونەوەیان پتروپتر دەبوو، گزنفۆن بەو قەناعەتە گەیشت کە دەبێ ڕووداوێکی جیددی قەومابێ. بۆیە سواری ئەسپەکەی بوو و لەگەڵ لیکیۆس و سوارەکانی بە مەبەستی یارمەتیدانی جەماوەرەکەی سەر شاخ غاریاندا. کاتێک نیزیکتر بوونەوە، دەنگی جەماوەر باشتر دەبیسترا. سەربازەکان هاواریان دەکرد: " بەحر، بەحر، بەحر" و هەرکامیان لەبەر خۆیەوە ئەو وشەیەی بەوەی خوارەوەی خۆی دەگوتەوە. ئەوسا تەوای لەشکر خێرا بەرەو ئەوێ چوون. هێزەکانی پاشقەرەوڵ و باروبنەی لەشکر بە گشتی گەیشتنە سەر دوندی چیاکە. سەرباز و لۆکاژ و ستراتیژەکان بە چاوی پڕ لە فرمێسکی شادی یەکتریان لە باوەش گرت. لەپڕێکا بێ ئەوەی کەس بزانێ کێ فەرمانی داوە، سەربازەکان کۆمەڵێک بەردیان کۆکردەوە. تەپۆڵکەیەکیان دروست کرد و هێندێک لە قەڵغانە چەرمییەکان و داردەست و قەڵگانی داریان هاویشتە سەر یەک و کابرای چاوساغیش مەتاڵی خۆی شکاند و داوای لە خەڵکیتریش کرد کە بە هەمان شێوە بجوڵێنەوە.

یۆنانییەکان بە گشتی دوای سپاس لە چاوساغ، ئەسپێک و هێندێک ئەشیای زێو و دەستێک جلی فارسی و دە داریک پارەیان پێدا. چاوساغەکە داوای هێندیک ئەنگوستیلەی کرد و حەزی لێیان بوو و سەربازەکانیش ژمارەیەکی زۆریان بۆ کۆکردەوە و دایانێ. ناوبراو ئاواییەکی بە یۆنانییەکان نیشاندا کە لەوێ خێمە لێبدەن. ئەو هەروەها ڕێگای بەرەو وڵاتی ماکرۆنییەکانی بە یۆنانییەکان نیشاندا و هەرکە شەو داهات بەرەو وڵاتی خۆی گەڕاوە.

## بەشی ٨

### ڕۆیشتن لە وڵاتی ماکرۆنییەکان - گەیشتنە چیاکانی کولک - شەڕ لەگەڵ بەربەرەکان - چوونە نێو ناوچەی ترابزۆن و سازدانی کۆمەڵێک کێبەرکێی وەرزیشی - شادی بێ وێنەی یۆنانییەکان

یۆنانییەکان لەو شوێنەڕا بە سێ قۆناخ و دە فەرسەخ ڕێگا، بە قووڵایی وڵاتی ماکرۆنییەکاندا تێپەڕین. ڕۆژی یەکەم گەیشتنە چۆمێک کە سنووری نێوان ماکرۆنی و سکیتی‌یەکان بوو. لای چەپیان شوێنێکی گەلێک حاستەم و مەحکەم بوو و لەلای ڕاستیش چۆمێک هەڵکەوتبوو کە ڕووباری سنووری نێوان ئەو دوو وڵاتە دەڕژایە نێوی. دەبوایە لەو چۆمەی دووهەم بپەڕنەوە. قەراخ چۆمەکە داری کەم بوو و زیادتر مێشەیەکی چڕ و پڕ بوو. کاتێک یۆنانییەکان لەو جێگایە نیزیک کەوتنەوە، خێرا دەستیان بە بڕینی دار و دەوەنی قەراخ چۆم کرد بۆوەی هەرچی زووتر لەو شوێنە ڕزگاریان بێت.

ماکرۆنییەکان خاوەن مەتاڵ و نێزە و جلوبەرگی پەشمی بوون. لەوبەری چۆم چەشنی بەرەی جەنگ ئامادە ڕاوەستابوون و یەکتریان بۆ شەڕکردن

هانده‌دا و به‌رده‌وام به‌ردیان داویشت و ده‌که‌وتنه نێو ئاوه‌که‌. به‌رده‌کانیان نه‌ده‌گه‌یشتنه یۆنانییه‌کان و بۆیه‌ش که‌سیان نه‌ئه‌نگاوت.

له‌و وه‌خته‌دا کابرایه‌ک له‌نێو سووکه چه‌کداره‌کانی یۆنانیدا به گزنفۆن ناسێندرا. ئه‌و کابرایه پێشتر له یۆنان غولام بوو و زمانی ماکرۆنی ده‌زانی. هاته پێشه‌وه و گوتی که زمانی ئه‌و خه‌ڵکه ئه‌وه‌نده به باشی ده‌دوێ که ئه‌و ولاته به نیشتمانی دووهه‌می خۆی ده‌زانێ. ئه‌گه‌ر یۆنانییه‌کان بخوازن، ئه‌و ده‌توانێ له‌گه‌ڵ ئه‌و خه‌ڵکه‌ی به‌رامبه‌ر قسه بکا. گزنفۆن گوتی: باشه با قسه‌یان له‌گه‌ڵ بکا و بزانین به‌ڕاستی ئه‌وانه کێن.

کاتێک لێیان پرسین ئێوه کێن، ئه‌وان له ولامدا گوتیان که ماکرۆنین. گزنفۆن به کابرای گوت بپرسه و بزانه بۆچی جه‌به‌ه‌یان گرتووه و وه‌ک دوژمن له به‌رامبه‌رماندا ڕاوه‌ستاون. ماکرۆنییه‌کان ولامیان داوه که ئێوه بۆچی هێرشتان هێناوه‌ته سه‌ر ولاتی ئێمه و ده‌خوازن وێرانی بکه‌ن. ستراتێژه‌کان داوایان کرد ئه‌و خه‌ڵکه باشتره دڵنیا بکرێن که ئێمه مه‌به‌ستێکی خه‌راپمان نییه. ئێمه چوبووین دژی پاشا شه‌ڕ بکه‌ین. ئێستا ته‌نیا ده‌خوازین بگه‌ڕێینه‌وه ولاتی خۆمان و ده‌مانهه‌وێ هه‌رچی خێراتر بگه‌ینه قه‌راخ به‌حر.

ماکرۆنییه‌کان پرسیاریان کرد که چۆن ده‌کرێ زه‌مانه‌تێک بۆ ئه‌و گوتانه به‌وان بده‌ن. ستراتێژه‌کان ڕایانگه‌یاند که ئاماده‌ین به‌ڵێن بده‌ین و په‌یمان ببه‌ستین بۆوه‌ی گشت لایه‌ک دڵنیا بن. دوای ئه‌و ڕاوێژه ماکرۆنییه‌کان وه‌ک به‌ڵێن نێزه‌یه‌کیان پێشکه‌ش به یۆنانییه‌کان کرد و له‌لایه‌ن له‌شکریشه‌وه نێزه‌یه‌ک بۆ ده‌سپێکی ئاشتی و ئاگربه‌س بۆ ماکرۆنییه‌کان به‌ڕێکرا. به گۆڕینه‌وه‌ی ئه‌و نێزانه په‌یمانی ئاشتی دامه‌زرا و هه‌ردوولا خوایان به شاهید گرت.

دوابه‌دوای ئه‌و په‌یمانه، ماکرۆنییه‌کان خێرا که‌وتنه یارمه‌تیدانی یۆنانییه‌کان و ده‌ستیان به بڕینی دار و ده‌وه‌نی قه‌راخ چۆم کرد و ڕێگایان بۆ په‌ڕینه‌وه‌ی له‌شکر خۆشکرد. هه‌روه‌ها ڕێگایان پێدان که چه‌ندی پێویستییانه ئازووقه و تفاق بۆخۆیان بکڕن. سێ ڕۆژی ڕێک شانبه‌شانی له‌شکری یۆنانی به ڕێگادا ڕۆیشتن تا گه‌یشتنه زنجیره چیاکانی کۆلخیدا.

لەشکری یۆنانی سەرەتا بە شێوەی فالانگ (وشەیەکی یۆنانی، ستوونی نیزامی سەربازان بەشێوەی ١٦ دە ١٦) ڕێگا دەڕۆیشت. دوای ئەوەی کۆبوونەوە، ستراتیژەکان کەوتنە ڕاوێژ بۆوەی بزانن بە چ جۆرێک باشتر دەتوانن بەربەرەکانی بکەن. گزنفۆن لەو نێوەدا پێیوابوو کە شێوازی فالانگ ئەسڵەن بە مەسڵەحەت نییە و باشتروایە بە شێوەی لۆخۆس(دەستەی سەد کەسی) بێ. چونکە شێوازی فالانگ تووشی شکست دێت. ئەو هەروەها گوتی: " کاتێک لە چیای مەبەستمان وەسەر دەکەوین چەند شوێنێک بۆ پێهەڵگەڕان زۆر ڕاحەتە بەڵام هێندێک شوێنی زۆر ناخۆشە. ئەگەر بە شێوەی فالانگ ڕێکخرابین یەکسەر نەزم و تەرتیبمان لێتێکدەچێ ئەوەش خێرا دەبێتە هۆی شپرزەیی و بێزاری سەربازەکان. جیا لەوەش کاتێک لەشکر کۆدەبێتەوە سەریەک، دوژمن بەرەیەکی فراوانتر لە هی ئێمەی بەدەستەوە دەبێ و ئەگەر جەبهەی خۆی چووکتر بکاتەوە، ئەو هێزە زیادییەی لەبەر دەستیدا دەبێ، لە هەرکوێ بخوازێ کەڵکی لێوەردەگرێ. لەحاڵێکدا ئەگەر بە شێوەی لۆخۆس خۆمان سازمان بدەین، وەختێک بکەوینە بەر پەلاماری بە کۆمەڵ یا تیربارانی گشتی، دیارە ئەگەر ڕووداوێکی ئەوتۆ بێتە پێش، نەزمەکەمان ئەگەریش بشێوێ، نابێتە هۆی کارەساتێکی گەورە. بۆیە من پێموایە بە شێوەی لۆخۆسی جیاجیا دابەش بین مەسڵەحەتترە. ئەوەندەی بکرێ پانتاییەکی بەرفرە بە بوونی بۆشایی لە نێوانماندا داگیر بکەین. کاتی شەڕ بە لۆخۆسەکانی پێشەوەی هەرچوار تەنیشت بەربەرەکانی لەگەڵ ڕیزەکانی پێشەوەی دوژمن بکەین. لۆخۆسەکانی دواوە پشتی جەبهە بگرن و ئەو سەربازانەی لە پێشەوەش جێدەگرن لە کەسانی بە غیرەت بن. لە هەر جێگایەک فرسەت و ڕێگای دەرباز بوون هاتەکایەوە خێرا لۆخۆسەکان بۆی دەرچن و هەرکەس فەرماندەری دەستەی خۆی بکا. بەو جۆرە دوژمن ناتوانێ خۆی بخزێنێتە جێ بۆشایی ئەو هێزانەی ڕۆیشتوون. چونکە لە چوارلاوە لۆخۆسەکانی خۆمانی لێیە و کاتی پەلاماری دوژمنیش ئەوەندە هاسان نییە بەرەی ئێمە تێکبشکێ. هەڵبەت ئەگەر لۆخۆسێک تووشی گرفت بێ، ئەوەی تەنیشتی بە هاواریەوە دەچێ. ئەگەر هەر لۆخۆسێکیش خێرا بگاتە سەر چیاکە و دوندەکە بگرێ، لە هێزەکانی دۆژمن هیچکەس لەوێ نامێنێتەوە.

گشت لایەک ئەو پێشنیارەی گزنفۆنی پەسند کرد. ڕێکخستن بە شێوەی لۆخۆسی دەستی پێکرد. گزنفۆن لە بەشی ڕاستڕا بەرەو لای چەپ ڕۆیی و ئەوجار ڕووی لە سەربازەکان کرد و گوتی: " پیاوەکان! ئەو خەڵکانەی دەیانبینن دوایین بەربەست لەسەر ڕێگای ئێمەن، بۆوەی نەهێڵن بگەینەوە ئەو شوێنەی لەو ماوەیەدا ئاوات و ئارەزومان بووە. ئەگەر شێوەیەک، ڕێگایەک ببینینەوە دەبێ بیانگرین و بە زیندوویی بیانخۆین ".

کاتێک لۆکاژەکان هەرکام جێگای خۆی گرت و هێزەکانی ژێر فەرمانیان لە نێوەندی لەشکر بە شێوەی ستوونی ڕاست دامەزراند، نیزیکەی هەشتا دەستە سەربازی چەکداری قورس ڕێکخران و هەر دەستەیەش سەد کەس بوون. سەربازەکانی سووکە چەکدار و تیرهاوێژیش بە سێ قیسم دابەشکران و لە ڕاست و چەپ و نێوەند جێیان گرت. هەرکام لەو بەشانە نیزیکەی شەش سەد سەرباز دەبوون. پاش ئەو دابەشکرانە ستراتیژەکان دەستووریان‌دا کە تێکڕا دوعا بخوێنن و لە خواکان بپاڕێنەوە. کاتێک دوعا خوێندرا و سروودی جەنگییان چڕی، وەڕێکەوتن. خیریسۆفۆس و گزنفۆن لەگەڵ سووکە چەکدارەکان خێرا و بەچەشنێک دەڕۆیشتن کە وەپێش هێزەکانی دوژمن بکەون.

هێزەکانی دوژمن وەختێک چاویان بە جوڵەی ئەو وەجبەیە کەوت، هێندێکیان پەلاماری کەرت ڕاستی یۆنانییەکانیان‌دا و بەشێکیشیان ڕووی لەلای چەپ کرد و بۆشاییەکی گەورەیان لە نێوەندی خۆیاندا دروست کرد. ئارکادییەکانی سووکە چەکدار بە فەرماندەری ئێسخینیسی خەڵکی ئاکارنانا پێیان‌وابوو کە هێزەکانی دوژمن ڕوویان لە هەڵاتن کردوە، بە هاوار و نەعرەتە هێرشیان کردە سەریان. ئەوانە یەکەم وەجبە بوون و لە کێو وەسەرکەوتن و بەدوای ئەوانیشەوە ئارکادییەکانی چەکداری ژێر فەرمانی کلێئانۆرسی خەڵکی ئۆرخۆمێنۆ وەڕێکەوتن. هێزەکانی دوژمن دەستیان بە هەڵاتن کرد. ڕانەوەستان و هەر بابایە خەریکی خۆ ڕزگارکردن بوو. کاتێک یۆنانییەکان کێوەکەیان دەرباز کرد ئەوسا ڕوویان لە گوندەکانی دەوروبەر کرد و ئازووقە و تفاقێکی زۆریان کۆکردەوە. کەرستەکانی‌تر زۆر بەلای یۆنانییەکانەوە گرینگ نەبوون بەڵام هەنگوینی ئەو دەڤەرە گەلێک ناسراو بوو. هەرکام لە سەربازەکانی یۆنانی هەنگوینی شانەی خواردبوو تووشی

پەرێشانی و ڕشانەوە و زگچوون هاتبوو. جەماوەرێک دوای خواردنی ئەو هەنگوینە نەیاندەتوانی بەسەر پێوە ڕاوەستن. ئەوانەش کە زۆر کەمتریان خواردبوو، وەک کەسیک دەچوون کە تووشی سەرخۆشییەکی قورس هاتبن. جەماوەرێکیان بە خواردنی ئەو هەنگوینە وەک شێتانیان لێهاتبوو و هێندێکیشیان چەشنی مردوو بوون.[110] خەڵکێکی ئەوەندە زۆر تووشی ئەو وەزعە هاتبوو و لەسەر عەرزی ڕاکشابوو کە وەک لەشکرێکی شکست خواردوو دەچوو و تۆزی خەفەت تەواوی ئۆردوگای داگرتبوو. ڕۆژی دوایی بەبێ ئەوەی کەس بمرێ، تەقریبەن لە هەمان وەختدا گشتیان هەستانەوە و حاڵیان باشتر ببوو. ڕۆژانی سێهەم و چوارەم کاتێک لەجێوە هەڵدەستان، سەریان لە گێژەوە دەهات و دەتگوت دەرمانداو کراون.

دوای ئەو ڕووداوە لەو شوێنەڕا بە دوو قۆناخ، حەوت فەرسەخ ڕێگایان بڕی و گەیشتنە قەراخ بەحر و نیزیک شاری تراپێزوندا(ترابزۆن)[111]. شارێکی یۆنانیی‌نشین و کۆلۆنی سینۆپی‌یەکان هەڵکەوتوو لە ئێفکسینۆ پۆندۆ لە وڵاتی کولخی‌یەکان بوو. لەوێ زیادتر لە سی ڕۆژ مانەوە و بەسەر دێهاتی کولخی‌یەکاندا دابەش‌کران. کاتی مانەوەیان لەو گوندانە بەرەو تاڵانی وڵاتی کۆلخیدا دەچوون. خەڵکی تراپێزۆندا خزمەتێکی باشی خەڵکی نێو ئۆردوگایان کرد. ئەو خزمەتەش بۆیە بوو تاکوو یۆنانییەکانیش لەگەڵ دانیشتووانی وڵاتی کۆلخی کە دراوسێیان بوون دۆستانە ڕەفتار بکەن و لەو ماوەیەدا دیارییەکی زۆر پێشکەش بە لەشکر کرا.

دوای ئەو ڕووداوانە، جێژنی قوربانی ڕێکخرا چونکە بەڵێنێک بوو بە خواکانیان دابوو و دەبوایە بەڕێوە بچێ. بەو بۆنەوە گاگەلێکی زۆریان کۆکردەوە تا بۆ خواوەندی ڕزگاری واتە دیا و خواوەندی ڕێنوێنی ڕێگا ئیراکلیس[112] و باقی خواکانی‌تر قوربانی بکرێن چونکە یارمەتی لەشکریان دابوو و دوعای سەربازەکانیان قبوڵ کردبوو. ئەوجار بۆ پێکهێنانی

---

١٠٩- هەنگوینی شیرین لە هەنگی ناوچەی ترابزونە کە زیادتر گوڵی شیلانەکانی بنەماڵەی ڕۆز و بەتایبەتی گوڵەباخێک بەناوی ڕازالیئا بۆن‌دەکا و لەو هەرێمە دەفرۆشرێ و ڕەنگی تۆزێک ڕەشترە و بۆرە تاڵاییەکی پێوە دیارە.

١١٠- هەرێمی سینۆپی کۆلۆنی میلیتو بووە و لە کۆتاییەکانی سەدەی حەوتی پێش زایینداا بنیات نراوە.

١١١- خواوەند ئیراکلیس پشتیوان و پارێزەری مرۆڤ لە کاتی سەفەرکردندا بووە.

کێبەرکێیەکانیان لەو شاخەی خێمەیان لێدابوو ئامادەکارییان بۆ کرد. لەوێ دراکۆندیۆی سپارتی هەڵبژێردرا. ناوبراو لە وڵاتی خۆی دوور خرابۆوە، چونکە کاتێک منداڵ بوو یەکێکی هاوتەمەنی خۆی بە چەقۆ کوشتبوو. دراکۆندیۆ دیاریکرا کە شوێنی هەڵاتن و غارە ئەسپ دەستنیشان بکا و بەرپرسایەتی کێبەرکێی بەشداران وەستۆ بگرێ. کاتێک ڕێورەسمی قوربانیدان کۆتایی هات، پێستی گایەکانی سەربڕاو گشتیان درانە دراکۆندیۆ و داوایان لێکرد کە ڕێنوێنی خەڵکەکە بۆ شوێنی کێبەرکێ بکا.

ناوبراو ڕاست ئەو جێگایەی دەست نیشان کردبوو کە پێشتر خێمەیان لێدابوو و گوتی: " ئەو تەپۆڵکەیە باشترین شوێنە بۆ ئەو کەسەی گەرەکی بێ غاربدا ". خەڵکەکە لێیان پرسی کە چۆن دەکرێ لە جێگایەکی کەندەڵان و پرداری ئەوتۆ پاڵەوانییەتی بەڕێوە بچێ. ناوبراو لە وڵامدا گوتی: " هەڵبەت ئەو کەسەی دەکەوێتە خوارەوە تووشی ئازارێکی زۆر دەبێ ". بەهەرحاڵ لەسەر ڕێگاکە[112] لاوەکان کە بەشی زۆریان یەخسیر بوون، ئامادەی ڕاکردنی خێرا و لەولاشەوە جەماوەرێکی کرێتی کە زیادتر لە شێست کەس دەبوون بۆ ڕاکردنی دیلیخۆ (ڕاکردنی مەودایەکی بیستوچوار تا سی ستادیۆیی) جێیانگرتبوو. بۆ زۆرەوانی و مستوەشێنی جەماوەرێکی دیکە دیاریکرابوو. بەگشتی هەرهەموویان کێبەرکێیەکی جوانیان پێشکەش کرد. حەشیمەتێکی فرەش بۆ چاولێکردن و تەشویق و لاینگری لەو شوێنە حازر بوون.

سوارکارەکان دەبوایە لە تەپۆڵکە بەرزەکەڕا بەرەو بەحر سوارچاکی خۆیان بنوێنن و لەوێشەوە بگەڕێنەوە پشتی بەرزاییەکە. کاتێک بەرەو خوارەوە هەڵدەهاتن، کۆمەڵێک ئەسپ سەرمەقولاتیاندا. لە گەڕانەوەشدا هەروەها، لەبەر توندی هەورازەکە بە زەحمەتێکی زۆر وەسەر کەوتنەوە و هەنگاوەکانیان بەجارێک شلببۆوە و نەیاندەتوانی ڕابکەن. لەکاتی ئەوتودا هەراوهوریای خەڵک و پێکەنین و تەشویق پتر دەبیسرا.

---

112- ستادیۆ ڕێگایەکی سادە و مەودای ٦٠٠ پێ بووە.

# کتێبی پێنجەم

## بەشی ١

**خیریسۆفۆس وەدوای دۆزینەوەی گەمی کەوت - دابینکردنی ئازووقە و دردۆنگی لە گزنفۆن لەلایەن سەربازانەوە - ناردنی دیکسیپۆس بۆ هێنانی گەمی و هەڵاتنی ناوبراو - پۆلیکراتیس تەنیا یەک گەمی هێنا.**

گشت ئەو کارانەی یۆنانییەکان بە درێژایی ڕێپێوانەکەیان جێبەجێیان‌کرد، واتە لە لەشکرکێشی کوروش‌ڕا تا گەڕانەوەیان بۆ ڕۆخەکانی دەریای ڕەش و هەروەها چۆنییەتی گەیشتنەوەیان بۆ تراپیزۆندا و قوربانییەکانی کە پێشتر لەمەر ڕزگاری و نەجاتیان بەڵێنیان دابوو کە هەرکات گەیشتنە وڵاتی دۆست جێبەجێی بکەن، بابەت گەلێک بوون کە لە کتێبی پێشوودا باسیان لێوەکرا.

لە درێژەی ڕێگادا یۆنانییەکان کۆبوونەوە و تەگبیریان لە چۆنییەتی پاشماوەی ڕێگا کرد. سەرەتا لیئۆنی خەڵکی توریۆس هەستا سەرپێ و

دەستی بە ئاخاوتن کرد و گوتی: " پیاوەکان! من بەڕاستی چیتر تاقەتی ئەوەم نییە باروبنە تێکبنێم و خێرا لە شوێنی خۆم جێبگرم و بە ڕاکردن چەکەکەم دەست بدەمێ و بەردەوام پاسەوانی بکەم و لە شەڕیشدا بەشداربم. ئێستا کە بەحرمان لەپێشە، دەخوازم بەدەست گشت ئەو چەرمەسەریانەوە نەجاتیم بێت و باقی ڕێگا بەسەر بەحردا تێپەڕین و بەدەم حەسانەوە و خەوتنەوە، وەک ئۆدیسە لەنێو گەمییەکدا بگەڕێینەوە یۆنان ".

کاتێک سەربازەکان گوێیان لەو قسانە بوو، پەسندیان کرد. یەکی‌تریش بە هەمان شێوە قسەی کرد و بەگشتی هەموو لایەک لەگەڵ ئەو بۆچوونە بوون. لە درێژەدا خیریسۆفۆس وەقسە هات و گوتی: " پیاوەکان! ئەناکسیڤیۆسی گەمیوان بەخۆشییەوە دۆستێکی نیزیکی منە. ئەگەر ئیزن بدەن دەچمە لای ناوبراو، پێموایە بتوانم ژمارەیەک گەمی جەنگی لێوەرگرم کە بتوانین بگەینەوە یۆنان. هەڵبەت ئێوە پێویستە تا من دەگەڕێمەوە چاوەروان بن. حەول‌دەدەم هەرچی زووتر بگەڕێمەوە لاتان ".

سەربازەکان کاتێک گوێیان لەو قسانە بوو، زۆر ڕازی وەبەرچاو هاتن و تێکڕا یەکدەنگ داوایان لە خیریسۆفۆس کرد کە گەمییەکان خێرا بێنێ و بگەڕێتەوە.

دوای ئەو باسە، گزنفۆن ڕووی لە جەماوەر کرد و گوتی: "پیاوەکان! خیریسۆفۆس دەچێ هاسانکاری بۆ هێنانی گەمی بکا و ئێمەش لێرە چاوەڕوانی گەڕانەوەی ئەو دەکەین. ئێستا گەرەکمە سەبارەت بە هێندێک ئەرک و وەزیفە بۆ ئێوە بدوێم کە کاتی مانەوەمان لێرە دەبێ جێبەجێیان بکەین. یەکەم، پێویستە ئازووقە لە وڵاتی ژێردەستی دوژمن دابین‌بکەین. چونکە لێرە بژیوێکی ئەوتۆ لەگۆڕێدا نییە، پارەیەکی زۆرمان بەدەستەوە نییە کە پێداویستیەکانی پێبکڕین و بازاڕیش کیفایەتی خواستەکانی ئێمە ناکا. لەوەش بگوزەرێین، ئێرە خاکی ژێر حوکمی دوژمنە و ئەگەر بۆ وەدەستهێنانی پێویستییەکانمان بە شێوەیەکی بێ‌نەزم و بێ پاسەوان بجوڵێینەوە، هەمیشە مەترسی تێداچوونمان هەیە. بۆیە بە باوەڕی من دەبێ بە ئاواییەکانی ژێر دەسەڵاتی دوژمندا بگەڕێین و ئازووقەی پێویست

کۆکەینەوە و بۆوەی تووشی ڕووداوی ناخۆش و مەترسیدار نەبین، لەسەرمان فەرزە بێکار نەجوڵێینەوە و ڕێگای دوور نەڕۆین. ئێمەی ستراتێژەکانیش پێویستە بەهەر شێوەیەک بکرێ و بگوونجێ پارێزگاری لەو سەربازانە بکەین کە بۆ تالآن دەچن". ئەو پێشنیارانە بەگشتی لەلایەن جەماوەرەوە پەسند کران.

گزنفۆن دوای ئەو پەسند کردنە ئەوجار گوتی: " تکایە گوێ لەو بابەتەش ڕابگرن، هەڵبەت کەسانێک لە ئێوە هەن کە وەدوای کۆکردنەوەی غەنیمەت دەکەون. بەباوەڕی من گەلێک پێویستە ئەوانەی ئەو کارە دەکەن پێشتر ئێمە ئاگاداری چوونیان بکەن و پێمان بڵێن پەلاماری کوێ دەدەن، بۆوەی ژمارەی ئەو کەسانە بزانین کە بۆ ئەو کارە دەچن. هەروەها ئێمەش کە دەمێنینەوە، ئەگەر دەستەیەک تووشی گرفت هات بتوانین یارمەتی بدەین و هێزی بۆ بنێرین. دەبێ بۆ وەختێکی ئەوتۆ کەسانی ئامادەمان هەبێ و بزانین هێزی یارمەتیدەر بۆکوێ بنێرین. هەروەها ئەگەر کەسانی کەم ئەزموون لەگەڵ هێزەکانی دوژمن کەوتنە شەڕ، ئێمە بتوانین ڕێوشوێنێک دیاری بکەین و زانیاری پێویستیش بە هێزی یارمەتیدەر بدەین کە بە هاواریانەوە دەچێ ". ئەو پێشنیارەش پەسندکرا.

هێندێک بیر و بۆچوونی دیکەش لەلایەن گزنفۆنەوە هاتنە گۆڕێ و لە درێژەدا ناوبراو گوتی: " وەک دەزانن، لەبەر مانەوەی درێژخایەنی ئێمە لێرە، هێزەکانی دوژمن ئەوەندەیان وەخت هەیە کە لە ڕێگای دووریشەوە بە سازماندراوی بگەنە ئێرە و پەلامارمان بدەن و چی هەمانە لە دەستمان دەربێنن. لە بارێکەوە ناهەق نین ئەگەر هێرشمان بکەنە سەر و تووشی گرفت و کێشەمان بکەن چونکە ئێمە مڵک و سامانی ئەوانمان لەژێر دەست دایە. ئەوان هەروەها لە باری نیزامییەوە ڕێکوپێکترن. بۆیە بە پێویستی دەزانم کە پارێزگارییەکی باش لە ئۆردوگاکەمان بکەین و لە چوار دەورمان پاسەوان دابنێین. چونکە ئەگەر بە مابەین و بە دوای یەکدا و لە شوێنی جیاواز دیدەبان دابنێین، بۆ دوژمن دژوار دەبێ بە مەبەستی تالآن، هێرشمان بکاتە سەر.

هەروەها بە پێویستی دەزانم سرنج بەو خالانەش بدرێت. ئەگەر دلنیابین کە گەڕانەوەی خیریسۆفۆس بە گەمییەکانەوە مسۆگەرە، پێویست نییە لەوە زیادتر قسە بکەم بەلام لەبەر ئەوەی هێشتا لێمان ڕوون نییە ئاکام چدەبێ، واباشترە لێرەش حەولی پەیداکردن و ئامادەکردنی ژمارەیەک گەمی بۆ ڕۆیشتن بدەین. چونکە ئەگەر ناوبراو بە گەمییەوە بگەڕێتەوە و لێرەش ئێمە چەندێکمان ئامادە کردبێ، ئەوسا بە ڕادەیەکی پتری گەمییەوە و بەڕاحەتی زیادترەوە دەڕۆین. بەلام ئەگەر خیریسۆفۆس گەمی دەست نەکەوت کەلک لەو گەمییانە وەردەگرین کە لێرە ئامادەمان کردون. هەلبەت من بەردەوام دەبینم کە ڕۆژانە ژمارەیەکی زۆر گەمی دێنە بەندەرەکانی کەنارئاوی دەریای ڕەش. بە باوەڕی من دەکرێ داوا لە گەمییەکانی جەنگی تراپێزۆندی بکەین و لەو لاشەوە هەر پاپۆڕێکی دیکە هات بیگرین و ناچاری بکەین لە بەندەر و لە شوێنێ جیا و نیزیک لەنگەر بگرێ و فەرمانەکانیان لێکەینەوە و نیگابانیان بۆدانێین، ڕەنگە بتوانین بە ڕادەی پێویست گەمی بۆ ڕۆیشتنمان ئامادەبکەین ". ئەو پێشنیارەش بە تێکرای دەنگ پەسندکرا و گزنفۆن دیسانیش وەقسە هات و لە درێژەدا گوتی: " پاش ئەوەی ئەو بڕیارانەتان پەسند کرد ئەوسا بیر لەوەش بکەنەوە کە پێویستە مەخاریجی ئەو گەمییانە دابینبکەین کە بە زۆر ڕایاندەگرین. خاوەنەکانیان ئازووقە و خواردەمەنییان گەرەکە، چونکە ناچارن لەو ماوەیەدا بێکار و لە بەندەر چاوەڕوانی ئێمە بن، با ئێمە سوودێکمان بۆ ئەوان هەبێ و ئەوانیش خێرێکمان بۆ بدەنەوە ". ئەو پێشنیارەش قبولکرا.

گزنفۆن ئەوجار هاتە سەر باسی بابەتێکی دیکە و گوتی: " ئەگەر بارودۆخەکە ئەو جۆرەی دەخوازین بەرەو باشی نەچوو و گەمی پێویستمان دەست نەکەوت، داوا لە خەلکی ئاوایییەکانی قەراخ بەحر بکەین ڕێگای هاتووچۆ دروست بکەن و بەپێی زانیارییەکانی هەمانە جادەکانیان بۆ دەربازبوون گونجاو نین. پێموایە خەلکەکە لەو بارەوە خێرا ملدەدەن، چونکە لەلایەکەوە لێمان دەترسن و وەکیتریش دەخوازن هەرچی زووتر لە یەخەیان

بینەوە ". ڕاست لەو کاتەدا تەواوی سەربازەکانی یۆنانی تێکڕا و یەکدەنگ هاواریان کرد کە ئێمە لەوە زیادتر گەرەکمان نییە ڕێگا بپێوین.

کاتێک گزنفۆن چاوی بە نەفامی ئەوانە کەوت، ئیتر پێشنیارەکەی نەدایە بەر دەنگدان، بەڵکوو دواتر بە نهێنی پێوەندی بە شارەکانی سەر ڕێگاوە گرت کە بە خواست و مەیلی خۆیان ڕێگای دەربازبوون بۆ لەشکری یۆنانی خۆش بکەن و پێیگوتن هەرچی ڕێگامان خۆشتر بێ گەڕانەوەمان بۆ یۆنان خێراتر بە ئەنجام دەگا. گەمییەک لە خەڵکی تراپێزۆندا کە پەنجا بێڵژەن و خاوەن هەشتا کارگێڕ بوو بە قەرز وەرگیرا. گەمیوانەکەی دێکسیپۆی لاکۆنی هەڵبژێردرا و دانیشتووی خوودی دەڤەرەکە بوو. ناوبراو لە جیات ئەوەی خۆی سەرقاڵی کۆکردنەوەی گەمی دیکە بکا، سواری گەمییەکە بوو و بەلای دەریای ڕەشدا هەلات. دواتر گیرا و زۆر عادلانە سزادرا. وەختێک سیڤتیس حاکمی وڵاتی تراکی بوو، دێکسیپۆ تووشی ڕکەبەرایەتی دژی ناوبراو هاتبوو و دواتر بەدەستی نیکاندرۆی لاکۆنی کوژرا.

یۆنانییەکان ئەوجار ناوگانێکی گەمی بچووک بە ژمارە کەمیان لە خەڵکی تراپێزۆندا بە قەرز وەرگرت. سەردەستە و فەرماندەری ئەو ناوگانەش پۆلیکراتی ئاتێنی بوو. ناوبراو هەرچەند گەمی دۆزییەوە، خێرا هێنایە ژێر دەسەلاتی ئۆردوگای یۆنانی. ئەو گەمییانەی باریان دەهێنا کاتیک دەگەیشتنە بەندەر، دەسبەجێ پاسەوانیان لەسەر دادەندرا و وەک ملکی خۆیان پارێزگاریان لێدەکرد. دیارە ئەوەش بگووترێ کە ئەو گەمییانە بۆ تالان و غەنیمەت کۆکردنەوەش کەڵکیان‌لێوەردەگیرا. پاش ئەو بارودۆخە، یۆنانییەکان هێندێکیان بۆ تالان و ڕاو و ڕووت دەچوون و بەشێکیشیان بۆ غەنیمەت کۆکردنەوە و جاروباریش بێ دەستکەوت دەگەڕانەوە.

کلێئێنێتۆس لەگەڵ دەستەیەکی ژێر حوکمی خۆی بە مەبەستی تالان کردن دەرکەوتبوو و لە شوێنێکی چڕ و قایم خۆی و پیاوەکانی کوژران.

# بەشی ٢

## شەڕ لەگەڵ دریلییەکان

لەبەر ئەوەی وەدەستهێنانی ئازووقە و گەڕانەوە لە هەمان ڕۆژدا گەلێک دژوار بوو، گزنفۆن نیوەی سەربازانی یۆنانی لەگەڵ چەند بەڵەدێکی تراپیزۆندی هەڵگرت و پەلاماری وڵاتی جیران واتە دریلییەکانیدا و نیوەیتری هێزە یۆنانییەکانیشی بۆ پاراستنی ئۆردوگا بەجێهێشت. ئەوەش بۆیە بوو کە کۆلخییەکان لەسەر ماڵ و موڵکی خۆیان دەرکرابوون و گشتیان کۆببوونەوە و ئەو بەرزاییانەیان گرتبوو کە دەیانڕوانییە سەر هێزە یۆنانییەکان.

تراپیزۆندییەکان لە کاتی تاڵانکردندا، یۆنانییەکانیان بە ڕێگایەکدا نەبرد کە بتوانن بە هاسانی دەستکەوتێکیان هەبێ، بەڵکوو بردبوویاننە سەر ئەو دریلییانە کە لە کۆنەوە کێشەیان لەگەڵیان بوو و شەڕکەرتر و بە غیرەتتر لە تەواوی گەلانی ڕۆخەکانی دەریای ڕەش بوون.

کاتێک یۆنانییەکان گەیشتنە بەرزترین شوێنەکانی ئەو وڵاتە، دریلییەکان تەواوی مڵک و ماڵ خۆیان ئاگر تێبەردا و ڕۆیشتن چونکە لەو باوەڕەدا بوون خێرا دەکەوێتە دەست دوژمن. لە ئاکامدا یۆنانییەکان جیا لە چەند سەر

ڕەشەوڵاغ و بەراز کە لەدەست ئاگرەکە ڕایانکردبوو، دەستکەوتێکیتریان نەبوو. یەکێک لەو گوندانەی ئاگریان تێبەردا، گەورەدێ و پێتەختی خەڵکی خۆیان بوو و تەواوی ئاوارەی دێهاتەکانیتر لەوێ کۆبببوونەوە. ئەو دێیە لە دۆڵێکی قووڵ هەڵکەوتبوو و تەنیا بە ڕێگای تەنگ و باریکدا دەکرا بۆی بچن.

سووکەچەکدارەکان بە مەودای پێنج شەش ستادیۆ پێشتر لە هێزەکانی چەکداری قورس دەڕۆیشتن. کاتێک بە دۆڵەکەدا دەرباز بوون چاویان بە مێگەلێکی مەڕ و مالات و کەلوپەلیتر کەوت دەسبەجێ پەلاماری گوندەکەیاندا. بەدوای ئەو هێزەدا جەماوەرێکی دیکە کە لە ئۆردوگاوە بۆ تالان هاتبوون، ئەسپابی چەشنی توڕ و توونگە و گۆزە و گلێنەیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو بۆوەی ئازووقە و خواردەمەنی پێڕاگوێزن. ژمارەی ئەوانەی بە دۆڵەکەدا دەرباز ببوون زیادتر لە دوو هەزار کەس دەبوون.

لەبەر ئەوەی ئەوانە نەیاندەتوانی بە شەڕ و پەلامار گوندەکە بگرن (چونکە لە دەوری دێ خەندەک هەڵکەندرابوو و گڵەکەشی کرابووە تەپۆڵکە و سەنگەر. بورجی پاسەوانی لەسەر ئەو تەپۆڵکانە دروستکراو لە دار دروست کرابوون) بۆیە یۆنانییەکان بەرەو دواوە پاشەکشەیان کرد. لەو کاتەدا دریلییەکان هێرشیان دەست پێکرد. یۆنانییەکان نەیانتوانی خێرا پاشەکشە بکەن (ڕێگا تەنگەبەرایی و سەرەولێژ بوو) و دەبوایە یەک یەک بگەڕێنەوە دواوە. لە ڕووی ناچاری ڕاسپاردەیان ناردە لای گزنفۆن کە لە دواوە لەگەڵ چەکدارەکان بەرەو ئەو شوێنە دەهات و ئاگاداریان کردەوە.

" گوندێک هەیە پڕ لە کەرستە و کەلوپەلی بە نرخە. ئێمە ناتوانین بیگرین چونکە خاوەن حەساری مەحکەمە. گەڕانەوەمان هاسان نییە. دوور بوونەوەمان گەلێک دژوارە، چونکە کاتی پاشەکشە ناچارین شەڕی دوژمن بکەین کە بە دوامانەوەیە".

گزنفۆن وەختێک گوێی لەو قسانە بوو لەگەڵ پاشماوەی چەکدارەکان نیزیک دۆڵەکە کەوتەوە و فەرمانی بە هێزەکانیدا خۆیان ڕێکخەن و ناوبراویش لەگەڵ لۆکاژەکان بە گەڵیدا داگەڕا خوارەوە بۆوەی چاوەدێری و هەڵسەنگاندنی بارودۆخەکە بکا و بە قەناعەتێک بگات کە کامیەک لەو دوو

ڕێگایانە بگرێتەبەر. ئایا فەرمان بە هێزەکانی پێشەوە بدا کە بگەڕێنەوە یا بە خۆی و شەڕکەرانی بەردەستی پەلاماری گوندەکە بدەن و بیگرن. شک لەوەدا نەبوو کە ئەگەر داوای پاشەکشەی لە هێزەکان بکردایە، کاتی گەڕانەوەیان بۆ دواوە تووشی خەسار دەهاتن و جەماوەرێکیان لێدەکوژرا. قەستی گرتنی گوندەکەی کرد و لۆکاژەکانیش زیادتر بەو خواستەوە گەشبین بوون. گزنفۆن خۆیشی لەگەڵیان هاودەنگ بوو و هێماکانی قوربانی بۆ خواکان لەمەڕ شەڕ و دەربازبوون نیشانەی سەرکەوتنیان پێوە دیاربوو.

گزنفۆن لۆکاژەکانی نارد تا هێزەکانی چەکدار بە شێوەیەکی بەربڵاو دامەزرێنن. خۆی لە دۆڵەکەدا مایەوە و تەواوی سووکە چەکدارەکانی کۆکردەوە و حوکمی دەسەر کردن خۆیان لە وردەشەڕان دوورخەنەوە.

کاتێک چەکدارە قورسەکان گەیشتنە جێ، گزنفۆن فەرمانی بە لۆکاژەکان‌دا چۆن بە مەسڵەحەتی دەزانن و باشتر دەتوانن شەڕبکەن، بەوجۆرە هێزەکانیان دامەزرێنن. لەبەر ئەوەی نیزیک بە تەواوی لۆکاژەکان گەیشتبوونە ئەو شوێنە و لە نیزیک یەکتر کۆببوونەوە و ڕێگای ژێرپێنانی دەستووراتیان نەبوو و دەبوایە وەک هەمیشە پەلاماری هاوبەش و جوامێرانە دەست پێبکەن. ئەو حوکمە لەلایەن لۆکاژەکانەوە بەڕێوەچوو. گزنفۆن ئەمری دەسەر سووکە چەکدارەکان کرد نێزە بەدەست بن و بە یەکەم دەنگی شەیپووڕ بیانوەشێنن و کەماندارەکانیش تیرەکانیان لەسەر کەوان و هەر بەو دەنگە بیانهاوێن. لە کاتی پێویستیش‌دا قۆچەقانی هاوێژەکان خورجینەکانیان پڕ لە بەرد بێ و ئەوانیش بە بیستنی دەنگی شەیپوور، دەست بە بەردهاوێژی بکەن. ناوبراو چەند کەسێک لە فەرماندەکانی بۆ چاوەدێری کردنی ڕەوتی پێشوەچوونی پلانەکە ناردە لای هێزەکان.

کاتێک گشت ئامادەکارییەک کرا، لۆکاژ و ژێردەستەکانیان و تەواوی ئەوانەی خاوەن بەرپرسیارەتییەک بوون بەبێ لەبەر چاو گرتنی پلە و پایە، ڕوویان لە هێڵی پێشەوە کرد و ئەوجار بۆ ماوەیەکی کورت بەرەوڕووی هەڤدوو هاتن (لەبەر ئەوەی شوێنی هەڵکەوتنی گوندەکە و دامەزرانی هێزەکان بە شێوەی نیوە بازنە بوو). وەختێک سرۆودی ئایینی بۆ خواوەند

ئاپۆلۆن خوێندرا، شەیپوور لێدرا و چەکدارەکان تێکڕا بە نەعرەتە و هاوار بۆ خواوەندی جەنگ "ئاری"، پەلاماریان دەست پێکرد. تیر و نێزە و بەرد، بەرێژنە بەسەر دوژمندا باری. لەگەڵ ڕێژنەی تیر و بەرد ئاگریش دەهاوێژرایە نێو ڕیزەکانی دوژمن. دوای ماوەیەکی کورت هەراوهوریا لە نێو دێدا دەستی پێکرد. هێندێک لە یۆنانییەکان چوونە نێو گوند و بە هێندێک تاڵانەوە شوێنەکەیان بەجێهێشت و نێوە نێوەش برینداریکیان لەگەڵ خۆیان دەهێنا دەرەوە. لەبەردەم دەروازەکانی دێدا قەرەباڵغییەکی گەورە سازبوو و خەڵک وەسەریەک دەپەڕی. کاتێک پرسیار لەو خەڵکە کرا کە تازە لە دەروازەکانەوە هاتبوونە دەرەوە، گوتیان کە قەڵایەک لە نێو دێدا هەیە و گیرانی گەلێک دژوارە و دوژمن لەوێرا پەلاماری ئەو یۆنانییانەی نێو گوندی داوە.

گزنفۆن دروست لەو کاتەدا فەرمانی بە تۆلمیدیسدا و گوتی: " هەرکەس گەرەکیەتی تاڵان بکا بۆی هەیە بە ئازادی بچێتە نێو دێ. حەشیمەتێکی فرە خێرا پەلاماری دێیاندا و بە یارمەتی یۆنانییەکانی نێوەوە چوون و هێزەکانی دوژمنیان لە قەڵای گوند ئاخنییەوە. هەرچی لە دەرەوەی قەڵا وەبەر دەست هات، ڕۆیبوونێ و بە تاڵان لەگەڵ خۆیان هێنایانە دەرەوەی حەساری ئەو گوندە. لەو نێوەدا، کۆمەڵێک لە هێزەکانی چەکداری یۆنانی لە دەوری خەندەک و ژمارەیەکیش لەسەر ڕێگای قەڵا دامەزران.

گزنفۆن و لۆکاژەکان باری جۆغرافی شوێنەکەیان بە وردی هەڵسەنگاند و لە ڕێگا چارەیەک بۆ داگیرکردنی قەڵا دەگەڕان. چونکە تەنیا ئەو کاتە لەشکرەکەیان دەیتوانی نەجاتی بێ. جیا لەوە پاشەکشەی هێزەکەیان گەلێک دژوار دەبوو. دوای لێکدانەوە و شوناسایی ورد، بەو قەناعەتە گەیشتن کە داگیرکردنی ئەو قەڵایە ئیمکانی بۆ نییە. ئەوسا کەوتنە بیری دۆزینەوەی ڕێگاچارەیەک بۆ پاشەکشەکردن. پیاوەکان خەریکی دەرهێنانی دارسینگەکان بوون و لۆکاژەکانیش، ئەوەی بێکار و بێ تاقەت بوو، لەگەڵ ئەو جەماوەرەی خەریکی گواستنەوەی غەنیمەت بوون گشتیان لەو شوێنە دەرکرد و

بەشێکیش لە چەکدارە قورسەکانیان ڕەگەڵ ئەواندا. تەنیا ئەو کەسانەیان هێشتنەوە کە جێگای متمانە بوون و شەڕیان بۆ دەکرا.

کاتێک پاشەکشە دەستی پێکرد، جەماوەرێک لە هێزەکانی دوژمن هاتنەدەر. ئەوان خاوەن قەڵگانی چندراو لە دار و نێزە و کڵاوی چەرمی (پاڤلاغۆنی) بوون. هێندێک لەو هێزە چووە سەربانی ئەو ماڵانەی لە دوو لای جادەی بەرەو قەڵا هەڵکەوتبوون. لەوەش ئەرغەیان بوون کە کەس لە پشتەوەڕا هەڕەشەیان لێناکا مەگەر لە لای درگای قەڵاڕا. یۆنانییەکان بەشێک لە هێزەکانی دوژمنیان بەرەو دەروازەی قەڵا ڕاونا. تووشی دژکردەوە هاتن و لە ماڵەکانڕا خۆڵ و بەردێکی زۆریان بەسەردا باری. لە ئاکامدا چ ئەوانەی مابوونەوە و چ ئەوانەش کە پاشەکشەیان دەکرد، تووشی مەترسی لەنێوچوون هاتبوون. هەوا بوومەلێڵ ببوو و بەرەو تاریکی شەو دەڕۆیی و بارودۆخەکە خەراپتر دەبوو. هێزە یۆنانییەکان تووشی سەرسوڕمان و پەرێشانی هاتبوون و بەردەوام شەڕیان دەکرد. ڕاست لەو وەختەدا کە بەدوای دەربازبووندا دەگەڕان، خواوەندی نەجات ڕێگای ڕزگاری پێ نیشاندان. لە ناکاو ماڵێک لە لای دەستی ڕاستی جادە ڕووی لە سووتان کرد. وێدەچوو ڕزگاریدەرێک ئاگری لەو ماڵە بەردابێ. کاتی ڕووخانی خانووەکە، هێزەکانی لای ڕاستی جادە گشتیان ڕایانکرد. گزنفۆن شانسی هێنا و خێرا ئاگاداری ئەو ڕووداوە بوو. ناوبراو فەرمانیدا ماڵەکانی دەستی چەپیش ئاگر تێبەردەن. ئەو خانووانە تەواویان لە دار دروستکرابوون و لەجێوە ئاوریان گرت. هێزەکانی جێگیر لە نێو ئەو بینایانەدا بەپانەوە هەڵاتن.

هێزەکانیتری دوژمن کە بە شێوەی جەبهەیی دامەزرابوون، وێدەچوو خۆیان ئامادەی پەلامارێکی قورس بۆ سەر لەشکری یۆنانی کردبێ. گزنفۆن دەستووریدا ئەو کەسانەی لە بەرپێکی دوژمندا نین بەپەلە دارودەوەن لە نێوان خۆیان و دوژمندا کۆکەنەوە. وەختێک چرپی و دەوەنێکی فرە کۆکرایەوە، لەگەڵ ماڵەکانی نیزیک خەندەک هەموویان ئاگریان تێبەردرا. بەو شێوەیە دوژمن لە چوار لاوەڕا کەوتبووە نێو گەمارۆی ئاگرەوە و دوژمن بە گرفتی سووتمانەوە سەرقاڵ کرا. لە نێوان هەردوو هێزدا بەربەستێک لە ئاگر

دروست کرابوو. یۆنانییەکان توانیان فرسەتەکە بقۆزنەوە و لەو گەمارۆیە ڕزگاریان بێ. مرۆڤ لە دوورەوە دەیدیت کە چۆن تەواوی بورج و خانووەکانی دێ لە ئاگردا دەسووتێن و تەنیا قەڵا لەو وێرانییە بەدوور بوو.

هێزە یۆنانییەکان ڕۆژی دوایی بە ئازووقە و دەستکەوتەکانیانەوە، لەبەر پاراستنی گیانی خۆیان ئەو شوێنەیان بەجێهێشت. لەبەر ئەوەی لە گەلی تەنگ و بەرتەسکی دەڤەری دریلییەکانی ترابزۆن دەترسان، بۆسەیەکی بە درۆیان دانایەوە. نیزامییەکی خەڵکی میسیا کە ناوی میسیۆس بوو لەگەڵ دە پیاوی کریتی بۆ نیزیکترین دارستانی سەر ڕێگا ناردران. مەتالی ئەوانە لە مس دروست کرابوون. جاروبار بریقەی ئەو مەتاڵانە لەبەر ڕۆشنایی تیشکی خۆر دەدیترا. خەڵکی گوند بە بینینی ئەو بریقانە ترسیان ڕێنیشتبوو و پێیانوابوو کە ئەوە بۆسەیەکی گەورەی هێزە یۆنانییەکانە. یۆنانییەکانیش وەختێک دڵنیا بوون کە هێزەکانیان بە تەواوی گەیشتوونەتە خوارەوەی گەلی، فەرمانیان بە میسۆس‌دا بۆسە کۆکاتەوە. ناوبراو خێرا ئەو دە کەسەی هەڵگرت و بەرەو خوارێ داگەڕا. پیاوانی کریتی لە ترسان بەنێو دارستاندا ڕایانکرد و لەوێشەوە بەنێو دۆڵێکی لێڕەواردا خۆیان قووتاردا. میسۆس خۆیشی بۆوەی بە ڕێگای ڕووتەندا نەڕوا، تووشی خەتەر هات و داوای یارمەتی کرد. خێرا چەند کەسێک بە هانایەوە چوون و بە برینداری نەجاتیان‌دا. ئەوانەش کە بۆ یارمەتی ناوبراو چوبوون کەوتبوونە بەر پەلاماری دوژمن. بە ناچار ڕوو لە دوژمن و پشتاوپشت گەڕانەوە دواوە. کاتی پاشەکشە، چەند کەس لە کەواندارەکانی کریتی بەردەوام خەریکی تیرهاوێژی بوون. لەکۆتاییدا هێزە یۆنانییەکان توانیان گشتیان بگەنەوە ئۆردوگاکەیان.

## بەشی ٣

**نەگەیشتنەوەی خیریسۆفۆس - بەشێک لە سواری گەمی بوو- وەڕێکەوتنی پاشماوەی لەشکر بە ڕێگای ویشکاییدا - گەیشتنە دەڤەری سرازۆنیت - ڕێژەی نیزامی و سەرژمێری - دابەشکردنی پارە - قوربانی بۆ خواوەند ئاپۆلۆن و دیا لەلایەن گزنفۆنەوە - باسکردنی چۆنییەتی گەڕانەوە لەلایەن سیلۆنێت و بەیانی شێوەی بەڕێوەچوونی قوربانییەکانی گزنفۆن**

لەبەر ئەوەی کە نە خیریسۆفۆس گەڕاوە و نە گەمی و بەلەمی پێویستیش دەست کەوت و نە ئازووقەش کیفایەتی دەکرد، ناچار بوون خێرا شوێنەکەیان بگۆڕن و بەرەوە تراپێزۆن وەڕێکەون. هەرچی ژن و مناڵ و کەسانی باڵای چل ساڵ و نەخۆش و بریندار بوون بەباروبنەوە لەو گەمییانەیان بارکردن کە تا ئەو کاتە دەگیریان خستبوون. ستراتێژەکانی بە تەمەنتر لە فیلیسیۆس و سۆفێنێتۆس، ئەوانیش سواری ئەو گەمییانە کران و دەستووریان پێدرا سەرپەرستی گشت لایەک بکەن. پاشماوەی هێزە یۆنانییەکان بە ڕێگای تازە دروستکراودا وەڕێکەوتن.

دوای سێ ڕۆژ گەیشتنە کێراسۆندا. شارێکی یۆنانی لە قەراخ بەحر و خاوەن دانیشتووانی سینۆپی بوو. ئەو دەڤەرە پێیدەگوترا کۆلخیدا. لە شاری کێراسۆندا دە ڕۆژ مانەوە. لەوماوەیدا بەسەرکردنەوە و سەرژمێرییەکی تەواوی لەشکر و چەک و سیلاح بەڕێوەچوو. ئەو لەشکرە سەرجەم هەشت هەزار و شەش سەد کەس بوو. ئەوانە ئەو کەسانە بوون کە ڕزگاریان هاتبوو. باقی ئەوەیتر تێداچووبوون. هێندێک بەدەست دوژمن و بەشێکیش لەبەر بەفر و سەرما و چەند کەسێکیش بەهۆی نەخۆشی گیانیان لەدەستدابوو.

لەو شوێنە پارەی فرۆشتنی دیلەکان بەسەر گشت لایەکدا دابەشکرا. یەک لە دەی ئەو داهاتە بۆ خواکان ئاپۆلۆن و ئێفیسیائارتێمی تەرخان کرا. ستراتێژەکان ئەو برە پارەیەشیان لەنێو خۆیاندا دابەشکرد تا لە کاتی خۆیدا هەرکەسە پێشکەشی خواکانی بکا. بەشێ خیریسۆفۆس ڕادەستی نێئۆن، خەڵکی ئاتین، سەر بە دەڤەری لاکێدێمۆنی درا. ئەو پارەیەی بۆ خواوەند ئاپۆلۆن لەلای گزنفۆن داندرابوو، ناوبراو بە خەزێنەی مەعبەدی خواکانی ئاتێنی لە دەڤەری دێلفوسیدا. ئیمزا و ناوی خۆی و پرۆکسێنۆسی لەسەر نووسی. پرۆکسێنۆس لەگەڵ کلێئارخۆس پێکەوە کوژرابوون. ئەو دوانە دۆستی یەکتر و خەڵکی فیلۆکسێنیا بوون. گزنفۆن کاتێک لەگەڵ ئاییسیلائۆ پێکەوە لە ئاسیارا بەرەو ڤێۆتێۆ دەگەڕانەوە، لەبەر ئەوەی ڕێگایەکی پڕ لە مەترسی بوو بەشە خەڵاتی دیاریکراو بۆ خواوەند ئارتێمیسیشی لە مەعبەدی ئێفێسیۆس ڕادەستی مێغافێزۆس، خەزێنەداری دێرەکە کرد. گزنفۆن بەڵێنیدا کاتێک بە سلامەتی گەڕانەوە، ئەو دیاریە بگەڕێنێتەوە بۆ شوێنی خۆی، ئەگەریش مردن ئەوە دوای گۆڕینەوەی بە خەڵاتێکی شایانی خواوەند ئارتێمیس، پێشکەش بە مەعبەدەکەی بکرێت.

لە دەورانێکدا کە گزنفۆن لە ئاتێن دوورخرابۆوە، لە سکیلووندا دەژیا[114].
ئەو ئاوایيە شارێکی نیزیک ئۆلیمپیا بوو و لەلایەن لاکێدێمۆنییەکانەوە دروست کرابوو. وەختێک مێغافیزۆس بۆ سەیرکردنی کێبەرکێیەکانی ئۆلیمپیک هات ئەو برە پارە ئەمانەتییەی لای بوو، ڕادەستی گزنفۆنی کردەوە. گزنفۆن بەو پارەیە مڵکێکی لەسەر ناوی خواوەند ئارتێمیس لەو شوێنەی خواوەند ئاپۆلۆن بە مەسڵەحەتی زانیبوو، کڕی. ڕووبارێک بە نێوەڕاستی ئەو مڵکەدا دەرباز دەبوو و پێیدەگوترا سێلینۆس. هەڵبەت لە دەڤەری ئێفێسیۆس لە نیزیک مەعبەدی ئارتێمیس ڕووبارێکیتر هەر بەو ناوە واتە سێلینۆس هەبوو. لەنێو هەردوو چۆمدا ماسی و سەدەف بە فراوانی بەرچاودەکەتن. دیارە لە مڵکی دەڤەری سکیلووندا موچە ومەزرا بۆ ڕاو و شکاریش هەبوو. گزنفۆن لەوێ قوربانگە و مەعبەدێکیتریشی بینا کرد. پارەکەشی لە داهاتی یەک لە دەی حاسلاتی ئەو مڵکە و هەروەها نەزر و دیاری خەڵک وەدەست هێنا. لەو کاتەوە بەردەوام قوربانی پێشکەشی بارەگای خواوەند ئارتێمیس دەکرد. دانیشتووانی سکیلووندا و خەڵکی دەوروبەر بە ژن و پیاوەوە بەشداری جێژن و مەراسیمەکان دەبوون. خواوەندی بژیو، ئارد و جۆ و نان و شەڕاب و خواردەمەنی لە گۆشتی قوربانی ئەو ئاژەڵانەی لەو لەوەڕگە پیرۆزە لەوڕابوون و خاوەن گۆشتی چەور بوون، بۆ بەشدارانی ڕێوڕەسم و جێژنەکان دەنارد. ڕۆژی جەژن جیا لە منالانی گزنفۆن، زارۆکیتریش بۆ ڕاو وەدەر دەکەوتن و گەورە پیاوانیش بۆیان هەبوو وێڕای منالانیتر بچنە شکار. لەو مووچە و مەزرایەدا ڕاوی بەراز و ئاسکەکێوی و غەزاڵ دەکرا. ئەو شوێنە لەسەر ڕێگای هەرێمی لاکێدێمۆنی بەرەو ئۆلیمپیا هەڵکەوتبوو. لە مەعبەدی ئۆلیمپوس مەودای بیست ستادیۆ دوور بوو. ئەو جێگە موقەدەسە خاوەن چیا و دارستانێکی فرە بوو و گەلێک بەرازی خۆماڵی و بزن و گا و ئەسپ بە لەوەڕگەکانی دەژیان. خواردەمەنی و ئازووقە ئەوەندە زۆر بوو کە

---

١١٣- گزنفۆن ئەو کاتەی ئاوارە ببوو لە ئاتێن دوور خرابۆوە و لە سکیلووندا دامەزرابوو. سپارتییەکان خانوویەکیان پێدابوو. ناوبراو لە ساڵی ٣٩٣ تا ٣٧٥ی پێشزایینیدا واتە تا ئەو کاتەی تێبییەکان شاری سکیلووندایان دووبارە گرتەوە لەو شوێنە ژیا.

بەشی تەواوی خەڵکی بەشدار لە مەراسیمەکانی دەکرد. لە دەوروبەری مەعبەد بە فراوانی داری میوە هەبوو. میوەی جۆراوجۆر بە درێژایی فەسڵەکان لەو باغاتە دەستدەکەوت. ئەو پەرستگەیە وەک مەعبەدی گەورەی ئێفێسیۆس دەچوو. جیاوازیان لەوەدا بوو کە لە مەعبەدی ئێفێسیۆس پەیکەرەی خواوەند لە زێڕ دروست کرابوو بەڵام لێرە لە داری سەرو داتاشرابوو. لە نیزیک ئەو مەعبەدە ستوونێکی لێبوو کە لەسەری بەو چەشنە نووسرابوو:

" ***ئەو شوێنە پیرۆزە پێشکەش بە خواوەند ئارتێمیس کراوە. هەرکەس خاکی ئێرە داچێنێ یا باغاتی میوەی بەساحێب بکا، دەبێ یەک لە دەی داهاتی ساڵانەی ئێرە بەمەبەستی قوربانی بۆ خوا خەرج بکا و پاشماوەکەشی بۆ مەرەمەتی مەعبەد بەکار بێنێ. هەرکەس ئەو دەستوورە بەڕێوە نەبا، لە لایەن خواوە سزا دەدرێت*** ".

# بەشی ٤

## گەیشتنە سەر سنوورەکانی وڵاتی مووسینی خولقاندنی گرفت بۆ لەشکر لەلایەن مووسینیەکان شکستی مووسینیەکان – ڕەوشت و هەڵسوکەوتی مووسینیەکان

ژن و منداڵ و ئەوانەی تەمەنیان بالآی چل ساڵ بوو سواری گەمی و بەلەمەکان کران و لە شاری کێراسونداوە وەڕێکەوتن. پاشماوەی هێزەکانیش ڕێگای ویشکاییان گرتەبەر. کاتێک گەیشتنە سنوورەکانی وڵاتی مووسینیک[115]، تیمیستیئۆسی دانیشتووی تراپێزونیان لەگەڵ ڕاسپاردەی مووسینییەکان ناردە لای خەڵکی ئەو ناوچەیە بۆوەی پرسیار بکەن کە ئایا لەشکری یۆنانی وەک دۆست یا دوژمن بۆی هەیە بە وڵاتەکەیاندا دەرباز بێ! پاش فەترەیەک تیمیستیئۆس گەڕاوە و گوتی کە خەڵکی ئەو دەڤەرە لەگەڵ وڵاتی دراوسێیان لەشەڕدان[116]. ئەوان گەرەکیانە لەگەڵ ئێمە ببنە هاوپەیمان.

---

١١٤- مووسینیەکان بۆیە خاوەن ئەو ناوەن، چونکە لەنێو (مووسینووس)دا واتە لە قەڵا و بورجی دار و چێودا ژیاون. یەکەمجار هێرۆدۆت وەک گەلێکی ئاسیایی دانیشتووی قەراخ ئاوەکانی دەریای ڕەش ناویان دێنێ. وڵاتەکەیان خاوەن کانزای سرووشتی ئاسنی برۆنز بووە.

١١٥- مووسینیەکانی ڕۆژئاوایی دوژمنایەتی مووسینیەکانی ڕۆژهەڵاتییان کردوە.

تیمیستۆئۆس دوباره گەڕاوه لایان و ئەوجار سەرۆک عەشیرەتەکانی مووسینی لەگەڵ خۆی هێنا.

کاتێک ئەو سەرۆک عەشیرەتانه گەیشتنەجێ خێرا کۆبوونەوەیەک لەنێوان هەردولایەندا سازبوو. گزنفۆن به یارمەتی دیلمانجییەتی تیمیستۆئۆس به سەرۆک عەشیرەتەکانی مووسینی گوت: "ئەی خەڵکی مووسینی، ئێمه دەخوازین به سڵامەتی بگەڕێینەوه خاکی یۆنان، لەبەر ئەوەی ژمارەی پێویستی گەمی و بەلەممان لەبەر دەستدا نییه ناچارین به ڕێگای ویشکاییدا دەرباز بین. پێمانوایه خەڵکی ئەو هەرێمەی لەگەڵ ئێوه له شەڕدان، ڕێگه له ئێمەش دەگرن. دەزانین ئەوانه دوژمنی ئێوەن. هەرکات ئەوان ئێوه ئەزییەت بکەن، ئەگەر ئێوه هاوپەیمانی ئێمه بن، به یارمەتی ئێمه دەتوانن بیانهێننه ژێر حوکمی خۆتان. بەڵام ئەگەر ئێستا لەگەڵ ئێمه دۆستایەتی و هاوپەیمانییەتی دانەمەزرێنن، لەبیرتان نەچێ جارێکیتر فرسەتی ئەوتۆتان دەست ناکەوێ تا لەگەڵ هێزێکی مەزنی وەک ئێمه ببنه هاوپەیمان ".

سەرۆکی مووسینییەکان تەواوی پێشنیارەکانی پەسند کرد و هاوپەیمانییەکەی قبوڵ کرد. گزنفۆن له وڵامدا گوتی زۆر باشه و درێژەی به قسەکانیدا: " ئەگەر ببینه هاوپەیمانی ئێوه له کوێ کەڵکمان لێوەردەگرن، چۆن یارمەتی دەربازبوونمان دەدەن؟ ". ناوبراو له وڵامدا گوتی: " ئێمه له تواناماندا هەیه له جەبهەی ڕوبەڕووماندا پێکەوه پەلاماری دوژمنی هاوبەش بدەین و لەو نێوەشدا گەمی و پیاوەکانمان بنێرینه ئێره بۆوەی به ڕێگایەکی لەباردا دەربازتان بکەن ". دوای ئەو گفتوگۆیانه بەڵێنی تەواویان به یەکتردا.

ڕۆژی دوایی سێسەد بەلەمی ڕەختەی وەک داری یەکپارچەی هەڵۆڵکراو گەیشتنەجێ. لەنێو هەر یەک لەو بەلەمانەدا سێ کەس دانیشتبوون. دوو کەس لەوانه دابەزین و له ستوونی عەسکەریدا جێیان گرت و نەفەری سێهەمیش مایەوه. گشت ئەو کەسانەی له نێو بەلەمەکاندا مابوونەوه دەبوایه ئاژۆتنی گەمییەکانیان وەستۆبگرن. ئەو جەماوەرەش که دابەزیبوون ژمارەیان دەگەیشته سەد کەسێک و به شێوەی ستوونی، بەڕیز ڕاوەستان و مەیدانێکی بازنەیی چۆلیان چەشنی گۆڕەپانی سەما به چۆڵی جێهێشت. ئەو لەشکره

نوێیه گشتیان خاوەن مەتاڵی داری داپۆشراو بە پێستی گای سپی پڕ موو بوون و وەک گەڵای دەچوون. بە دەستی ڕاستیان نێزەیان ڕاگرتبوو. نێزەکان درێژاییان نیزیکەی شەش زەرع بوو. سەرنێزەکان ئاسنی تیژکراو و بنی نیزەش وەک گۆی خڕ و داتاشراو لە هەمان دار دروست کرابوو. ئەو چەکدارانە داوێنی کورتیان لەبەر خۆیان کردبوو و تا سەر ئەژنۆیان دەهات و لە پەشمی ئەستوور چندرابوو. ئەوانە هەروەها کڵاوی چەرمی چەشنی پاڤلاغۆنییەکانیان لەسەرنابوو و کلکێکی دروست کراو لە مووی ئەسپی سپی لە نێوەڕاستەکەی قایم کرابوو. لە ڕاستیدا وەک کڵاوی فارسەکان دەچوو. ئەو جەنگاوەرانە تەوری دوو سەریشیان بەدەستەوە گرتبوو. دوای ئەو ڕووداوانە یەکەم پیاویان سروودی نەتەوایەتی چڕی، ئەوانیتریش لەگەڵیان گوتەوە.

ئەوانە پاش دەربازبوون بەنێو ڕیزی یۆنانییەکاندا، خێرا پەلاماریان بەرەو پۆستەکانی پاسەوانی دوژمن دەست پێکرد. مەبەست لەو هێرشە گرتنی قەڵایەکی سەخت و نیزیک لەخۆیان بوو. ئەو قەڵایە لە شوێنێک پێش ئەوەی بگاتە دەروازەی شار واتە پێتەختی ئەو وڵاتە هەڵکەوتبوو. لە بەرزترین جێگای وڵاتی مووسینییەکان دروست کرابوو و بۆ گرتنی بەردەوام شەڕ دەکرا. خاوەن دەسەڵاتی ئەو قەڵایە، مانای حوکمڕانی تەواوی وڵاتی مووسینییەکانی دەدا. ئەو مووسینییانەی لەگەڵ یۆنانییەکان بوون، دەیانگوت کە دوژمنەکانیان بەناهەق ئەو شوێنەیان گرتووە و ئەوە موڵکی گشت مووسینییەکانە. ئێستا ئەوانەی داگیریان کردوە، یەک لایەنە بوونەتە خاوەنی گشت مافێک.

بەدوای ئەو دەستەیە لە مووسینییەکاندا، هێندێک یۆنانیش وەڕێکەوتن. هەڵبەت بەبێ ئاگاداری و داوای ستراتێژەکان و تەنیا بە خواستی خۆیان، بۆوەی تاڵانێک بکەن. هێزەکانی دژبەر تەواوی ئەو ماوەیەی ئەوانە بەرەوڕوویان دەهاتن بێدەنگیان پاراستبوو. کاتێک گەیشتنە بەردەمیان ئەوجار لێیان وەخۆکەوتن و پەلاماریاندان. دەستەی هێرشکەریان ڕاونا و گەلێکیان لەو بەربەرانە کوشت و ژمارەیەکیش یۆنانی وەبەرهاتن.

ڕاودوونانی پەلاماردەران تا ئەو کاتەی کە چاویان بە هێزی یارمەتیدەری یۆنانی کەوت بەردەوام درێژەی هەبوو. بەدیتنی یۆنانییەکان گەڕانەوە دواوە و لەو نێوەدا سەری بڕاوی ژمارەیەک مووسینی و یۆنانییان بەدەستەوە گرتبوو و گۆرانییان دەچڕی و بە موسیقاوە هەڵدەپەڕین و سەرە بڕاوەکانیان بە دژبەرەکانیان پیشان دەدا.

یۆنانییەکان زۆر ناڕاحەت بوون چونکە پەلامارەکەیان سەرنەکەوتبوو و هێزەکانی دوژمنیش زیادتر لە پێشوو غیرەتیان وەبەر هاتبوو. لەشکری یۆنانیش بە نۆرەی خۆی زیادتر لەوە ناڕاحەت بوو چونکە بەدوای هێزەکانی هاوپەیمان واتە بەربەرەکاندا ڕایانکردبوو و ژمارەشیان کەم نەبوو. هەروەها ڕووداوی ئەوتۆ هیچکات بەدرێژایی لەشکرکێشیەکەیان ڕووی نەدابوو.

گزنفۆن لەوکاتەدا یۆنانییەکانی بانگ کرد و پێی‌گوتن: " سەربازان! داواکارم بۆخاتری ئەو ڕووداوە ورەتان بەر مەدەن. دەبێ ئەوە بزانن کە شتێکی گرینگمان بۆ ڕوون بۆوە. ئەو ڕوونبوونەوەیە نرخی لە شکستەکە کەمتر نییە. سەرەتا دەبێ ئەوە بزانن کە ئەوانەی قەرارە ببنە چاوساغی ڕێگامان دوژمنی کەسانێکن کە ئێمەش لە ڕووی ناچاری بووینەتە دوژمنیان. لەلایەکی‌ترەوە ئەو کۆمەڵە یۆنانییانە بێ حورمەتیان بە نەزم و تەرتیباتی نیزامی ئێمە کرد. ئەوان سەرەڕۆیانە جوڵانەوە و چاوەڕوانی ئەوەیان نەکرد کە شەڕکە پێکەوە بکەین. ئەوان پێیانوابوو کە بەتوانان و هاوکاری بەربەرەکانیان وەک هی ئێمە لێکدابۆوە. دیتتان چۆن تووشی سزا هاتن. بۆیە لە داهاتوودا ناچار دەبن حورمەت بۆ لەشکر و دەستوورات و نەزم و نیزامەکەی ئێمە دابنێن. ئێستا دەبێ خۆتان ئامادە بکەن و بە هاوپەیمانە بەربەرەکانمان نیشان بدەین کە ئێمە لەوان بەتواناترین. ئێستا دەبێ بە هێزەکانی دوژمنیش بسەلمێنین کە ئێمە وەکو ئەو جەماوەرە بێنەزم نین کە ئێوە ماوەیەک بەر لە ئێستا شکستتان پێدان".

ئەو ڕۆژە هیچ کارێکیان نەکرد. ڕۆژی دوایی بەڵام، پاش ئەوەی قوربانییان پێشکەشی خواکان کرد و نیشانەی خێریان بەدیکرد، ئەوسا نانیان خوارد و لە درێژەدا فەرمانیان بە ستوونەکانی نیزامی‌دا و هێزەکانی

بەربەریشیان هەر بەو چەشنە ئامادە کرد و لە قۆڵی چەپ دایانمەزراندن. پاش خۆ ڕێکخستن وەڕێکەوتن. تیرهاوێژەکانیش لە نێوەڕاستی ستوونەکانی‌تردا جێیان‌گرت. ڕیزی چەکدارەکان لە پشتەوە بوو. تاقمێک لە پیاوانی دوژمن سووکەچەکدار بوون و بە ئەسپایی هەڵدەهاتن و بەردیان دەهاویشت. ئەوانە کەوتنەبەر تیری کەوانداران و پەلاماری سووکە چەکداری لەشکری یۆنانی کە لە ڕیزەکانی پێشەوە دەڕۆیشتن. باقی هێزە یۆنانییەکان سەرەتا پەلاماری قەڵایان‌دا. ئەو قەڵایەی ڕۆژێک پێشتر بەربەر و یۆنانییەکانی سەربەخۆی تووشی شکست کردبوو و بۆیان نەگیرابوو و هەڵاتبوون. هێزەکانی دوژمن چەشنی ڕۆژی بەریَ لەو شوێنە دامەزرابوون.

لە شەڕی ئەمجارەدا هێزە یۆنانییەکان جوامێرانە شەڕیان‌کرد. کاتێک چەکدارە قورسەکانی یۆنانی گەیشتنەجیَ، شەڕکەرەکانی دژبەر ڕایانکرد و سووکە چەکدارەکانی یۆنانی سەریان لەدوونان. ڕاکردووان بەرەو شار واتە پێتەختەکەیان غاریان‌دا و چەکدارە قورسەکانی یۆنانیش بە هێمنی و نەزمەوە وەدوایان کەوتن. هێزەکانی دوژمن کاتێک گەیشتنە بیناکانی سەر تەپۆڵکەی شار، دوبارە خۆیان ڕێکخستەوە و شەڕێکی ئازایانەیان دەست‌پێکردەوە. ئەوان خاوەن تەوری دووسەر واتە زووبین بوون کە دەسکێکی درێژ و ئەستووری هەبوو و پیاو بە زەحمەت بۆی هەڵدەسوڕا. بەهەرحاڵ حەولێکی زۆریان بۆ پاراستنی خۆیان‌دا.

یۆنانییەکان بە هیچ شێوەیەک پاشەکشەیان نەکرد و بەردەوام بەرەو پێشەوە ڕۆیشتن. پەلامار و گەمارۆیان دژی هێزەکانی دوژمن خێراتر کرد. شەڕکەرەکانی دژبەر ناچاربوون شوێنەکەیان جێهێڵن و ڕاکەن. پاش فەترەیەک گشتیان پێتەختیان چۆلکرد. سەرۆکەکەیان بەدائیم لەنێو قەڵایەکی چووکی چێویدا جێی‌گرتبوو کە لە بەرزترین شوێنی شارەکە هەڵکەوتبوو. ئەو لە گشت لایەکەوە بەخێودەکرا و پاسەوانی لێدەدرا. ناوبراو لە هاتنەدەر لەو قەڵا چێویە خۆی پاراست. یەکی‌تر لە سەرۆکەکانی دژبەر کە لە قەڵایەکی دیکەدا دەژیا و پێشتر داگیری کردبوو، ئەویش خۆی بەدەستەوە نەدا. لە ئاکامدا هەردوکیان لەنێو قەڵاکانیاندا سووتێندران.

کاتێک یۆنانییەکان دەستیان بەسەر ئەو شوێنەدا گرت، لەنێو ماڵەکاندا حەمباری نانیان دۆزیەوە کە بە قسەی مووسینییەکان هی ساڵانێک لەوە پێش بوو. قەیاسێکی زۆریش گەنمی تازەی ساڵ دەست یۆنانییەکان کەوت کە بە باقەوە پاشەکەوت کرابوو. لەو نێوەدا حەمباری گەنمی سپی تایبەت بۆ ئەسپەکانیان دۆزرایەوە. یۆنانییەکان هەروەها بەسەر گۆشتی قاورمە و لەخوێگیراوی دێلفین لەنێو کووپاندا کەوتن. مووسینییەکان قەڵەوایی و پیوی ئەو دێلفینانەیان چەشنی خەڵکی یۆنان لەجیاتی ڕۆنی زەیتوون بەکاردەهێنا. لە سەربانی ماڵەکان ڕادەیەکی زۆر بەڕووی نەقەڵشیوی تازە هەڵخسترابوو. ئەو بەڕووانە لەگەڵ هێندێک گەنم پاش برژاندن و کوڵاندنیان، ئەوسا وەک شەوچەلە و دانولە بۆ خواردن دادەندران. شەڕابێکی کە لە ماڵەکاندا دۆزرایەوە، ئەگەر بە خەستی خورابایەوە زۆر توند بوو بەڵام پاش تێکەڵکردنی ئاو بەتام و شیرین دەبوو.

یۆنانییەکان نانخواردن و ڕادەست کردنی قەڵای گیراو بە مووسینییەکانی هاوپەیمانیان وەرێکەوتن. وەختیک بە دێهاتەکانی ژێر دەسەڵاتی دوژمندا تێپەڕین، دانیشتووانی ئاواییەکان پێشتر ڕایانکردبوو و گوندەکانیان چۆلکردبوو. بەشێکیش لەو دێیانە بە خواستی خەڵکەکەیان ڕادەستی هێزە یۆنانییەکان کران. بەشی هەرە زۆریان هەر بەو چەشنە لەگەڵ یۆنانییەکان جوڵانەوە. شارەکان بەگشتی لێکدوور نەبوون و نیزیک بە هەشتا ستادیو (نیزیک بە سێ فەرسەخ) مەودا نێوانیان بوو. کاتیک خەڵکی دانیشتووی ئەو شارانە هەرایان لە یەکتر دەکرد، گوێیان لەیەکتر دەبوو. چیاکانی ئەو ناوچەیە گەلێک بەرز و دۆڵەکانیشیان قەیاسێک قووڵبوون.

یۆنانییەکان دوای دەرباز بوون لەو هەرێمە گەیشتنە وڵاتی دۆست. لەو جێگایە منالانی دەوڵەمەند و قەڵەو و سپیلکە هاتنە پێشوازیان. خواردنی ئەو منالانە تەنیا گوێزی کوڵاو بوو و پێستی لەشیان نەرم و سپی بوو[117]. سەرتاسەری قەلافەتیان وەک یەک قەڵەو بوو. پشت و سەر سینگیان بە هێمای گوڵ خاڵکووت کرابوون. ژن و پیاوی ئەو دەڤەرە گشتیان سپی پێست

---

١١٦- بە ڕەچەڵەک قەفقازی بوونە.

بوون. ئەوانەی لەو شەڕانەدا بەشدار ببوون، دەیانگێڕاوە کە ئەو خەڵکە تایبەتە لەباری ڕەوشت و ئەخلاقەوە گەلێک کێوی و وەحشی دەجوڵانەوە. کاری ئەوەندە قەباعەتیان دەکرد کە لە دابونەریتی یۆنانی گەلێک دوور بوو. ئەوەی خەڵک دەبێ بە شاراوەیی بیکەن، ئەوانە بە ئاشکرا دەیانکرد. بەپێچەوانەشەوە کاتێک خۆیان تەنیا دەبوون بە چەشنێک دەجوڵانەوە وەک ئەوەی لەنێو جەماوەرن. بەواتایەک بەتەنیا قسەیان دەکرد و پێدەکەنین یا هەر جێگایەکیان دەست کەوتایە ڕادەوەستان و هەڵدەپەڕین. هەمیشە وایاندەنواند کە بە تەنیا نین و لەنێو خەڵکدان.

# بەشی ٥

## تێپەڕین بە وڵاتی کالیپسی و تیڤارینیی‌یەکاندا – چوونە نێو وڵاتی کووتی‌ئۆر – چاوپێکەوتن لەگەڵ ڕاسپاردەکانی سینۆپی

یۆنانییەکان بە وڵاتی مووسینیی‌یەکاندا کە هەم دۆست و هەمیش دوژمن بوون، تێپەڕین و بە هەشت مەنزڵ گەیشتنە هەرێمی خالیڤی‌یەکان. خەڵکی ئەو دەڤەرە وەک کەمایەتییەکی ژێر دەسەڵاتی مووسینییەکان، بەواتایەک کۆلۆنی و بەشێک لەوان بوون. زۆربەیان کاری بەرهەم هێنان و بازرگانی ئاسن‌یان دەکرد.[117]

یۆنانییەکان لەو وڵاتەڕا چوونە ناوچەکانی مڵکی تیڤارینییەکان[118]. شوێنێکی زیادتر دەشتایی و قەراخ بەحر و سەرەولێژ بوو. ستراتێژەکان لەو باوەڕدا بوون کە لەشکری یۆنانی پێویستە بەرەو ئەو هەرێمە بڕوا، چونکە دەڤەرێکی بەحاسڵات بوو. تیڤارینیی‌یەکان هەرچەند دیاری و خەڵاتیان نارد بۆوەی دۆستایەتی خۆیان نیشان بدەن، بەڵام یۆنانییەکان وەریان نەگرت. بە پێچەوانەوە وڵامیان ناردەوە کە دەست ڕاگرن تاکوو خۆیان لەسەر بڕیارێک ساغ دەبنەوە. لە کاتی قوربانی بۆ خواکان، چاوەڕوانی پێشهاتی بەپێز بوون.

---

١١٧- گەلێکی ئاشتیخوازی کەنارەکانی دەریای ڕەش کە دراوسێی خالیڤی‌یەکان بوونە.

پاش چەند جار قوربانی ، تاڵەبینەکان بەو ئاکامە گەیشتن کە خواکان شەڕیان پەسند نەکردوە. لە کۆتاییدا دیاری تیڤارینییەکانیان قبوڵ کرد و بڕیاری چوونە نێوەوەی وڵاتی دۆستیان پەسند کرد.

دوای دوو ڕۆژ ڕێگاپێوان گەیشتنە شارێکی یۆنانی بەناوی کووتیئۆر، کە جێگای نیشتەجێیی دانیشتووانی سینۆپی و لە وڵاتی تیڤارینییەکان هەڵکەوتبوو. لەشکری یۆنانی تا ئەو شوێنە بە ویشکاییدا ڕێگا ڕۆیشتبوو بۆوەی بگاتەوە وڵاتی خۆی. مەودای ڕێگاکە لە پاش شەڕی بابێل تا گەیشتنە کووتیئۆر، سەد و بیست و دوو قۆناخ، شەش سەد و بیست فەرسەخ، هەژدە هەزار و شەش سەد ستادیۆ بوو. ماوەی زەمەنی ئەو گەشتە هەشت مانگی ڕێکی خایاندبوو.

قۆشەنی یۆنانی چل و پێنج ڕۆژ لەو شوێنە مایەوە. لەو ماوەیەدا گەلێک قوربانییان پێشکەشی خواکان کرد و هەریەک لە هۆزەکانی یۆنانی بە جیاواز ڕێوڕەسمی ئایینی خۆیان بەڕێوە برد. هەروەها چەندین کێبەرکێی وەرزیشییش بەئەنجام گەیشتن. ئازووقەی پێویستیان بە زەبری تاڵان وەدەست هێنا. بەشێک لەو ئازووقەیەیان لە خەڵکی پاڤلاغۆنی ئەستاند و باقیتریش لە دانیشتووانی کووتیئۆر ئەستێندرا. ئەو دوو کۆمەڵگایە نە بە خواستی خۆیان خواردەمەنیان دەفرۆشت و نە ڕێگای چوونە نێو شارەکانیشیان بە نەخۆش و بریندارەکانی یۆنانی دەدا.

لەو نێوەدا ڕاسپاردەکانی سینۆپی هاتنە لای سپای یۆنانی، چونکە لە تاڵانی شارەکانی خاوەن دانیشتووانی کووتیئۆری سەر بە دەسەڵاتی سینۆپییەکان دەترسان. ئەوان نیگەرانی شارەکانی خۆشیان بوون. هەڵبەت خەبەری تاڵانی ناوچەکەیان لەلایەن سپای یۆنانییەوە پێگەیشتبوو. کاتێک ڕاسپاردەکانی سینۆپی گەیشتنە ئۆردوگای یۆنانی، نارەزایەتی خۆیان لە هەمبەر کردەوەی یۆنانییەکان دەربڕی. لەلایەن کۆڕی ڕاسپاردە، ئێکاتۆنیمۆس قسەی کرد. ناوبراو ڕاوێژکارێکی کارامە و ناسراو بوو.

" پیاوانی لەشکر! خەڵکی سینۆپی ئێمەیان ناردوە کە بەبۆنەی سەرکەوتنی ئێوەی یۆنانی بەسەر بەربەرەکاندا، پیرۆزباییتان لێبکەین. شادی و خۆشحاڵی

خۆمان لەمەر ڕزگاریتان و گەڕانەوەتان بۆ ئێرە دەربڕین. وەک بیستوومانە ئێوە تووشی گەلێک بەسەرهات و کوێرەوەری هاتوون. ئێمە بەو بۆنەوە شانازی بە خۆمان و ئێوە دەکەین چونکە گشتمان یۆنانین. هەڵبەت لێرەدا بە پێویستیشی دەزانین کە ڕاشکاوانە بڵێین، ناخوازین لەلایەن لەشکری ئێوەوە تووشی زەرەد و زیان بێین. چونکە ئێمە ئەوەندەی ژیاوین و هەینە بچووکترین ئازارمان بۆ ئێوە نەبووە. ئەو کووتیئۆرییانەی ئێرە خەڵکی خۆمانن و ئەو ناوچەیەش کە لێی دەژین پاش ئەوەی لەدەست بەربەرەکان ڕزگارمان کرد، بە خودی ئەو خەڵکەمان بەخشییەوە. ئێستا چوون ئەوانە ژێردەستەی ئێمەن و وەک کێراسۆندییەکانی دەڤەری تراپێزۆنماڵیات بە ئێمە دەدەن. ئەگەر ئێوە بە خەراپی لەگەڵیان بجوڵێنەوە، زەرەدەکەی ڕاستەوخۆ بۆ شاری سینۆپی دەگەڕێتەوە. سەرەڕای ئەوانە زانیاریمان هەیە کە کەسانێکی نێو لەشکری ئێوە بە زەبری چەک هاتووچۆی نێو شار دەکەن و دەچنە ماڵەکان و بەزەخت و زۆری پێداویستییەکانیان بە خەڵکی شار و دەوروبەر دابیندەکەن. ئێمە ئەو چەشنە کردارانە قبوڵ ناکەین و ئەگەر درێژەیان پێبدرێ ناچار دەبین لەگەڵ کوریلا و پافلاغۆنییەکان و هەر لایەنێکی بۆ پێشگیری لە ڕەفتاری ئێوە یارمەتیمان بدا، ببینە هاوپەیمان".

پاش قسەکانی وەفدی راسپاردە ئەوسا گزنفۆن لەسەر ناوی لەشکری یۆنانییەوە هەستا سەرپێ و دەستی بە ئاخاوتن کرد. " ئەی سینۆپییەکان! ئێمە گەلێک ڕازین بەوەی کە بە سلامەتی گەیشتینە ئێرە. توانیمان گیانی خۆمان و حورمەتی چەکەکانمان بپارێزین، هەروەک دەزانن گەلێک دژوارە هەم ئەو گشت چەکوچۆڵە هەڵگری و هەمیش شەڕ بکەی. ئێستا گەیشتووینە شارەکانی یۆنانی. لە شاری تراپێزۆن تەواوی پێداویستییەکانمان دەکڕی. لەوێ ناچاربووین بۆ بژێوی خۆمان و میوانداری لەوانیش پارە بۆ کڕینی شتومەک سەرف بکەین. کاتێک دیاریان پێشکەش دەکردین بە دڵفراوانی و بە زیادترەوە خەلاتمان دەکردن. هەرکات لە بەربەرەکان کەسانێک دەبوون بە هاوپەیمانی ئەوان، ئێمە خۆمان لە ئەزیەتکردنیان دەپاراست. ئەوانەش کە دوژمنیان بوون سزامان دەدان. بۆ ڕاستی و دروستی قسەکانم ئێوە دەتوانن لەو کەسانە بپرسن کە لە ڕێگادا چاوساغمان

بوونە. ئەو چاوساغ و ڕێنیشاندەرانە ئێستا لێرەن. لەسەر حیسابی دۆستایەتی نێوانمان بۆ ڕێنوێنی ئێمە ڕەگەڵمان کەوتن. هەڵبەت لەو ناوچانەی کە پێیاندا دەرباز بووین، چی ئەوانەی شوێنی دانیشتنی بەربەرەکان بوو و چی هی یۆنانییەکان، ئازووقە و تفاقمان وەگیر نەدەکەوت و ناچار بووین زەخت و زۆری بەکاربێنین چونکە بەڕاستی پێویستیمان پێبوو. کاردوخەکان، تائووخییەکان و خالدییەکان هەرچەند کۆڵۆنی پاشا نەبوون و هۆیەک لەگۆڕێدا نەبوو دوژمنایەتی هەڤدو بکەین، سەرەڕای مەترسی تێداچوون، ناچاربووین شەڕیان لەگەڵ بکەین، چونکە چاولەدەست بووین و ئەوانیش ڕێگای دابین کردنی ئازووقە و تفاقیان لێگرتبووین و بەناچار پەنامان بۆ تالآنکردنیان برد.

سەبارەت بە ماکرۆنی‌یەکان هەرچەند بەربەریشن، لەبەر ئەوەی ئەوەندەی لەدەستیان هات یارمەتییان داین، ئێمەش وەک دۆست لەگەڵیان جولاینەوە و هیچ کەرستەیەکمان بەزۆر لێنەستاندن. لە پێوەندی لەگەڵ کووتی‌ئوریەکان کە باستان کرد و گوتتان کۆڵۆنی ئێوەن، پێویستە بڵێم ئەگەر ئێمە بەزۆری شتێکمان لێ‌ئەستاندبن تەنیا خۆیان هۆی ئەو کردارەی ئێمە بوونە. ئەوان سەرەتا ئێمەیان وەک دۆست وەرنەگرت. پاش ئەوەی درگای شاریان داخست و ڕێگای چوونە نێو شاریان لێگرتین، ئەوسا حازر نەبوون ئازووقە و تفاقمان لە دەرەوەی ئاواییش پێبفرۆشن. بەرپرسیاری ئەو بڕیارەش بە گوتەی خۆیان ئەو کەسە بووە کە ئێوە دیاریتان کردبوو.

سەبارەت بەو گرفتەش کە ئێمە لە شارەکانیان بە زەبری شەڕ چووینەتە نێویان، دەبێ بڵێم کە چاوەڕوان بووین بە حورمەتەوە نەخۆش و بریندارەکانمان لێوەرگرن و یارمەتیمان بدەن، بەلآم بە پێچەوانەوە درگای شاریان لێمان نەکردوە و ناچار بووین بەبێ ئیزنی ئەوان و بێ شەڕ و پێکدادان، دیوارە نزمەکەی شار بڕوخێنین و بچینە نێو شار. ئێستا نەخۆش و بریندارەکانمان لەنێو ماڵی کووتی‌ئورییەکاندا بە خەرجی خۆمان تیمار دەکەین و لە رووی ناچاری نیگابانی لە دەروازەی شاریش دەدەین بۆوەی پیاوانی حاکمی دیاریکراوی ئێوە ئازارێک بەو بێدەسەلآتانە نەگەیێنن و هەرکاتێکیش بخوازین ڕایانگوێزین بەڕاحەتی بۆمان بلوێ. پاشماوەی لەشکرەکەشمان وەک دەبینن لە دەرەوەی شار جێگیر بووە و بۆ

بەربەرەکانی لەگەڵ پەلاماری ئەو کووتیئوورییانەی باسیان دەکەن لە حاڵەتی ئامادەباشی تەواو دا. ئەگەر کەسێک خزمەتمان پێبکا، چاکەی دەدەینەوە، ئەگەریش دژایەتیمان بکا، بێ وڵام نامێنێتەوە.

سەبارەت بە هەڕەشەکانی ئێوەش، ئەگەر بە قەناعەتێک گەیشتن کە ئێمە بۆ مەبەستێکی تایبەتی ئەو تالانانەمان کردوە، ئەوا دەبنە هاوپەیمانی کوریلا[١١٩] و پاڤلاغۆنییەکان بە دژی ئێمە. گەرەکمە ئەوە بزانن، ئەگەر پێویست بێ لەبەرامبەر هەردوو لایەکتاندا دەجەنگین و لەبیرتان نەچێ ئێمە لەگەڵ لەشکری لە ئێوە بەهێزتر بەشەڕهاتووین. ئەگەر ڕۆژێک بە قەناعەت بگەین کە بۆ بەرژەوەندی خۆمان ببینە هاوپەیمانی حاکمی پاڤلاغۆنی (هەڵبەت بەپێی زانیاری هەمانە ئەویش خوازیارە کە شار و ناوچەکانی قەراخ بەحری ئێوە داگیر بکەین) حەولدەدەین یارمەتی ناوبراو بدەین و بۆ گەیشتن بە ئامانجی هاوبەش دەتوانین ببینە دۆستی هەڤدوو ".

دوای قسەکانی گزنفۆن، وەڤدی سینۆپی کە لەگەڵ ئێکاتۆنیمۆ هاتبوو لەمەر قسەکانی گزنفۆن ئاشکرا بە ڕووخساریانەوە دیاربوو. یەکێک لە ئەندامانی وەڤدەکە وەقسەهات و بە یۆنانییەکانی گوت کە ئەوان بۆ شەڕ و دەعوا نەهاتوون بەڵکوو خوازیاری دۆستایەتین و لە درێژەدا گوتی: " ئێوە کاتێک هاتنە شاری سینۆپی، ئێمە بە حورمەتەوە وەرتان دەگرین و میوانداریتان لێدەکەین و کۆڵێک دیاریتان پێشکەش دەکەین. ئێستا دەبێ دەستوور بە کووتیئوورییەکان بدەین کە پێداویستییەکانی ئێوە بەپێی توانا دابین بکەن، چونکە هەست دەکەین قسەکانی ئێوە ڕاستن".

پاش ئەو گفتوگۆیانە، کووتیئوورییەکانیش بەنۆرەی خۆیان دیاریان بۆ یۆنانییەکان ناردە. ستراتێژەکانی یۆنانی، ئەوانیش میواندارییەکی بەپێزیان بۆ وەڤدی سینۆپی سازدا. دواتر هەردوولایان چەند بابەتێکیتریان بەشێوەی دۆستانە تاووتوێ کرد و بەتایبەتی یۆنانییەکان داوای زانیاری پێویستییان سەبارەت بە ڕەوشی ڕێگاوبان لە لایەنی بەرامبەر کرد.

---

١١٨- حوکمڕانی پاڤلاغۆنی و زۆر وێدەچێ ساتراپ بووبێ. ناوبراو لاینگری لە کووروش کردوە و هەزار سوارکاری بۆ ناردوە.

## بەشی ٦

### ئامۆژگاری ئێکاتۆنیمۆس - بڕیار لەسەر ڕۆیشتن بە ڕێگای بەحردا

ئەو ڕۆژە بەو شێوەیە کۆتایی هات. ڕۆژی دوایی ستراتیژەکان کۆبوونەوەیەکیان بۆ سەربازەکانی لەشکر پێکهێنا و مەسڵەحەتیان لەوەدا دیت کە دیدارێک لەگەڵ وەفدی سینۆپی ڕێکخەن و سەبارەت بە چۆنییەتی ڕەوتی ڕێگا گفتوگۆ بکەن. یۆنانییەکان لەو باوەڕەدا بوون کە ئەگەر قەرار بێ بە ڕێگای ویشکاییدا دەرباز بن پێویستیان بە یارمەتی و ڕێنوێنی سینۆپی‌یەکان دەبێ و وەک بەڵەدی وڵاتی پاڤلاغۆنی‌یەکان کەڵکیان لێوەردەگیرێ. ئەگەریش قەرار بێ بە ڕێگای بەحردا برۆن دیسانیش سینۆپی‌یەکان تەنیا هیوا بۆ دۆزینەوە و ئامادەکردنی گەمی بۆ سەربازەکانی لەشکر دەبن. بۆیە پاش بانگهێشتی وەفدی ناوبراو، گفتوگۆیان سەبارەت بەوە کە دەبێ چبکەن، دەست پێکرد و سەرەتا بڕیاردرا کە لەشکری یۆنانی دۆستایەتی خۆی لەبەرامبەر سینۆپی‌یەکان بە ئاشکرا نیشان بدا.

ئێکاتۆنیمۆس ئەوجاریش هەستا سەرپێ و داوای لێبوردنی سەبارەت بە قسەکانی پێشووی خۆی لە بەشداران کرد. ڕوونکردنەوەیەکی سەبارەت بە

هاوپەیمانی لەگەڵ حاکمی پاڤلاغۆنی بەناوی کۆریلا دایە بەشداران و گوتی کە مەبەستی هەڕەشە دژی سینۆپییەکانی یۆنانی نەبووە بەڵکوو ئەو باسە تەنیا بۆوەی بوو کە لەشکری یۆنانی هەرچەند دەستی ئاواڵە بوو لەگەڵ بەربەرەکان هاوپەیمانییەتی دامەزرێنێ، بەپێچەوانەوە یارمەتی ئێوە یۆنانییەکانی بەلاوە گرینگتر بووە. کاتێک وەفدەکە پرسیاری سەبارەت بە چۆنییەتی ڕێگا پرسیاری لە ئێکاتۆنیمۆس کرد، ناوبراو لەبەر خواکان پاڕاوە و پاشان درێژەی بە قسەکانیدا و بەو شێوەیە ئاخاوت: " ئەگەر من باشترین ئامۆژگاریم بۆ ئێوە هەبێ، ئێوەش لە هەموو بوارێکدا چاکەم لەگەڵ دەکەن و هەڵبەت پێچەوانەکەشی دروستە. ئێوە گەرەکتانە ئەو وتوێژە نهێنی بمێنێتەوە. من بەڵێنتان پێدەدەم کەس پێی‌نازانێ. ئێستا ئەگەر دیتتان ئامۆژگاری بەنرخم دایە ئێوە، تکایە قەدرم بزانن. ئەگەریش پەندەکانم بێ مایە بوون نفرینم بکەن. من دەزانم کە ڕۆیشتنی ئێوە بە ڕێگای دەریادا بۆ ئێمە گەلێک دژوارە. چونکە پێویستە ئازووقەی فرەتان بۆ دابین بکەین. بەلام ئەگەر بە ڕێگای ویشکاییدا دەرباز بن تووشی شەڕ و پێکدادان دێن. کورتی ببڕمەوە، بەپێی ئەزموونی خۆم ئەوەی پێویستە دەیڵێم چونکە ولات و دەسەلاتی پاڤلاغۆنی‌یەکان باش دەناسم. ولاتی ئەوان دوو سروشتی تایبەت بەخۆی هەیە، دەشتایی پان و بەرین و شاخ و چیای بەرز. ئەوەش دە‌انم > لە کوێ‌ڕا ڕاستەوخۆ دەکرێ بچییە نێو ئەو ولاتە. هیچ ڕێگایەکی دیکە ‌ەگۆڕێدا نییە جیا لە دۆڵێکی تەنگەبەری نێوان شاخەکان کە ڕەنگە جەماوەرێک ئەو بەرزاییانە بگرن و چاوەدێری دۆڵی گۆرین بکەن. ئەو کاتە کەس ناتوانێ بەو گەلییەدا دەرباز بێ. ئەگەر گەرەکتانە دەتوانن کەسێک لە پیاوانی خۆتان لەگەڵ من بنێرن تا ئەو شوێنەتان پێ نیشان بدەم. ئەوەشم لێ‌ڕوونە کە لە سەحڕادا شەڕکەرانی ئەو وەحشی و بەربەرانە وەک خەڵکی دەڤەری ئێمە نین و لە لەشکری سوارەی پاشا جەنگاوەرترن. ئەوانە هیچکات نەچوونەتە ژێر دەسەلاتی پاشا و خاوەن حاکمێکی گەلێک لەخۆڕازین.

ئەگەر ئاوای دابنێین کە ئێوە بە شێوەیەکی نهێنی یا بە خێراییەکی تەواوەوە بە کێوەکاندا دەرباز بن و لەشکری سوارەی دوژمنتان لە سەحڕا

شکست پێدا کە ژمارەیان زیادتر لە سەد و بیست هەزار کەس دەبێ، ئەوسا دەگەنە سەر هێندێک ڕووبار. یەکەم چۆم بەناوی تێرمۆدۆند سێ پلێترا بەرینە و بەباوەڕی من پەڕینەوەی بۆ ئێوە هێندێک دژوارە. بەتایبەت کە دەکەونە بەر پەلاماری هێزێکی زۆری دوژمن و هاوکاتیش شەڕکەرەکانی نەیار بە دواتانەوە دەبن. پاش ئەو چۆمە ئەوجار دەگەنە ڕووباری ئێری، ئەویش خاوەن بەرینایی سێ پلێترا دەبێ و لە درێژەی ڕێگادا چۆمی (ئالی)تان دێتە پێش. ئەو چۆمە لەوانی پێشوو بەرتەسکتر نییە. دوو ستادیۆ بەرینە و پەڕینەوە بە بێ بەلەم و لۆتکە ناکرێ.

کێ یارمەتی ئامادەکردنی ئەو لۆتکە و بەلەمانە دەدا خۆی پرسیارێکە. دەبێ بڵێم کە پەڕینەوە لە چۆمی پارتێنییۆن مەحاڵە. دواتر پاش پەڕینەوە لە چۆمی ئالی دەگەنە سەر ئەو ڕووبارەی دوایی، ئەوەش خۆی نەک هەر هاسان نییە بەڵکوو من لەو باوەڕدام کە پاشماوەی ڕێگای ئێوە ئیمکانی پێشڕەوی بۆ نییە. ئەگەر لێرەوە بە ڕێگای دەریادا بڕۆن، ڕاحەتتر دەگەنە سینۆپی. لەوێشەوە کەنارەکانی بەحر دەگرنە پێش و دەچنە ئێراکلیا و ئەوسا بەهاسانی دەتوانن لەو شارەڕا چ بە ویشکاییدا و چ بە دەریادا بەبێ گرفت درێژە بە ڕێگاکەتان بدەن. بۆیە دەڵێم بێ گرفت چونکە لە ناوچەی ئێراکلیا ئێوە دەتوانن ژمارەیەکی زۆر گەمی و بەلەم دابینبکەن".

کاتێک ئێکاتۆنیمۆس ئاخاوتنەکەی تەواو بوو، یۆنانییەکان لێی وەشک کەوتن، چونکە ناوبراو دۆستی کۆریلا بوو و لە سینۆپی پێشتر لەلای ئەو میوان ببوو. ئێکاتۆنیمۆس بەرتیلی لە کۆریلا وەرگرتبوو تاکوو یۆنانییەکان بەو شێوەیە ڕێنوێنی بکا و ئەوەش خۆی گومانەکەی پتر کردبوو. لە ڕاستیدا ئەو چەشنە ڕێنماییە بۆ پێشگیری لە زەرەد و زیان گەیشتن بە دانیشتووانی سینۆپی لەکاتی ڕێپێوانی لەشکری یۆنانی بە ڕێگای ویشکاییدا لەبەر چاو گیرابوو. یۆنانییەکان لەبەر گرفتەکانی بەردەمیان بڕیاریاندا بە ڕێگای بەحردا دەرباز بن. دوای ئەو باسانە ئەوجار گزنفۆن دەستی بە قسەکردن کرد و گوتی: " ئەی خەڵکی سینۆپی، ستراتێژەکان ئەو ڕێگایەیان هەڵبژاردوە کە ئێوە بە مەسڵەحەتی دەزانن. ڕەوتی کارەکانیش بەو شێوەیە دەبێ: ئەگەر

دڵنیا بن کە ئەوەندە گەمی و بەلەم دەست دەکەوێ کە تەنانەت یەک سەربازیش لێرە نەمێنێتەوە ئەوسا بە ڕێگای دەریادا دەڕۆین. دیارە ئەگەر قەرار بێ هێندێک لەڕووی ناچاری لێرە بمێننەوە و ئەوەی‌تریش بڕۆن، هیچکەس سواری گەمی نابێ. چونکە بۆمان دەرکەوتووە لەهەر جێگایەک بە ژمارە زۆر بین خاوەن هێزیشین و دەتوانین پارێزگاری لە خۆمان بکەین و ئازووقە و تفاق بۆ مان و گوزەرانمان وەدەست بخەین. ئەگەریش ژمارە و هێزمان لە دوژمن کەمتر بێ، ئاشکرایە چارەنووسی کۆیلەتی و یەخسیری بەشمان دەبێت".

سینۆپی‌یەکان هەرکە گوێیان لەو قسانە بوو، داوایان لە یۆنانییەکان کرد کە وەڤدێک بنێرنە شاری سینۆپی. ئەوکاتە کالیماخۆسی ئارکادی، ئاریستونای ئاتێنی و سامۆلای ئاخی‌ئۆ دیاری‌کران لەگەڵ ڕاسپاردەکانی سینۆپی وەڕێکەون. لەو نێوەدا، وەختێک گزنفۆن چاوی بەو هەموو چەکدارە قورس و سوک و تیرهاوێژ و نێزەدار و سوارە و پیادە یۆنانییە کەوت کە خاوەن ئەزموونێکی زۆری جەنگاوەرین و گشتیان لە قەراخ دەریای ڕەش کۆبوونەتەوە و قەتیش هێزێکی ئەوەندە فرە لە شوێنێک بێ وەسیلە و ئیمکانات نەکەوتووەتەوە سەریەک، تووشی خەیاڵاتێک هات. گزنفۆن ئەو دیاردەیەی بەلاوە گرینگ بوو بۆیە بیری لەوە کردەوە دەست بە ئاوەدانی ناوچەکە بکەن و شارێک بنیات بنێن و بیکەنە بازێڕێکی مەزن بۆ وڵاتی یۆنان. کاتێک سەرجەم دانیشتووانی یۆنانی و خەڵکی ناوچەکانی دەوروبەری دەریای ڕەشی حیساب کرد، بەو ئاکامە گەیشت کە ئەو شارە ڕۆژێک دێت گەلێک مەزن و ئاوەدان و پڕڕەونەق بێ. بۆ ئەو مەبەستە پێش ئەوەی هیچ زانیارییەک بداتە لەشکر، سەرەتا تاڵەبینی کوروش بەناوی سیلانۆس ئامڤراکیوتی بانگهێشت کرد و قوربانی پێشکەش بە خواکان کرد. سیلانۆس لە جێبەجێ بوونی خۆزگەی گزنفۆن نیگەران بوو و لەوە دەترسا کە بە دروستکردنی ئەو شارە لەشکر ناچار بێ هەمیشە لەوێ جێگیر بێ. ناوبراو بەدزییەوە خەبەری ئەو پلانەی لەنێو سەربازەکاندا بڵاوکردەوە و ڕایگەیاند کە گزنفۆن دەخوازێ لەشکر لەو شوێنە دامەزرێنێ و بیکاتە بازێڕێکی یۆنانی

و بەحیسابی ناو و هێزی خۆی تەواوی بکا. سیلانۆس گەرەکی بوو هەرچی خێراتر بگەڕێتەوە یۆنان و ئەو سێ هەزار داریکەی کوروش پێیدابوو و لە سەرتاسەری ڕێگادا پاراستبووی، لەدەستی نەچێ. ئەو دەستخۆشانەیە کاتی خۆی بۆخاتری پێشگۆیی ناوبراو لەمەر هێرشی هێزەکانی ئەردەشیر پاشا بۆسەر سپای کوروش بە سیلانۆس درابوو. ناوبراو گوتبووی دوژمن تا دە ڕۆژ خۆی لە هیچ پەلامارێک نادا و پێشگۆییەکەشی وەڕاست گەڕابوو.

سەربازەکانی لەشکر کاتێک لە مەبەستی گزنفۆن گەیشتن، هێندێکیان بەباشیان زانی و زۆرێکیش لە دژی ڕاوەستان. ستراتێژەکانی وەک تیماسیۆن داردانیئا و تۆراکسی ڤیۆتیۆسی ئەو هەواڵەیان بە بازرگانانی دەڤەری ئیراکلیا و سینۆپی ڕاگەیاند کە بەهەڵکەوت ئەو کاتە لەوێ بوون. ستراتێژەکان گوتیان ئەگەر ئێستا مووچەی سەربازەکانی لەشکر و پێداویستییەکانی کاتی سەفەر دابین نەکەن لەشکرێکی ئاوا زۆر و بەهێز ناچار دەبێ لە قەراخ ئاوەکانی دەریای ڕەش بۆ هەمیشە بمێنێتەوە و جێگیربێ. ئەوان هەروەها گوتیان کە گزنفۆن خۆزگەی دروستکردنی شارێکی گەورەی لێرە لەدڵدایە و لەسەر ئەوە ڕاوەستاوە کە دروست کاتی گەیشتنی گەمییەکان مەبەستی خۆی بۆ گشت لایەک ئاشکرا بکا و قەرارە ئەو وەخت بەو چەشنە بدوێ:

" پیاوەکان! سەربازەکان! ئێستا گشتتان دەبینن کە ناتوانن بژیوی پێویستی خۆتان دابین بکەن و بەهاسانی بگەڕێنەوە وڵاتی یۆنان و خێروبێرێکتان بۆ نیشتمانەکەتان هەبێ. ئەگەر ئێوە گەرەکتان بێ دەتوانن بەشێوەیەکی دیکە کەڵک لە هێزەکەتان وەرگرن. پاش ئەوەی شوێنێکی گرینگتان لە ناوچەیەکی پڕ حەشیمەتی دەریای ڕەش هەڵبژارد، لێی جێگیر بن. دواتر ئەو کەسانەی حەزیان لە مانەوە نییە دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان و ئەو جەماوەرەش کە خوازیاری نیشتەجێ بوونن بەدڵی خۆیان دەکەن. ئەوکات گەمی پێویستتان دەبێ و هەر جێگایەکی حەزی لێبکەن خێرا دەتوانن داگیری بکەن".

کاتێک بازرگانەکان گوێیان لەو قسانە بوو بەپەلە خەڵکی شارەکانی سینۆپی و ئیراکلیایان ئاگاداری ئەو ڕەوش و پلانانە کردەوە. تیماسیۆن داردانی بەپەلە ئیڤری‌ماخۆسی داردانی و تۆراکسی ڤیۆتیۆیی لەگەڵ بازرگانەکان وەڕێخست بۆوەی ئەو خەبەرە بە وڵاتدا بڵاو بکەنەوە.

خەڵکی سینۆپی و ئیراکلیا وەختێک گوێیان لەو هەواڵە بوو لەجێوە وڵامیان بۆ تیماسیۆن نارد و گوتیان کە ئامادەن یارمەتی ماڵی تەواو بکەن بۆوەی ناوبراو لەشکری یۆنانی ڕازی بە ڕۆیشتن لە ناوچەکەیان بکا. کاتێک تیماسیۆن بە تامەزرۆییەوە گوێی لەو بەڵێنانە بوو خێرا ڕووی لە سەربازەکانی لەشکر کرد و گوتی: " سەربازەکان نابێ بیر لە مانەوە لێرە بکەینەوە و نابێ هیچ ئامانجێک بەلاتانەوە گرینگتر لە گەڕانەوە بۆ وڵاتی یۆنان بێ. هەروەک بیستووتانە کەسانێک هەن کە قوربانی پێشکەش بە خواکان دەکەن بەبێ ئەوەی ئێوە بزانن بۆ کام مەبەست ئەو کارە دەکا. بەڵێنتان پێدەدەم ئەگەر بگەڕێینەوە لە هەوەڵی مانگی داهاتوودا یەک لیرەی ئاڵتوونی کیزیکی بەهەر سەربازێک دەدەم[120]. بەڵێن بێ بتانگەیێنمە تروادا، ئەو شوێنەی لێی‌دەرکراوم و دڵنیام هاوڵاتییەکانم بە باوەشی گەرمەوە پێشوازیتان لێدەکەن و یارمەتیتان دەدەن. لەوێڕا من بۆ شوێنی وەها دەوڵەمەند ڕێنماییتان دەکەم کە ئێوە بتوانن سەروەت و سامانێکی باش کۆکەنەوە. من وڵاتی ئێ‌ئۆلیدا، فریژیا و ترووادا و بەگشتی ئەو ناوچانەی لەژێر دەسەڵاتی (فارناڤازۆس)دان بەباشی بەڵەدم. دەڤەری‌تریش دەناسم چونکە خۆم خەڵکی ئەو هەرێمەم و سەردەمی خۆی لەگەڵ لەشکرکێشییەکانی کلێ‌ئارخۆس و دێرکیلیدای ژێر فەرمانی فارناڤازۆس‌دا خزمەتم کردوە".

تۆراکسی ڤیۆتیۆیی، ناوبراو بەردەوام لەگەڵ گزنفۆن لە کێشەدا بوو، دووبارە هەستا سەرپێ و سەبارەت بە چۆنییەتی ڕۆیشتن قسەی کرد. ئەو گوتی: " کاتێک ڕۆخەکانی دەریای ڕەش بەجێ‌دەهێڵین یەکسەر دەگەینە

---

۱۱۹- کیزیکینۆس، دراوی زێڕ لە هەرێمی کیزیکۆ (شارێکی ئاسیای بچووک لە پرۆپۆندیدا) و بەرابەری قیمەتی داریک بووە. لە کاروباری بازرگانیدا مامەڵەی پێکراوە.

خێرسۆنیسۆ. وڵاتێکی جوان و بە پیتوبەرەکەتە. لەوێش هەرکەس بخوازێ نیشتەجێ بێ یا بگەڕێتەوە وڵاتی خۆی، سەربەستە و کەس پێشیپێناگرێ. بۆیە هیچ مانایەکی نییە کاتێک یۆنانێکی بەو جوانییە هەیە، خەڵک ناچار بێ لە وڵاتی بەربەرەکاندا بمێنێتەوە". ناوبراو لەلایەن خۆی و تیماسیۆن بەڵێنی بە جەماوەردا هەرکە گەیشتنەوە، مووچەی دیاریکراو بدرێت. دیارە تۆراکس ئەو قسانەی لەسەر حیسابی قەولەکانی تیماسیۆن دەکرد کە خەڵکی ئیراکلیا و سینۆپی پێشتر بە ناوبراویان دابوو بۆوەی لەشکر ڕازی بە ڕۆیشتن لەو هەرێمە بکا.

گزنفۆن کاتی ئاخاوتنی تۆراکس بێدەنگی خۆی پاراستبوو. فیلیسیۆس و لیکۆسی خەڵکی ئاخایی بەجووتە هەستانە سەرپێ و گوتیان: " چەندە دژوار و ترسناک دەبوو بەتایبەتی کەسێکی وەک گزنفۆن حەول بدا ڕازیمان بکا لەو شوێنە بمێنینەوە و بە قوربانیدانیش ڕای خواکان لەمەر نیشتەجێ بوونمان وەربگرێ، بەبێ ئەوەی هیچ زانیارییەک بە سەربازەکانمان بدا و ستراتێژەکانیش لەو بارەوە ئاگادار بکا ".

لەوکاتەدا گزنفۆن ناچار بوو هەستێتە سەرپێ و بەو شێوەیە بدوێ: " سەربازان! وەک دەبینن من پێش هەر کارێک پرس بە خواکان دەکەم. بۆوەی بزانم چەندە دەتوانم خێرم بۆ ئێوە و شەخسی خۆم هەبێ. من هەر چۆنێک بیر بکەمەوە و قسە بکەم و بجوڵێمەوە، گرینگی بە پاراستنی بەرژەوەندی زیادتری ئێوە و خۆم دەدەم. ڕاستە، فەترەیەک لەوە پێش خەریکی داخوازی ئامۆژگاری و ڕێنوێنی خواکان بووم. پرسیارم لەوان ئەوە بوو کە ئایا باس لە خۆزگە و بیر و بۆچوونەکەم بکەم و هەوڵی بۆ بدەم یا تەواو لێی بێدەنگ بم. تاڵەبین سیلانۆس وڵامی دامەوە کە قوربانییەکان نیشانەی خێریان پێوە دیارە و ناوبراو خۆیشی دەزانێ کە من سەبارەت بە تاڵەبینی ئەوەندەش ناشارەزا نیم چونکە بەردەوام لە ڕەوتی فاڵ گرتنەوەکاندا بەشدار بوومە.

هێماکانی قوربانی نیشانەی خەیانەت و دەغەڵکاری خەڵکێکیان سەبارەت بە منەوە پێوەدیار بوو، گومانیش لەوەدا نییە کە سیلانۆس ڕاستی لێکداوەتەوە. چونکە بۆخۆی گەرەکی بوو من لەبەر چاوی ئێوە ڕەش بکا و

لەڕاستیدا ئەو خۆی باسی خۆزگەکانی منی لای جەماوەر کردوە و گوتوویەتی کە من بەبێ مەیل و ئاگاداری ئێوە خەریکی جێبەجێ کردنی خەیالاتی ئەوتۆم. منیش لەبەر ئەوەی ئێوەم لە چاوەڕوانی و سەرسوڕماندا دیت، بیرم لێکردەوە کە باشترە شارێک داگیر بکەین و پاشان هەرکەس بخوازێ، دەتوانێ سواری گەمی بێ و بگەڕێتەوە ولاتی خۆی. هەرکەسێکیش حەزی لە مانەوە بێ و بیهەوێ بژیوێک بۆ ماڵ و منداڵی دابین بکا، بمێنێتەوە. ئێستاکە دەبینم کە خەڵکی سینۆپی و ئیراکلیا خەریکن بەلەم و گەمیتان بۆ ئامادە دەکەن و کەسانێکیش بەڵێنیان داوە ئەگەر هەوەڵی مانگ وەرێبکەون، مووچەی باشتان پێدەدەن. کەوابوو لەوە باشتر نییە کە هەرچی زووتر خۆمان ڕزگار بکەین و هەر جێگایەکی گەرەکمانە ڕووی تێبکەین و مووچە و یارمەتیش وەربگرین. من لە خۆزگەی خۆم دەگووزەرێم. هەرکەس لەگەڵ خواستی من بووە، داوای لێدەکەم ڕایبگۆڕێ. دەبێ ئەوەش بڵێم هەرچەند ئێمە وەک ئێستا بە دەوری یەکەوە بین و پەرشوبلاویمان تێنەکەوێ، ڕێز و حورمەتمان لەلای خەڵک زیادتر دەبێ و هەر داخوازیەکی هەمان بێ بۆمان جێبەجێ دەکرێت، چونکە غەنیمەت تەنیا لە خەڵکی لە ئێوە بێهێزتر دەستێندرێ. بەپێچەوانەوە ئەگەر لە یەکتر جیا بینەوە و هێزمان لە کەمی بدا، ئیتر ناتوانین ئازووقە و پێداویستییەکانمان دابینبکەین و چێژ لە گەڕانەوە وەربگرین. منیش لەسەر ئەو بڕوایەم کە پێویستە بگەڕێینەوە یۆنان و ئەگەر کەسانێک بخوازن بمێننەوە، دەبێ پێش گەیشتنمان بۆ شوێنێکی ئەمن و هەمیشەیی لە یەخەی خۆمانیان بکەینەوە. هەرکەس لەگەڵ ڕاو و بۆچوونی منە تکایە دەستی بەرزکاتەوە".

جەماوەرەکە بەپانەوە دەستیان بەرزکردەوە. تەنیا سیلانۆسی تاڵەبین نارەزایەتی دەربڕی. ئەو لەسەر ڕۆیشتن پێداگربوو و تەنیا ئەو ڕێگایەی بەلاوە دروست بوو و حەولی دەدا بە هێنانەوەی دەلیل قسەکەی خۆی بەرێتە سەر. ئەو گوتی: " هەرکەس بخوازێ بگەڕێتەوە ولاتی خۆی پێویستە ئازاد و سەربەست بێ". سەربازەکان قسەیان پێبڕی و گەرەکیان نەبوو لەو بارەوە

زیادتر درێژەدادڕی بکا و هەڕەشەیان لێکرد ئەگەر بخوازێ لەدەست لەشکر ڕابکا، بە توندی سزا دەدرێت.

دوای ئەو باس و خواسانە، وەختێک دانیشتووانی ئیراکلیا تێگەیین کە یۆنانییەکان تازە بڕیاری ڕۆیشتنیان داوە و گزنفۆنیش لەگەڵیان هاوڕایە، گەمی و بەلەمیان بۆ ڕاگواستن ئامادە کرد، بەڵام سەبارەت بە مووچە و پارە درۆیان لەگەڵ تیماسیۆن و تۆراکس کرد و خۆیان لە دابینکردنی پاراست. ئەوەش بووە هۆی سەرلێشێوانی ئەو کەسانەی بەڵێنی مووچەیان دابوو و لە سەربازەکانی لەشکر گەلێک دەترسان. بۆوەی خۆیان لەو مەترسییە ڕزگار بکەن چەند کەس لە ستراتێژەکانیان ڕەگەڵ خۆیاندا، واتە ڕاست ئەو کەسانەی پێشتر ئاگاداری پلانی داڕێژراویان بوون. گشتیان ئامادە بوون و تەنیا نێئۆن ئاسینێئی لەوێ نەبوو. ناوبراو جێگری ستراتێژ خیریسۆفۆس بوو و هێشتا نەگەیشتبۆوە و نەیتوانی بەشداری لە کۆبوونەوەکە بکا. هەموویان تێکڕا هاتنە لای گزنفۆن و پێیانگوت کە ئاڵوگۆڕ لە بیر و بۆچوونیاندا پێکهاتوە و بەو ئاکامە گەیشتوون ئێستا کە گەمییان لە بەردەستدا هەیە و دەتوانن لە چۆمی فاسی بپەڕنەوە، باشترە وڵاتی فاسییەکان (کۆلخیدا) داگیربکەن.

شای ئەو هەرێمە لەو کاتەدا بە هەڵکەوت نەوەی پاشای ئائیتی بوو. گزنفۆن بەو پێشنیارە ڕازی نەبوو و بە ستراتێژەکانی گوت کە ناخوازێ باسێک لەوبارەوە لەلای سەربازەکان بکا. ناوبراو گوتی: " ئەگەر ئێوە خوازیاری کارێکی ئەوتۆن، خۆتان سەربازەکان کۆکەنەوە و پێشنیارەکە باس بکەن". لەوکاتەدا تیماسیۆن ئاردانی پێشنیارێکی دیکەی هێناگۆڕێ و داوای کرد هیچ شتێک بە سەربازەکان نەگوترێ و ستراتێژەکان تەنیا حەولی ڕازی کردنی لۆکاژەکان لەمەر ئەو پلانە بدەن. پاش ئەو ساغ بوونەوەیە گشتیان ڕۆیشتن.

# بەشی ٧

## بوختان هەڵبەستن بۆ گزنفۆن لەلایەن نیئۆن ئاسینیئی - بەرپەرچدانەوەی بوختانەکان لەلایەن سەربازانەوە - ڕێنوێنی شەرماوی لۆکاژ کلیئارت - باسێک لەسەر کاروکردەوەی پێشووی فەرماندەکان

سەربازەکان پاش پرسیار و وڵام وەرگرتنەوە ئاگاداری بڕیارەکان بوون. نیئۆن بە دژایەتی گزنفۆن دەستی بە ئاخاوتن کرد و گوتی: " گزنفۆن پاش ئەوەی هێندێک لە ستراتیژەکانی بۆلای خۆی راکێشا، پشتی لە خواستی سەربازەکانمان کرد و گەرەکی بوو دووبارە لەشکر بەرەو هەرێمی فاسی[121] بەرێتەوە ".

کاتێک سەربازەکان گوێیان لەو قسانە بوو، قەڵس بوون و لە چەند کۆڕێکی جیاواز و لەدەوری یەکتر کۆبوونەوە. ئەوان لەوە دەترسان کە مەبادا جارێکی دیکە کەڵکی نابەجێیان لێوەرگیرێ و وەک ئەو کاتەی ناچارکران دژی کۆلخیدی و ئاغۆرانۆمەکان(دەزگای ڕاگەیشتن بەسەر نەزم و قیمەت لە

---

١٢٠- لێرەدا مەبەست لە فاسی واتە خەڵکی کۆلخیدایە نەک چۆمی فاسی لە ئەرمەنستان.

بازاڕەکانی یۆنانیدا) شەڕ بکەن. لەو تێکهەڵچوونەدا ئەو سەربازانەی نەیانتوانی خۆیان بگەیێننە گەمییەکان بەخەستی بەردەباران کران.[122]

گزنفۆن کاتێک ئاگاداری ئەو کۆبوونەوانە بوو خێرا بڕیاریدا تەواوی سەربازەکانی لەشکر کۆکاتەوە و ڕێگا نەدا بەتەنیا لێرەولەوێ ڕاوێژبکەن. جارچی دەستووری بانگهێشتەکەی بڵاوکردەوە. سەربازەکان کاتێک گوێیان لەو بانگهێشتە بوو خێرا ئامادەی دانیشتنەکە بوون. گزنفۆن یەکسەر ڕووی لە سەربازەکان کرد و بێئەوەی هیچکام لە ستراتێژەکان تاوانبار بکا (چونکە لە بەرەی نابراودا بوون) ڕووی لە سەربازەکان کرد و گوتی: " سەربازەکان، بیستوومە یەکێک بوختانم پێدەکا. گوتوویەتی گەرەکمە بە فریودانی ئێوە بگەڕێینەوە دەڤەری فاسی. تکاتان لێدەکەم گوێم لێبگرن. بۆ ڕەزامەندی خواکانمان، ئەگەر دەرکەوت من درۆم لەگەڵ کردون، بەبێ دادگایی و ڕوونبوونەوەی تاوانەکانم، مەهێڵن لێرە برۆم. بەڵام ئەگەر دەرکەوت کە لەلایەن دژبەرانمەوە بوختانم پێکراوە، ئەوسا دەبێ بەو شێوەیەی پێویستە سزابدرێن. ئێوە بێشک دەزانن ڕۆژ لە کام لاوە هەڵدێ و لە کوێ ئاوادەبێ. ئەگەر کەسێک بخوازێ بەرەو یۆنان بچێ دەبێ ڕۆژئاوا بگرێتە بەر، ئەگەریش بەرەو وڵاتی بەربەرەکان بڕوا دەبێ لای ڕۆژهەلات ڕەچاو بکا. ئایا ئیمکانی هەیە پیاو ئێوە فریوبدا، لەو جێگایەی ڕۆژ ئاوا دەبێ بڵێ ڕۆژ هەڵدێ و لەو شوێنەش ڕۆژ هەڵدێ بڵێ خۆرئاوایە. ئێوە گشتتان ئەوە دەزانن بای شەماڵ گەمییەکان لە دەریای ڕەشڕا بەرەو ئێرە دێنێ و بای زریانیش لێرەوە بەرەو نێوەندی دەریا و وڵاتی فاسییان دەبا. گەمیوانەکان دەڵێن کاتێک بای شەماڵ هەڵدەکا، سەفەر بەرەو یۆنان پڕخێر و بێرە. ئێستا پرسیار ئەوەیە، ئایا ئیمکانی خەیانەتێکی ئەوتۆ هەیە کاتێک بای زریان لەلای هەرێمی پۆندەوە هەڵدەکا، ئێوە سواری گەمی بن و وەڕێبکەون؟ ڕەنگە کەسێک بڵێ ئەوەش دەلیل نییە، چونکە کاتێک هەوای ساف و خۆشە پیاو دەتوانێ بە گەمی سەفەر بکا. باشە ئەو کاتە ئەگەر من توانیم بەتەنیا سواری گەمییەک

---

١٢١- ئاغۆرانۆمۆس، کوێخای بازاڕ کە لەسەر قیمەتی کڕین و فرۆشی کەرستەکان بڕیاری داوە.

بم و بڕۆم، ئێوه چۆن به سه‌دان گه‌می ناتوانن وه‌دوام بکه‌ون! ئه‌وه‌ش ڕوونه که به‌بێ ئه‌وه‌ی خۆتان گه‌ره‌کتان بێ، من ناتوانم به درۆیه‌ک ڕازیتان بکه‌م که به‌ره‌و شوێنی مه‌به‌ستی من ده‌ڕێکه‌ون.

باشه، با ئاوای دابنێین که من توانیم ئێوه هه‌ڵفریوێنم و چووینه ده‌ڤه‌ری فاسی. له‌وێ خێرا بۆتان ده‌رده‌که‌وێ که خاکی یۆنان نییه، منیش که درۆم له‌گه‌ڵ کردون و له‌وێ به‌ته‌نیام، ئێوه‌ی فریوخواردووش نیزیک به ده هه‌زار که‌س ده‌بن، ئه‌وکاته که‌سێکی تاوانبار که ئێوه‌ی به هه‌تڵه بردوه و خۆیشی تووشی مه‌ترسی هاتووه، ده‌بێ چاوه‌ڕوانی چ چاره‌نووسێک بێ؟ بۆیه پێموایه، ئه‌و قسانه‌ی ئێستا ته‌نیا گوته‌ی مرۆڤی نادان و نه‌فامن که ئێره‌یی به ڕێز و حورمه‌تی من له‌لای ئێوه‌وه ده‌به‌ن. من له‌و باوه‌ڕه‌دام به‌خیلییان به مندا دێ، به‌ڵام له ئێوه ده‌پرسم، ئایا پێشم به که‌س گرتووه قسه‌ی خۆی بکا، به‌تایبه‌ت ئه‌گه‌ر پێشنیاری به‌نرخی هه‌م بۆخۆی و هه‌میش بۆ ئێوه هه‌بێ و باری ئه‌منی گشتیشی له‌به‌رچاو گرتبێ.

ئایا، ئێوه کاتی دیاریکردنی سه‌رکرده بینیتان من پێش به هه‌ڵبژاردنی هیچکام له فه‌رمانده‌کان بگرم! من هه‌میشه کشاومه‌ته‌وه دواوه و ته‌نیا ئه‌وه‌نده بۆ من گرینگ بووه سه‌رکرده‌ی نوێ مه‌سڵه‌حه‌تی ئێوه‌ی له‌به‌رچاو گرتبێ. ئێستا له‌وه زیادتر له‌سه‌ری ناڕۆم. ئه‌گه‌ر که‌سێک له‌و باوه‌ڕه‌دایه من خه‌یانه‌تم به شه‌خسی ئه‌و یا ئێوه به‌گشتی کردوه، تکایه بێته ئێره و باسی تاوانه‌کانم بکا و بیان‌سه‌لمێنێ. به‌ڵام ئه‌گه‌ر به‌و ڕوونکردنه‌وانه‌ی من ڕازی بوونه، تکایه بڵاوه‌ی مه‌که‌ن تا سه‌باره‌ت به ڕووداوێک که له‌نێو له‌شکردا خه‌ریکه بقه‌ومێ، وریاتان بکه‌مه‌وه! ئه‌گه‌ر ئه‌و گرفته بته‌قێته‌وه یاکوو کاتی ته‌قینه‌وه‌ی هاتبێ، تکام له ئێوه ئه‌وه‌یه هه‌رچی زووتر پێشی پێبگرن بۆوه‌ی له به‌رامبه‌ر زه‌مین و ئاسمان و دۆست و دوژمن وه‌ک شه‌ڕانی و بێکار و ترسنۆکترین خه‌ڵک ناو ده‌رنه‌که‌ین و ناچار نه‌بین له شه‌رمان خۆمان داپۆشین".

کاتێک سه‌ربازه‌کان گوێیان له‌و گوتاره بوو، سه‌رسوڕماو داوای ڕوونکردنه‌وه‌ی ڕاستییه‌کانیان کرد. گزنفۆن دیسانیش ده‌ستی به قسه‌کردن

کردەوە و گوتی: " ئێوە هیچ دەزانن کە هێندێک لە بەرزاییەکانی ئەو دەڤەرە شوێنی دانیشتنی بەربەرەکانە. ئەوانە دۆستی خەڵکی کێراسۆندان و لەو شاخانەڕا دادەگەڕێنە خوارەوە و ماڵاتی قوربانی و وڵاغ و چی کەرستەی بۆ خورد کردنەوە بێت، بە ئێمەی دەفرۆشن. ئەوەندەی من بزانم هێندێک کەس لە ئێوە چوونەتە نیزیکترین گوندی ئەوان لەو نیزیکانە و پێداویستییەکانتان کڕیوە و گەڕاونەوە. کلیئاریتۆس زانیاری هەبووە کە ئەو گوندە زۆر لەبەر چاوان نییە و بۆخاتری دۆستایەتی خەڵکەکە لەگەڵ دانیشتووانی کێراسۆندا، پارێزگارییەکی ئەوتۆی لێناکرێت. ناوبراو بە مەبەستی تاڵان، شەو پەلاماری ئەو دێیەی داوە بەبێ ئەوەی هیچ بە ئێمە بڵێ. ئەو لەبەر خۆیەوە ئاوای دانابوو کە ئەگەر دەرەقەتی گرتنی هات، پاش تاڵانکردنی ئیتر ناگەڕێتەوە ئۆردوگا و یەکسەر سواری ئەو گەمییە دەبێ کە لە نیزیک گوندەکە لەنگەری گرتبوو و چاوەڕوانی ئاکامی تاڵانکردنەکە بووە. ئەوان بیریان لەوە کردبۆوە کە هەرچی تاڵانی دەستیان کەوت خێرا ڕایگوێزنە نێو گەمی و بە نهێنی دەریای ڕەش جێبهێڵن. هەڵبەت لەو باوەڕەدام کە پێشتر لەگەڵ خاوەنی گەمییەکە سەروسەودایەکیان هەبووە. هەرچی بێ، ناوبراو ئەو ژمارە سەربازەی توانی ڕازییان بکا، هەڵگرتووە و پەلاماری گوندی گۆرینیداوە. پاش ماوەیەک هەوڵدان، ڕۆژیان بەسەردا هاتووە. خەڵکی دەڤەرەکە خێرا لێیان ڕاساون، لە مەتەرێزەکان دەریانپەڕاندوون و کلیئاریتۆس خۆی و سەربازەکانی کەوتوونەتە بەر ڕێژنەی تیرهاوێژەکان. کلیئاریتۆس و ژمارەیەکی زۆر لە سەربازەکانی کوژراون. ئەوانەش کە نەجاتیان هاتووە، پەنایان بۆ خەڵکی کێراسۆندا بردوە. ئەو ڕووداوانە پاش ڕۆیشتنی ئێمە لەوێ کە بە ڕێگای ویشکاییدا بەرەو ئێرە دەهاتین، قەومان. ژمارەیەکی زۆر لەو کەسانەش کە دەبوایە بە ڕێگای دەریادا بێن، لە کێراسۆندا مانەوە چونکە پێرانەگەیشتبوون لەنگەری گەمی کۆبکەنەوە.

دوای ئەو ڕووداوە، ئەوجۆرەی خەڵکی کێراسۆندا باسیان کرد، سێ پیاو ماقووڵی دانیشتووی گوندەکە توانیویانە خۆیان بگەیێننە لەشکر و چاویان بە ستراتێژەکان بکەوێ. ئەوان بۆ خەڵکی کێراسۆندایان باسکردوە و پێیان

سەیر بووە کە ئێمە ویستوومانە هێرش بکەینە سەریان. بە گوتەی کێراسۆندییەکان، پاش ئەوەی ئەو سێ پیاوە دڵنیابوونە کە ئەوە پەلاماری لەشکری یۆنانی نەبووە، خۆشحاڵی خۆیان دەربڕیوە و گەرەکیان بووە بێنە ئێرە بۆلای ئێمە لە کووتیئورا. ئەوان بەمەبەستی سکاڵا کردن لەدەست ئەو چەشنە کردەوانە حەولیان داوە بگەنە لای ئێمە و داوامان لێبکەن کە بچین کوژراوەکانمان وەرگرینەوە و بەخاکیان بسپێرین.

چەندێک لە یۆنانییەکانی ڕزگاربوو لەو شەڕە کە ئێستاش لە کێراسۆندا ماونەوە، باسدەکەن کە ئەو سێ پیاو ماقووڵە بەربەرە ڕوویان لە هەر لایەک کردوە، بەردەوام بەردباران کراون و داوا لە خەڵکیتریش کراوە لێیان بدەن. لە ئاکامدا بە بەردەباران کوشتوویانن. پاش کوژرانی ئەو سێ کەسە، ئەوسا خەڵکی کێراسۆندا هاتنە لای ئێمە و ناڕەزایەتی خۆیان لەهەمبەر ئەو کردەوانە دەربڕی.

کاتێک ئێمە ستراتێژەکانی یۆنانی گوێمان لەو خەبەرانە بوو، ناڕەزایەتی خۆمان سەبارەت بەو کارە دەربڕی و لەگەڵ خەڵکی کێراسۆندا ڕاوێژمان کرد کە چۆن کوژراوەکانی یۆنانی بەخاک بسپێرین. ڕاست لەو کاتەدا کە لەگەڵ کێراسۆندییەکان بیرمان لە ڕێگا چارەیەک دەکردەوە، لەپێش ئۆردوگادا گوێمان لە هەراوهوریایەک بوو کە دەیانگوت: " لێیاندەن، بیانکوژن". لەنەکاو دیتمان جەماوەرێکی زۆر پەلاماری کێراسۆندییەکانیاندا و دەستەکانیان پڕ لە بەرد بوو و خەریکی کۆکردنەوەی خڕکە بەردان بوون. کێراسۆندییەکان لەبەرئەوەی پێشتر بە ڕووداوەکەیان زانیبوو بەڵام خەبەری بەردەبارانەکەیان پێنەگەیشتبوو، تووشی ترس و خۆفێکی فرە هاتبوون. لە ڕووی ناچاری و خۆپاراستن پەنایان بۆ گەمییەکان بردبوو. خوا شاهیدە زۆربەی پیاوانی خۆشمان لەو هێرشە ترسان. من لەو کاتەدا لێیان وەنیزیک کەوتمەوە و لێمپرسین کە چی قەوماوە و بۆوا دەکەن. لەوانە هەرچەند هێندێکیان خەبەریان لە هیچ نەبوو، لەخۆڕا بەردیان دەهاویشت. هەرچۆنێک بوو، توانیم کەسێک بدۆزمەوە کە زانیاری سەبارەت بە ڕەوتی ڕووداوەکە هەبێ، بۆی گێڕامەوە کە تەواوی ئەو شەڕە کاتێک ڕوویدا کە ئاغۆڕانۆمەکان لەگەڵ

ستراتێژەکان ناحەز جوڵابوونەوە. لەو نێوەدا خەڵک چاوی بە یەکێک لە ئاغۆرانۆمەکان بەناوی زیلارخۆ دەکەوێ کە بە هاوارهاوار بەرەو دەریا هەڵدێ. خەڵکیش کە گوێیان لە هەراوهوریای ناوبراو دەبێ وەک ئەوەی کە بەرازێک یا ئاسکەکێوییەک خۆی نیشاندابێ، سەری لەدووی دەنێن. کاتێک کێراسۆندییەکان دەبینن کە جەماوەرە بەرەو ئەوان دێن، هەستیان بە مەترسی کردوە و لەگەڵ هێندێک لە خەڵکی ئێمە ڕایانکردوە و کەوتوونەتە نێو بەحر. هەرکەسێک مەلەی نەزانیوە، خنکاوە. پێتانوایە خەڵکی کێراسۆندا دوای قەومانی ئەو ڕووداوە چیانکردوە؟ نابەجێ نەجوڵاونەوە، بەڵکوو لەوە ترساون کە لەشکری یۆنانی تووشی سوێی سەگانە هاتبێ.

ئێستا ئێوە دوای پێزانینی ئەو ڕووداوە ترسناکە، پێتانوایە لەشکری ئێمە بەو وەزعەی هەیەتی کەوتووەتە چ بارودۆخێکی نالەبار؟ ئێوە گشتتان بەو وەزعەی ئێستا نە دەتوانن دژی هیچ لایەنێکی نەیار شەڕ بکەن و نە دەتوانن بەرگریش لە خۆتان بکەن و هەرکەس بە مەیلی خۆی چۆن دڵی بخوازێ لەشکر بێروبەوێدا ڕادەکێشێ.[١٢٢] ئەگەر کەسانێکیش بیانهەوێ بۆ ئاشتی یا خواستێکی دیکە بێنە لای ئێوە، لەڕێوە لەلایەن کەسانێکی نێو ئێوەدا بە ناهەق دەکوژرێ. ئەوەش بۆوەیە مەبادا ئێوە گوێتان لە قسەی خێرخوازانە بێ. دوای ئەوەش ئەو فەرماندەرانەی ئێوە دەنگتان پێداون، کەس حیسابیان بۆ ناکا. بەڵام ئەو کەسەی خۆی وەک فەرماندە بەسەر ئێوەدا سەپاندوە، فەرمان دەدا: لێیان بدەن، لێیان بدەن. ئەو کەسە دەسەڵاتی ئەوەی هەیە کە هەم فەرماندەکان و هەمیش ئێوە بکوژێ، بەبێ ئەوەی دادگاییەک لەگۆڕێدا بێ. بۆ کەسێکی ئەوتۆ تەنیا ئەوەندە بەسە کە خەڵکانێک وەدوای بکەون و ئیتاعەتی لێبکەن هەروەک لەو ڕووداوەی پێشوودا دیتمان. ئێستا بە هەڵسەنگاندنی خۆتان لێکیبدەنەوە، لەلایەن ستراتێژەکانی خۆهەڵبژاردە چەندە ناهەقی دەرهەق بە ئێوە کراوە. هەر ئەو چاوەدێرەی بازاڕ واتە زیلارخۆس، ئەگەر سەبارەت بە ئێوە بە ناهەقیش جوڵابێتەوە، ئەوە سواری گەمی بوو و ڕایکرد

---

١٢٢- لەشکری میرییەکان بەشێوەی دیموکراتیک ئیدارە دەکرا و لە هیچ شوێنێکیش مووچەی وەرنەدەگرت. ئەوەش بە پێچەوانەی یاسا و ڕێسای لەشکری یونانی بووە.

بەبێ ئەوەی سزابدرێ. بەڵام ئەگەر بەناهەقی نەجوڵابێتەوە، دیسانیش لەدەست لەشکر دەرچوو بەبێ ئەوەی دادگایی کرابێ چونکە لەوە دەترسا بێتاوان بکوژرێ.

ئەوانەی ڕاسپاردەکانی ئاغۆرانۆمییان بەردەباران کرد، ئەو بارودۆخەیان خوڵقاند: " کە ئێمەی یۆنانی لە ناوچەی کێراسۆندا ، ئەگەر هێزێکی زۆر بۆ پاراستنمان لەگەڵ خۆمان نەگێڕین، هەست بە ئەمنییەتی خۆمان نەکەین. سەبارەت بە کوژراوەکان، واتە ئەو جەنازانەی ماوەیەک لەوە پێش قاتڵەکانیان داوایان لێکردین بچین بە خاکیان بسپێرین، ناتوانین وەک وەفدێکی خێرخواز بە خەیاڵی ئاسوودەوە بچین و بێ ئەوەی تووشی شەڕ بین تەرمەکانیان بێنینەوە. تازە کێ غیرەت دەکا ببێتە ڕاسپاردە، وەختێک دەزانێ کوژران چاوەڕوانی دەکا. هەربۆیە دوای ئەو بارودۆخە شێواوە ناچار بووین داوا لە خەڵکی کێراسۆندا بکەین کە خۆیان تەرمەکان بنێژن. ئێستا ئەگەر پێتانوایە گشت ئەو شتانەی باسم لێوەکردن دروستن، بۆچی باری یاسایی بەو وەزعە ترسناکە نادەن. ئێستا کە بارودۆخی ژیانمان بەو گەندەڵییە گەیشتووە، با هەرکەسە بەجیا و لەبەر خۆیەوە پارێزگاری لەخۆی بکا و لەوەبەدواوە هەوڵ بۆ وەدەستهێنانی پۆست و مەقامی بەرز بدا. لەلایەکیترەوە ئەگەر پێتانوایە ئەو کردەوانە هی ئاژەڵی دڕندە و کێوین نەک هی مرۆڤ، بڕیار بدەن کۆتایی بەو ئاکار و هەڵسوکەوتانە بێت. بۆخاتری خوا، لێتان دەپرسم کاتێک ئەو چەشنە بێ حورمەتییانەمان لێ ڕوودەدەن چۆن دەتوانین قوربانی پێشکەش بە خواکان بکەین، چۆن دەتوانین دژی دوژمنەکانمان شەڕ بکەین، وەختێک بەو شێوەیە خەریکی فەوتاندنی یەکترین؟ کام شار و گوند دۆستانە میوانداریمان لێدەکات و وەرمان دەگرێ، وەختێک دانیشتووەکانیان ئەو بێ نەزمییە بە لەشکرەکەمانەوە دەبینن؟ کێ بە جوامێرییەوە بێ ئەوەی بەرژەوەندی بکەوێتە مەترسییەوە ئامادەیە ئازووقە و تفاقمان پێبفرۆشێ، وەختێک لە بارودۆخێکی ئەوتۆ کەوتووین کە ئەوە ڕوخسارمانە و بۆ پڕبەهاترین شت بێ قیمەتی خۆمان دەردەخەین و ئەو گشتە هەڵانەمان لێ ڕوودەدا؟

ئایا بە خەیاڵتاندا دێ کە بتوانن باوەڕەکان بێننەوە سەر جێی خۆیان؟ پرسیار لە ئێوە دەکەم: کاتێک ئێمە مرۆڤی ئەو چەشنە مرۆڤەین، کێ دەتوانێ باوەڕمان پێبکا و حورمەتمان بگرێ؟ بۆیە لێتان دەپرسم چونکە ئێمە وەختی خۆی ئەگەر کەسێک کردەوەی لەو شێوەیەی بەئەنجام گەیاندبا، وەک ترسەنۆک و ناپیاو چاومان لێدەکرد".

دوای قسەکانی گزنفۆن گشتیان هەستانە سەرپێ و ئەو پێشنیارانەیان پەسند کرد: " ئەو کەسانەی بوونەتە هۆکاری خولقاندنی ئەو بارودۆخە ئاڵۆزە، پێویستە سزا بدرێن و لەمەو بەدوا ڕێگا بە هیچکەس نەدرێت بێ قانوونی بکا. ئەگەر کەسێک لە داهاتوودا نایاسایی بجولێتەوە، سزای تا پلەی کوشتنی بۆدیاری بکرێ ". خەڵکەکە هەروەها پێشنیاریان کرد کە تەواوی ستراتێژەکان دادگایی بکرێن، چونکە ئەگەر کەسێک لە کاتی کوژرانی کوروشەوە بەهەر چەشنێک ناهەقی بەخەرج دابێ، خێرا دەبێ دادگایی بکرێت و لە تاوانەکانی بکۆڵدرێتەوە و حوکمی لەسەر بدرێت. وەک قازی دادگا پێشنیارکرا لۆکاژەکان ئەو ئەرکە وەستۆ بگرن. هەروەها بەپێی ڕێنوێنییەکانی گزنفۆن و پێشگۆیی تاڵەبینەکان، پاکسازی لەشکر دەست پێبکرێت و تاوانباران تاوانی کردەوە ناحەزەکانیان بدەنەوە. لەکۆتاییدا ڕێوڕەسمی پاکسازی و قوربانی بۆ خواکان و چەند بۆنەیەکی دیکە بەڕێوەچوون.

## بەشی ٨

### تاوانبارکردنی گزنفۆن سەبارەت بە سزادانی سەربازەکانی لەشکر - وەڵامی گزنفۆن و بێ مانا بوونی تاوانەکان

بڕیاردرا کە ستراتیژەکان سەبارەت بە کردەوەکانیان لە ڕابردوودا دادگایی بکرێن. فیلیسیۆس و کسانتیکلیس سزای پارەی قەیاسی بیست "منۆ" (پارەی سەردەم)یان بۆ دیاریکرا. ئەو بڕە پارەیە کاتی دابەزاندنی کەرستە و باری بە غەنیمەت گیراو لە گەمییەکان کە کاتی خۆی بەدەست پۆلیکرات گیرابوون، کەمی هێنابوو. سۆفینیتۆس بە دانی دە منۆ سزادرا چونکە کاتێک وەک سەرۆک هەڵبژێردرابوو، لە بەڕێوەبردنی ئەرکەکانیدا چالاک نەجوڵابۆوە. گزنفۆن بەوە تاوانبار کرا کە لە هێندێک کەسی دابوو. ئەوەش جێگای سرنج بوو کە لە حزووری جەماوەر و بە ئاشکرا و بە شاهیدەوە سەبارەت بەو تاوانەی دادگایی کرا.

گزنفۆن هەستا سەرپێ و داوای لە یەکەم خاوەن سکاڵا کرد کە بڵێ لەکوێ و کەی لێیدراوە. کابرا لە وڵامدا گوتی: " کاتێک لە سەرمان دەمردین و بەفرێکی قورس دەباری". ئەوجار گزنفۆن وڵامی داوە و گوتی: " بەو جۆرەی باست کرد ڕاست لەو کاتەدا کە زستانێکی سارد بوو و بێ ئازووقە

مابووینەوە و شەڕاب دەست نەدەکەوت تەنانەت بۆنی پێوە بکەین و زۆربەمان لە ڕادەبەدەر ماندوو بووین و تووشی ئازار و ئەزیەت هاتبووین و دوژمن پێ‌بەپێ بە دوامانەوە بوو. دەبێ بڵێم ڕاستە من لە بارودۆخێکی ئاوا سەخت و دژواردا توونـد و شەڕانی جوڵامەوە. هەڵبەت کاتێک بیری لێدەکەمەوە، دەبوایە لەوەش بێ‌حەیاتر هەڵسوکەوتم لەگەڵ ئێوە کردبا. لەو ولاغانە خەراپتر بام کە ئەو جۆرەی دەڵێن، چەندی باریان بکەی و لییان بدەی ماندوو نابن و بێ حەیایی و جەنەگرییان زیادتر خۆی دەنوێنێ.

باشە! پێم‌بڵێ لەبەرچی لەتۆم‌دا؟ کام یەک لەو دوو داوایانم لە تۆ کرد و بە قسەت نەکردم. ئایا لەسەر مەعشووقە لەگەڵت بەشەڕ هاتم، یا مەست و سەرخۆش بووم؟".

لەبەر ئەوەی خاوەن سکاڵا وڵامی بۆ هیچکام لەو پرسیارانە پێ‌نەبوو، ئەوسا گزنفۆن لە کابرای پرسی: " ئایا تۆ چەکداری قورس بووی؟ ". خاوەن سکاڵا وڵامی داوە: " نەخێر". پاشان گزنفۆن لێی پرسی: "سووکەچەکدار بووی؟". " نا سووکە چەکداریش نەبووم بەڵکوو هاوڕێیەکانم داوایان لێکردم هێسترێک ڕاکێشم".

گزنفۆن کابرای ناسییەوە: " ئایا تۆ ئەو کەسە بووی کە سەربازێکی نەخۆشت پێبوو؟ ". خاوەن سکاڵا گوتی: "بەڵێ من بووم، قەسەم بەو خوا گەورەیە تۆ زەحمتت لێکردم ئەو سەربازە و چەک و سیلاحی هاوڕێیەکانم و باری کەوتوویان وەستۆ بگرم ".

گزنفۆن ئەوسا پێی‌گوت: " کەوتنی باری هاوڕێیەکانت بەو شێوەیە بوو. من داوام لە کەسانی دیکە کرد ئەو بارە کەوتووە هەڵگرنەوە و بیهێنن و هەروەها دەستوورم پێدان بە ڕێگایەکی‌تردا ئەو شتوومەکە بگەیێننە دەستم. پاش ئەوەی شتەکانی تۆم جیاکردەوە گشتیانم ڕادەستی خۆت کردەوە. تۆش لەداخان سەربازە نەخۆشەکەت بەسەر من داداوە. ئێستا دەخوازم گوێتان لە تەواوی ڕەوتی بەسەرهاتەکە بێ، چونکە ڕاستی و حەقیقەت بایخی ئەوەی هەیە مرۆڤ گوێی لێبگرێ.

" سەربازێک لەبەر ماندوویی و شەکەتی هیلاک ببوو و نەیدەتوانی ڕێگا بڕوا و لە دواوە مابۆوە. ئەوەندەی دەگەڕاوە سەر من، تەنیا دەمزانی کە ئینسانێکی نەخۆشە و لەگەڵ لەشکری ئێمەیە. تۆم ناچار کرد هەڵگری و ڕاستی بکەیەوە و نەهێڵی بمرێ. ئەوەشم دەزانی کە دوژمن پێبەپێی ئێمە بەدوامانەوەیە" . تەواوی ئەو قسانە لەلایەن خاوەن سکاڵاوە وەڕاستگەڕان.
گزنفۆن دیسان دەستی بە ئاخاوتن کردەوە: " من تۆم ناردە لای هێزەکانی پێشقەرەوڵ، کاتێک ئێمەی پاشقەرەوڵ گەیشتینە لاتان لەنەکاو تۆم بینی کە خەریکی گۆڕهەڵکەندن بووی. گەرەکت بوو سەربازەکە بنێژی. خێرا هاتمە لات و کارەکەتم پەسند کرد. گشت سەربازەکانیش چاویان لەو هەڵسوکەوتە بوو. سەربازەکە کە بە باوەڕی تۆ مردبوو، لەنەکاو قاچەکانی بەئەسپایی جوڵاند. ئەوانەی لەوێ بوون تێکڕا هاواریان کرد: ئەو ئینسانە هێشتا زیندووە! تۆ ئەو کاتە گوتت، ئەو سەربازە ئیتر ناتوانێ بژی، من لەوە زیادتر تاقەتی هەڵگرتنی ئەو کەلاکەم نییە.
بەڵێ ڕاست لەوکاتەدا بوو کە من لێمدای. چونکە من دڵنیا بووم کە تۆ دەتزانی ئەو سەربازە هێشتا زیندووە. ئەوە دەقی ڕەوتی ڕووداوەکەیە کە بەبێ درۆ بۆم گێڕانەوە.
خاوەن سکاڵا لە وڵامی گزنفۆندا گوتی: باشە مەگەر دواتر نەمرد؟
گزنفۆن گوتی: ئێمە کە لێرەین، ڕۆژێک گشتمان دەمرین. بە بۆچوونی تۆ دەبێ هەموومان زیندە بەچاڵ بکرێین.
دوای ئەو قسانە، تەواوی سەربازەکان هاواریان کرد کە گزنفۆن لێدانێکی ئەوتۆی لەو کابرایە نەداوە. گزنفۆن ئەوسا داوای لە سەربازەکان کرد ئەگەر کەسێکیتر هەیە و لێدانی وێکەوتووە، باسی بکا. کەس هەڵنەستا سەرپێ. گزنفۆن کە دیتی کەسی دیکە سکاڵای نییە، دەستی بە ئاخاوتن کردەوە: " پیاوەکان! من تاوانی لێدان قبوڵ دەکەم چونکە بەڕاستی کەسانێک هەبوون نەزم و نیزامی لەشکرییان نەدەپاراست. ئەگەر ئەوانە بە قسەی منیان کردبا، ڕەنگ بوو نەجاتیان هاتبا. سەربازەکانی ئێمە بۆ هەر جێگایەک ڕۆیشتبان نەزم و تەرتیباتی لەشکرییان دەپاراست. لە هەر شوێنێک پێویست بوایە

دەجەنگین. بەلام ئەوانە بە پێچەوانەوە هەڵسووکەوتیان دەکرد و نیزامی لەشکرییان بەلاوە گرینگ نەبوو و تەنیا بە مەبەستی تالان و دزی ڕەگەڵمان کەوتبوون. خۆیان لە ئێوە پێ زیادتر بوو و بەردەوام کاری نایاساییان ئەنجام دەدا. دڵنیابن ئەگەر ئێمەش گشتمان بەو شێوەیە هەڵسوکەوتمان کردبا، تووشی تێداچوون دەهاتین.

بەڵێ هەر کەس سستی نواندوە و نەجوڵاوەتەوە و لەبەر ماندوویی حازر بە ڕۆیشتن نەبووە و بوونی ئێمە و خۆی لە مەترسی هاویشتووە، من ئەو کەسەم بە زەبری لێدان ناچار بە جوڵە کردوە. خۆیشم، کاتێک سەربازەکان خەریکی پێچانەوە و بارکردنی کەلوپەلی لەشکر دەبوون و هەوای سارد و بەستەڵەک بوو، ناچار دەبووم ماوەیەکی زۆر هیچ چەشنە جموجۆڵێکم نەبێ و سەرما ئازاری دەدام و خێرا دەستم بە جوڵانەوە و حەرەکەتی قاچەکانم دەکرد. لەبەر ئەوەی خۆم باش دەناسم، هەرکەسێکم دەدیت کە دادەنیشت و تەوەزەلی ڕەچاو دەکرد، بە زۆری ناچار بە ڕۆیشتن و پیاسەم دەکرد. ئێوە دەزانن کە حەرەکەت و جوڵە، گەرمی بە لەش دەبەخشن و دەبنە هۆی زیندوویی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ. کاتێک یەکێک بەتەنیا و بێدەنگ دادەنیشت، پێموابوو کە هێزی سروشتی گەڕانی خوێنی لەدەستداوە و ئێوەش هەستتان پێکردوە کە ژانی پەنجەکانی دەست و پێ چەندە ناخۆشە. دواکەوتنی هەر سەربازێک لەبەر تەمبەڵی دەبووە گرفتێک بۆ پێشوە چوونی ئێوە و بە تایبەتی ئێمەمانان کە لە دواوە دەهاتین. بۆیە من ناچار بووم بە کوڵەمستە تێیکوتم بۆوەی دواتر نەکەوێتە بەر پەلاماری دوژمن.

ئێستا باشتر وایە ڕێگا بدرێ بەو کەسانەی زەختم لێکردون، ئەگەر لەلایەن منەوە زەرەدێکیان پێگەیشتووە یا ناهەقییەکیان لێکراوە، هۆکاری کردەوەکانم بپرسن تا بۆیان ڕوونبکەمەوە. ئەگەر توند و تیژی من دەرهەق بەو کەسانە لەوەش زیادتر لە دڵمدا بوایە و دەرمنەخستبا و دوژمن یەخسیری کردبان، ئایا ئەو کاتە بە هیچکام لە ئارەزوویەکانیان دەگەیشتن! دەلیلەکانی من، گزنفۆن گوتی، زۆر ڕوون و ئاشکران. ئەگەر کەسێکم سەبارەت بە قازانجی خۆی سزا دابی، دەبێ منیش وەک دایک و باوک

بۆخاتری مناڵەکانیان یا ماموستا بۆخاتری قوتابیان، سزابدەن. پزیشکەکانیش تەنانەت زۆرجار ناچارن ئەندامێک لە لەشی مرۆڤ ببڕنەوە تەنیا بۆوەی خزمەتێکیان بە سلامەتی نەخۆشەکەیان کردبێ.

هەڵبەت ئەگەر لەو باوەڕەدان گشت ئەو کارانەم تەنیا بۆ بێ حورمەتی کردنی ئێوە کردوە، بەهەڵە چوونە. لەبیرتان نەچێ کە من ئێستا بە یارمەتی خواکان خاوەن غیرەتێکی پتر لەو کاتەم و دەتوانم شەڕابی زیادتریش بنۆشم، ئەی بۆ لە کەسیش نادەم. ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە ئێستا گشتتان بە سلامەتی لەو بەندەرە دەبینم و ئەمنییەتی تەواوتان هەیە و بێمزەڕەت گەیشتوونەتە ئێرە. دیارە ئەگەر زستان سەخت بێ و دەریا تۆفانی، گرفتێکی بچووکی نێوان گەمیوان و باقی کارگێڕانی گەمی دەبێتە هۆی ئەوە کە گەمیوان بچێتە پێشەوەی گەمی و سوکانداریش سوکان جێهێڵێ و بچێتە دواوەی گەمی. لە کەش و هەوایەکی ئەوتۆدا، کۆمەڵێک هەڵەی بچووک دەبنە هۆی فەوتانی گشت خەڵکەکە.

ئێوە بە هەڵوێستەکانتان پەسندی بەرهەق بوونی هەڵسوکەوتی منتان کرد. کاتی لێدانی ئەو کەسانە ئێوە لەلام بوون و لەجیاتی بیرکردنەوەیەکی سانا، شمشێرتان بەدەستەوە بوو. ئەگەر گەرەکتان بوایە، بەهاسانی دەتانتوانی لە فریای ئەو کەسانە بکەون. ئێستا بە خواوەند دیا سوێندتان دەدەم ڕاستیم پێبڵێن، گەر کەسێک تەرکی پۆست و مەقامی خۆی کردبا و ئێوەش لە سزادانی خۆتان پاراستبا و یارمەتی منیشتان نەدابا، مانای چدەبوو! بەبڕوای من ئێوە هەقتان بە ئاژاوەگێڕەکان داوە کە بە مەیلی خۆیان هەڵسووکەوتی شەڕانی بکەن و بێ سزادران بجوڵێنەوە. بۆیەش ئەوە دەڵێم، چونکە ئەگەر تۆزێک بە سرنجەوە لایەنی باشی گرفتەکانتان هەڵسەنگاندبا، لێتان ڕوون دەبۆوە کە ئەوانە پێشتر خەراپەکار بوون و تاکوو ئێمڕۆش بەو چەشنە دەمانەوە. با نموونەیەکی بچووکتان بۆ باس بکەم. بیسکۆس تێسالی، پیاوێکی بەغیرەت و ئازا ئەوکاتە خۆی لە نەخۆشیدا و حەولێکی فرەیدا قەڵغان هەڵنەگرێ. ئێستا زانیاریم هەیە کە ناوبراو خەڵکێکی زۆری دەڤەری کووتیئوری ڕووتکردوە و گشت دەستکەوتەکانی لە کۆڵی خۆی ناوە. باشە

ئەگەر تۆزێک ماقوڵ بیری لێبکەینەوە، نابێ هەڵسوکەوتێکی ئەوتۆ لەگەڵ ناوبراو بکەین کە مرۆڤ دەرهەق بە سەگی دەکات. تەنیا بەو جیاوازییەی کە سەگ ڕۆژێ دەبەسترێتەوە و شەوێ بەرەڵا دەکرێ، بەڵام سەبارەت بە بیسکۆس پێویستە شەوێ ببەسترێتەوە و ڕۆژێ بەڕەڵا بکرێت ".

گزنفۆن لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: " من ئێستا لەوە سەرم سوڕ ماوە کە ئێوە لەبیرتانە چەندە بە خەراپی لەگەڵتان جوڵاومەوە و بێدەنگی لێناکەن. بەڵام ئەگەر لە سەرمای سەختی زستاندا خێرا لە فریای هەرکام لە ئێوە کەوتم یا بۆخاتری سلامەتی ئێوە ناچار بە شەڕکردن لەگەڵ دوژمن بووم و هەرکە نەخۆش و بێهێزێکم بەرچاو دەکەوت، خێرا بۆرە یارمەتییەکم بۆ ئامادە دەکرد، بۆ هیچتان لەبیر نەماوە؟ با لەوە گەڕێین، هەق وایە مرۆڤ زیادتر کرداری باشی لەبیر بێ نەک تەنیا ڕەفتاری خەراپ ".

دوای ئەو قسانەی گزنفۆن، گەلێک سرووشتی بوو گشت لایەک هەستنە سەرپێ. چونکە کردەوەکانی ناوبراویان هاتەوە یاد. ئاکامی تەواوی ئەو باسانە ئەوە بوو کە ڕەوتی ڕووداوەکان ڕاست بەو شێوەیە بوون کە ناوبراو باسی لێکردن.

# کتێبی شەشەم

## بەشی ١

### پەیمان بەستن لەگەڵ خەڵکی پاڤلاغۆنی - سەما و هەڵپەڕکێی سەماکاران - ڕۆیشتن لە کووتیئۆرا - چوونە نێو هەرێمی هارمێن - دیاریکردنی گزنفۆن وەک سەرکردەی لەشکر - ڕەتکردنەوەی ئەو داوایە لەلایەن گزنفۆن و دیاریکردنی خیریسۆفۆس

لەو ماوەیەدا کە یۆنانییەکان لە کووتیئۆرا مانەوە، ژمارەیەکیان ئازوخەیان لە بازاڕ دەکڕی و باقی قۆشەنیش لە ڕێگای تاڵانکردنی ناوچەی پاڤلاغۆنی خۆیان دابین دەکرد. خەڵکی پاڤلاغۆنیش بە نۆرەی خۆیان یۆنانییەکانی پەرشوبڵاویان ڕووتدەکرد، بەتایبەت ئەوانەی دوور لە ئۆردوگا خێمەیان لێدابوو بەردەوام دەکەوتنە بەر پەلامار و ئازاردانی پاڤلاغۆنییەکان. لە ئاکامدا دوژمنایەتییەکی گەورە لەنێوان هەردوو لایەندا ساز ببوو.

کۆریلاس، ئەوکاتە حاکمی هەرێمی پاڤلاغۆنی بوو. ناوبراو چەند کەس سوارەی ڕاسپاردە لای یۆنانییەکان. ئەوانە جلوبەرگی ڕازاوەیان لەبەر خۆیان کردبوو. ئەو وەفدە بۆیە بەڕێکرابوون تا بە یۆنانییەکان بڵێن کە کۆریلاس بڕیاری داوە نە ئازاری بۆ کەس هەبێ و نە دەخوازێ یۆنانییەکانیش زیانی پێبگەیێنن.

ستراتێژەکان لە وڵامی ڕاسپاردەکاندا گوتیان کە پێویستە لەگەڵ سەربازەکانیان ڕاوێژ بکەن. هاوکات میوانداریيەکی بەجێشیان بۆ وەفدی پاڤلاغۆنی ڕێکخست. لەو میوانداریيەدا هێندێک لە یۆنانییەکانی ڕیزدار و بەرهەقیش بانگهێشت کران. دوای قوربانی کردنی چەند سەر ئاژەڵی جۆراوجۆر بۆ خواکان، ئەوسا مێزێکی پڕ لە خواردەمەنییان ڕازاندەوە و کورسیلەی ڕاحەتیان دامەزراندن و دەست بە خواردن و نۆشین کرا. بۆ خواردنەوەی شەڕاب کەڵکیان لەو پەرداخانە وەرگرت کە لە شاخی کەڵ دروستکرابوون و لەو ناوچەیە بە فراوانی دەستدەکەوتن.

دوای تەواوبوونی ڕێوڕەسمی دوعا و پاڕانەوە ئەوجار سرودی ئایینی بۆ خواوەند ئاپۆلۆن خوێندرایەوە. پاشان تراکییەکان هەستانە سەرپێ و سەما و هەڵپەڕکێی بە چەکەوەیان دەستپێکرد و خەڵکیتریش وێڕای ئەوان بەشداری گۆوەندەکە بوو. تراکییەکان خەنجەریان بەدەستەوە بوو و خۆیان هەڵداویشت و ئارام و هێدی هەڵدەپەڕین. لەکاتی هەڵپەرکێدا، شانۆی شەڕە خەنجەر پیشاندرا، بەچەشنێک کە یەکیان لەوەیتری دەدا و لەو نێوەدا کەسێکیان وەک بریندارێکی قورس دەکەوتە سەر عەرز. کەسی دووهەم بە سەماکردن چەکوچۆڵی بریندارەکەی کۆدەکردەوە و بریندارەکەش خۆی لە مردن دەدا. پاڵەوانی سەرکەوتوو بە چەکەکانەوە لە کابرای کوژراو دوور دەکەوتەوە و گۆرانییەکی قارەمانانەی بە زاراوەی تراکی دەچڕی. لەو گۆرانییەدا بە شاژنی تراکی واتە "سیتالکاس" هەڵدەگوترا و هەر بەو ناوەش بوو. لەو نێوەدا کەسانیتر جەنازەی بەحیساب کوژراویان لە مەیدان ڕادەکێشایە دەرەوە.

لە درێژەی مەراسیمەکەدا، ئەوجار ئینییەکان و ماغنییەکان هەستانە سەرپێ و دەستیان بە هەڵپەڕکێ کرد. ئەوانیش بە چەکەوە سەمایان دەکرد و

ناوی هەڵپەڕکێیەکەش کارپیئا و بەو شێوەیە بەڕێوە دەچوو: یەکێک لە دوو کەسی سەماکەر، چەکەکەی لە شوێنێکی نیزیکی خۆی دادەنا، لاسایی جووتیارێکی دەکردەوە و بە جووتێک کەڵ خەریکی کێڵانی زەوی دەبوو. بەردەوام ئاوڕی لە پشتەوە دەداوە و وای نیشان دەدا کە لە هاتنی چەتە و ڕێگر دەترسێ. ئەو چەتەیە لەکۆتاییدا وەدیار کەوت. کابرای جووتێر لە دوورەوە چەتەی بینێ، خێرا پەلاماری چەکەکەی خۆیدا و لە پێش کەڵەکان لەگەڵ دژبەرەکەی دەستیان بە شەڕکرد. هەردوکیان وەک ئەو سەماکەرانەی کە پێشتر باسمان لێوە کردن بە ئاهەنگ و ڕیتمەوە و بە دەنگی خۆشخوانێکیتر هەڵسوکەوتی جەنگییان نیشان دا. لە ئاکامدا کابرای چەتە، وەرزێرەکەی شکستدا. لاق و دەستی بەست و جووتە کەڵەکەی لێدەدزی و وەپێش خۆیدان. جاروبار هەڵدەکەوت کە ڕەوتی ئەو شانۆیە بە پێچەوانەوە بێ. واتە جووتیارەکە سەرکەوێ و چەتەکە ببەزێنێ و لە پشتەوەڕا دەستەکانی ببەستێ و لە تەنیشت کەڵەکان لە نیری جووتی ببەستێتەوە و درێژە بە کێڵانی زەوییەکەی بدا.

پاش ئەو شانۆیە ئەوسا یەکێکی خەڵکی میسیا هاتە مەیدان و دوو مەتاڵی سووکی چنداو و لە پێستی بزن وەرگیراوی پێبوو و دەستی بە سەما کرد. ئەوەیان لاسایی شەڕ لەگەڵ دوو کەس لە دژبەرەکانی خۆی دەکردەوە. بەردەوام سەمای دەکرد و هەڵدەپەڕی. لەگەڵ هەردوو حەریف شەڕی بوو. هێندێکجار تەنیا بە مەتاڵێکەوە دەجەنگی، وەختیتریش بە خیرایی وەردەسوڕایەوە و بەرگری لەخۆی دەکرد. هاوکات لەگەڵ ئەو کردەوانە خۆی هەڵداویشت و سەرمەقولاتی لێدەدا و هەردوو مەتاڵەکەی بەدەستەکانییەوە مەحکەم ڕادەگرت. لەسەریەک نەزم و هارمۆنییەک لە گشت جوڵەکانیدا بەدیدەکرا. لە کۆتاییدا سەمای فارسی دەکرد و مەتاڵەکانی لێکدەدا و چۆکی دادەدا و هەڵدەستایە سەرپێ و ئەو حەرەکەتانەش گشتیان بە دەنگی مۆسیقاوە بەڕێوە دەچوون.

لەکاتی بەڕێوەچوونی ئەو مەراسیمەدا، لەنەکاو ماندینییەکان هاتنە نێو گۆڕەپان. جەماوەرێکیش لە ئارکادییەکان هەستانە سەرپێ. بە چەکوچۆڵی

تەواو ڕێکوپێکەوە و بە ئاهەنگ و مۆسیقا دەستیان بە سەمای چەکدارانە کرد. بەدەم مۆسیقاوە هەڵدەپەڕین و وەک مەراسیمی ئایینی چوونەژوورەوەی نێو مەعبەدەکان دەچوو. پاڤلاغۆنییەکان بە دیتنی گشت ئەو دیمەنانەی، وەک سەمای بە چەکەوە و نەزم و تەرتیباتێکی هەیانبوو، سەریانسوڕمابوو. کاتێک میسۆس چاوی بە پاڤلاغۆنییەکان کەوت کە هەیەجان دایگرتوون، یەکێک لە ئارکادییەکانی ڕازی کرد ژنە سەماکەری خۆی ئیزن بدا هونەرێک بنوێنێ. کابرای ئارکادی دەستی ژنەکەی گرت و بردییە پێش بینەرانی بەشدار. ژنەی بە جوانی ڕازاندبۆوە و دوو مەتاڵی بچووکیشی دابووە دەستی. ژنەی سەماکەر بە چەشنێکی سووک و چالاکانە سەمایەکی کرد کە پێی دەگوترا پیریخییۆ. لە کاتی سەمادا بوو بە هەراوهوریا. پاڤلاغۆنییەکان دەنگی نارەزایەتییان دەربڕی. پرسیاریان ئەوە بوو کە چۆن ژنیش لەگەڵ ئەوان شەڕی کردوە و پێیان کەمایەسی و بێحورمەتی بوو. یۆنانییەکان بە پێکەنینەوە وەڵامیان دانەوە کە هەر ئەو ژنانە بوون پاشایان لە ئۆردوگای یۆنانی دەرپەڕاند. ئەو شەوە لەسەریەک بەو شێوەیە دەرباز بوو.

پاش ئەو ڕۆژە، سبەینەکەی بڕیاردرا نە سەربازەکانی یۆنانی و نە چەکدارەکانی پاڤلاغۆنی سزا نەدرێن. دوای ئەو دیدارە وەفدی پاڤلاغۆنی گەڕاوە و یۆنانییەکانیش پاش وەرگرتنی ژمارەیەکی زۆر گەمی، سوار بوون و شەو و ڕۆژێک بە یارمەتی بای لەبار بەلای چەپی وڵاتی پاڤلاغۆنیدا ڕێگای بەحریان گرتەبەر. ڕۆژی دوایی گەیشتنە سینۆپی و لە بەندەری ئارمینی لەنگەریان گرت. سینۆپییەکان لە وڵاتی پاڤلاغۆنی دەژیان، بەڵام کۆلۆنی میلیسییەکان بوون. ئەوان قەیاسی سێ هەزار میدیمنۆ ئاردی جۆ و هەزار و پێنسەت کوپەی شەڕابیان وەک دیاری بۆ یۆنانییەکان نارد. ڕاست لەو کاتەدا خیریسۆفۆسیش گەیشتەوە لایان و دیارییەکی گەلێک بەوەجی لەگەڵ خۆی هێنابوو. ناوبراو هەرچەند هیچ شتێکی ئەوتۆی دەست نەکەوتبوو، بەوحاڵەش توانیبووی فەرماندەی ناوگانی گەمییەکان بەناوی ئاناکسیڤیۆس و چەند کەسێکیتر ڕازی بکا دوای دەرکەوتنی لەشکری یۆنانی لە پۆندۆ، مووچەی

گشت سەربازان بدەن. هێزە یۆنانییەکان پێنج ڕۆژ لە ئارمینی مانەوە. لەبەر ئەوەی بەو قەناعەتە گەیشتن کە ئەوجار لە یۆنان نیزیک بوونەتەوە، بیریان لەوە کردەوە کە بە چ شێوەیەک دیاری و خەڵات بۆ کاتی گەیشتنەوەیان ئامادە بکەن. وایان بە مەسڵەحەت زانی کە بۆ ئەو کارەیان سەرکردەیەک هەڵبژێرن. پێیانوابوو لەجیاتی چەند کەس، ئەگەر تەنیا یەک کەس ئەو ئەرکە وەستۆ بگرێ باشترە. لەبەر ئەوەی دەیانزانی ئەگەر تەنیا یەک کەس بێ، هەڵسوڕانی لەشکر بە شەو و ڕۆژ ڕێکوپێکتر دەبێ. ئەگەر پێویست بە شتێک بێ، ئەو کەسە دەتوانێ بە نهێنیش بیکا. دیارە لەڕووی ناچاری تووشی خەیانەت بێ، ئاساییە کە خێرا و بێ سێ و دوو لێکردن دەیکات. چونکە پێویست ناکا گفتوگۆی لەسەر بکا. بە پێچەوانەی هەڵسووکەوتەکانی پێشوو کە ستراتێژەکان ناچار بوون بۆ هەر بابەتێک ڕاوێژ لەگەڵ لەشکر بکەن، ئەو کەسە ئیتر بۆ هەر بڕیاردانێک سەربەستە.

سەربازەکانی یۆنانی پاش ئەوەی لەسەر بڕیارێکی ئەوتۆ ساغ بوونەوە، یەکڕاست چوونە لای گزنفۆن. لۆکاژەکان چوونە پێشەوە و باسی ئەو مەسڵەحەتەی سەربازەکانیان لای ناوبراو کرد. هەرکەس لەبەر خۆیەوە تێدەکۆشا بە نەرم و نیانی گزنفۆن ڕازی بە وەرگرتنی ئەو ئەرکە بکا بۆوەی لەشکر وەستۆ بگرێ. ڕەزامەندییەکی فرە بە ڕوخساری گزنفۆنەوە دیاربوو. پێیوابوو شانازییەکی گەورەیە و پلە و پایەیەکی بەرزی پێدراوە و لەو ڕێگایەوە لای دۆستان و خەڵکی شارەکانی وڵاتەکەی ناوبانگ دەردەکا و قۆشەنی ژێر فەرمانیشی خزمەتێکی تازەی پێدەکات، بەڵام بەو حاڵەش قبوڵی نەکرد.

کاتێک لە دڵەڕاوکێدا بوو و نەیدەزانی چۆن وڵامی ئەو داواکارییە بداتەوە، بەو ئاکامە گەیشت کە باشترین ڕێگا بۆ جوابی ئەو خواستەی لەشکر پرس بە خواکان بکا. دەستووریدا دوو ئاژەڵی لەباری بۆ بێنن بۆوەی بیانکاتە قوربانی. قوربانییەکەی پێشکەشی خواوەند دیا کرد. ئەوەش لەسەر پێشنیاری تاڵەبینی مەعبەدی دێلف بوو کە بۆ پرسی ئەوتۆ، گونجاوتر بوو.

هەڵبەت بەر لەوەش پێشنیار بە گزنفۆن کرابوو کە لەگەڵ کەسانیتر فەرماندەری لەشکر وەستۆ بگرێ و ئەویش بەنۆرەی خۆی لە خەمی چارەنووسی هێزە یۆنانییەکاندا بێ. ئەوکاتیش خەونی بینیبوو. لەو باوەڕەدا بوو کە ئەو سەردەمیش ئەو خوایەی خەونی پێوە دیبوو، خواوەند دیا بوو. گزنفۆن کاتێک لە دەڤەری "ئێفێسۆ"ڕا وەڕێکەوت بۆوەی ڕەگەڵ لەشکری کوروش کەوێ، هەڵۆیەک کە لەلای ڕاستی ئەو بە بێدەنگی نیشتبوو لە شەقەی باڵانی دا. تاڵەبینی هاوڕێی گزنفۆن ڕووی لە ناوبراو کرد و پێیگوت کە فڕینی ئەو هەڵۆیە بۆ ئەو پەیامێکیی بەنرخ و پڕ لە گەورەییە. لێکدانەوەکەی ئەوەیە کە گزنفۆن لە داهاتوودا تووشی چەرمەسەری و کوێرەوەری دبێ. هەڵۆش بە نۆرەی خۆی کاتێک دەنیشێ لەلایەن باڵندەی گۆشتخۆرەوە دەکەوێتە بەر پەلامار، هەر چەند ناتوانن هیچ بەڵایەکی بەسەر بێنن. هەڵۆ بە دانیشتنەوە ڕاوی بۆ ناکرێ، دەبێ بەرز بفڕێ تا بتوانێ بژیوی دەست کەوێ.

بەو شێوەیە قوربانی پێشکەش بە خواکان کرد و گوێی لە پەند و ئامۆژگارییەکانی راگرت. پێیگوترا بەرپرسیارییەتی زیادتر لەوەی هەیەتی وەرنەگرێ و کاتێک داواشی لێبکەن قبوڵی ئەو ئەرکە نەکا. بە خواستی خواکان ئەو گرفتەش چارەسەر بوو.

لەشکر کۆبۆوە. گشتیان لەو باوەڕەدا بوون کە تەنیا یەک کەس سەرکردایەتییان بکا و ئەویش گزنفۆن بێ. هەرچەند بەتەواوی ڕوونبۆوە کە دەنگی متمانە بە ناوبراو دەدرێ، ئەو هەستا سەرپێ و دەستی بە ئاخاوتن کرد: " پیاوەکان! من وەک هەر مرۆڤێکی خاوەن ئەخلاقی بەهێز و لاواز گەلێک شادم کە ئێوە شانازییەکی ئەوتۆم پێدەبخشن و لەوبارەوە سپاستان دەکەم. لەگەڵ ئەوەشدا داوا لە خواکان دەکەم کە پەسندم بکەن کە خزمەتی زیادتر و بە نرختر بە ئێوە بکەم. ئەوەی کە ئێوە ڕێزتان بۆ من داناوە و لەنێو ڕیزەکانتاندا کەسێکی لاکێدیمۆنیتان هەڵبژاردوە بۆوەی سەرۆکایەتی گشتی ئێوە بکا، پێموانییە ئەگەر ئەو داوایەتان لە خواکان کردبا، بەدڵی ئێوەیان کردبا. چونکە هەڵبژاردنی من بەمانای دەرباز بوون لە مەترسی و

قەیرانەکان نییە و چارەسەری گرفتەکان ناکا. من لەبیرمە کە بەرلەوەی ئاتێنییەکان ناچاربن بە ئاشکرا سەرکردایەتی وڵاتی یۆنان بەدەست لاکیدێمۆنییەکان قبوڵبکەن، خواکانیش دەستیان لە دوژمنایەتی ئاتێنییەکان هەڵنەدەگرت. کاتێک ئاتێنییەکان ڕێبەری لاکیدێمۆنییەکانیان پەسندکرد، خواکانیش هێوربوونەوە و دژایەتییان وەلانا و لەوە زیادتر زەختیان لە شاری ئاتێن نەکرد و پەیمانی ئاگربەسیان لەژێرپێ نەنا. بەهەرحاڵ بیرم لەو ڕووداوە دەکردەوە. لە فکری ئەوەدا بووم ئەگەر ڕۆژێک فەرمانی ئەو خوایانە بەجێنەگەیێنم خێرا تووشی سزا دێم.

سەبارەت بەو بڕیارەی بیرتان لێکردوەتەوە، واتە تەنیا یەک کەس وەک ڕێبەر هەڵبژێرن و گرفتی کەمتر بۆ لەشکر دەخوڵقێ، دەبێ ئەوە لەبەرچاو بگرن ئەگەر هەر کەسێکی دیکە وەک سەرۆک هەڵبژێرن، من هیچ چەشنە دژایەتییەکی ناکەم. چونکە لەو باوەڕەدام لەکاتی شەڕ هەر کەسێک دژایەتی فەرماندەکەی بکا، وەک ئەوەیە کە دژی ڕزگاری خۆی جوڵاوەتەوە. هەڵبەت ئەگەر من هەڵبژێرن، پاش فەترەیەکی کورت بەچاوی خۆتان دەبینن کە خەڵکانێک بەتەواوەتی دژایەتی من و ئێوە دەکەن و ئەوەش بەلامەوە شتێکی سەیر نییە ".

پاش ئەو قسانە، جەماوەرێکی زۆر هەستانە سەرپێ و داوایان کرد کە دەبێ تەنیا و تەنیا گزنفۆن، نەک کەسێکی دیکە ئەرکی سەرۆکایەتی وەستۆ بگرێ. ئاغاسیاس ستێمفالی لەو نێوەدا دەستی بە قسان کرد و گوتی: " ئەگەر شتێکی ئەوتۆ بقەومێ، تەنیا بۆ پێکەنین دەبێ". ناوبراو درێژەی بە قسەکانیدا: " هەڵبەت لاکیدێمۆنییەکانیش بە کارێکی ئەوتۆ قەڵس دەبن کاتێک بەشداری میوانداریی شەو بن و کەسێکی جیا لە خۆیان وەک سەرۆک هەڵبژێرن. هەرچۆنێک بێ، ئەگەر ڕەوتی کارەکان بەو شێوەیە بچنە پێش، ئەوکات دەبێ بەپێی لەبەرچاوگرتنی ئەو عەقڵییەتە ئێمەش مافی بەڕێوەبردنی ئەرکی لۆکاژیمان نەبێ چونکە خەڵکی ئارکادیین".

پاش ئەو قسانەی ئاغاسیاس، لەشکر دەنگی ناڕەزایەتی خۆیان لەهەمبەر گوتەکانی ناوبراو دەربڕی. لەو کاتەدا گزنفۆن وەبیری هاتەوە کە لەنێو قسەکانیدا بابەتێکی گرینگی لەبیر کردوە باسی لێوە بکا و بۆیە دووبارە

چووه نێوەڕاستی سەربازەکانی دانیشتوو و دەستی بە ئاخاوتن کردەوە: " پیاوەکان! هەڵبەت بۆوەی ئێوە دڵنیا بکەم و منیش مەبەستی خۆم باشتر پێکابێ، بەناوی گشت خواکان سوێند دەخۆم کە ڕاستییەکەتان پێبڵێم. من کاتێک ئاگاداری مەبەستی ئێوە کرام، خێرا پرسم بە خواکان کرد کە ئەگەر ئەو ئەرکە وەستۆ بگرم، خێری بۆ ئێوە و من چدەبێ. خواکان لە کاتی قوربانی کردندا ڕاشکاوانە تێیان‌گەیاندم کە پێویستە بەهەر شێوەیەک و هەر ڕێگایەک کە دەگوونجێ خۆم لە قبوڵی سەرکردایەتی لەشکر بپارێزم".

دوای قسەکانی گزنفۆن، لە ئاکامدا خیریسۆفۆس وەک سەرکردە هەڵبژێردرا. ناوبراو خێرا ئەرکی سەرکردایەتی وەستۆ گرت. خۆی بە سەربازەکانی لەشکر ناساند و گوتی: " پیاوەکان، من هیچکات بەوە تەنگاو نیم ئەگەر ئێوە لەجیاتی من کەسێکی‌تر دیاری بکەن. ئێستا کە گزنفۆن‌تان دیاری نەکردوە، خزمەتتان پێکردوە. هێشتا هیچ نەقەوماوە، دێکسیپۆس لەلای ئەناکسیڤیۆس ئەوەندەی لە دەستی هاتووە بوختان و درۆی دژی ئەو هەڵبەستووە. سەرەڕای داواکاری من کە ئەو کارە نەکا و لەو چەشنە بوختانانە خۆی بپارێزێ، بەو حاڵەش ناوبراو گوتوویەتی کە گزنفۆن زۆری گەرەک بووە ببێتە سەرکردەی لەشکر و کلێئارخۆس و تیماسیۆن‌یش لەگەڵی بن. ئەو هەروەها گوتوویەتی کە تیماسیۆن هەرچەند خەڵکی داردانی‌ئایە، دیسانیش گزنفۆن ئەوی لە دێکسیپۆسی لاکۆنی بەلاوە باشتر بووە.

خیریسۆفۆس لە درێژەدا گوتی: " ئێستا کە منتان وەک سەرکردە هەڵبژارد، هەوڵدەدەم کە ئەوەندەی بتوانم خزمەتتان پێبکەم. لە ئێستاوەڕا دەتوانن خۆتان ئامادە بکەن کە سبەینێ بەیانی زوو وەڕێکەوین. هەڵبەت ئەگەر وەزعی کەشوهەوا لەبار بێ، دەبێ بەرەو ئیراکلیا وەڕێبکەوین و گشتمان پێویستە لە بەندەر کۆببینەوە. سەبارەت بە باقی کارەکانیش، کاتێک گەیشتینە ئیراکلیا بیرێکیان لێ دەکەینەوە ".

## بەشی ٢

### وەرێکەوتنی یۆنانییەکان - گەیشتنە ناوچەی ئیراکلیا - تەواوبوونی سەرکردایەتی خیریسۆفۆس - دەسەڵاتداری نوێی گزنفۆن - دابەشبوونی لەشکر بەسەر سێ دەستەدا

ڕۆژی دوایی لە شاری سینۆپیڕا بە یارمەتی بای سازگار، هاوسووی کەنارئاوەکان دوو ڕۆژ ڕێگای بەحریان پێوا. لە کاتی گەمیئاژۆتندا چاویان بە ڕۆخەکانی یاسۆنا کەوت. وەک دەگوترا گەمی ئارغۆس لەو شوێنە نووقمی ئاو ببوو و شوێنی تێکەڵبوونەوەی چەند چۆمی وەک تێرمۆدۆندا و بەدوای ئەودا ڕووبارەکانی ئیریۆس و ئالیئۆس و دوایین چۆمیش پارتێنییۆ بوو. پاش تێپەڕین بەو تەنگەبەرایيەدا گەیشتنە شاری ئیراکلیا. شارێکی یۆنانی و پڕ لە موهاجیرەکانی مێغاری. ئەو شارە لە وڵاتی ماریاندینۆ[١٢٤]هەڵکەوتبوو. لە نیزیک نیمچە دورگەی ئاخیرۆسیادا واتە لەو

---

١٢٣- گەلێکی تراکی کە لە نیزیک ئیراکلیا و لە ڕوخەکانی دەریای ڕەش نیشتەجێ و کۆلۆنی ئەو شارە بوونە. هێندێک لە شارەزایان لەو باوەڕەدان کە ئەوانە (ماریاندین)ی بوونە و بەشێکیش دەیانگەڕێننەوە بۆسەر پافلاغۆنییەکان.

شوێنەی دەگوترا ئیراکلیس لە ئاسمان دابەزیوەتە خوارەوە سەر عەرز بۆوەی شەڕی کێرفێرۆ(کێرفێرۆ یا سێرفێرۆ، سەگێکی سێ سەری نێو ڕەوایەتەکانی یۆنانییە) بکا، لەنگەریان گرت. لەو شوێنە ئیمڕۆش کەندالێکی ئێجگار قووڵ بەرچاو دەکەوێ و وەک نوختەی هاتنە خواری ئیراکلی دەچێ. قووڵایی ئەو کەندەلانە زیادتر لە دوو ستادیۆ دەبێ. دانیشتووانی ئیراکلی لەو جێگایە میوانداریان لە یۆنانییەکان کرد و وەک دیاری قەیاسی سێ هەزار مێدیمنۆ ئاردی جۆ و دوو هەزار کووپەی شەڕاب و بیست جوانەگا و سەت سەر مەڕیان نارد. لە شاری ئیراکلیا چۆمی لیکۆس بەنێو دۆڵەکەدا دەرباز دەبوو کە خاوەن بەرینایی دوو پلێترا بوو.

سەربازەکان پاش کۆبوونەوەیان بیریان لەوە کردەوە کە لە دەڤەری (پۆندۆ)ڕا چۆن دەکرێ بە باشترین شێوە پاشماوەی ڕێگا بپێون، واتە بە ڕێگای ویشکایی یا بەحردا بڕۆن. لەو کاتەدا لیکۆنی ئاخایی هەستا سەرپێ و گوتی: " من و جەنگاوەرەکانم سەبارەت بە هەڵوێستی ستراتێژەکان تووشی سەرسوڕمان هاتووین. ئەوان هیچ حەولێک بۆ دابینکردنی ئازووقەی ڕۆژانەی لەشکر نادەن. چونکە ئەو دیارییەی ئیراکلییەکان بۆیان ناردوین تەنیا بەشی خواردنی سێ ڕۆژی لەشکرەکەمان دەکا. لەو شوێنانەی کە تا ئێستا حەولمان داوە ئازووقەی لێدابین بکەین، بۆمان مسۆگەر نەبووە. بە باوەڕی من دەبێ داوا لە خەڵکی ئیراکلی بکەین یارمەتی ئازووقەیان کەمتر لە سێ هەزار کیزکین نەبێ. لەو نێوەدا یەکێک قسەکەی بە ناوبراو بڕی و گوتی نابێ لە دە هەزار کیزکین کەمتر بێ. ئێستا پێویستە وەڤدێک دیاری بکەین و بینێرینە لایان و خۆمان چاوەڕوانی وڵامی ئەوان بین و دوای وەرگرتنەوەی وڵامیان، ئەوسا یەکدەنگ بڕیاری گونجاو بدەین.

دوای ئەو قسانە، لەپێشدا خیریسۆفۆس لەلایەن جەماوەرێکەوە وەک سەرۆکی وەڤدەکە پێشنیارکرا و خەڵکانێکیش گزنفۆنیان پێ باشتر بوو. ئەوانە هەردووکیان خۆیان بە توندی دژی ئەو کارە بوون و لەسەر ئەو باوەڕە بوون کە شارێکی دۆست و یۆنانی نابێ بکەوێتە بەر زەخت و گوشار بۆ شتێک کە خۆیان بەدڵەوە خوازیاری نەبن.

لەبەر ئەوەی خیریسۆفۆس و گزنفۆن لەگەڵ ئەو پێشنیارە نەبوون، لیکۆنی ئاخایی، کلیماخۆسی پەراسیۆ و ئاغاسیاسی ستیمفالیئۆ دیاریکران. ئەوانە چوونە نێو شار و باسی خواستەکەی خۆیان کرد. دەنگۆی ئەوە هەبوو کە لیکۆن هەڕەشەی لە خەڵکی ئیراکلیا کردوە چونکە داواکەی قبوڵ نەکراوە. ئیراکلییەکان کاتێک گوێیان لە داخوازی ڕاسپاردەکان بوو، وڵامیان داوە کە پێویستە بیری لێبکەنەوە. خەڵک خێرا مەڕوماڵات و دەغڵودان و چی شتوومەکی لە بازاڕەکانی دەرەوەی شار هەیانبوو گواستیانەوە نێو شار و بەپەلە دەروازەکانیان داخست و بە چەکەوە لەسەر دیوارەکان سەنگەریان گرت بۆوەی پاریزگاری لە شارەکەیان بکەن.

لەمەر تەواوی ئەو ڕووداوانە ستراتێژەکان[١٢٥]تاوانبار کران. چونکە هەڵوێستەکانیان لەجیات ئەوەی گرفتەکە چارەسەر بکەن بەتەواوی شێواندیان. لەو کاتەدا دیسان کۆبوونەوە. جەماوەری ئارکادی و ئاخایی بە سەرکردەیی کالیماخۆسی پەراسیۆ و لیکۆنی ئاخایی بە جیا کۆبوونەوە و ڕایانگەیاند کە تەواو ناڕازین لەوەی کە سەرۆکەکەیان کەسێکی خەڵکی ئاتێنی سەر بە پێلۆپۆنیسۆ یا لە خەڵکی لاکیدیمۆنی بێ کە کەمترین هێزی سەربازی لەنێو لەشکردا هەبێ[١٢٦]. ئەوان هەروەها دەیانگوت خۆیان حەولی تەواویان داوە لەشکر لەو وەزعە ڕزگاربکەن، بەڵام قازانجەکە بۆ کەسانیتر بووە. ئەوانەی تا ئێستا تێکۆشاون لەشکر ڕزگاری بێ، ئارکادی و ئاخایی بوونە. ئەگەر بە ژمارەش لەبەرچاو بگیرێن نیوەی زیادتری لەشکر پێکدێنن. لەئاکامدا بەو قەناعەتە گەیشتن لەنێو خۆیاندا سەرۆک هەڵبژێرن و پاشماوەی ڕێگا خۆیان بە تەنیا بڕۆن و هەوڵبدەن دەستکەوتی بەوەج مسۆگەر بکەن.

---

١٢٤- سەربازەکانی لەشکر خیریسۆفۆس و گزنفۆنیان بە تاوانبار دەزانی، چونکە هەردووکیان لەوەی کە وەک ڕاسپاردە بچنە شاری ئیراکلیا خۆیان پاراست. لەشکر هەرچەند بەر لە ماوەیەکی کەم خیریسۆفۆسی وەک سەرکردە هەڵدەبژاردبوو، بەڵام بەردەوام فەرمانەکانی گزنفۆنیان بەجێ دەگەیاند.

١٢٥- کاتێک خیریسۆفۆس ڕەگەڵ لەشکری کورۆش کەوت تەنیا حەوسەد چەکداری قورسی لەژێر فەرمانیدا بوو. لەحاڵێکدا گزنفۆن لە ئاتێنڕا بە تەنیا خۆی هاتبوو، بەبێ ئەوەی تاکە سەربازێکیشی لەگەڵدا بێ.

کاتێک ئارکادی و ئاخاییەکان خیریسۆفۆس‌یان جێهێشت، هێشتا جەماوەرێکی زۆر بەلایەوە مابوو. گزنفۆن‌یش لەگەڵ ناوبراو مایەوە. گشتیان یەکیان گرت و بۆ فەرماندەری ئەو بەشە تەنیا دە کەس ستراتێژیان هەڵبژارد. ئەوانە مافی دەنگدانی تەواویان هەبوو و هەرکات زۆرینە لەسەر بابەتێک ساغ دەبۆوە، ستراتێژەکانی دیکە پێویست بوو بڕیارەکە جێبەجێ‌بکەن. بەو شێوەیە سەرۆکایەتی گشتی خیریسۆفۆس دوای شەش حەوت ڕۆژ دوای هەڵبژێرانی کۆتایی پێهات.

گزنفۆن گەرەکی بوو باقی ڕێگا لەگەڵ خیریسۆفۆس درێژە پێبدا و لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە بەو شێوەیە ئەمنییەتی پتری دەبێ تا ئەوەی هەر ستراتێژێک بە تەنیا ڕێگا بگرێتەبەر.

نێئۆن گەرەکی بوو گزنفۆن ڕازی بکا بە تەنیا بکەوێتە ڕێگا. ناوبراو لە خیریسۆفۆسی بیستبوو کە حوکمڕانەکەی خیریسۆفۆس بەناوی ڤیزاندیۆ کلێئاندرۆس قەولی بەو داوە بە گەمی و بەلەمەکانییەوە لە بەندەری کاڵپ بێتە پێشوازی. هەڵبەت بەو گەمییانە دەبوایە تەنیا هێزەکانی خیریسۆفۆس و نێئۆن ڕاگوێزن. هەربۆیە نێئۆن بەردەوام ئامۆژگاری گزنفۆنی دەکرد.

خیریسۆفۆس خۆیشی لەبەر تەواوی ئەو گرفتانەی بۆی خوڵقابوون، ناهومێد ببوو و نەفرەتی لە هەرچی لەشکر بوو. نێئۆنی سەربەست کردبوو چی دەخوازێ بیکا. گزنفۆن خێرا پرسیارێکی بە مێشکدا هات. ئەگەر لە لەشکر جیا بێتەوە و بە تەنیا خۆی بڕوا چدەقەومێ. بە باشتری زانی بەدانی قوربانی پرسیار لە خواکان بکا، بەتایبەت لە خواوەند ئیراکلیۆس کە کام ڕێگا بگرێتە بەر. پرسیاری ئەوە بوو ئایا لەگەڵ ئەو سەربازانەی دەمانەوە بڕوا یا گشتیان لە یەخەی خۆی بکاتەوە. وڵامی خواوەند ئیراکلیۆس لە هێماکانی قوربانی دەرکەوت. مەسڵەحەت زاندرا لەگەڵ پاشماوەی لەشکر درێژە بە ڕێگا بدا.

لەئاکامدا، لەشکری یۆنانی سێ بەش بوو. ئارکادی و ئاخایی کە زیادتر لە چوارهەزار کەس دەبوون و تەواویان چەکدار بوون. قۆشەنی خیریسۆفۆس نیزیکەی هەزار و چوارسەد چەکدار دەبوون و حەوسەد پیاوی تراکی

سووکە چەکداری سەر بە کلیئارخۆس‌یشیان لەگەڵ بوون[127]. هێزەکانی گزنفۆن دەگەیشتنە هەزار و حەوسەت چەکدار و نیزیکەی سێسەت سووکەچەکدار و چل سوارە نیزام. تەنیا گزنفۆن سوارە نیزامی هەبوو.

ئارکادی و ئاخایی توانیان لە خەڵکی ئیراکلیا گەمی و بەلەم وەرگرن و بڕۆن. بۆوەی هەرچی خیراتر پەلاماری بیتینی‌یەکان بدەن و ئەوەندەی دەکرێ تاڵانی زۆر دابین‌بکەن. ئەوان گەیشتنە بەندەری کالْپ کە لە نێوەڕاستی وڵاتی تراکی هەڵکەوتبوو و ملکی بیتینی‌یەکان بوو.

خیریسۆفۆس لە شاری ئیراکلی‌ڕا وەڕێکەوت و ڕێگای پیادەی گرتەبەر و بەنێو خاکی بیتینی‌یەکاندا تێپەڕی و گەیشتە وڵاتی تراکی. لەبەر ئەوەی نەخۆش بوو بەرەو ڕۆخەکانی دەریا پێشڕەوی کردبوو. لە کۆتاییدا گزنفۆن کەڵکی لە هێندێک گەمی و بەلەمی ئیراکلییەکان وەرگرت و لەگەڵ هێزەکانی خۆی سوار بوو و گەیشتنە سنووری نێوان وڵاتی تراکی و ئیراکلیا و لەوێشەوە بە ڕێگای ویشکاییدا درێژەی بە ڕێپێوانەکەیدا.

---

١٢٦- ژمارەی سووکە چەکدارەکانی تراکی ژێر فەرمانی کلی‌ئارخوس سەرەتا هەشت سەد کەس بوونە.

# بەشی ٣

## وەرپێکەوتنی سێ دەستەی قۆشەنی یۆنانی - کۆبوونەوەی هەرسێ لایەن
## لە بەندەری کالپ

هەرکام لە بەشەکانی لەشکر بەو شێوەیە هەڵسوکەوتیان کرد: ئارکادییەکان، هەرکە شەو گەیشتنە بەندەری کالپ، بەرەو نیزیکترین ئاواییەکانی ئەو دەڤەرە وەرێکەوتن کە دوورترین مەودای نێوانیان لەگەڵ دەریا نیزیک بە سی ستادیۆ دەبوو. کاتێک ڕۆژ بۆوە هەر ستراتێژێک بەجیا لەگەڵ هێزەکانی خۆی پەلاماری گوندێکیدا. پەلامار بۆ سەر ئەو گوندانەش کە پێیانوابوو گەورەترن، دوو ستراتێژیان بۆ داندرا. هەروەها ڕێککەوتن کە لە کاتی تەنگانەدا گشتیان لەسەر گردێک کۆبنەوە کە پێشتر دیارییان کردبوو. بەو شێوەیە خێرا و لەنەکاو بەسەر گوندەکانیان دادا. لە ئاکامدا توانییان خەڵکێکی زۆر بەدیل بگرن و مەڕ و ماڵاتێکی زۆر بەتاڵان بەرن. ئەو ژمارەیەش لە دانیشتووانی گوندەکان کە توانییان لەدەست پەلامار ڕزگاریان بێ، یەکتریان گرتەوە. گەلێک لەو خەڵکە کە سووکەچەکدار بوون، لە دەست هێزە یۆنانییەکان ڕایانکردبوو. پاش ئەوەی جەماوەرێکی زۆری تراکی

کۆبۆوە، سەرەتا پەلاماری گوردانێکی ئارکادییەکانیاندا کە لە ژێر فەرمانی (سمیکریتا)دا بوون. پیاوانی ناوبراو خەریکی ڕاکردن بەرەو گردی دیاریکراو بوون و کەلوپەلێکی زۆریان تالانکردبوو. ئەوانە بە قوونەشەڕ پاشەکشەیان کرد. لە دۆڵێکی سەر ڕێگایاندا یەکسەر ڕوویان لە هەڵاتن لەدەست تراکییەکان کرد بەڵام لەوێ سمیکریتا خۆی و تەواوی هێزەکانی کوژران. تراکییەکان هەروەها کەوتنە سەر هێزەکانی ژێرفەرمانی یەکێک لە ستراتێژەکانی دیکە بەناوی ئیغیساندرۆس و گشتیان کوشتن و تەنیا هەشت کەسیان بە زیندوویی ڕزگارییان هات و ئیغیساندرۆسیش لەگەڵ ئەو کەسانە بۆی دەرچوو. لەسەر تەپۆڵکەکە هێزەکانیتری ئارکادی کۆبوونەوە. هێندێکیان تالانیان هێنابوو و چەندێکیش بێ دەستکەوت گەڕابوونەوە.

تراکییەکان کە لە سەرەتای هێرشەکەدا سەرکەوتبوون، بە دەنگ و هاوار یەکتریان تێگەیاند و گشتیان ئەو شەوە بە دەوری یەکتر کۆبوونەوە. هەرکە ڕۆژ بۆوە دەوری ئەو گردەیاندا کە هێزە یۆنانییەکان لەسەری کۆببوونەوە. یۆنانییەکانی سەر ئەو گردە، جەماوەرێکیان سوارکار بوون و بەشێکی زۆریشیان سووکە چەکدار و خەڵکیتریش بەردەوام بە یارمەتییانەوە دەچوو. لە کۆتاییدا بە هێمنی پەلاماری هێزەکانی چەکداری یۆنانییانی واتە ئارکادییەکانیاندا. یۆنانییەکانی ئارکادی خاوەن دەستەی کەماندار و نێزەوەشێن نەبوون و بە پێچەوانەی تراکییەکان، سوارەی چەکداریشیان نەبوو. تراکییەکان بەڵام، بە سواری ئەسپ، پەیتاپەیتا پەلاماری یۆنانییەکانی سەرگردیان دەدا و هەرچەند بەردەوام لەلایەن یۆنانییەکانەوە تووشی بەرگری دەهاتن، گشت جارێ دوای پەلامار خێرا بۆی دەردەچوون. حەشیمەتێکی تراکی زۆر هاوکات لە چەند لاوە پەلاماری گردەکەیاندا.

لە هێزە یۆنانییەکان ژمارەیەکی زۆر بریندار بوون. تراکییەکان هیچ زەرەدێکیان پێنەگەیشتبوو. یۆنانییەکان تووشی بارودۆخێکی گەلێک نالەبار هاتبوون کە نەیاندەتوانی هیچ چەشنە جموجۆڵێک لەخۆیان نیشان بدەن و خێرا لەلایەن تراکییەکان پێشیان پێدەگیرا و تەواو لە گەمارۆ کەوتبوون. ئاڵقەی گەمارۆ تا ڕادەیەک تەنگ ببۆوە کە یۆنانییەکان دەستیان بە ئاویش

ڕانەدەگەیشت. لەوکاتەدا لەبەر پەرێشانی وەزعەکەیان، داوای ڕاوەستانی شەڕیان کرد و جیا لە هەر شتێک لەسەر گرفتی یەخسیرەکان بە ئەنجامێک نەگەیشتن و کاتێک یۆنانییەکان داوای دیلەکانی خۆیان کرد، تراکییەکان لە ڕادەستکردنەوەیان خۆیان پاراست. گرفتی نێوانیان لەسەر ئەو خاڵە لەجێی خۆیدا مایەوە و سوڵح نەکرا. ئەوە بارودۆخی ئارکادی‌یەکان بوو.

خیریسۆفۆس بە قەراخ بەحر و بە هەرێمی ڤیتینیادا ڕێگای پێشڕەوی گرتەبەر. ناوبراو گەیشتە بەندەری کاڵپ. گزنفۆن بە نۆرەی خۆی ڕێگای نێوەڕاستی وڵاتی ڕەچاو کرد و لەو ماوەیەدا سوارکارەکانی بە خێرایی تەواو بەرەو پێشەوە غاریان دەدا. تووشی چەند پیاوێکی بە ساڵاچوو هاتن. ئەوانەیان هێنایە لای گزنفۆن. پرسیاریان لێکرا ئاخۆ کەسیان لە هێزەکانی‌تری یۆنانی لەو ماوەیەدا دیتووە. ئەو پیرانە باسی ئەو ڕووداوەیان گێڕایەوە و گوتیان کە ئارکادی و ئاخایی چۆن لەسەر گردێک و لەلایەن تراکییەکانەوە کەوتوونەتە ئاڵقەی گەمارۆ.

گزنفۆن کاتێک گوێی لەو قسانە بوو، پیرەکانی خستە ژێر چاوەدێری توندی نیزامی چونکە لەکاتی تەنگانەدا بۆ چاوساغی ڕێگا پێویستی پێیان هەبوو. لە درێژەدا دە کەس پاسەوانی لە دەوری هێزەکانی خۆی دانا و ستراتێژەکانی بانگ کرد و قسەی بۆ کردن: " سەربازەکانم! جەماوەرێک لە ئارکادییەکان کوژراون و باقی لەشکرەکەشیان لەسەر گردێک لەلایەن دوژمنەوە کەوتووەتە گەمارۆ. من لەو بڕوایەدام ئەگەر ئەوانە لەناو بچن، ئەوکات ئێمە ناتوانین بە زیندوویی بۆی دەربچین و ڕزگاریمان بێ. دوژمن گەلێک بەهێزە و غیرەتێکی زۆری وەبەر هاتووە و لەخۆ بایی بووە. ئێستا ئەرکی سەرشانمانە ئەوەندەی لە تواناماندا هەیە، هەرچی زووتر لە فریای ئەو بەشە لە لەشکرەکەمان بکەوین کە زیندوو ماون. لەگەڵ ئەوان پێکەوە تێبکۆشین و بەتەنیا نەمێنینەوە بۆوەی تووشی مەترسی نەبین. چونکە لێرە بەولاوە ناتوانین بۆ هیچ شوێنێکی دیکە بەبێ چاوەدێری جووڵە بکەین. ئەگەر بگەڕێینەوە دواوە بۆ شاری ئیراکلیا، ڕێگامان زۆر دوورە. شاری خریسۆپۆل‌یش لێرەوە دوورە، بۆوەی بچینە ئەوێ دەبێ بزانین کە دوژمن

لەسەر ڕێگا هەیە یان‌نا. ڕێگای تاکوو بەندەری کالْپ، ئەو جێگایەی پێموایە هێزەکانی خیریسۆفۆسی لێیە بۆ ئێمە نیزیکترە، هەڵبەت ئەگەر ئەویش نەجاتی هاتبێ و مابێ. دیارە لەوێ هیچ گەمییەک وەگیر ناکەوێ سوار بین و بۆی دەرچین. سەبارەت بە ئازووقەش دەبێ بڵێم تەنانەت بەشی ڕۆژێکیشمان وەگیرناکەوێ.

ئەگەر ئەو هێزە گەمارۆدراوە بفەوتێ ئێمە تووشی مەترسی پتر دبین چونکە ئەوکات تەنیا پیاوەکانی خیریسۆفۆسمان بۆ دەمێننەوە. بەڵام ئەگەر ئەوانە ڕزگار بکەین و گشتمان لە شوێنێک کۆبینەوە، ئەو وەختە بە هاوکاری یەکتر دەتوانین نەجات بوونمان مسۆگەر بکەین. بۆیە پێویستە سەرەڕای پاراستنی هێمنایەتیمان، هەرچی زووتر وەڕێکەوین. ئێستا کاتی ئەوە هاتووە یا بە شانازییەوە بمرین یا بە فەخرەوە هەڵەیەک ڕاستکەینەوە و ئەو یۆنانییانەی مەترسی تێداچوونیان لەسەرە نەجاتیان بدەین. خواوەندیش ئێمە بەرەو ئەو سەرفەرازییە هیدایەت دەکا چونکە ئەویش دەخوازێ ئەو کەسانە سەرشۆر بکا کە تەنیا بۆخاتری بەرژەوەندی خۆیان تێدەکۆشن، نەک وەک ئێمە کە بە پێی خواستی خواکانمان هەنگاو دەنێینەوە و سەربەرزین. کەوابوو دەبێ هەوڵی جێبەجێ‌کردنی ئەو کارە بدەین و هاوکات پارێزگاری لە خۆشمان بکەین، بەشێوەیەک کە بەردەوام لەلام بن و گوێ لە فەرمانەکانی من ڕاگرن.

لە ئێستاوە تا وەختێکی لەبار کە دەتوانین پشووی نان‌خواردن ڕاگەیێنین، ڕێگا دەڕۆین و ئۆردو لێنادەین. ئەوەندەی بەرەو پێشەوە دەچین، تیماسیۆن لەگەڵ سوارەکانی بەردەوام هەوڵبدەن پاسەوانی ئێمە بن و هەمیشە سەیری ڕێگای پێشەوەمان بکەن مەبادا تووشی کارەساتی لەنەکاو بین".

گزنفۆن دوای ئەو قسانە، وەک فەرمانەدەی لەشکر وەژوور کەوت. هەروەها بۆ تەنیشتەکانی لەشکر ژمارەیەکی زۆری پاسەوان لە هێزی سووکە چەکدار نارد بۆوەی بە تەواوی چاوەدێری دەوروبەر بکەن، تاکوو مەبادا لەو دوو لایەشەوە کارەساتێک بقەومێ. فەرمانی پێدان هەرچی لەسەر ڕێگا وەبەر چاو کەوت، خێرا بیسووتێنن. ئەو وەرزە عەرز نەرم بوو و

سوارەکان بۆ گشت لایەک غاریان دەدا و بەردەوام ئاگریان لە وڵاتی بەردەدا. هێزەکانی سووکە چەکداریش لە تەنیشتەوە دەڕۆیشتن و بەنۆرەی خۆیان ئاوریان دەکردەوە. هەرچی بۆ سووتان دەبوو، دەیانسووتاند. هێزەکانی لەشکریی ئاگریان بە دەستەوە گرتبوو، وڵات دەسووتا بۆیە ڕەشایی پیاوانی لەشکر لە دوورەوە زیادتر وەبەر چاو دەکەوت. لە فرسەتێکی گونجاودا، دەشتاییان بەجێهێشت و بەرەو بەرزاییەکان هەڵکشان. ئۆردویان لێدا. لەسەر ئەو بەرزاییەڕا و لەنەکاو چاویان بە ئاگرەکانی دوژمن کەوت. مەودای چل ستادیۆ لێیان دوور بوون. تراکییەکانیش ئەوەندەی لە توانایاندا بوو ئاگریان کردبۆوە. پاش ئەوەی خێرا خێرا نانیانخوارد، پێیانڕاگەیاندرا کە ئاگرەکانی خۆیان لەسەر تەپۆڵکەکان بکوژێننەوە.

ئەو شەوە پاسەوانیان لە چواردەوری لەشکر دانا و لێیخەوتن. هەرکە گزینگی خۆرەتاوی بەیانی دەرکەوت، لەبەر خواکان پاڕانەوە و بە خێرایی تەواو پەلاماری شەڕگەیاندا. تیماسیۆس و سوارەکانی بە چاوساغی پیرمێردەکان، بێ پشوودان بەرەو پێشەوە غاریاندا و گەیشتنە ئەو گردەی هێزە یۆنانییەکان پێشتر لێی لەگەمارۆ کەوتبوون. لەوێ نە لە هێزەکانی دۆست و نە هی دوژمن، هیچکەس نەمابوو. ئەو هەواڵەیان خێرا بە گزنفۆن گەیاند. تەنیا چەند پیرە پیاو و پیرێژن و چەند سەر مەڕومالات وەبەر چاو کەوتن. سەرەتا بۆیان جێگای پرسیار بوو کە دەبێ چقەومابێ. دوایی لەو خەڵکەیان پرسی کە لەوێ مابوونەوە و تێگەیشتن کە تراکییەکان هەرکە تاریکی شەو داهاتووە، خێرا هەڵاتوون و یۆنانییەکانیش بەیانی زوو ڕۆیشتوون. ئەو خەڵکە نەیدەزانی یۆنانییەکان بەرەو کوێ ڕۆیشتوون. کاتێک پیاوەکانی گزنفۆن گوێیان لەو قسانە بوو، خێرا بەرکوڵێکیان کرد و باروبنەیان تێکنا و بەرەو بەندەری کالْپ وەڕێکەوتن، بەو هیوایەی لەگەڵ باقی هێزە یۆنانییەکان یەکتر بگرنەوە. کاتی ڕۆیشتنیان چاویان بە شوێنپێی سەربازەکانی ئارکادی و ئاخایی کەوت کە بەرەو بەندەری کالْپ ڕۆیشتبوون.

وەختێک لەگەڵ باقی هێزەکان گەیشتنە هەمان شوێن، شادییەکی بێوێنە گشتیانی داگرت و وەک برا، بەردەوام باوەشیان بە یەکتردا دەکرد.

ئارکادییەکان لە هێزەکانی گزنفۆنیان پرسی کە بۆچی ئەو شەوە ئاگرەکانیان کوژاندەوە، چونکە کاتێک ئاگر کوژانەوە، ئەوان لەو بڕوایەدا بوون کە پەلاماری دژی دوژمن دەستیپێکردوە و هێزەکانی دوژمن ترسیان ڕێنیشتووە و کۆتاییان بە گەمارۆ هێناوە و هەڵاتوون. پیاوانی گزنفۆنیش گوتیان کاتێک دیتمان ئێوە هیچکامتان وەدیار نەکەوتن و وەختیش دەگوزەرا، تەواو نیگەران بووین و هاوکاتیش لە پەلاماری دوژمن بۆ سەر خۆمان دەترساین. بەیانی سەحەری لێمانڕوون بۆوە کە ئێوە بەرەو بەحر داگەڕاون. ئەوکاتە بوو کە بڕیارماندا وەدوای پێوشوێنی ئێوە بکەوین و لە ئاکامدا گەیشتینە ئێرە.

# بەشی ٤

## سەبارەت بە بەندەری کالپ - ڕازیبوونی یۆنانییەکان - بۆچوونی هەڵەی نیۆن - وەدیارکەوتنی سوارکارەکانی فارناڤازۆس

ئەو ڕۆژە لە کەنارئاوەکانی نەرمان و دەشتایی قەراخ بەندەر ئۆردویان لێدا. ئەو شوێنە لە وڵاتی تراکی سەر بە ئاسیای بچووک هەڵکەوتبوو و پێیدەگوترا بەندەری کالپ. وڵاتی تراکی لە دەروازەکانی هەرێمی پۆندۆڕا دەستی پێدەکرد و دەگەیشتە ئیراکلیا. هەڵبەت لەشکر بەلای ڕاستدا چووە نێو خاکی پۆندۆ. ئەگەر مرۆڤ بە بەلەمی بێ بایەوان و بە زەبری بێڵ سەفەری کردبا، مەودای نێوان ڤیزاندیۆ هەتا ئیراکلیا ڕۆژێکی تەواوی دەخایاند. لەو مابەینەدا جیا لە (بیتینی)یەکانی تراکی، هیچ شارێکی یۆنانی یا دۆستی یۆنانی لەسەر ڕێگا بەرچاونەدەکەوت. ئەو جۆرەی باسدەکرا کاتێک یۆنانی بەهەڵکەوت یەخسیردەکران، جا لەبەر گەمیوانی یا هۆکاریتر هاتووچۆی ئەو دەڤەرەی کردبا، بە ناحەزترین شێوە دەکەوتە بەر زوڵمی خەڵکی ئەو وڵاتە.

بەندەری کالپ لە نێوەڕاستی ڕێگای دەریایی نێوان ئیراکلیا و ڤیزاندیۆ هەڵکەوتووە، واتە ئەو شوێنەی کە ویشکاییە و وەک زمان دەچێ و

شاخاوییه و بۆ نێو بەحر ڕاکشاوە. ئەو بەشەی دەچێتە نێو بەحر دەبێ و شێوەی زمان دەدا، ڕەوەزە بەردێکی بڵیندە و بەرزاییەکەی دەگاتە نیزیک بیست ئۆرغیا (قەیاسی پێوانی قووڵایی بەحر لەو سەردەمەدا). دیارە بەلای ویشکاییدا وڵاتەکە گۆرتر و پانتاییەکەی چوار پلێترا دەبێ. لەو گۆڕاییەدا دە هەزار کەس دەتوانن نیشتەجێ بن.

لەژێر ئەو کێوە ڕەوەزە و بەلای ڕۆژئاوادا، بەندەری کالْپ هەڵکەوتووە و خاوەن گۆڕایی نەرم و ڕەختەیە. لە نووختەیەکی بناغەی ئەو ڕەوەزە ئاوێکی شیرین بە دەستاو دێتەدەر و دەڕژێتە نێو بەحر. ئەو شوێنە لە نیزیک بەحرە و بە دارستان داپۆشراوە کە زیادتر بۆ دروستکردنی بەلەم و گەمی کەڵکی لێوەردەگیرێ. ئەو دەشتاییە بە درێژایی بیست ستادیۆ بەرەو نێوەند ڕاکشاوە و خاکێکی نەرمی هەیە و بەردەڵان نییە. لایەنیتری ئەو دەڤەرە بەرەو بەحر دەچێ و زیادتر لە بیست ستادیۆ مەودای هەیە و بە دارستانی چڕ و جۆراوجۆر داپۆشراوە. پاشماوەی خاکی ئەو ناوچەیە پانوپۆڕ و پڕ بەرهەمە و دێهاتێکی زۆری لێهەڵکەوتووە. گەنم و جۆ و دەغڵودانیتر وەک هەرزن، کونجی و هەنجیر و داری بەری و ترێ بۆ شەڕابی شیرین بەرچاو دەکەون. داری زەیتوونی لێنەبوو. ئەوە باسێک سەبارەت بەو وڵاتە بوو.

لەشکری یۆنانی (وەک پێشتر گووتم) لە گۆڕایی و نەرمانەکان خێمەی لێدا. لەشکر نەیدەویست لەو ناوچانە دامەزرێ کە بۆ دروستکردنی شار گونجاو بوون. هەرچەند هێندێک کەس خوازیاری بنیاتنانی شارێک بوون. بەڵام جێبەجێ بوونی ئەو خواستە دژوار بوو چونکە وەک دژایەتی لەگەڵ باقی شارەکانی یۆنانی دەڤەری پۆندۆ لێکدەدرایەوە.

لەلایەکیتریشەوە زۆربەی سەربازەکانی لەشکر لەبەر نەبوونی مووچەی بەردەوام لەلایەن دەسەڵاتێکەوە فەقیر و هەژار مابوونەوە و لە هیچ شوێنێک دانەمەزرابوون و تەواوی هومێدیان مووچە و خەڵاتەکانی کوروش بوو. هەر بەو هیوایەش وەدوای لەشکر کەوتبوون. کەسانێک لەوانە کاتێک چوونە لای کوروش، خەڵکانێکیتریشیان ڕەگەڵ خۆیان دابوو. هی ئاواش هەبوو کە بۆ ئەو مەبەستە چی پاشەکەوتی هەیبوو خەرجی کردبوو. زۆر مرۆڤیتریش

کەسوکاری خۆیان بەجێهێشتبوو و ڕەگەڵ لەشکر کەوتبوون و باوکەکانیش ژن و منداڵیان وێڵ کردبوو بەو هەوایەی کە لە کاتی گەڕانەوە، سەروەت و سامانێک لەگەڵ خۆیان بێننەوە. هەڵبەت ئەوەش بگوترێ کە خەڵکانێکی زۆر گوێبیس ببوون کە پیاوانی لەشکری کوروش بەشێوەی جۆراوجۆر پارە و سامان کۆدەکەنەوە. ئەو جەماوەرەش کە ئەو شتانەیان بیستبوو، هەر بەو چەشنە بیریان لە بارودۆخەکە کردبۆوە. ئەوان تەنیا بۆ ئەو مەبەستە هاتبوون و ئێستاکەش گەرەکیان بوو بە سلامەتی بگەڕێنەوە سەر ماڵوحاڵی خۆیان.

کاتێک دوایین وەجبەی لەشکر گەیشتەجێ، گزنفۆن قوربانی پێشکەشی خواکان کرد بەو مەبەستەی لە پێشگۆیی و ئامۆژگارییەکانیان سەبارەت بە پاشماوەی ڕێگا دڵنیابێ. ناوبراو گەرەکی بوو لەشکر بە مەبەستی دۆزینەوەی ئازووقە و بەخاک سپاردنی تەرمی سەربازەکانی کوژراو ئامادەبکا. دامودەزگای قوربانی ئامادەکرا و ئارکادییەکانیش بەشداری ڕێورەسمەکە بوون. زۆربەی جەنازەکان لە شوێنی کوژراوەکان نێژران. لەبەر ئەوەی پێنج ڕۆژ بەسەر کوژرانیاندا تێپەڕیبوو، هەڵگێڕوەرگێڕیان گەلێک دژوار بوو و نەدەکرا بۆ شوێنیتر ڕاگوێزرێن. بەشێک لە کوژراوەکانیان لەسەر ڕێگا هەڵگرتەوە و لە گۆڕی بە کۆمەڵدا بە ڕێکوپێکی ناشتیانن. ژمارەیەک لە کوژراوەکانیان نەدیتەوە و تەنیا گۆڕێکی بەتاڵیان دروستکرد و ژمارەیەکی زۆر تاجە گوڵینەیان لەسەر دانا.

لەدرێژەدا، کاتێک ئەو کارانە جێبەجێکران ئەوسا گشتیان گەڕانەوە ئۆردوگا. پاش خواردنی ژەمی شەو، خەوتن. ڕۆژی دوایی دوو کەس لە لۆکاژەکان بە ناوەکانی ئاغاسیاس ستیمفالی و یێرۆنیمۆسی خەڵکی ئیلیۆس و چەند کەسی بە ساڵاچووی ئارکادی تەواوی سەربازەکانیان کۆکردنەوە و ئەو بڕیارانەیاندا: هەرکەس لە داهاتوودا ببێتە مایەی لەتبوونی لەشکر پێویستە سزای مەرگی بۆ دیاری بکرێت. لەشکر دەبێ تێکڕا و بە یەکەوە وەڕێکەوێ و ڕیزەکانی نیزامی وەک چۆن پێشتر دیاریکرابوون ئاوا بمێننەوە و سەرکردەکانیش پێویستە ستراتێژەکانی قەدیمی بن. دیارە خیریسۆفۆس

ئەو کاتە مردبوو و لە ژیاندا نەمابوو. ناوبراو تووشی نۆبەتە هاتبوو و دەرمانێکی خواردبوو و پێی مردبوو. جێگای ئەو بە نیئۆنی ئاسینیئی ئەسپێردرا.[128]

دواتر گزنفۆن هەستا سەرپێ و دەستی بە ئاخاوتن کرد: " پیاوەکان، سەربازان! ئێمە درێژە بە ڕێگا دەدەین و بەپێی ڕێککەوتنمان بە ڕێگای ویشکاییدا دەڕۆین، چونکە گەمی و بەلەممان وەگیر ناکەوێ. پێویستە لێرە بڕۆین، لەبەر ئەوەی ئازووقەمان نەماوە. ئێمە ستراتێژەکان لە خواکان دەپاڕێینەوە تا عاقیبەتی سەفەرەکەمان پێبڵێن و بزانین بەکوێ دەگەین. بەڵام ئێوە لە ئێستاوەڕا خۆتان ئامادە بکەن بۆ شەڕێکی کە قەت نەکرابێ، چونکە دوژمنانمان وەغیرەت کەوتوون".

لە کۆتاییدا ستراتێژەکان قوربانییان پێشکەش بە بارەگای خواکان کرد و پاڕانەوە. ئەوکاتە تاڵەبین ئاریکسیۆنی ئارکادی لە مەرسیمەکەدا بەشدار بوو چونکە تاڵەبینی پێشوو واتە سیلانۆس ئابراکیۆتی لە شاری ئێراکلیا گەمی بەکرێ گرتبوو و لە لەشکر ڕایکردبوو. کاتێک پرس بە خواکان کرا و نیشانەکانی قوربانی دەرکەوتن، خێروبێریان پێوە دیار نەبوو. هەربۆیە ئەو ڕۆژە وەڕێنەکەوتن. کەسانێک لەو باوەڕەدا بوون کە چوون گزنفۆن خوازیاری نیشتەجێ بوون لەو مەکانە بووە و خواستوویەتی شارێک دروست بکا، تاڵەبینی ڕازی کردوە بڵێ کە نیشانەکانی قوربانی بۆ وەڕێکەوتنی لەشکر بە خێروبێر نابیندرێن و بۆیە لێرە ناڕۆین.

گزنفۆن بۆ ئەو مەبەستە ڕایگەیاند کە ڕۆژی دوایی کاتێک قوربانیتر بەو بۆنەوە دەکرێ گشت سەربازان بەشداری ڕێوڕەسمەکە بن و ئەگەر تاڵەبینی دیکەش لەنێویاندا هەیە، بەوپەڕی ڕەزایەتەوە بێ و لەگەڵ ئاریکسیۆن پرس بە خواکان بکەن و نیشانەکان بخوێننەوە. خەڵکێکی کەم هاتن و بەشداری ڕێوڕەسمی قوربانی بوون. هەرجارێ قوربانی دەکرا و پێوەندی لەگەڵ

---

۱۲۷- گزنفۆن لە نووسینەکەیدا زۆر بە خێرایی بەسەر مەرگی خیریسۆفۆس‌دا دەرباز دەبێ. وەک ڕووداوێکی گرینگ باسی لێوە ناکات. هۆی مەرگی خیریسۆفۆس ڕوون ناکاتەوە. مرۆڤ نازانی لەبەر بێدەرمانی مرد یاکوو دەرمانەکان هیچ کاریگەریەکیان لەسەر نەخۆشیەکەی ناوبراو دانەنا.

خواکان سازدەدرا، هیچ نیشانەیەکی خێر بۆ وەڕێکەوتنی لەشکر بەرچاو نەدەکەوت. لەئاکامدا ناڕاحەتی گشت سەربازەکانی لەشکری داگرت، چونکە ئازووقە بەتەواوی کۆتایی هاتبوو و هیچ شوێنێکیش نەبوو کە لێی‌بکڕن.

سەبارەت بەو گرفتە دووبارە ستراتێژەکان کۆبوونەوە و لەگەڵ گزنفۆن ڕاوێژیان کرد. گزنفۆن گوتی: "ستراتێژەکان! لەمەر وەڕێکەوتنی لەشکرەکەمان هەروەک دەبینن هێشتا ئیزنی خواکانی لەسەر نییە. دەبینم پێویستیەکی زۆریشمان بە ئازووقە هەیە. بە باوەڕی من ئەوجار دەبێ تەنیا یەک پرسیار لە خواکان بکەین ئەویش سەبارەت بە ئازووقە بێ. ڕاست لەو کاتەدا یەکێک هەستا سەرپێ و گوتی: "ئەوە باشترە، چونکە ئەوەندەی من دیتم نیشانەکان لەگەڵ وەڕێکەوتنی لەشکر نەبوون. ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە من دوێنێ زانیارییەکم لە گەمیوانێک دەسکەوت کە بە گەمی گەیشتووەتە ئێرە. ئەو گوتی کە حاکمی ڤیزاندیۆ واتە کلێئاندرۆس بەنیازە بە گەمی و بەلەمەوە بگاتە ئێرە".

دوای ئەو هەواڵە گشتیان هاتنە سەر ئەو بڕوایە کە پێویستە سەبر بکەن و هاوکاتیش وەدوای دابینکردنی ئازووقە بکەون. ئەوجاریش هەر بەو شێوەیە، سێ جار قوربانییان بۆ هەمان مەبەست پێشکەش بە بارەگای خواکان کرد و دیسانیش خێری پێوە نەبوو. زۆر لە ستراتێژەکان چوونە نێو خێمەی گزنفۆن و سەبارەت بە نەبوونی ئازووقە دەنگی ناڕەزایەتییان دەربڕی. ناوبراو بەردەوام لە ناردنی لەشکر بۆ دابین کردنی ئازووقە خۆی دەپاراست چونکە ڕەزایەتی خواکانی لەسەر نەبوو.

ڕۆژی دواییش لەسەر نەبوونی ئازووقە و وەڕێکەوتنی لەشکر و دەرنەکەوتنی نیشانەی خێر لەکاتی قوربانیدا و ڕازی نەبوونی خواکان، دەنگی ناڕەزایەتی سەربازان بەرزبۆوە. ئەو ئاژەڵانەی بۆ قوربانی‌کردن دیاریکرابوون، ئەوانیش تەواو بوون. ستراتێژەکان ئامادە نەبوون لەشکر وەڕێخەن بۆوەی ئازووقە دابین بکەن و دووبارە کۆبوونەوەیەکیان سازدا.

گزنفۆن جارێکی‌تریش دەستی بە ئاخاوتن کردەوە: " وێدەچێ هێزەکانی دوژمن لە شوێنێک کۆبوونەتەوە و ئێمە ناچارین شەڕیان لەگەڵ بکەین.

ئەگەر باروبنەمان لە شوێنێکی ئەمن و قایم لەنێو شاخەکاندا وەشێرین، ڕەنگە بتوانین دژی دوژمن وەخۆکەوین. بە باوەڕی من ئەوکات خواکان نییەتی لەباریان دەبێ". کاتێک سەربازەکان گوێیان لەو قسانە بوو دەنگی نارەزایەتییان هەڵبڕی و گوتیان پێویست ناکا بەو شوێنەدا بڕۆین کە لەگەڵ دوژمن تووشی پێکدادان دەبین و لەسەر قوربانیکردنی پتر پێداگر بوون. مەڕیتر بۆ قوربانی وەگیرنەدەکەوت. لەڕووی ناچاری کەڵ و عارەبەیان بەسەر یەکەوە دەکڕی. گزنفۆن داوای لە کلیئانۆرای ئارکادی کرد کە ناوبراو خۆی ڕێورەسمی قوربانی وەستۆ بگرێ، بەو هیوایەی کە بە گۆڕینی خاوەن قوربانی ڕەنگە نیشانەی باشتر دەرکەون. ئەوجاریش ڕەزایەتی خواکان لە قوربانیدا وەبەرچاو نەکەوت.

ستراتێژ نیئۆن جێگری خیریسۆفۆس، دوای مەرگی ناوبراو هەستی بە ڕەنج و ئازاری سەربازەکان دەکرد. بۆوەی یارمەتی سەربازەکانی ژێر فەرمانی بدا، پێشتر چاوی بە دانیشتوویەکی خەڵکی ئیراکلی کەوتبوو و کابرا بە نیئۆنی گوتبوو ئەگەر سەربازەکان گەرەکیان بێ، دەکرێ لە گوندەکانی دەوروبەر ئازووقە دابین بکەن و ئەویش چاوساغی و ڕێنماییان بکا. نیزیک بە دوو هەزار کەس بۆ ئەو مەبەستە بە جەواڵ و خۆرجین و زەرفی جۆراوجۆر وەڕێکەوتن. کاتیک گەیشتنە ئاواییەکان، بەسەر گوندەکاندا بڵاوبوونەوە. سەرەتا سوارەکانی فارناڤازۆس پەلاماری دژی یۆنانییەکانیان دەست پێکرد. ئەو سوارانە لەڕاستیدا بۆ یارمەتیدانی ڤیتینییەکان هاتبوون و خاوەن هەمان ئامانج بوون، واتە ئەگەر ئیمکانی هەبێ ڕێگا بە یۆنانییەکان نەدەن پەنا بۆ وڵاتی فریژییەکان بەرن. ئەو سوارانە توانیان نیزیکەی پێنسەت کەس لە لەشکری یۆنانی بکوژن و باقی ئەوانیتریش ئاوارەی چیاکان بکەن.

ئەو هەواڵە بەهۆی کەسێکەوە کە لەدەست پەلامارەکە ڕزگاری هاتبوو، گەیشتەوە ئۆردوگا. گزنفۆن چوون ڕۆژی قوربانی دیتی خێروبێرێک دەرنەکەوت، بەپەلە یەکێک لە کەڵەکانی عارەبەی هێنا مەیدان و کردیە قوربانی (ماڵاتیتر بۆ قوربانی لەگۆڕێدا نەمابوون) و ڕەزایەتی خواکان

دەرکەوت. ناوبراو خیرا سەربازەکانی ژێر تەمەن سی ساڵی ڕەگەڵ خۆیدا و بە یارمەتی لێقەوماوانی لەشکرەوە چوو. پاش دۆزینەوە و بە هاوارەوە چوون، گشت ئەوانەی بۆ نێو دارستانەکان ڕایانکردبوو، لەگەڵ خۆی هێنانییەوە ئۆردوگا.

هەرکە ئێوارە داهات و ڕۆژ ئاوابوو، یۆنانییەکان بەوپەڕی ناهومێدییەوە دەوری سفرەی نانخواردن دانیشتن. لەپڕێکا لەلای دارستانەوە جەماوەرێکی خەڵکی ڤیتینی پەلاماری پاسەوانانی یۆنانییاندا و ژمارەیەکیان لێکوشتن و تا نێوەندی ئۆردوگا هێرشیان هێنا. لەوکاتەدا یۆنانییەکان ڕاسان و ڕۆبوونە چەکەکانیان و وەدوای پەلاماردەران کەوتن. پاش ڕاودوونانی هێزەکانی دوژمن هەستیان بەوەکرد کە شەوێکی مەترسیداریان لەپێشە و ناتوانن ئۆردوگا کۆبکەنەوە و بەنێو دارستاندا بڵاوەی بکەن. بەباشیان زانی گشتیان بە چەکەوە بنوون و لە سەربازە جوامێر و شەڕکەرکەرەکان پاسەوانییەکی بەوەجیان لە دەوری ئۆردوگا دامەزراند.

# بەشی ٥

## جێگیربوونی لەشکر لە شوێنێکی مەحکەم - هێرشی یۆنانییەکان بۆسەر دوژمن - ڕاستگۆیی و جوامێری گزنفۆن - سەرکەوتنی لەشکری یۆنانی بەسەر دانیشتووانی ڤیتینی و هێزەکانی فارناڤازۆس‌دا

ئەو شەوە دەرباز بوو. کاتێک ڕۆژ بۆوە، ستراتیژەکان لەشکریان بەرەو بەرزاییەکان ڕێنمایی کرد(ئەوەش پێشنیاری گزنفۆن بوو کە گوتبووی باروبنەیان لەنێو چیاکاندا وەشێرن). سەربازەکان بە چەک و شتومەکیانەوە بەرەو شاخەکان هەڵکشان. بەر لە زیافەت کردن بەڵام تەنگەبەرایی نێو گەڵیەکەیان بە خەندەک و دیوار بەست و سێ دەروازەیان تێکرد. ڕاست لەو کاتەدا گەمییەک لە ئیراکلیاڕا هات و ئاردی جۆ و ماڵاتی قوربانی و شەڕابی هێنابوو.

ڕۆژی دوایی، کاتێک گزنفۆن لە خەو هەستا، خێرا قوربانییەکی پێشکەش بە خواکان کرد. نیاز و نییەتی قوربانی لەگەڵ وەرێکەوتن بوو. لە یەکەم وەجبەی قوربانیدا نیشانەکانی خێروبێر دەرکەوتن. هاوکات، ئاریکسیۆن پەراسیۆس هەرکە ڕێوڕەسمی قوربانی بەجێگەیاند، دیتی لە لای ڕاستەوە

هەڵۆیەک بەسەریاندا دەسوڕێتەوە و بۆیە خێرا داوای لە گزنفۆن کرد سەرکردایەتی لەشکر وەستۆبگرێ. پاش ئەو مەراسیمە ئەوجار لە خەندەکەکانی هەڵیانکەندبوو، گوزەران و چەکەکانیان لەنێو داڵانە بەرتەسکەکەدا تاقەت کرد و چاوەڕوانی فەرمانەکان بوون و جارچی شەیپوڕی لێدا. وەختێک ژەمی نیوەڕۆ تەواو بوو، سەربازان دەبوایە بە چەکەوە وەڕێبکەون و خەڵکی بێکار و دیلەکانیش لەوێ جێبهێڵن. لەشکر وەڕێکەوت. نێئۆن مایەوە و ناوبراویان وەک پارێزەری ئۆردوگا دیاریکردبوو. لۆکاژ و ستراتێژەکان لەگەڵ لەشکر ڕۆیشتن. ئەوانە پێیان شوورەیی بوو ڕەگەڵ لەشکر نەکەون، وەختێک گشت ئەوانی دیکە ئامادەی ڕۆیشتن بوون. ئەوانەی لە چلوپێنج ساڵ بەتەمەنتر بوون، مانەوە و باقی خەڵکیتریش وەڕێکەوت.

پێش ئەوەی سەرجەم پازدە ستادیۆ ڕێگا بڕۆن، چاویان بە کەلاکی کوژراوەکان کەوت. وەختێک چاویان بە یەکەم وەجبەی ئەو کوژراوانە کەوت، هاوکات لەگەڵ ڕێپێوان، مردوەکانیان ناشت. پاش بە خاکسپاری کوژراوەکان، لەشکر دووبارە وەڕێکەوتەوە. جارێکیتریش بەسەر کەلاکی مردواندا کەوتن. لێرەش وەک وەجبەی پێشوو، لەشکر وێستا و قەبریان بۆ کوژراوەکان هەڵکەند و بە خاکیان ئەسپاردن. وەختێک گەیشتنە سەر جادەی سەرەکی کە کۆمەڵێک کوێرەڕێی گوندەکانی دەوروبەر دەهاتنەوەسەری، کوژراوێکی زۆریان دۆزیەوە. ناچار بوون گشتیان کۆکەنەوە و لەنێو گۆڕێکی بە کۆمەڵدا بیاننێژن.

دوای ئەو کارە، دوانیوەڕۆ گەیشتنە قەراخ ئاواییەکان و هەرچی دەستیان کەوت، بۆ پارێزگاری لە خۆیان ڕۆیبوونێ و تاڵانیان کرد و بەردەوامیش ڕێگایان پێوا. لەپڕێکا چاویان بە گردێکی پێش خۆیان کەوت کە دوژمن جمجۆڵی خێرای لەسەر دەکرد. وەک ئەوەی خۆی ئامادەی جەنگ بکا و بە ستوونی سوارە و پیادە ڕیزببوون. ئەو لەشکرەی دوژمن، پیاوەکانی فارناڤازۆس بوون کە بۆ پەلامار دژی یۆنانییەکان ناردرابوونە ئەو شوێنە و لەژێر حوکمی سپیتریدات و ڕاتیندا بوون. لەشکری دوژمن چاوی بە

یۆنانییەکان کەوت، بە مەودای پازدە ستادیۆ دورتر ڕاوەستان و جێیانگرت. ئاریکسیۆنی تاڵەبین خێرا قوربانی پێشکەش کرد و نیشانەی خێروبێر دەرکەوت. گزنفۆن ڕووی لە سەربازان کرد و گوتی: " پیاوانی ستراتێژ! بە باوەڕی من باشترە هێزی یارمەتیدەر لە دواوەی لەشکر لەپشت سوارە نیزام دامەزرێنین. بەوجۆرە چاکتر دەتوانن بە هاوارمانەوە بێن. بۆ پتر ترساندنی دوژمنیش پێویستە ڕوخسارێکی نوێ بە لەشکر بدەین بۆوەی گوردان و تۆکمە بەرچاوبکەوێت".

کاتێک گزنفۆن ئەو قسانەی کرد، گشت ستراتێژەکان لەگەڵی هاوڕا بوون. ئەوسا ناوبراو درێژەی بە ئاخاوتنەکەیدا و گوتی: " سەربازان! کاتی ئەوە هاتووە پێشڕەوی بکەن و بەرەوڕووی دوژمن ببنەوە و نابێ لێرە بێ جموجۆڵ بوێستن. چونکە هەم ئێمە و هەم دوژمن هەردوکمان باش چاومان بەسەر یەکترەوە هەیە. منیش پاش دابەشکردن و دامەزراندنی دوایین گوردانەکان بەپێی بڕیارەکان بە دواتاندا دێم". لە درێژەدا ئەوانەی دیاریکرابوون بەرەو پێشەوە بچن. وەڕێکەوتن و گزنفۆنیش خەریکی ڕێکخستنی دوایین گوردانەکان بوو. ناوبراو فەرمانیدا کە هێزەکانی پشتەوە بچنە تەنیشتی ڕاستەوە و وەدوای گوردانی ژێر حوکمی سامۆلای ئاخایی بکەون. دووهەمین دەستەی بەجیا نارد بۆوەی پشتی هێزەکانی نێوەند بگرن کە ئەوانیش لەژێر فەرمانی پیریا ئارکادیدا بوون و سێهەم بەشیش لە پشت سەری گوردانی فەرماندە فراسیا ئاتێنی دامەزران. هەرسێ بەش بە یەکەوە بە مەودای یەک پلێترا پشتیوانییان لە هێزەکانی نێوەندی دەکرد.

لەو ماوەیەدا کە هێزەکانی دامەزراو خەریکی پێشڕەوی بوون، تووشی دۆڵێکی تەنگ و ناخۆش هاتن. لەبەر ئەوەی نیگەران بوون ئاخۆ پێیدا دەربازبن یا ڕاوەستن، خێرا ئەو پرسیارەیان زمان بە زمان گەیاندە ستراتێژ و لۆکاژەکان و داواکرا بەپەلە خۆیان بگەیێننە بەرەی پێشەوەی شەڕگە. گزنفۆن سەرەتا نەیدەزانی هێزەکانی پێشەوە تووشی چۆن گرفتێک هاتوون و بۆی پرسیار بوو کە بۆچی لەشکر چەقیوە. هەرکە ئاگاداری کێشەکە کرا بەپەلە خۆی گەیاندە ڕیزەکانی پێشەوە. گشت فەرماندەکان لەوێ کۆبوونەوە.

بەتەمەنتر لە هەموویان سۆفینێتۆس گوتی کە بە مەسڵەحەت نازانی لەشکر لەو دۆڵە ترسناکەدا تووشی مەترسی بکا. گزنفۆن قسەی پێبڕی و خێرا گوتی: " پیاوەکان! هەروەک دەزانن تا ئێستاشی لەگەل بێ من هیچکات لەشکرم لەبەر خواستی خۆم ڕوبەڕووی مەترسی و خەتەر نەکردوەتەوە. چونکە بەو ئاکامە گەیشتووم کە ئێوە پێویستیتان بە ئامۆژگارییەکانی من نییە و شک و گومانیش لە جوامێریتاندا بەدیناکەم. ئەوەی پێویستە بیکەین بۆوەی بە سلامەتی بگەینەوە وڵاتی خۆمان، بەو شێوەیەیە: بەبێ ئەوەی شەڕ بکەین ئیمکانی نییە لێرە دوور کەوینەوە، چونکە ئەگەر ئێمە پەلاماری دوژمن نەدەین، ئەوان سەرمان لە دوو دەنێن و هێرشمان دەکەنە سەر. ئێستا بیری لێبکەنەوە، ئێمە دەستی خۆمان وەپێش خەین و حەملەیان بکەینێ یاکوو چەکەکانمان لەسەر شان دابنێین و هەڵێین. دڵنیام ئەو وەختە دەبینین کە دوژمن چۆن وەدوامان دەکەوێ. ئەوەش باش دەزانن کە پیاو لەبەر چاوی دوژمن ڕابکا، هیچکات بە قازانجی نییە. بەڵام ئەگەر هەنگاو بە هەنگاو شەڕی لەگەڵ بکا، ترسەنۆکەکانیش وەغیرەت دەکەون.

من لەو باوەڕەدام کە بە نیوەی لەشکرەکەمان پەلاماری دوژمن بدەین. ئەوەم پێباشترە تا بە قۆشەنێکی تەیار و دووبەرابەری دوژمن هەڵێین. ئەوەش ڕوونە کە ئەگەر پەلامار لەلایەن ئێمەوە دەست پێبکا، ئەوسا تووشی دژکردەوەی ئەوان دەبین. ئەگەر پاشەکشە بکەین، ئەوان وەغیرەت دەکەون و ڕێمان‌دەکەون. ئێستا ئەگەر پێمان وایە ئەو بەرزاییە دژوارە، ناچاریشین شەڕ بکەین، نابێ بەرزی شاخەکە کاریگەری لەسەر ورەی ئێمە دابنێ بۆوەی پێیدا دەرباز بین. من پێم باشتر بوو دوژمنانمان بەو قەناعەتە بگەن کە ئێمە بەڕاحەتی دەتوانین وەسەر بکەوین و ئەوانیش پاشەکشە بکەن. ئێمە هەڵبەت دەبێ لەو شوێنەڕا دوژمن تێبگەیێنین کە هیچکات ناتوانن کارێک بکەن و هیچ چەشنە مەجالێکی ڕزگاربوونیشیان نییە. بەلای منەوە پرسیارێکی سەیرە کە هێندێک پێیانوایە ئەو بەرزاییە مەترسی‌دارتر لە گشت ئەو شاخ و بیابانانەیە کە تا ئێستا دەربازمان کردون. باشە چۆن دەتوانین بە دەشتایی دوای ئەو شاخانەدا بڕۆین ئەگەر هێزی سوارەی دوژمن شکست نەدەین. مەگەر ئەو

کێوانەی لەسەر ڕێگا دەربازمان کردن، هەموویان لەوەیان هاسانتر بوون؟ با ئەوەش بڵێم کە دوژمنی بەهێزتر بەدوامانەوە بوو! باشە ئەگەر لەجیاتی شەڕ بەرەو دەریا بڕۆین، پێتان وانییە ئەو بەحرەی ناوچەی پۆندۆ کە لە پێش خۆتاندا دەیبینن بەربەست و گرفتێکی گەورەتر لەوەی ئێستایە. لە ڕۆخەکانیش نە گەمی هەیە سواری بین و نە ئازووقە کە لە کاتی مانەوەماندا لەو شوێنە پێیبژین. ئەوەش ڕوون و ئاشکرایە کە کاتێک گەیشتینە قەراغ بەحر دەبێ ئەوەندەی دەگونجێ، لەوێش خێرا بڕۆین بۆوەی بتوانین بژیو دابین بکەین، کەوابوو باشترە شەڕ بکەین. ئێستا هێزەکانمان تێرن و وەک سبەینێ نابن کە گشتیان برسی دەبن. پیاوانی لەشکر! ئێستا بە هەڵفڕینی هەڵۆ و هێماکانی قوربانی، دەرکەوتووە کە سەردەکەوین. کەوابوو بۆ پێشەوە! با بەرەو دوژمن بڕۆین و ئێستا کە ئێمەیان دیتووە، کاتی پشوودانیشیان پێنەدەین و نەهێڵین لە هیچ جێگایەک ئۆردو لێبدەن".

دوای ئەو قسانە لۆکاژەکان فەرمانی پێشڕەوی بە لەشکردرا و کەس بۆی نەبوو لێی پاشگەز بێتەوە. گزنفۆن خۆی وەپێش کەوت و حوکمی کرد گشت لایەک ڕوو لە سەنگەرەکانی دوژمن بەرەو پێشەوە بڕۆن. ئەو لەو باوەڕەدا بوو هەرکەس لەجێوە بەرەوڕووی دوژمن بێتەوە باشترە لەجیات ئەوەی نیوەی لەشکر بە دۆڵێک و بەسەر پردێکدا دەرباز بێ کە دوو داوێنی گەڵییەکەی لە یەکتر گرێدابوو. سەربازەکان یەکبەدوای یەکدا وەڕێکەوتن و بەسەر پردی گۆریندا پەڕینەوە. کاتێک لەوێ تێپەڕین گزنفۆن لە گوڕدانەکان نیزیک بۆوە و هاواری کرد:" پیاوانی لەشکر! لەبیرتان نەچێ، تا ئێستا بە یارمەتی خواکان لە چەند شەڕی قورسدا سەرکەوتوو بووینە. هەمووشمان بەرەو ئێرە هاتووین و تکایە ئەوەش لەبەر چاو بگرن و ئەوانەش کە خۆیان لە شەڕ پاراست دیتتان چیان بەسەرهات. ئێستا لە نیزیک وڵاتی خۆمان یۆنانین. بۆ پێشەوە، خواوەند ئیراکلیس ڕێپیشاندەری جەنگەکانمان لەبیر مەکەن و هەمووتان تکایە بەناوی خۆتان یەکتر بانگ بکەن و ورە بە یەکتر بدەن. دەی پەلامار دەست پێبکەن. بڕوام پێبکەن ئەگەر کەسێک بە قسە و

عەمەل سەرکەوتوو بێ و جوامێرانە بجووڵێتەوە، زۆر خۆشە لە دواڕۆژدا ئەو سەرکەوتنانە وەبیر بێنێتەوە و بیانگێڕێتەوە ".

گزنفۆن بەدەم ئەو شێوە ئاخاوتنە بەرەو سەنگەرەکانی دوژمن هێرشی برد و فەرماندەریی هێزەکانی وەستۆگرت و لە دوو لاوە سەربازە سووکە چەکدارەکانی دانا و پێکەوە بەرەوڕووی هێزەکانی دوژمن پێشڕەوییان کرد. فەرمانیدا نێزەکان لەسەر شانیان دانێن تا ئەو کاتەی عەمەلیاتی لێدان بە شەیپوڕ ڕادەگەیێندرێ. دوای ئەوە بڕیاری پەلامار بۆ پێشەوە درا، داواکرا بە هێمنی هەنگاو هەڵێننەوە و کەس بۆی نەبوو ڕابکا. لەدرێژەدا شەیپوڕ لێدرا و دروشمی "یا خواوەندی ڕزگاری، ئیراکلی ڕێپیشاندەر" لە گشت لایەکەوە بیسرا.

دوژمن لە جێگای خۆی نەبزوتبوو چونکە لەو باوەڕەدا بوو کە ئەو شوێنە زۆر مەحکەمە. کاتێک یۆنانییەکان نیزیک کەوتنەوە، هێزەکانی سووکە چەکدار بە نەعرەتەکێشان پەلاماری دوژمنیان‌دا و لەسەر دەستوور ڕانەوەستان. بەربەرەکان دژکردەوەیان لەخۆیان نیشان‌دا و هێرشیان بۆسەر یۆنانییەکان دەستپێکرد. سوارکارەکانی دوژمن هاوڕێ لەگەڵ ڤیتینی‌یەکانی پیادە، پێکەوە بەرەو یۆنانییەکان هاتن و لە ئاکامدا هێزەکانی سووکەچەکداریان ناچار بە پاشەکشە کرد. لەوکاتەدا گوڕدانێک لە چەکدارە قورسەکانی یۆنانی وەدیار کەوتن و بە پەلە بەرەو ڕووی دوژمن بوونەوە. هاوکات شەیپوڕ لێدرا و تێکەڵ بە نەعرەتە و سرووودی ئایینی بۆ خواوەند ئاپۆلۆن بوو. نێزەکان ڕوو لە دوژمن گیران. هێزەکانی بەربەر دەرووەستی ئەو پەلامارە نەهاتن و شکستیان خوارد و ڕایانکرد. تیماسیۆن بە یارمەتی سوارەکانی ژێر فەرمانی خۆی سەری لەدوو نان و ئەوەندەی بۆی کرا لێی کوشتن. قۆڵی چەپی لەشکری دوژمنیش تووشی پەڕشوبڵاوی هات و سوارەکانی یۆنانی کەوتنە سەریان.

قۆڵی ڕاستی دوژمن نەکەوتبووە بەر پەلامارێکی قورس و بە هێمنی بەرەو تەپۆڵکەیەک هەڵکشا. کاتێک یۆنانییەکان دیتیان ئەوانە پاشەکشە ناکەن، بەو قەناعەتە گەیشتن کە هەست بە مەترسییەکی ئەوتۆ لەلایەن ئەو بەشە

ناکرێ و بەرەو ئەوانیش هێرشیان برد. دیسانیش سروود و پەلامار تێکەڵ بەیەک بوون. ئەو بەشە لە هێزەکانی دوژمن ئەسڵەن خۆی نەگرت. هێزەکانی سووکەچەکدار کەوتنە سەریان و پەرشوبڵاویان کردن. دیارە لەوانە ژمارەیەکی کەم کوژرا. هێزی سوارەی ئەوان بەلای یۆنانییەکانەوە هێشتا جێگای مەترسی بوو. یۆنانییەکان دیتیان سوارکارەکانی فارناڤازۆس هێشتا ڕیزەکانی خۆیان پاراستبوو و سوارکاری ڤیتینییش لەسەر تەپۆڵکەیەک لەلای ئەوان گیرسابوونەوە و چاویان لە ڕەوتی شەڕەکە بوو. یۆنانییەکان هەرچەند دەیانزانی لێدانی ئەو هێزە سوارەیە دژوارە، بەڵام بە مەسڵەحەتیان زانی کە پەلاماری ئەوانیش بدەن و ئەوەندەی دەکرێ فرسەتی هێرشی دووبارەیان لێبستێندرێتەوە و نەهێڵن وەغیرەت بکەونەوە. یۆنانییەکان خۆیان ڕێکخستەوە و پەلاماریان دەستپێکرد. هێزەکانی سوارەی دوژمن هەرکە چاویان بە یۆنانییەکان کەوت، خێرا بۆی دەرچوون و بە خێرایی بەرەو خوارەوە داگەڕان و وەک ئەوە دەچوو کە سوارەنیزامیان بەدواوە بێ. ئەوانیش ڕوویان لە دۆڵێکی نێو دارستان کرد و یۆنانییەکان بەڵەدی نەبوون. پێش ئەوەی یۆنانییەکان بزانن ئەو دۆڵە کوێیە، دەستیان لە هێرش کردن هەڵگرت چونکە ڕۆژ بەرەو ئاوابوون دەچوو. ئەو هێزانە تۆزێک بە درەنگی گەڕانەوە شوێنی خۆیان. دەستکەوتێکی زۆریان کۆکردبۆوە. گشتیان ئێوارە درەنگانێک بەرەو بەحر وەڕێکەوتن. ڕێگایان تا ئۆردوگا نیزیک بە شێست ستادیۆ دەبوو.

## بەشی ٦

### گرتنی غەنیمەت لە ڤیتینییەکان - هاتنی کلیئاندرۆس - کێشەی نێوان ئاغاسیاس و دیکسیپۆس - وتاری گزنفۆن و ئاغاسیاس - وڵامی کلیئاندرۆس - جوامێری و گەورەیی کلیئاندرۆس - چوونە نێو دەڤەری خیریسۆپۆس

لەدرێژەدا دوژمن سەرقاڵی کاروباری خۆی واتە دامەزراندنی ماڵوحاڵ و جێگیربوون لە شوێنێکی دیکە بوو. یۆنانییەکانیش چاوەڕوانی کلیئاندرۆس‌یان دەکرد کە بە کۆمەڵێک بەلەم و گەمییەوە بگەڕێتەوە لایان. سەربازەکانی لەشکر لەمەودوا بێ مەترسی بە وڵاغ و یەخسیرەکانەوە وەدەرکەوتن و بە ئازووقەی جۆراوجۆر وەک خواردەمەنی، گەنم، جۆ، شەراب، هەرزن، کونجی و هەنجیرەوە دەگەڕانەوە. ئەو وڵاتە هەموو شتێکی لێدەستدەکەوت. تەنیا ڕۆنی زەیتوونی لێنەبوو. هەرکاتێک لەشکر خەریکی پشوودان دەبوو، ئیزن بە سەربازەکانی لەشکر دەدرا بە مەبەستی تاڵانکردن وەدەرکەون و هەرچی دەستیان بکەوێ بۆخۆیان پاشەکەوتی بکەن. بەڵام

کاتێک لەشکر بەگشتی لە ئۆردوگاڕا بۆ هەمان مەبەست دەچووە دەرەوە، سەربازان هەرشتێکی لەسەر بریاری خۆیان پێیان بەکەڵک بوایە و تاڵانیان بکردایە پاش ڕاوێژ دەیانخستە سەر خەزێنەی لەشکر و بۆ گشت لایەک دەبوو. گشت پێداویستییەک دابین‌دەکرا. لەلایەکی‌تریشەوە خواردەمەنی و ئازووقەیەکی زۆر بە گەمییەکانیش لە شارەکانی یۆنان‌ڕا بۆ لەشکر هات کە بە ئازادی لە بەندەرەکان لەنگەریان گرت. پێشتر زانیارییەک بە خەڵکی شارەکان گەیشتبوو کە قەرارە لە شوێنی دامەزرانی لەشکر، شار و بەندەر دروست بکرێ.

جەماوەری دوژمنیش، ئەوانەی لەو دەوروبەر دەژیان، چونکە هەواڵیان پێگەیشتبوو کە گزنفۆن خەریکی دامەزراندنی شارێکە، وەفدێکیان ناردە لای ئەو و داوایان لێکرد کە چ دەتوانن لەمەر دۆستایەتی بیکەن. گزنفۆن ئەو وەفدەی بە سەربازەکان ناساند بۆوەی ڕازییان بکا کە چەندە هاسان و بە قازانج دەبێ ئەگەر شارێک لەو شوێنە بنیات‌بنرێت.

ڕاست لەو کاتەدا کلێئاندرۆس بە دوو بەلەمی نەفەر هەڵگر و بێ گەمی بارهەڵگر گەڕاوە. ئەوەش لەکاتێکدا بوو کە سەربازەکان بە مەبەستی ڕاوڕووت دەرکەوتبوون. هێندێکیان بە کێوێک هەڵگەڕابوون و مێگەلێکیان حەیوان تاڵان کردبوو. ئەو سەربازانە چوونە لای دێکسیپۆس کە تازە لە شاری تراپێزۆندا ڕایکردبوو و بەدرۆ پێیان گوت کە ئەو ڕانە مەڕە کەسانی‌تر بەتاڵانیان هێناوە. داوایان لە دێکسیپۆس کرد ئەو حەیوانانە لەلای خۆی ڕاگرێ و دەتوانێ چەند سەرێک بۆخۆی هەڵگرێ و ئەگەر فرسەتێکی گونجاو هەڵکەوت، ئەوانی دیکە ڕادەستی خۆیان بکاتەوە. دێکسیپۆس ئەو سەربازانەی دەرکرد کە چوبوونە لای و ڕایگەیاند کە ئەو مێگەلە دەبێتە مڵکی لەشکر و پاشان چووە لای کلێئاندرۆس و باسی ڕووداوەکەی بۆ ئەو کرد و گوتی کە سەربازەکان ئەو حەیوانانەیان تاڵان کردوە. پاش ئەو باسوخواسە ئەمری پێکرا کە هەرکەسێ خەریکی دزی و ڕاوڕووت بێ، خێرا بیگرن و بیبەنە لای ئەو.

ڕۆژێکیان دێکسیپۆس سەربازێکی گرت کە خەریکی دزی بوو و بردیە لای کلێئاندرۆس. کاتی بردنی سەربازەکە تووشی ئاغاسیاس هات و ناوبراو سەربازەکەی لێئەستاندەوە. ئەو سەربازە لە گوردانی ئاغاسیاسدا خزمەتی دەکرد. چەند سەربازێک لەوکاتەدا شاهیدی ڕووداوەکە بوون و پەلاماری دێکسیپۆسیاندا. پێیانگوت کە تۆ جاش و خۆفرۆشی و لەجێوە گرتیان. لەو وەختەدا چەند گەمیوانێک ئەو هەلاوبگرەیان دیت و خێرا بەرەو بەحر هەلاتن و کلێئاندرۆس خۆیشی لەگەڵیان ڕایکرد. گزنفۆن وێڕای ستراتێژەکان پێشیان بە ڕاکردووەکان گرت و بۆ کلێئاندرۆسیشیان ڕوونکردەوە کە هیچ ڕووداوێکی ئەوتۆ نەقەوماوە و ئەو هەراوهوریایەش لەبەر خاتری دەستووری ناوبراو بووە کە پێشتر بە سەربازەکانی داوە. کلێئاندرۆس لەبنەوە لەلایەن دێکسیپۆسەوە هاندرابوو، بۆیە تەواوێک ترسی لەمەر ئەو ڕووداوە ڕێنیشتبوو. ئەو پێیداگرتبوو کە دەڕوا و لە تەواوی ئاواییەکانی سەر ڕێگا ڕادەگەیێنێ کە هیچکەس جێگا و ڕێگا بە لەشکری یۆنانی نەدات و بۆ باوەڕ پێکردن نابن و مەترسی خولقێنن. دیارە ئەوکاتە شارەکانی یۆنانی لەژێر دەسەلاتی لاکێدێمۆنییەکاندا بوون.

یۆنانییەکان بەو قەناعەتە گەیشتن کە هەڕەشەکانی کلێئاندرۆس تووشی زیانی قەرەبوو نەکراویان دەکا و بۆیە داوایان لە ناوبراو کرد کارێکی ئەوتۆ نەکا. کلێئاندرۆس لە وڵامدا گوتی ناچارە یا ئەو کارە بکا، یا دەبێ ئەو کەسەی ویستوویەتی لە دێکسیپۆس بدا و ئەوەش کە سەربازەکەی لەدەستی دەرهێناوە، ڕادەستی ئەو خۆی بکرێن کە هەڵبەت مەبەستی ئاغاسیاسی دۆستی نیزیکی گزنفۆن بوو و دێکسیپۆس بەردەوام قسە و بوختانی بۆ هەڵدەبەست. گشت لایەک تووشی سەرلێشێواوی هاتبوون. فەرماندەکانی نیزامی کۆبوونەوەیەکیان سازدا و هیچ بایخێکیان بە هەڕەشەکانی کلێئاندرۆس نەدا. گزنفۆن بە سرنجێکی پترەوە دەیڕوانییە گرفتەکە و بۆیە هەستا سەرپێ و دەستی بە ئاخاوتن کرد: " سەربازەکانم! ئەو کێشەیە بەلای منەوە ئەوەندەش بێ بایخ نییە. کلێئاندرۆس گەرەکیەتی جێمانهێڵێ و بۆچوونێکی ئەرێنیشی سەبارەت بە ئێمە لە مێشکیدا نییە. ئێوە دەزانن

شارەکانی یۆنانی لیمان نیزیکن و بەدەست لاکیدیمۆنییەکانەوە حوکمڕانی دەکرێن. هەمووشیان خاوەن هێزن و لەو شارانەوە هەرکەس بخوازێ، دەتوانی بە مەیلی خۆی لەگەڵ خەڵک بجولێتەوە. ئەگەر کلیئاندرۆس سەرەتا پێشمان پێبگرێ و نەهێڵێ لە شاری ڤیزاندیۆ نیزیک بکەوینەوە و بە حاکمانی شارەکانیش رابگەیێنێ کە ڕێگا بە ئێمە نەدەن بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەلاتیان بچین و تاوانیشمان تەنیا ئەوە بێ کە خاوەن ڕێوشوێن نین و دژی لاکیدیمۆنییەکان بەبێ قانوونی جولاوینەوە و ئەگەر ئاناکسیفیۆس بەو هەواڵە بزانێ، ڕەوشەکەمان لەوەش ئاڵۆزتر دەبێ و ناتوانین نە لێرە بمێنینەوە و نە بڕۆین. ئیمڕۆ لاکیدیمۆنییەکان فەرمانڕەوایی بەحر و ویشکایی دەکەن. ئەسڵەن دروست نییە بۆ خاتری یەکدوو کەس ئێمە گشتمان لێرە بمێنینەوە و دوور لە یۆنان بژین. بۆیە دەبێ بەپێی بڕیارەکان بجولێینەوە چونکە تەواوی شارەکانی ئێمە ژێردەستەی ئەوانن. من بەش بەحاڵی خۆم (لەبەر ئەوەی دەیزانی کە دیکسیپۆس بە کلیئاندرۆسی گوتبوو کە ئاغاسیاس هیچ کارێک بەبێ دەستووری گزنفۆن ناکا) ئێوە و ئاغاسیاس لەو نێوەدا بێتاوان دەزانم. ئەگەر ئاغاسیاس خۆی بڵێ کە گزنفۆن بووەتە هۆی دروست بوونی ئەو گرفتە، هەرچەند من نەبوومە، بەلام بەوحاڵەش تاوانەکە وەستۆدەگرم. دەڵێم ئەو خەڵکە تووشی هەیەجان هات و ناماقووڵ جولایەوە و بەردەبارانی دەست پێکرد، یا هەرکردەوەیەکی ناحەزیتری بەجێگەیاندبێ ئەوە من هانمداون و ئامادەی توندترین سزاشم. هەڵبەت ئەوەش دەڵێم کە ئەگەر کەسێک تاوانی هەڵبەستبێ، دەبێ ئەویش بدرێتە دەست کلیئاندرۆس و سزا بدرێ. ئەوە تەنیا ڕێگا چارەیە کە گشتمان لە حاست ئەو تاوانانەی وەپاڵمان خستراوە ڕزگارمان بکا. بارودۆخی ئێستامان زۆر جێگای داخە. وەختێک دەگەینەوە شارەکانی خۆمان لەجیات ئەوەی ڕێزمان لێبگیرێ و خەڵک شانازیمان پێوەبکا، گەیشتووینە ئاستێک کە تەنانەت وەک خەڵکی ئاساییش وەرمان ناگرنەوە و ناهێڵن لەگەڵیان بژین ".

لە درێژەی باسەکاندا، ئاغاسیاس هەستا سەرپێ و گوتی: " پیاوانی لەشکر! من سوێند بە خواکان دەخۆم کە نە گزنفۆن و نە هیچ کەسێکیتر لە

ئێوە دەستووری بە من نەداوە کە ئەو سەربازە لەدەست دێکسیپۆس دەرهێنم. من دیتم کە سەربازێکی بە غیرەت و جوامێر لە گوڕدانی من بەدەست دێکسیپۆس ڕاکێشدەکرێ و گشتیان دەزانن ناوبراو جاش و خۆفرۆشە و زۆرم بەلاوە سەیر بوو. بەڵێ من قبوڵ دەکەم کە ئەو سەربازەم لە چنگی ناوبراو دەرهێناوە.

ئێوە پێویست ناکا من بدەنە دەست کلێئاندرۆس. من خۆم هەروەک گزنفۆن گوتی، بەتەنیا دەڕۆمە لای کلێئاندرۆس. ئەو هەر بڕیارێک بدا سەربەستە. تکایە لەبەر گرفتێکی ئەوتۆ خۆتان تووشی دوژمنایەتی لەگەڵ لاکێدیمۆنییەکان مەکەن. دڵنیاتان دەکەم سەبارەت بەو گرفتە تووشی ناڕاحەتی و کێشەتان ناکەم و گشتتان بە خۆشی و سڵامەتی دەگەنەوە یۆنان. ئەوەی من دەخوازم چەند کەس لەو سەربازانەی کە ئێوە پێتانوایە دەتوانن کارێک بکەن و قسەیەک بڵێن و بە غیرەتەوە دیفاعێک لە من بکەن، لەگەڵم بنێرنە لای کلێئاندرۆس ".

پاش ئەوەی ئەو ئیزنە بە ئاغاسیاس درا کە هەرکەسێکی گەرەکی بێ لەگەڵ خۆی ببا، ناوبراو پێشنیاری کرد کە ستراتێژەکان گشتیان لەگەڵی بچن. ستراتێژەکان ئامادە بوون و ڕەگەڵ ناوبراو کەوتن و پێکەوە چوونە لای کلێئاندرۆس و ئەو سەربازەشیان لەگەڵ خۆیان برد کە ئاغاسیاس لەدەست دێکسیپۆس دەری‌هێنابوو.

لەکاتی چاوپێکەوتندا ستراتێژەکان وەقسە هاتن و گوتیان: " کلێئاندرێ! لەشکر ئێمەی ناردوەتە لای ئێوە. ئەو سەربازانە داواکارن کە تۆ گشتمان بە تاوانبار بزانی چونکە ئەوە تۆی کە ئێمە دادگایی دەکەی. ئەگەر یەکدوو کەس یا زیادتر بە تاوانبار دەزانی، هەقت هەیە بێ هیچ گرفتێک بیانکێشیە پای مەحکەمە. ئێمە گشتمان لە بەردەستی جەنابت داین. تۆ خاوەن دەسەڵاتی تەواوی و هەرکەس بەباوەڕی تۆ تاوانبارە، سزای بدە. دڵنیا بە هیچکەس لەو کەسانەی لەژێر حوکمی ئێمەدان، ناتوانن نەیێنە حزووری جەنابت". دوای ئەو قسانە ئاغاسیاس وەنیزیک کەوتەوە و گوتی: " کلێئاندرێ! ئەوە من بووم کە سەربازەکەم لەدەست دێکسیپۆس دەرهێنا و گەرەکی بوو بیهێنێتە لای تۆ.

ئەوەش بڵێم کە ئەو سەربازە گەلێک بە غیرەت و جوامێرە. سەبارەت بە دێکسیپۆس پێویستە بڵێم کە ناوبراو کەسێکی ناسراوە. کاتێک ئێمە ماوەی پەنجا ڕۆژ خەریکی داواکاری گەمی لە تراپێزۆندییەکان بووین و لەلایەن لەشکرەوە ئەو ئەرکەمان پێ‌ئەسپێردرابوو، ناوبراو سواری گەمییەک بوو و خەیانەتی پێکردین و هەڵات. ئەو خەیانەتی بەو کەسانە کرد کە هاوبەشی گشت مەترسی و نەهامەتییەکان بوون. لەماوەی ئەو پەنجا ڕۆژەدا بۆخاتری خەراپەکاری دێکسیپۆس تووشی ئەو هەموو نێوان ناخۆشییە لەگەڵ تراپێزۆندییەکان هاتین. چەندی ئێمە دەمانزانی، ئەوەندەش ئەو تێگەیشتبوو کە چەندە دژوارە لەوێرا چ بە ڕێگای ویشکایی و چ بە ڕێگای بەحردا و بە بوونی ئەو هەموو ڕووبارانەی بەردەممان، بتوانین بگەینەوە یۆنان. خۆتان دیتتان چۆن تووشی ئەو گشتە وێرانییە هاتین.

من سەربازم لە چنگ کەسێکی ئەوتۆ دەرهێناوە. ئەگەر ئەو سەربازە لەدەست تۆ یا یەکێک لە پیاوانی ژێر فەرمانتدا بوایە، هەڵبەت نەک لەوانەی لە لەشکر ڕایانکرد، بەڵێنت پێدەدەم ئەو کارەم نەدەکرد و ئەو کێشەیەش ساز نەدەبوو. ئەوەشت لەبیر نەچێ ئەگەر ئێستا من بکوژی، پیاوێکی جوامێرت بۆخاتری کەسێکی خائین و بێ غیرەت کوشتووە ".[129]

کاتێک کلێ‌ئاندرۆس گوێی لەو قسانە بوو: " گوتی کە بە قسەی دێکسیپۆس ناکات و کردەوەکانی ناوبراویش پەسند ناکا، ئەگەر ئەو شتانەی لەسەر ناوبراو دەڵێن ڕاست بن. هەڵبەت سەرەڕای خەراپەکار بوونی ئەو کابرایە لەنێوماندا، نەدەبوایە هێرشی بکرێتە سەر. باشتر ئەوە بوو دادگایی بکرێ، هەروەک ئێستای تۆ. جەنابی ئاغاسیاس، ئەوکات ئەویش سزای خۆی بۆ دیاری دەکرا. ئێستا ئێوە بڕۆن و ئاغاسیاس لەلای من جێبهێڵن و کاتێک دادگایی دەستی پێکرد ئاگادارتان دەکەمەوە. من هیچکەس لەو بارەوە بەتاوانبار نازانم چونکە ئاغاسیاس خۆی دانی بە هەڵەکەی خۆی ناوە و دژی یاساکان هەڵسوکەوتی کردوە".

---

١٢٨- لە ئاخاوتنی ئاغاسیاس‌دا دەردەکەوێ کە مرۆڤێکی سادە و بێ خەوش بووە و قسەی خۆی بە ڕاشکاوی کردوە و دانی بە تاوانی خۆی ناوە و لە بەرامبەر خوفرۆشێکدا جوامێرانە ویستاوە.

ئەوجار سەربازەکە دەستی بە ئاخاوتن کرد و گوتی: " کلیئاندریَ! ئەگەر پێتوایە من ناهەقیم لە کەسێک کردوە، با دادگایی بکرێم. من نە لە کەسێکم داوە و نە کەسیشم بریندار کردوە. تەنیا ئەوەندەم گوتووە کە ئەو مەڕانە ماڵی گشت لایەکە. چونکە ستراتێژەکان بڕیاریان‌دابوو هەرکات تەواوی لەشکر بۆ دابینکردنی ئازووقە دەرکەوێ و لەو نێوەدا کەسێک بەتەنیا تالانێکی دەستکەوێ، ئەو تالانە دەبێتە مافی گشت لایەک. من تەنیا ئەو قسەیەم کردوە. دوایی دێکسیپۆس منی گرت و گەرەکی بوو بمهێنێتە لای ئێوە. ئەو مەبەستی بوو من بێدەنگ بکا و کەس ورتەی لێوە نەیە و خۆیشی گەرەکی نەبوو باسی بکا. لەو نێوەدا دەیتوانی بەشی خۆی بپچڕێ و حەیوانەکان لەجیات ئەوەی بۆ لەشکر بن، بەحیسابی خۆی ڕایانگرێ ".
کلیئاندرۆس ڕووی لەو سەربازە کرد و گوتی: " چونکە تۆش لەو کێشەیەدا بەشداری، دەبێ لێرە بمێنییەوە و بڕیارت لەسەر بدرێت ".
لەو نێوەدا کلیئاندرۆس و پیاوەکانی خەریکی نان‌خواردن بوون. گزنفۆن خێرا لەشکری کۆکردەوە و داوای لێکردن کە وەفدێک بنێرنە لای کلیئاندرۆس بۆوەی گیراوەکان ببەخشن. دوایی بڕیاردرا کە ستراتێژ و لۆکاژەکان و هەروەها دراکۆندیۆی سپارتی و لە خەڵکانی‌تریش بەرپرسەکان ئامادەبن بۆوەی بچنە لای کلیئاندرۆس بە مەبەستی بەردانی ئەو دوو پیاوە.
گزنفۆن لەگەڵ ئەو خەڵکە هاتنە لای کلیئاندرۆس و گوتی: " کلیئاندریَ! تۆ دوو کەس لە پیاوەکان ڕادەگری و لەشکریش ڕێگا بە تۆ دەدا کە چی دڵت دەخوازێ لەگەڵ ئەوان و ئێمە بیکەی. ئێستا ئەو لەشکرە لەبەر تۆ دەپاڕێتەوە کە ئازادیان بکەی و نەیانکوژی. چونکە ئەوانە بە درێژایی ساڵێک جوامێری نەما بۆ لەشکر نەیکەن. لەشکر داوا لە تۆ دەکا لەجیات ئەو کارە بێی و ببیە سەرکردەیان، هەڵبەت ئەگەر ئیزنی خواکانی لەسەر بێ. لەشکر بەڵێنی پێداوم کە هەم توانایی خۆی نیشان بدا و هەمیش ئیتاعەت لە تۆ بکا و بە هیممەتی خواکان و بەبێ ترس و بە فەرماندەری جەنابت دوژمن تێک بشکێنین.
سەربازەکان هەروەها داوایان کردوە ئەگەر تۆ لەنێویاندا بی و سەرکردایەتییان بکەی و دێکسیپۆس‌یش باشتر بناسی و لە نیزیکەوە توانایی

هەرکامیان ببینی، ئەوسا دەتوانی بەپێی شایستە سالاری ڕێز بۆ هەردووک لایان دابنێی ".

کاتێک کلێئاندرۆس گوێی لەو قسانە بوو، گوتی: " زۆرباشە، سوێند بە خواکان دەخۆم کە خێرا وڵامتان بدەمەوە. پیاوەکانیشتان ئازاد دەکەم و خۆشم یارمەتیتان دەدەم هەمووتان بگەنەوە یۆنان، بەو شەرتەی ئیزنی خواکانی لەسەر بێ. ئەو قسانە بەپێچەوانەی ئەو دەنگۆیانە بوون کە سەبارەت بە ئێوە بیستبووم واتە بە کردەوەکانتان خەریک بن لەشکر لە لاکێدێمۆنییەکان دوورخەنەوە ".

لەدرێژەدا ڕاسپاردەکان ڕەزایەتی خۆیان بەتەواوی دەربڕی. گیراوەکانیان لەگەڵ خۆیان بردەوە و چوونەوە ئۆردوگا. کلێئاندرۆس قوربانی پێشکەش بە خواکان کرد و داوای ڕەزایەت و مەیلی ئەوانی لەمەر پێوانی پاشماوەی ڕێگا کرد. گەلێک هێمنانە و دۆستانە لەگەڵ گزنفۆن، پێکەوە ڕاوێژێکیان سەبارەت بە ڕەوشی ڕێگا کرد. کلێئاندرۆس وەختێک دڵنیا بوو کە لەشکر بە ئیمانەوە فەرمانەکانی جێبەجێ‌دەکا، ئەوجار خوازیاری مافی سەرکردایەتی زیادتر بوو. بەڵام پاش ئەوەی سێ ڕۆژ بەدوای یەکدا قوربانی پێشکەش کرد و خواکان بە ڕۆیشتنی لەشکر ڕازی نەبوون، ناوبراو ستراتێژەکانی بانگ کرد و ڕاوێژێکی لەگەڵ کردن و گوتی: " لە هێماکانی قوربانی وادەردەکەوێ کە خواکان ئیزنیان لەسەر نییە من سەرکردایەتی لەشکر وەستۆ بگرم، ئێوە بەڵام لەو بارەوە ناڕاحەت مەبن و لە قەرار و مەدارەکان وادەردەکەوێ کە ئێوە خۆتان بەو گرفتەوە ناڕاحەت مەکەن و بەپێی بڕیارەکان هەڵسوکەوت بکەن و لەشکر لەو وڵاتە بەرنەدەر و برۆن. ئێستاش پێویستە هەرچی زووتر وەڕێکەون. ئەگەر گەیشتنە ڤیزاندیۆ ئەوسا ئێمە بە باشترین شێوە وەرتان دەگرین و میوانداریتان لێدەکەین ".

پاش ئەو باس و ڕاوێژە، نیزامییەکان بڕیاریان‌دا تەواوی ئەو مێگەلە مەڕەی بۆ لەشکر دیاری کرابوو بە ناوبراوی ببەخشن. کلێئاندرۆس ئەو دیارییەی قبوڵ کرد و دووبارە بە لەشکری بەخشییەوە، سواری گەمی بوو و لێیدا ڕۆیشت. سەربازەکان دوای فرۆشتنی ئەو برە گەنمەی کۆیان کردبۆوە،

لەگەڵ تالانێکی کە دەستیان کەوتبوو بە ڕێگای ویشکایی وڵاتی ڤیتینییەکاندا ڕۆیشتن. لەبەر ئەوەی بە ڕێگای فەرمیدا دەڕۆیین، تا گەیشتنە وڵاتی دۆست، هیچ کەرستەیەکی بەنرخیان دەست نەکەوت کە بتوانن وەک دیاری و ماڵی خۆیان چاوی لێبکەن. بۆیە بڕیاریان‌دا کە دووبارە بەو ڕێگایەدا بگەڕێنەوە کە مەودای شەو و ڕۆژێک دەبوو. لەکاتی گەڕانەوەدا کۆیلەیەکی زۆریان دەست کەوت و مەڕ و ماڵاتێکی فرەشیان تالان کرد. پاش شەش ڕۆژ، ئەوسا گەیشتنە شاری خریسۆپۆلیس لە ناوچەی کالخیدۆنی.

# کتێبی حەوتەم

## بەشی ١

**فریوخواردنی ئاناکسیڤیۆس، حاکمی ناوگانی گەمییەکانی سپارتی، بەهۆی فارناڤازۆس - فریودانی یۆنانییەکان و دەرکردنیان لە شاری ڤیزاندیۆ (بیزانس) - دووبارە چوونەوەی یۆنانییەکان بۆ نێو شاری ڤیزاندیۆ - ئارام کردنەوەی لەشکری یۆنانی بەهۆی گزنفۆن - سەرکردایەتی کردنی کورتخایەنی کیراتاداس**

کۆی ئەو هەڵسوکەوتانەی بە درێژایی ڕێپێوانی یۆنانییەکان لەگەڵ کوروش تا شەڕی کوناکسا و گشت بەسەرهاتەکانیان بەدوای کوژرانی ناوبراوەوە و ڕەوتی گەڕانەوەیان تا گەیشتنە وڵاتی پۆندۆ، لەگەڵ ئەو ڕووداوانەی کاتی ڕۆیشتنیان بە ویشکایی و بەحر لەو هەرێمەدا هەتا خریسۆپۆلیس لە ئاسیای بچووک، هەرهەموویان بەوردی باسیان لێوەکرا.

لەدرێژەی ڕێپێوانی لەشکردا، فارناڤازۆس چونکە ترسابوو مەبادا یۆنانییەکان پەلاماری وڵاتەکەی بدەن، پەیامێکی بە ڕاسپاردە بۆ گەمیوان

ئاناکسیڤیۆس نارد کە ئەو کاتە لە شاری ڤیزاندیۆ دەبوو. فارناڤازۆس بەڵێنی دابوو ئەگەر لەشکر بە ئاسیادا(بەشی ئوروپا) دەرباز بێ، ئەو پێداویستییەکانیان بۆ دابین دەکات.

ئاناکسیڤیۆس لە شاری ڤیزاندیۆ، بانگهێشتی ستراتێژ و لۆکاژەکانی کرد. بەڵێنی پێدان ئەگەر بە ڤۆسپۆردا بڕۆن، ناوبراو مووچەی تەواوی سەربازەکان وەستۆی خۆی دەگرێ. یۆنانییەکان گوتیان کە پێویستە بیری لێبکەنەوە و وڵام بدەنەوە. گزنفۆن بە ئاناکسیڤیۆسی گوت کە دەخوازێ لە لەشکر دوور کەوێتەوە و بگەڕێتەوە یۆنان. ئاناکسیڤیۆس لەبەر گزنفۆن پاڕاوە کە سەرەتا لەگەڵ لەشکر بە ئاسیادا بڕوا پاشان بگەڕێتەوە یۆنان و ناوبراو ئەو داوایەی قبوڵکرد.

حوکمڕانی وڵاتی تراکی واتە سێئیتیس کەسێکی بەناوی میدۆساد ناردە لای گزنفۆن و داوای لێکرد لەشکر وەڕێخا، چونکە ئەوە بە قازانجترە. گزنفۆن لە وڵامدا گوتی: " لەشکر بەبێ ئەو داوایەش وەڕێدەکەوێ و من لەو باوەڕەدام سێئیتیس قەرار نییە نە بۆ من  و نە بۆ هیچ کەسێکی دیکە خێرێکی هەبێ. وەختێک لەشکر تێپەڕی ئەوکات منیش بۆ وڵاتی خۆم دەڕۆمەوە. ئەویش بەو کەسانەی دەمێننەوە، جا چ سەرکردەی لەشکری بن یا خاوەن پلەی لۆکاژ بۆ سەرەوە، چی پێیخۆشە بیانداتێ ".

لە درێژەدا لەشکر بە ڤۆسپۆردا تێپەڕی و گشت سەربازەکان گەیشتنە ڤیزاندیۆ. ئاناکسیڤیۆس بەڵام لە جێبەجێکردنی بەڵێنی مووچە پاشگەز بۆوە. بەپێچەوانەوە داوای لە لەشکر کرد بە چەک و باروبنەوە و بە پاراستنی ڕیزەکانی نیزامی، لە شار وەدرەکەون. سەربازەکانی یۆنانی لەو کارەی ناوبراو زۆر ناڕاحەت بوون چونکە هیچ توانایيەکی ماڵی ئەوتۆیان نەبوو کە ئازووقە بۆ پاشماوەی ڕێگایان دابین بکەن. هەر بۆیە بە خەمناکییەکی لەڕادەبەدەر باروبنەیان کۆکردەوە.

گزنفۆن لەوکاتەدا میوانی سەرکردەی نیزامی واتە کلێئاندرۆس بوو. بۆ خواحافیزی چووە لای ناوبراو. کلێئاندرۆس ڕووی لە گزنفۆن کرد و پێیگوت: " تۆ نابێ بڕۆی، ئەگەر ئەوکارە بکەی لەلایەن خەڵکێکەوە تاوانبار

دەکرێ کە تۆ هۆکاری وەدرەنگ کەوتنی ڕۆیشتنی لەشکر بوویە". گزنفۆن لە وڵامی کلیئاندرۆس‌دا گوتی: " من لەو بارەوە هیچ تاوانێکم نییە. نیزامییەکان خۆیان تاوانبارن. لەبەر ئەوەی پێویستیان بە ئازووقە و بژیو هەیە، ناڕاحەتن و خۆیان لە ڕۆیشتن پاراستووە". کلیئاندرۆس گوتی: " من داوات لێدەکەم لەگەڵ لەشکر بڕۆی، کاتێک لەشکر لە شار وەدەرکەوت، تۆش ئەو وەختە دەتوانی ڕێگای خۆت بەتەنیا بگریەبەر". گزنفۆن پێشنیاری بە کلیئاندرۆس کرد کە پێکەوە بچنە لای ئاناکسیڤیۆس و باس لەو گیروگرفتە بکەن و ڕاوبۆچوونی خۆیان بە ناوبراو بڵێن. پێکەوە چوون و کێشەکەیان خستە بەردەم ناوبراو. ئاناکسیڤیۆس داوای کرد کە پێشنیارەکەی کلیئاندرۆس وەبەر چاو بگیرێت، واتە لەشکر هەرچی خێراتر باروبنەی تێکبنێ و لەشار وەدەر بکەوێ و گوتیشی کە ڕابگەیێنن هەرکەس لەکاتی سەرژمێری لەشکردا خۆی بواردبێ سزادەدرێت.

سەرەتا ستراتێژەکان و پاشان ئەوانی دیکە و بەرەبەرە تەواوی لەشکر وەڕێکەوتن. تەنیا ژمارەیەکی کەم لەنێو شاردا مانەوە. ئێتیئۆنیکۆ لەبەر دەروازەکانەوە وێستابوو و حوکمی پێبوو کە هەر کە لەشکر بەتەواوی لە شار چووەدەر، خێرا دەروازەکان ببەستێ.

ئاناکسیڤیۆس هاتەدەرەوە و ستراتێژ و لۆکاژەکانی بانگ کرد و پێیگوتن: " ئازووقەی ڕێگاتان دەتوانن بە ڕاحەتی لە گوندەکانی تراکی وەدەست بێنن. چونکە لەوێ گەنم و جۆ و هەرچی گەرەکتانە بە فراوانی هەیە. پاش ئەوەی بە ڕادەی پێویست بژیوتان وەدەست کەوت، ئەوجار بچوونە خێرسۆنیسۆ و لەوێ کینیسکۆس‌یش مووچەتان دەداتێ".

سەربازەکان هێندێکیان لە دوورەوە گوێیان لەو قسانە بوو و بەشێکی زۆریشیان بەنهێنی و بە دەستووری لۆکاژەکانەوە ئاگاداری ئەو ئاخاوتنانە بوون. لەو وەختەدا ستراتێژەکان پرسیان کە کاتێک ناچارن بڕۆن ئایا وەک دۆست یا دوژمن چاو لە حاکم سیئیتیس بکەن، هەروەها دەبێ بە کێوی پێڕۆدا[130] تێپەڕن یا دەبێ بە وڵاتی تراکی‌دا دەور لێبدەنەوە.

---

١٢٩- چیای تراکی لە نێوان خێرسۆنیسۆس و پێرینتۆ هەڵکەوتووە و ئیمڕۆ پێیدەگوترێ تەکیداغ.

لەماوەی ئەو وتوێژەدا، ژمارەیەک لە سەربازەکان چەکەکانیان دەستدایە و خێرا بەرەو دەروازەکان ڕایانکردەوە بۆوەی بچنەوە نێو شار. ئێتیئۆنیکۆس لەگەڵ پاسەوانەکانی وەختێک چاویان بە سەربازانە کەوت بەرەو دیوارەکان هەڵاتن، خێرا دەروازەکانیان داخست و پشتێندەکانیان داداوە. سەربازەکان نیزیک بوونەوە و وەرگەڕانە لێدانی دەروازەکان و دەنگی نارەزایەتییان لێ بەرز بۆوە و هاواریان کرد کە ئەوە ناهەقییە بەو شێوەیە ئازار بدرێین و دەربکرێین و بێ دەسەلات بدرێینە دەست دوژمن. بەردەوام هەڕەشەیان کرد کە دەروازەکان دەشکێنن ئەگەر بە خۆشی نەکرێنەوە. هێندێک لە سەربازەکان بەرەو بەحر ڕایانکرد و وەسەر دیواری شەپۆلگێڕەوە کەوتن و بەسەر مۆرەی دەرەوەی قەراخ بەحردا دووبارە هاتنەوە نێوشار. چەندێکیتریش بە هەڵکەوت لەنێو شاردا مابوونەوە. ئەوانە وەختێک دیتیان لە نیزیک دەروازەکان چقەوماوە، لە نێوەوەڕا نیزیک کەوتنەوە و بە بیور کەوتنە گیانی دەروازەکان و قفڵ و پشتێندەی درگا دوو توێکانیان شکاند و ئەوانەش کە لە پشت درگاوە بوون گشتیان هاتنە ژوورەوە.

گزنفۆن وەختێک چاوی بەو هەرا و هورایە کەوت، لەوەی مەبادا لەشکر دەست بە تالان بکا و ڕووداوی ناخۆش بۆ سەربازەکانی نێو شار یا ئەوانەی حەولی گەڕانەوەیان دەدا، بێتە پێش تەواوێک تووشی نیگەرانی هات. دانیشتووانی شاری ڤیزاندیۆ کاتێک چاویان بە سەربازەکان کەوت کە بەو شێوەیە پەلاماری نێو شار دەدەن، لە بازارڕا ڕوویان لە هەڵاتن کرد. هێندێک بەرەو گەمییەکان و بەشێکیش بۆ ماڵەکانیان چوون. ئەوانەی بە هەڵکەوت لە ماڵەکانیان بوون خێرا دەستی ماڵومنداڵیان گرت و ڕایانکرد. بەشێکیش چوونە کەنارئاوەکانی دەریا و بەلەم و لۆتکەکانیان خستە سەرئاو بۆوەی خۆیان دەرباز بکەن. گشتیان لەوە دەترسان کە شار داگیر کراوە و هەموو شتێک وێران بووە. ئێتیئۆنیکۆس پەنای بۆ قەڵا برد بۆوەی گیانی خۆی لە مەترسی کوشتن ڕزگار بکا. ئاناکسیڤیۆس بە غاردان بەرەو بەحر ڕایکرد و سواری بەلەمی ماسی گرتن بوو. دەورێکی شاری لێدا و خۆی گەیاندە قەڵای شار.

ناوبراو خێرا دەستوبردی کرد و بەدوای پاسەوانانی کالخیدۆنیدا نارد کە خۆیان بگەیێننە قەڵا. ئەو لەو باوەڕدا بوو کە هێزەکانی ئەوێ توانایی بەرگری و پاراستنی قەڵایان لە هەمبەر هێزە یۆنانییەکاندا نییە.

سەربازەکان هەرکە چاویان بە گزنفۆن کەوت خێرا لێی نیزیک کەوتنەوە و پێیانگوت: " گزنفۆن بڕوانە! ئیمڕۆ ڕۆژی تۆیە کە جوامێری و پیاوەتی خۆت بنوێنی. ئەوە شارت لەبەردەستدایە، گەمی و بەلەم هەن، پارە و سامان و گشت لەشکر هەموویان لە خزمەتتدا. ئێستا کاتی ئەوە هاتووە گرینگی و بەوەجی خۆت سەبارەت بە ئێمە بسەلمێنی و ناسراو بی". گزنفۆن بڕیاریدا سەرەتا تۆزێک هێوریان بکاتەوە. بۆیە دەستی بە ئاخاوتن کرد و لە وڵامی سەربازەکاندا گوتی: " پیاوانی لەشکر! شک لەوەدا نییە کە هەقتانە و منیش بە خواستی ئێوە دەجوڵێمەوە. هەڵبەت بۆوەی ئەو کارە بکرێ، واتە خواستەکانی ئێوە بەجێ بگەن هەرچی زووتر چەکەکانتان دابنێن و لە ڕیزەکانی نیزامیدا جێبگرن". گزنفۆن پێشنیارەکانی خۆی بە لەشکر گوت و داواشی لە هێندێکیان کرد کە خێرا داخوازییەکەی بە تەواوی لەشکر ڕابگەیێنن. لە درێژەدا گشت سەربازەکان بە خواستی خۆیان و بەبێ دەستووری فەرماندەکانیان چەکەکانیان دانا و تەرتیباتی نیزامییان بەخۆوە گرت. لە ماوەیەکی کورتدا چەکدارەکان بە غاردان سیلاحەکانیان دانا و لە ڕیزەکانی هەشت کەسیدا وێستان. سووکە چەکدارەکانیش ڕکەبەرایەتی ئەوەیان بوو کە کامیان دەتوانێ لە دوو ڕیزی پێشەوەی لەشکردا جێبگرن.

ئەو شوێنەی لێی کۆببوونەوە، پێیدەگوترا تراکیۆ و باشترین گۆڕەپان بۆ خۆنیشاندان و سانی نیزامی بوو. دەشتێک بوو و خانوو و بینای لێ دروست نەکرابوو. پاش ئەوەی چەکەکانیان دانا و ئارام بوونەوە، ئەوسا گزنفۆن لەشکری بانگ کرد و لە دەوری خۆی کۆی کردنەوە و گوتی: " سەربازان! ئێستا ئەبەدا بۆ من جێگای پرسیار نییە بۆچی ئێوە تووشی ئەو گشتە غەززەبە هاتوون و ئاوا ناڕاحەت بوونە. ئێوە درۆتان لەگەڵ کراوە و فریو دراون، بۆیە ئەو گشتە نەهامەتییەتان بەسەر هاتووە. ئەگەر ئێوە هەروا بە قەڵسی و تووڕەییەوە بمێننەوە و دانیشتووانی لاکێدێمۆنی سەبارەت بە

خەیانەتەکانیان سزا بدەن و شارەکە تالان و وێران بکەن کە ئەسڵەن لەوبارەوە تاوانبار نییە، دەبێ حیسابی ئەوە بکەن کە بەرهەمێکی ناحەزی لێدەکەوێتەوە و تووشی گرفتی ناخۆشتر دەبین. ئەوکاتە دەبینە دوژمنی سەرەکی لاکێدیمۆنییەکانی ئێرە و هاوپەیمانەکانیان. هەر شەڕێکی نابەرامبەر لە نێوانماندا ساز بێ، ئاکامێکی ناخۆش و زەرەدێکی زۆری بۆ ئێمە بەدواوە دەبێ. ئێوە دەزانن کە ئێمەی ئاتێنی کاتی خۆی دژی لاکێدیمۆنییەکان شەڕمان کرد. ئەو وەختە ئێمە نیزیک بە سێ سەد گەمی نەفەر هەڵگرمان هەبوو. لەوانە بەشێکیان لەنێو ئاوەکاندا بوون و باقی‌تریش لەنگەریان گرتبوو. هەرچەند ناخوازم حیسابی ئەو پارەیە بکەم کە لە خەزێنەی شاری ئاتێن‌دا بوو و دەگەیشتە نیزیک بە هەزار تالاند، ئێمەماڵیاتی ساڵانەشمان کۆدەکردەوە. ئەو ماڵیاتە هەم لە خەڵکی ناوچەی ئەتیکی و هەمیش لە هاوپەیمانەکان وەردەگیرا. هەرچەند تەواوی دورگەکان و زۆربەی شارەکانی ئاسیا و ئوروپا و زۆر شاری دیکە کە پێویست ناکا ناویان‌بێنم و تەنانەت شاری ڤیزاندیۆش کە ئێستا بەو جۆرەی خۆتان بینیتان و لێی وەڕوورکەوتین، هەرهەموویان لەژێر فەرمانڕەوایی ئێمەدا بوون. ئێستا دەبێ بیر لەوە بکەنەوە کە تووشی گرفتێکی چەندە ناخۆش دەهاتین ئەگەر ئەو شارەمان تالان بکردایە. دەزانن کە لاکێدیمۆنییەکان، هاوپەیمانانی قەدیمی‌یان هەرماون. ئاتێنییەکان و هاوپەیمانانی پێشوویان لەڕووی ناچاری چوونەتە بەرەی لاکێدیمۆنییەکان. لەولاشەوە تیسافێرن و باقی بەربەرەکان حوکمڕانی تەواوی دەریاکان دەکەن و هەر ئێستا پاشای گەورەش بەردەوام دوژمنایەتیمان دەکا. لەبیرمەکەن ئێمە دژی ئەو لەشکرکێشیمان کرد بۆوەی لەسەر تەختی پاشایەتی لایبەرین و ئەگەر بۆمان کرابا دەمانکوشت. لە حاڵی حازردا گشت ئەو لایەنانە یەکیان گرتووە. ئێستا پرسیار لە ئێوە دەکەم: ئایا کەس لەنێو ئێوەدا ئەوەندە نەفامە کە بڵێ ئێمە دەمانتوانی لێرە شکستیان پێبدەین و حکوومەتیان بەسەردا بکەین. بێگومان نا! بەناوی خواکان سوێند دەخۆم وڵامەکەتان نایە. با ئەوەندەش ساویلکە نەبین. نە وێرانییەک بخوڵقێنین و نە شەرمەزاریش بین و نە دوژمنایەتی وڵاتی خۆمان بکەین و

دۆست و خزمان بڕەنجێنین. ئەگەر ئەو وڵاتە تاڵان و وێران بکەین، خەڵکی خوودی ئەو شارانە لێمان هەڵدەگەڕێنەوە. ئاخر تا ئێستا بەو هەموو هێزەمانەوە شارێکی بەربەرەکانمان داگیر و وێران نەکردوە، ئەی بۆچی هەر گەیشتینەوە یەکەم شاری یۆنان، دیسانیش دووپاتی دەکەمەوە، یەکەم شاری یۆنانی لەسەر ڕێگامان، دەبێ تاڵان و وێرانی بکەین؟ ئەویش ئەو شارەی پەنامان بۆ هێناوە. من بەش بە حاڵی خۆم پێش ئەوەی قەومانێکی ئەوتۆ ڕووبدا، ئاواتمە لەژێر هەزاران ئۆرغی خاکدا نێژرابم. بۆیە پێشنیارتان پێدەکەم کە ئێوەی یۆنانی بەقسەی لاکێدیمۆنییەکان بکەن و حەوڵبدەن ئەوەی هەق و مافی ئێوەیە وەدەستی بێنن. ئەگەر ئەوەش کارێکی ئەوەندە هاسان نییە، واتە بە مافی خۆتان نەگەیشتن، دیسانیش کارێکی ئاوا مەکەن کە لە یۆنان وەدەرمان بنێن.

ئێستا بە باوەڕی من باشتر ئەوەیە کە وەفدێک بنێرینە لای ئاناکسیڤیۆس بۆوەی پێی بڵێ کە ئێمە بۆیە هاتووینەوە نێو شار، بۆوەی قازانجێکیان پێبگەیێنین. ئەو کارەم پێباشە. ئەگەر نا، لانیکەم پێیان ڕابگەیێنین کە ئێمە لەشار وەدەر دەکەوین، نەک لەبەر ئەوەی خەیانەتمان پێکرابێ و فریومان خواردبێ، بەڵکوو ویستوومانە یاسا لە ژێر پێ نەنێین.

ئەو بڕیارانەیاندا. ڕاسپاردەیان ناردە لای کاربەدەستانی شارەکە بۆوەی وڵامێک وەرگرنەوە. وەفدەکە لە یێرۆنیمۆ خەڵکی ئێلیۆ، ئێڤریلۆخۆ خەڵکی ئارکادی و فیلیسیۆ خەڵکی ناوچەی ئاخایی پێکهاتبوو. ئەوانە ڕێککەوتن بۆوەی ئەو بڕیارانە بە گوێی کاربەدەستانی شارەکە بگەیێنن.

لەو ماوەیەدا کە سەربازەکانی یۆنانی چاوەڕوانی هەواڵی گەڕانەوەی ڕاسپاردەکانیان دەکرد، کیراتاداس خەڵکی ئێڤێئۆس بەردەوام حەولی دەدا پلەی سەرۆکایەتی لەشکریی پێبسپێرن. ناوبراو هەمیشە لەنێو خاکی یۆناندا سەفەری دەکرد و جارێ دوور نەخرابۆوە و بەدوای پلەیەکی نیزامی ئەوتۆوە حەوداڵ ببوو. کیراتاداس لە زۆر شار و لەنێو گەلێک لە میللەتەکاندا گەڕابوو کە پێویستیان بە ستراتێژ هەبوو و قەول و بەڵێنی فرەی دابوو بەڵکوو وەریگرن. لەو وەختەدا هاتبووە لای سەربازەکانی یۆنانی و گوتبووی

که ئامادەیە ڕێنوێنییان بکا و بیانگەیێنێتە دیلتای ولاتی تراکی، واتە ئەو شوێنەی کە سەربازەکان دەتوانن خێروبێرێکی زۆریان پێبگا. ناوبراو بەڵێنی ئەوەشی دابوو کە سەربازەکانی لەشکر تا دەگەنە ئەو دەڤەرە، لەبابەت ئازووقە و شەڕابەوە بە تەواوی دابینیان دەکات.

سەربازەکان هەرکە گوێیان لەو قسانە بوو، هاوکات وڵامی ئاناکسیڤیۆس‌یش هاتەوە کە گوتبووی ئەگەر لەشکر پشتیوانی لەو بکا، پەشیمان نابێتەوە چونکە خۆی لە ڕێگای کاربەدەستانییەوە حەول دەدات یارمەتییان بدا. سەربازەکانی لەشکر خێرا پێشنیاری کیراتاداس‌یان پەسند کرد و ناوبراویان کردە ستراتێژ و لە شار وەدەر کەوتن. کیراتاداس داوای سەربازەکانی قبوڵ کرد و بەڵێنی‌دا ڕۆژی دوایی بۆ بەڕێوەچوونی ڕێوڕەسمی قوربانی، گەنم و شەڕاب و تاڵەبین لەگەڵ خۆی بێنێ.[131]

وەختێک لەشکر لە شار وەدەر کەوت، ئاناکسیڤیۆس دەستووری‌دا دەروازەکان داخەن و ڕاشیگەیاند کە هەر سەربازێک لەنێو شاردا دەستگیر بکرێت، خێرا وەک کۆیلە دەفرۆشرێت. کیراتاداس ڕۆژی دوایی هاتە لای سەربازەکان. ئاژەڵی قوربانی و تاڵەبینی لەگەڵ خۆی هێنابوو. بیست کەسێکی لەگەڵ بوو. ئەوانە ئاردیان لەسەر شانی دانابوو و دەیانهێنا. بیست کەسێکی‌تریش شەڕابیان پێبوو. سێ کەس ڕۆنیان هەڵگرتبوو و دوو کەسیش سیر و پیوازیان پێبوو. پاش ئەوەی گشت ئەو کەلوپەلەی بەسەر سەربازەکاندا دابەشکرد، خۆی بە مەبەستی ئامۆژگاری و ئیزنی خواکان قوربانی پێشکەش کرد.

گزنفۆن ئەوکاتە داوای لە کلی‌ئاندرۆس کرد بێتە لای. لەبەر ناوبراو پاڕاوە کە یارمەتی بدا دووبارە بچێتەوە نێو شار و بەرەو یۆنان بڕوا. کلی‌ئاندرۆس چاوی بە گزنفۆن کەوت و لە وڵامیدا گوتی کە داوایەکی ئەوتۆ گەلێک سەختە

---

١٣٠- یونانییەکانی قەدیم لەکاتی لەشکرکێشیدا بەردەوام تاڵەبینیان لەگەڵ خۆیان بردوە. سەرەڕای ئازووقە و بژێو و ماڵات بۆ سەر بڕین، وەجبەی ئاژەڵی قوربانی بەجیا داندراوە. ئەوان پێویستییان بە ڕێنوێنی و ئامۆژگاری و ڕازامەندی خواکان لە هەموو کات و ساتەکاندا هەبووە. نموونەی بەرچاو، بوونی تاڵەبین کالخا کە لەگەڵ ئارغێوسەکان لە شاری تریا لە شەڕیترووادا بەشداری کردوە.

جێبەجێ بکرێت. ئاناکسیڤیۆس پێشتر بە کلێئاندرۆسی گوتبوو کە بە مەسڵەحەت نازانێ سەربازەکانی یۆنانی بەردەوام نیزیکی دیوارەکانی شار بکەونەوە و گزنفۆنیش لەنێو شاردا بێ. چونکە خەڵکی شار بە گومان و دڕدۆنگییەوە سەیری ئەوان دەکەن. کلێئاندرۆس هەروەها لەوڵامدا گوتی کە ئاناکسیڤیۆس زەمانێک ڕێگا بە گزنفۆن دەدا کە لەگەڵ کلێئاندرۆس خۆی پێکەوە بڕۆن.

گزنفۆنماڵئاوایی لە سەربازەکانی لەشکر کرد. لەگەڵ کلێئاندرۆس چووە نێو شار. کیراتاداس، ئەویش بەنۆرەی خۆی هیچ نیشانەیەکی خێروبێری لە قوربانییەکاندا بەدی نەکرد و خۆی لەو برە ئازووقەیەش پاراست کە بەسەر لەشکردا دابەشی بکا. ڕۆژی دوایی، کاتێک ئاژەڵەکانی ئامادەی قوربانیکردن و تاجی لەسەر سەری خۆی نابوو و چاوەڕوانی بەڕێوەچوونی ڕێوڕەسمەکە بوو، لەنەکاو تیماسیۆن داردانی، نێئۆن ئاسینێئی و کلێئانۆر ئۆرخۆمێنیۆسی لێی چوونە پێش و پێیانگوت دەست لە قوربانی کردن هەڵگرێ. لەبەر ئەوەی ئازووقەی بەسەر سەربازاندا دابەش نەکردوە، ناتوانێ سەرۆکایەتی لەشکر بکا. کیراتاداس حوکمی ستراتێژەکانی قبوڵ کرد و دەستووریدا ئازووقە دابەش بکرێ. لەبەر ئەوەی پێویستی بە بژیوی لەوە زیادتر هەبوو و ئەوەندەش کە هاتبوو تەنیا بەشی ڕۆژێکی دەکرد، ناوبراو خێرا بۆی دەرچوو. تەنیا ئاژەڵەکانی قوربانی لەگەڵ خۆی برد و بەو شێوەیە دەستی لە سەرۆکایەتی لەشکریش هەڵگرت.

## بەشی ٢

### باس لەسەر درێژەدانی پاشماوەی ڕێگا - فرۆشتنی چوار سەد سەربازی یۆنانی لەنێو شاری بیزانس - وتووێژی گزنفۆن و سیڤتیس

دوای ئەو ڕووداوانە نیئۆن ئاسینیئی، فرینیسکۆس و فیلیسیۆس و کسانتیکلیس ئاخایی و تیماسیۆن داردانی بەرەو دێهاتەکانی تراکی لە دەوروبەری ڤیزاندیۆ وەڕێکەوتن و لەوێ ئۆردویان لێدا. لەو نێوەدا ستراتیژەکان کێشەیان لە نێواندا ساز بوو و لێک جیا بوونەوە. کلیئانۆر و فرینیسکۆس گەرەکیان بوو لەشکر بەرنە ژێر دەسەڵاتی سیڤتیس تراکی، چونکە ناوبراو ئەو دوو کەسەی ڕازی کردبوو کە ڕەگەڵی بکەون و بە بەرتیل هەڵیفریواندبوون. بۆ یەکیان ئەسپی ناردبوو و بۆ دووهەمیشیان ژنێک. نیئۆن گەرەکی بوو بەرەو خێرۆنیسۆ بڕوا. ئەو لەو باوەڕەدا بوو کە ئەگەر بچێتە ژێر دەسەڵاتی لاکێدیمۆنییەکان، ڕەنگە ببێتە فەرماندەری گشتی لەشکر. تیماسیۆن پێیوابوو ئەگەر دووبارە بگەڕێتەوە ئاسیا، ڕەنگە بەو شێوەیە هاسانتر بگەڕێتەوە وڵاتی خۆی. لە ڕاستیدا هەرسێکیان خاوەن یەک مەبەست بوون.

لەبەر ئەوەی زەمان بە خێرایی تێپەڕ دەبوو، هێندێک لە ستراتێژەکان چەکەکانیان دانا و داوایان لە وڵاتی تراکی کرد کە ڕێگای وەرزێری و زەراعەتیان پێبدا. بەشێکیش لە سەربازەکان لەگەڵ خەڵکی ناوچە تێکەڵ بوون و ڕوویان لە شارەکانی دیکە کرد.

ئاناکسیڤیۆس کاتێک لە بارودۆخی نالەباری لەشکری یۆنان ئاگادار بۆوە، گەلێک خۆشحاڵ بوو لەوەی بەو چەشنە لێکدابراون. ناوبراو لەو باوەڕەدا بوو کە بەو چارەنووسەی تووشی لەشکری یۆنانی هاتووە، ئەو لەلای فارناڤازۆس قەدری زیادتر دەبێ.

ڕاست لەو سەردەمەشدا ئاناکسیڤیۆس بە گەمی لە شاری ڤیزاندیۆڕا وەڕێکەوت. ناوبراو لە شاری کیزیکو دیدارێکی لەگەڵ ئاریستارخۆس بەئەنجام گەیاند کە لەجیات کلێئاندرۆس بۆ شاری ڤیزاندیۆ دیاریکرابوو. هێشتا دەنگۆی ئەوە لەگۆڕێدا بوو کە پۆلۆس قەرارە وەک دەریادار لە جیاتی ئاناکسیڤیۆس ئیدارەی ناوگانی دەریایی وەستۆ بگرێ. ئاناکسیڤیۆس ئەو کاتە پێشنیاری بە ئاریستارخۆس کرد کە ئەو ژمارە سەربازەی لەشکری کوروش کە لەنێو شاری ڤیزاندیۆدا ماوەن وەک کۆیلە بفرۆشرێن.

ئاریستارخۆس وەختێک گەیشتە ڤیزاندیۆ نیزیک بە چوارسەد کەسی لەو سەربازانەی لەشکری یۆنانی فرۆشت. لەحاڵێکدا کلێئاندرۆس کە خاوەن بۆچوونێکی سیاسی‌تر بوو، هیچکام لەو سەربازانەی نەفرۆشتبوو. بەپێچەوانەوە، ئەوانەی نەخۆش بوون یارمەتی دابوون، چونکە هەستی بە ئازارەکانیان کردبوو و حوکمی لەسەر خەڵکی شاریش کردبوو کە نەخۆشەکان لە ماڵەکانیاندا بەخێوبکەن و خزمەتیان بکەن.

لەو نێوەدا ئاناکسیڤیۆس لەسەر ڕێگا گەیشتە پاریۆ و لەوێوە ڕاسپاردەی ناردە لای فارناڤازۆس بۆوەی بەڵێنەکانی نێوانیان وەبیر ناوبراو بخاتەوە. فارناڤازۆس کاتێک ئاگادار کرایەوە کە حاکم ئاریستارخۆس گەیشتووەتە شاری ڤیزاندیۆ و ئاناکسیڤیۆس‌یش لە حوکم کەوتووە، ئیتر ڕوویەکی خۆشی بە ئاناکسیڤیۆس نیشان نەدا. فارناڤازۆس لەڕاستیدا هەمان ئەو بەڵێنانەی

کاتی خۆی بە ئاناکسیڤیۆسی دابوو، هەر بەو شێوەیەش لەگەڵ ئاریستارخۆس مامەڵەی لەمەر پاشماوەی لەشکری یۆنانی کرد.
لە درێژ ماوەدا ئاناکسیڤیۆس داوای وتووێژی لەگەڵ گزنفۆن کرد کە ئەو کاتە پێکەوە لە سەفەر بوون. ناوبراو داوای لە گزنفۆن کرد بەهەر شێوەیەکی گونجاو بگەڕێتەوە دواوە بۆوەی بەهەر ڕێگایەکدا بکرێ، لەشکری پەرشوبڵاوی یۆنانی وەسەر یەک بخاتەوە و بە ڕێگای ویشکاییدا بیانگەیێنێتە پێرینتۆس و لەوێشەوە بەرەو ئاسیا بڕۆن. ئاناکسیڤیۆس بۆ ئەو کارە گەمییەکی نەفەر هەڵگری لە ئیختیار گزنفۆن نا. پیاوەکی لەگەڵ گزنفۆن نارد کە هەڵگری نامەیەک بۆ کاربەدەستانی ناوچەی پێرینتۆس بوو. لە نامەکەدا داوای کردبوو کە هەرچی خێراتر هێزێکی سوارە تا ئەو شوێنەی سەربازەکانی لێهەن، یارمەتی گزنفۆن بدەن. گزنفۆن دوای تێپەڕین بە ناوچەی پڕۆپۆندیدا گەیشتە ئۆردوی لەشکر. لەوێ سەربازەکان بە باوەشێکی گەرمەوە وەریان گرت و لەجێوە بەڵێنیان پێدا وەدوای بکەون تاکوو لە وڵاتی تراکیڕا بگەنە ئاسیا.
پێش ئەوەی بگەنە ئاسیا، سیڤتیس هەواڵی پێگەیی کە گزنفۆن گەیشتووەتە تراکی و بەرەو پێرینتۆ بەڕێوەیە. میدۆساتی ناردەلای گزنفۆن و داوای لێکرد کە لەشکر بەرێتە لای ئەو. سیڤتیس بەڵێنی یارمەتییەکی زۆری بە گزنفۆندا و بەحیسابی خۆی دەیویست بەو شێوەیە هەڵیفریوێنی. گزنفۆن لە وڵامدا گوتی کە ناتوانێ خواستێکی ئەوتۆ قبوڵ بکا. میدۆسات بە دەست بەتاڵی گەڕاوە لای سیڤتیس. کاتێک یۆنانییەکان گەیشتنە پێرینتۆ، نیئۆن بە خۆی و سەربازەکانییەوە لە لەشکر جیا بۆوە و بەجیا ئۆردوی لێدا. هەشت سەد کەسی لەگەڵدا بوو. باقی لەشکر لە نیزیک دیوارەکانی شاری پێرینتۆس خێمەیان لێدا. گزنفۆن لەوێ بە هەموو توانایەوە حەولی دۆزینەوە و دابینکردنی گەمی و بەلەمیدا بۆوەی لەشکر بە ئاسیادا دەرباز بکا. لەو نێوەشدا حاکمی نوێ ئاریستارخۆس بە دوو گەمی نەفەر هەڵگر گەیشتە ئەوێ. ناوبراو تازە ببووە پیاوی جێگای باوەڕی فارناڤازۆس. یەکەم حەولی ئەو کابرایە ئەوە بوو کە پێشگیری لە تێپەڕینی لەشکر بە ئاسیادا بکا. سەرەتا

فەرمانێکی توند و پڕ لە هەڕەشەی دەسەر خاوەن گەمییەکان کرد و پاشان هەڕەشەی لەشکریش کرد.

گزنفۆن ڕایگەیاند کە فەرمانی ئاناکسیڤیۆس بەجێدەگەیێنێ و گوتی: " بە مەبەستی جێبەجێکردنی ئەو کارە، ئاناکسیڤیۆس منی ناردووەتە ئێرە". ئاریستارخۆس لە وەڵامی گزنفۆندا گوتی: " ئاناکسیڤیۆس حاکم و دەریادار نەماوە، لەجیات ئەو من هەمەکارەم.[132] ئەگەر هەرکەسێک بگرم کە بەسەر بەحردا بپەڕێتەوە ئەوبەر، خێرا لە ئاودا نوقمی دەکەم". ئاریستارخۆس دوای ئەو قسانە چووە نێو شاری پێرینتۆ. ناوبراو ڕۆژی دوایی ستراتێژ و لۆکاژەکانی لەشکری یۆنانی بانگهێشت کرد. کاتێک ئەو فەرماندە نیزمییانە نیزیکی دەروازەی شار کەوتنەوە، یەکێک خۆی گەیاندە گزنفۆن و پێیگوت کە ئەگەر بچنە نێو شار هەمووتان دەسبەسەر دەکرێن. ئەوکاتە یا دەبێ بەگوێی ئاریستارخۆس بکەن یا گشتتان ڕادەستی فارناڤازۆس دەکا. گزنفۆن وەختێک گوێی لەو قسانە بوو سەرەتا ستراتێژ و لۆکاژەکانی نارد کە بە تەنیا بچنە ژوورەوە و خۆشی گەرەکی بوو قوربانییەک پێشکەش بە خواکان بکا. نەزرەکەی بۆیە بوو کە بزانێ چی لەدەست دێت. لە دەرەوە چاوەڕوان مایەوە و قوربانییەکەشی لەسەر ئیزنی خواکان سەبارەت بە بردنی لەشکر بۆلای سیڤتیس بوو. گزنفۆن پێشبینی ئەوەشی کردبوو کە تێپەڕین بە ئاسیادا ئیمکانی ئەوتۆی بۆ نییە. چونکە ئاریستارخۆس گەمی نەفەر هەڵگری بەو ڕادەیە هەبوو کە پێشگری لە ڕۆیشتنی لەشکر بکا. گزنفۆن گەرەکیشی نەبوو بەو لەشکرەوە پەنا بۆ ناوچەی خێرۆنیسۆ بەرێ، چونکە ئەو هەرێمەش کێشە و چەرمەسەری خۆی هەبوو. ئەگەر لەشکر لەوێ دەگیر بکەوتایە، گرفتی ئازووقەی بۆ چارەسەر نەدەکرا و ناچار دەبوو بەگوێی حاکمانی ئەوێ بجوڵێتەوە و لەشکریش مافی کۆکردنەوەی بژیوی پێنەدەدرا.

گزنفۆن کاتێک بەتەواوی سەرقاڵی لێکدانەوەی ئەو بارودۆخە بوو، دیتی کە ستراتێژ و لۆکاژەکان لەلای ئاریستارخۆسڕا گەڕانەوە. ئەوان بۆ

---

١٣١- شاری پێرینتۆ لەژێر دەسەڵاتی لاکێدێمۆنیەکانی حاکمی ڤیزاندیۆدا بوو. ئەوکاتە حاکمی شارەکە ناوی ئاریستارخۆس بوو.

گزنفۆن‌یان باس‌کرد که ئاریستارخۆس داوای لێکردون دوای ژەمی شەو بچنەوە لای. ڕاست ئەو کاتە بە ئاشکرا دەرکەوت کە ئاریستارخۆس لێیان لەفێڵە. گزنفۆن چوون نیشانەکانی قوربانی بۆ خواکان عاقیبەت بەخێر بینی، بردنی لەشکری بۆلای سیڤتیس بەمەترسی نەزانی. بە هاودەمی پۆلیکراتیسی ئاتێنی و گشت ستراتێژەکان و لە هێزەکانی نیئۆن‌یش نیزامییەکی جێگای باوەڕی ناوبراوی هەڵبژارد و گشتیان پێکەوە بەرەو بارەگای سیڤتیس وەڕێکەوتن کە مەودای شێست ستادیۆ لێیان دوور بوو. کاتێک ئەو کۆمەڵە فەرماندە یۆنانییە نیزیک کەوتنەوە، تووشی هێندێک کەلاوەی وێران هاتن. لەوێ ئاگر دایسان و هیچ پاسەوانێکیش لەو دەوربەری نەبوو. گزنفۆن سەرەتا پێیوابوو کە سیڤتیس لەگەڵ سەربازەکانی چووەتە شوێنێکی‌تر. بەڵام کاتێک گوێیان لە دەنگەدەنگی پیاوانی سیڤتیس بوو کە لە نێوان خۆیاندا ئاڵوگۆڕی پەیامیان دەکرد، گزنفۆن بەو ئاکامە گەیشت کە بۆیە ئەو ئاگرانەیان بەئەنقەست دوور لە خۆیان کردوەتەوە بۆوەی پاسەوانەکان لەنێو تاریکی شەودا نەبیندرێن. دووهەم هۆکار ئەوە بوو کە ژمارەیان دیاری نەکا و کەس بە شوێنی خێمەکانیان نەزانێ و دوژمن ئەگەر لێیان وەنیزیک بکەوێتەوە لەبەر ڕۆشنایی ئاگرەکان ببیندرێن.

کاتێک گزنفۆن گشت ئەو دیاردانەی بۆ ڕوون بۆوە، سەرەتا دیلمانجەکەی خۆی ناردە پێشەوە بۆوەی بە سیڤتیس بڵێ کە گزنفۆن لەو نیزیکانەیە و دەخوازێ چاوی پێی‌بکەوێ. پاسەوانەکانی سیڤتیس لە دیلمانجەکەیان پرسی کە گزنفۆن ئەو کەسەیە کە خەڵکی ئاتێنە و قەرارە لەلایەن لەشکری کوروشەوە بێ. کاتێک کابرای دیلمانج وڵامی داوە کە بەڵێ ئەو گزنفۆنەیە. پیاوەکانی سیڤتیس خێرا سواری ئەسپەکانیان بوون و بۆلای سەرکردەکەیان واتە سیڤتیس چوون. پاش فەترەیەک نیزیکەی دوو سەت کەس لە پیاوانی سووکەچەکداری سیڤتیس هاتن و دەوری گزنفۆن‌یان‌دا و بردیانە لای ناوبراو.

سیڤتیس پارێزگاریەکی توندی لە قەلایەکەیدا ڕەچاو کردبوو. پیاوەکانی بە ئەسپی ئامادە و لغاوکراو دەوریان گرتبوو. ناوبراو لەوە دەترسا مەبادا

دوژمنەکانی بەشەو هێرشی بکەنە سەر. سیڤتیس ئەسپەکانی بە ڕۆژ تێر دەکرد و شەو لغاوی دەکردن و ئامادەی پەلاماری دوژمن دەبوون. دەگوترا کە باپیرەی سیڤتیس بەناوی تیریس، کاتی خۆی خاوەن لەشکرێکی زۆر بووە، بەشەو کەوتووەتە بەر پەلاماری دوژمن و ژمارەیەکی فرە لە پیاوەکانی کوژراون و لەشکرەکەی تووشی زەرەدێکی زێدە هاتووە. دوژمنەکانیان (تینی) بوونە و ئەو جۆرەی دەیانگێڕاوە، شەڕکەرترین خەڵکی وڵاتی تراکی بوونە و ئەغڵەب بە شەو پەلاماری دژبەرەکانی خۆیان داوە.

کاتێک نیزیک کەوتنەوە، سیڤتیس فەرمانیدا کە تەنیا گزنفۆن لەگەڵ دوو کەس لە پیاوانی یۆنانی هەڵبژاردەی خۆی بێنێتە ژوورەوە. وەختێک وەژوور کەوتن، سەرەتا بەخێر هاتن کران و پاشان بە ڕەسمی تراکییەکان شەڕابیان لەنێو پەرداخی دروستکراو لە شاخەکەڵدا خواردەوە. میدۆسادیس لە تەنیشت سیڤتیس دانیشتبوو کە وەک سەفیری ناوبراو بۆ گشت مەعموریەتەکان دەنێردرا. لە درێژەدا گزنفۆن دەستی بە ئاخاوتن کرد و گوتی: " سیڤتیس! سەرەتا میدۆسادیس لەسەر خواستی تۆ لە کالخیدۆنا هاتەلام. ئەو داوای لێکردم لەشکرەکەم بە ئاسیادا تێپەڕێنم و بێینە تراکی. بەو بەڵێنەی کە ئەگەر من ڕازی بم، تۆ یارمەتیم دەدەی. ئەوە قسەی میدۆسادیس بوو". گزنفۆن ڕووی لە میدۆسادیس کرد و لێی پرسی ئاخۆ قسەکانی ئەوی بەلاوە دروستە یان‌نا. میدۆسادیس وتەکانی گزنفۆنی وەڕاست گێڕا. گزنفۆن دەستی بە ئاخاوتن کردەوە: " میدۆسادیس جاری دووهەمیش هاتەلام ڕاست ئەو کاتەی بە گەمی چوبوومە پاریۆ. داوای لێکردم بگەڕێمەوە لای لەشکر و بەڵێنیدا ئەگەر بێینە لای ئێوە، جەنابت وەک دۆست و برا وەرمان دەگری و تەواوی ناوچەکانی قەراخ بەحر کە لە ژێردەستتدا بە ئێمەی دەسپێری ".

گزنفۆن جارێکیتریش ڕووی لە میدۆسادیس کردەوە بۆوەی بزانێ لە بەڵێنەکانی پاشگەز بووەتەوە یان‌نا. میدۆسادیس قەول و بەڵێنەکانی دوپاتکردەوە. گزنفۆن ئەوجار داوای لە ناوبراو کرد بێتە پێشەوە و بە سیڤتیس بڵێ کە جاری یەکەم لە کالخیدۆنا چۆن ڕێککەوتوون. میدۆسادیس دەستی بە ئاخاوتن کرد و گوتی: " گزنفۆن! تۆ بە منت گوت کە لەشکر ناچارە بە شاری

ڤیزاندیۆدا دەرباز بێ و پێویست ناکا هیچ بەڵێنێک بە سیڤتیس بدەم. نەک بە ئەو، بەڵکوو بە تۆش و کەسێکی‌تریش. ئەوکات لەشکر قەراربوو بەوێدا بڕوا. تۆ بڕیارت دابوو لە لەشکر جیا ببیەوە و بەتەنیا بڕۆیەوە وڵاتی خۆت و ئەوە قسەی تۆ بوو". گزنفۆن لە وڵامدا گوتی: " باشە ئێستا پێم‌بڵێ کە وەختێک تۆ گەیشتییە سیلیمڤریا چیم پێگوتی". میدۆسادیس وڵامی داوە: " پێت‌گوتم ئیمکانی نییە خواستی ئێمە بەجێ‌بگا، چونکە ئێوە و لەشکر بەرەو پێرینتۆ ڕۆیشتن و دواتر ناچار بوون دووبارە بەرەو ئاسیا بێنەوە".

گزنفۆن دووبارە دەستی بە قسان کردەوە: " ئێستا هەرچی بێ گشتمان لێرەین. منیش و یەکێک لە ستراتێژەکان واتە فرینیسکۆس و لۆکاژێکیش بەناوی پۆلیکراتیس. لە دەرەوەش چەند کەسێکی باوەڕ پێکراو هەن. ئەوانیش جێگای باوەڕی ستراتێژەکانیانن. تەنیا ستراتێژ نێ‌ئۆن لاکونی‌مان لەگەڵدا نییە. سیڤتیس! ئەگەر دەخوازی بەڵێنەکانی نێوانمان بایخی پتری هەبێ، تکایە ئەوانی دەرێش بانگ بکە ژوورەوە. تۆ پۆلیکراتیس تکایە بچوو و بە هاوڕێیانی دەرەوە بڵێ کە چەکەکانیان دانێن و بێنە ژوورەوە. خۆشت تکایە لەگەڵیان وەرەوە ژوورێ. خەنجەرەکەشت لەخۆت بکەوە و لە دەرەوە داینێ ".

سیڤتیس کاتێک گوێی لەو قسانە بوو گوتی کە ئاتێنی‌یەکان هیچکات جێگای نیگەرانی نیین. ناوبراو باش دەیزانی کە ئاتێنییەکان لە پشتێ‌ڕا لەگەڵ تراکییەکان خزمایەتیان هەیە و بۆیە گشتیانی بە دۆستی خۆی دەزانی. دوای ئەو قسانە، ئەوانەی قەرار بوو، هاتنە ژوورەوە. گزنفۆن خێرا پرسیاری کرد کە پێویستە بۆ کام مەبەست و خواست لەشکر ئامادە بکا. سیڤتیس وڵامی داوە و گوتی: " باوکی من ناوی مایسادیس بوو. ڕەعیەتەکانی باوکم لە خەڵکی مێلاندیت، تینی و ترانیپسی پێکدەهاتن. کاتێک خەڵکی ئۆدریسی شۆڕشیان دژی باوکم دەست‌پێکرد، ئەو ناچار بوو لەوێ بڕوا و تووشی نەخۆشی هات و فەوتی کرد. من بێ باوک مامەوە و لەلای پاشای ئێستای تراکی واتە میدۆکۆس گەورە بووم. کاتێک باڵغ بووم ئێتر نەمدەتوانی لەسەر خوانی بێگانە لەوە زیادتر بژیم. ئەوکاتەی لەگەڵ میدۆکۆس لەسەر سفرەیەک نانمان دەخوارد، داوام لێکرد ئەوەندەی بۆی دەکرێ لە پیاوانی خۆی لە ئیختیارم بنێ تاکوو ئەو کەسانەی ئێمەیان لەسەر خاکی

خۆمان هەڵقەند، سزایان بدەم و بۆخۆم ببمە خاوەن دەسەلاتێکی سەربەخۆ و لەوە زیادتر وەک سەگ بە حەسرەتەوە چاو لە خواردنی سەر سفرە نەکەم و یەکێکیتریش ماڵ و ملکم بخوا. دوای ئەو باسانە میدۆکوس پاشا ئەسپ و پیاوەکانی دامێ کە سبەینێ چاوتان پێیان دەکەوێ. ئێستا بە بوونی ئەو پیاو و ئەسپانە خەریکی تالانی وڵاتی خۆمم. ئەگەر ئێوەش ڕەگەڵم بکەون و پێکەوە پەلامار بدەین، لەو باوەڕەدام کە بە یارمەتی خواکان دەتوانم دەسەڵاتی لەدەستچوو وەگیرخەمەوە. ئا لێرەدایە کە من پێویستیم بە یارمەتیتانە".

گزنفۆن لە وڵامی سیڤتیس‌دا گوتی: " ئەگەر قەرار بێ بۆ ئەو مەبەستە یارمەتیت بدەین، تۆ چ مواجبێک بە لەشکر و لۆکاژ و ستراتێژەکان دەدەی. پێمان بڵێ تا ئەوان خۆیان وڵامت بدەنەوە ". سیڤتیس بەڵێنی‌دا کە بۆ هەر سەربازێک سکەیەکی ستاتیرا لە مانگدا و بۆ لۆکاژەکان دوو سکە و بۆ ستراتێژەکانیش چوار سکە پارەبدا. هەروەها خاک و ئاو و ئاژەڵی باربەر و شوێنی مەحکەمیان لە قەراخ بەحر بداتێ. گزنفۆن ئەوجار پرسیاری کرد: " باشە ئەگەر لەو ئامانجەی تۆدا سەرنەکەوتین و مەترسی لاکێدیمۆنییەکانیش لەولا ڕاوەستێ، ئایا لە بارودۆخێکی ئەوتۆدا جەنابت قبوڵ دەکەی لەشکرەکەمان لە وڵاتی ژێر دەسەلاتی تۆدا و لەلای تۆ بمێنێتەوە". سیڤتیس وڵامی داوە و گوتی: " من لەگەڵ ئێوە وەک دۆست و برا و هاوماڵ دەجوڵێمەوە. چی دەستمان کەوت بەشی دەکەین. سەبارەت بە خۆشت دەبێ بڵێم کە پێمخۆشە کچی خۆمت بە ڕەسمی تراکییەکان لێ مارە دەکەم، ئەگەر تۆش کچت هەیە بە هاوسەری قبوڵی دەکەم. هەروەها دەخوازم شاری ڤیسانتی پێشکەش بە تۆ بکەم بۆوەی لێی نیشتەجی بی و یەکێک لە خۆشترین شارەکانی قەراخ بەحرە ".

## بەشی ٣

### چوونی لەشکری یۆنانی، جیا لە نیئۆن و پیاوەکانی بۆلای سیڤتیس - زیافەت بەبۆنەی پەیمانی نوێ - لەشکرکێشی شەوانە - دەسکەوتی زۆر

دوای ئەوەی گزنفۆن و ستراتیژ و لۆکاژەکان بە قەناعەت گەیشتن، ئەوسا دەستی ڕاستیان وێکدایەوە و پەیمانیان بەست. پێش خۆرهەڵات گەیشتنەوە ئۆردوگاکەیان لە نیزیک شاری پێرینتۆ و هەرکەسە لەبەرخۆیەوە خەڵکی خۆی لە ئاکامی وتوویژەکە ئاگادار کردەوە. کاتی خۆر هەڵات، ئاریستارخۆس دووبارە ستراتیژەکانی بانگ کردەوە. ستراتیژەکان لە چوون بۆلای ناوبراو خۆیان پاراست و لەجیات ئەو سەربازەکانیان کۆکردەوە. جیا لە پیاوەکانی نیئۆن کە نیزیک بە دە ستادیۆ دووربوون، تەواوی لەشکر کۆبۆوە. کاتێک هەموویان خڕبوونەوە، گزنفۆن هەستا سەرپێ و دەستی بە قسان کرد: " پیاوەکان! ئاریستارخۆس بە گەمیە نەفەرهەڵگرەکانی ناهێڵێ ئێمە بۆ شوێنی مەقسەدمان بڕۆین. بۆیە سواری گەمی جێگای مەترسیە. ئاریستارخۆس داوای لە ئێمە کردوە کە بە پێچەوانەی مەیلی خۆمان بەرەو خێرسۆنیسۆس و بە چیای پیرۆزدا بڕۆین.

ئەگەر ئێمە بەو ناوچە شاخاوییەدا تێپەڕین و مەترسی و گرفتەکانی سەر ڕێگامان دەرباز بکەین، ئاخرەکەی دەگەینە خێرسۆنیسۆس. ئاریستارخۆس بەڵێن دەدا کە لەوێ قەرار نییە وەک کۆیلە بمانفرۆشێ، وەک ئەوەی لە شاری ڤیزاندیۆ کردی. دەڵێ کە خەیانەتیشمان پێناکا و هەرکەس مووچەی خۆی وەردەگرێ و ئازووقەشمان بۆ دابین دەکا. هەڵبەت لێرە دیتتان چۆنی بۆ دابین کردین! بۆیە گشتمان خەریکە لەبرسان بمرین.

ئەو کابرایە لەو چەشنە بەڵێنانە دەدا. لە حاڵێکدا سیڤتیس، ئەویش قەول دەدا ئەگەر بچینە لای بە خۆشرەفتاری لەگەڵمان دەجوڵێتەوە. ئێستا بیری لێبکەنەوە چۆن بڕیارێک دەبێ سەبارەت بەو باسانە بدەین. بەواتایەک، ئەگەر دەخوازن لێرە بمێننەوە یا بگەڕێنەوە گوندەکانی نیزیک شاری ڤیزاندیۆ، واتە ئەو شوێنەی کە بژیوی لێ دەستدەکەوێ؟ من لەو باوەڕەدام کە چوون پارەمان نییە ئازووقەی پێبکڕین و بێ پارەش ئیجازەمان نییە دابینی بکەین، دەبێ بگەڕێینەوە ناوچەکانی ڤیزاندیۆ، ئەو جێگایەی خەڵکی دەڤەرەکە کەمتر لە ئێمەن و ناتوانن پێشمان پێبگرن و دەتوانین چەندی پێویستمانە خواردەمەنی کۆکەینەوە. کاتێک توانیمان پێداویستییەکانمان دابین بکەین، ئەوسا باشتر لە خواستی تاک تاکی خۆمان تێدەگەین. ئەو وەختە دەتوانین ئەو دوو ڕێگایە باشتر هەڵسەنگێنین، واتە پێشنیاری ئاریستارخۆس یاکوو داوای سیڤتیس. هەرکەس لە ئێوە لەگەڵ پێشنیاری من موافیقە، تکایە دەست هەڵبڕێ ".

جەماوەر بە پانەوە دەستیان هەڵێنا. " ئێستا بڵاوەی بکەن، گزنفۆن گوتی، باروبنەتان ببەستن، کاتێک دەستوورتان پێدرا وەدەوای ئەو کەسە بکەون کە چاوساغتانە". لە درێژەدا، گزنفۆن وەپێشکەوت و جەماوەر بەدوایدا. نێئۆن بەڵام، ڕاسپاردەکانی ئاریستارخۆس حەولێکی فرەیان لەگەڵدا ڕازی بکەن، بەڵام سەرنەکەوتن. پاش ئەوەی نیزیک بە سی ستادیۆ ڕێگایان بڕی، تووشی سیڤتیس هاتن. گزنفۆن هەرکە چاوی بە ناوبراو کەوت، داوای لێکرد نیزیک بێتەوە و گەرەکی بوو لە حزوور لەشکردا پێیبڵێ کە قۆشەنەکەی بە چۆن قەناعەتێک گەیشتووە.

کاتێک سیڤتیس نیزیک کەوتەوە، گزنفۆن پێیگوت: " ئێمە بڕیارمان داوە ڕوو لە شوێنێک بکەین کە لەشکر بتوانێ ئازووقە و خواردەمەنی پێویستی دەستکەوێ. لەوێ پێشنیارەکانی تۆ و ئاریستارخۆس تاووتوێ دەکەین. ئەوکاتە بڕیار دەدەین کامیان زیادتر بە قازانجمانە ".

سیڤتیس وڵامی داوە و گوتی: " من هێندێک دێهات پێدەزانم کە لێک دوور نین. ئێوە دەتوانن بژیو و خواردەمەنی پێویست لەوێ دابینبکەن. ڕێگاکەشی هەر ئەوەندە وەخت دەگرێ کە پیاو دانیشێ و تێر بە زگی خۆی بخوا ".
گزنفۆن پێیگوت: " کەوابوو وەپێشمان بکەوە ".

کاتی شێوان گەیشتنە ئەو دەڤەرە. سەربازەکان کۆبوونەوە و سیڤتیس قسەی بۆکردن. ناوبراو گوتی: " پیاوەکان! من داواتان لێدەکەم لە لەشکرکێشییەکەمدا یارمەتیم بدەن. بەڵێنتان پێدەدەم بۆ هەر کامتان یەک سکە و بۆ لۆکاژ و ستراتێژەکانیش بەپێی پلەی نیزامی مووچەیان پێبدەم. جیا لەوانەش ئەوەی نیشان بدا بەغیرەتترە، خەڵاتی تایبەتی بۆ لەبەرچاو دەگرم. خواردن و خواردنەوە وەک ئێستا بە ڕێکوپێکی لە وڵاتەکەمڕا بۆتان دابین دەکەم. هەڵبەت هەرچی تاڵان و کۆیلە و ماڵات دەستتان کەوت بە من دەگات، دەبێ بیانفرۆشم و ماڵیاتیش وەرگرم تا مووچەی ئێوەی پێدابینبکەم. لە ئاژەڵ و ماڵات کە دەیانگرین یا یەخسیرەکانی ژێر دەستمان ئەگەر هاتوو ڕایانکرد (بەتایبەت تراکییەکانی ژێر حوکمی من)، دەتوانین بە یارمەتی ئێوە بیانگرینەوە و کەڵکیان لێوەرگرین. گزنفۆن لەو وەختەدا لە سیڤتیسی پرسی: " لەشکر تا چ مەودایەک دوور لە دەریا دەبێ بەدوای تۆوە بێ". ناوبراو وڵامی داوە: " زیادتر لە حەوت ڕۆژ ڕێگا نابێ و جاروباریش کەمتر ".

دوای ئەو قسەوباسە، مەیدانی ئاخاوتنیان بۆ هەر کەسێک گەرەکی بوایە ڕای خۆی دەربڕێ، چۆلکرد. زۆربەی خەڵکەکە گوتیان کە سیڤتیس بە ئارامی و حورمەتەوە قسەی کرد. لەبەر ئەوەی زستان بوو و لەشکر نەیدەتوانی بگەڕێتەوە یۆنان  و وڵاتێکی دۆستیش نەبوو کە وەریان بگرێ و ڕێگای ئازووقە کڕینیان پێبدا، بۆیە مانەوە لە وڵاتی دوژمن و هاوکاری لەگەڵ سیڤتیس‌یان بە قازانج زانی. ئەوە باشتر بوو تاکوو تەنیا بمێننەوە و تەنیا

حیساب لەسەر هێزەکەی خۆیان بکەن. جیا لەوەش قەیاسێک شتوومەکیان دەستدەکەوت و هەرکام لەبەرخۆیەوە مواجبێکیشی وەردەگرت و شانسێکی باش بوو کە ڕووی تێکردبوون.

گزنفۆن پاشان گوتی: " ئەگەر کەسێک بۆچوونێکی هەیە تکایە باسیبکا. ئەگەر نا، ئەو پێشنیارە پەسند دەکەین". هیچکەس دژایەتی ئەو بۆچوونەی نەکرد و بڕیاری لەسەردرا. خێرا بە سێڤتیس ڕاگەیێندرا کە گشت لایەک ئامادەن لە لەشکرکێشی ناوبراودا بەشداربن. لە درێژەدا گوردانەکانی لەشکری یۆنانی لە چەندین گوندی جیاواز و بەجیا ئۆردویان لێدا. سێڤتیس لە گوندێکی خۆی گشت ستراتێژ و لۆکاژەکانی بۆ زیافەت بانگهێشت کرد. میوانەکان وەختێک گەیشتنە ئەو ماڵەی سێڤتیس لێی دەمایەوە، یەک بەدوای یەکتردا چوونە ژوورەوە. لەوێ چاویان بە کابرایەک بەناوی ئیراکلیدیس خەڵکی مارۆنیا کەوت. ئیراکلیدیس لە هەرکەسێک کە بەباوەڕی ئەو بۆیە دەبوو یارمەتی سێڤتیس بدا، نیزیک دەکەوتەوە. سەرەتا بۆلای وەفدی پارینییەکان (خەڵکی پارۆس) چوو کە ئەوکاتە لەوێ بوون بۆوەی پەیمانی دۆستایەتی لەگەڵ پاشای ئۆدریسییەکان واتە میدۆکۆس ببەستن. ئەوانە قەیاسێکی زۆر دیارییان بۆ پاشا و شاژن هێنابوو. ئیراکلیدیس لێیان نیزیک کەوتەوە و پێی گوتن: " میدۆکۆس لە سەرووی وڵاتی مەدیتەرانە حوکمڕانی دەکات و ڕێگای دوازدە ڕۆژ لە دەریاوە دوورە. ئێستا سێڤتیس لەگەڵ لەشکری یۆنانی بووەتە هاوپەیمان و حوکمڕانی ڕۆخەکانی بەحرە. لە داهاتوودا سێڤتیس دەبێتە دراوسێی ئێوە. ڕەنگە بۆ ئێوە هەم بە قازانج بێ و هەمیش بە زەرەر. ئەگەر ئێوە ماقوڵ بجوڵێنەوە، ئەو دیارییانەی بۆ پاشا و شاژن هێناوتانە بیدەنە سێڤتیس. بەو کارەتان دڵنیا بن کە ناوبراو بە چاوێکی دۆستانە دەڕوانێتە ئێوە. لەوە باشترە بە پاشایەکی بدەن کە ئەو مەودایە لێرەوە دوورە ". ئیراکلیدیس وەفدەکەی ڕازی کرد. ئەوجار چووە لای تیماسیۆن داردانی. ناوبراو بیستبووی کە تیماسیۆن پەرداخ و فەرشی دەستکردی لە ناوچەی بەربەرەکان بە تاڵان هێناوە. بە تیماسیۆنی گوت کە بەپێی ڕێوڕەسمی ناوچەیی، هەرکات سێڤتیس میوانداری شەو ڕێکدەخا،

میوانەکان دیاری پێشکەش بە ناوبراو دەکەن. ئەو هەروەها گوتی ئەگەر ڕۆژێک سیڤتیس ببێتە حوکمڕانێکی مەزن، ئەو وەختە تۆ دەنێریتەوە وڵاتی خۆت و سامانێکی زۆرت پێدەبخشێ.

ئیراکلیدیس هەرکەسێکی وەبەرچاو بکەوتایە، بەو شێوەیە لەگەڵی دەدوا. ناوبراو ئەوجار لە گزنفۆن نیزیک بۆوە و پێیگوت: " گزنفۆن! تۆ کە خەڵکی شارێکی گەورە و ناسراوی، لەلای سیڤتیس جێگای تایبەتی خۆت هەیە. ڕەنگە ناوبراو بۆتۆ ملک و ماڵ و قەڵا لەبەرچاو بگرێ. منیش بە نۆرەی خۆم حەولدەدەم وەبیر سیڤتیس بێنمەوە کە بەردەوام بە چاوێکی دۆستانە بڕوانێتە جەنابت. من دڵنیام چەندی تۆ بە پێشکەش کردنی دیاری سیڤتیس شاد دەکەی، ئەوەندە پاداشی باشتر لە داهاتوودا لە ناوبراو وەردەگریەوە. گزنفۆن کاتێک گوێی لەو قسانە بوو، تەواو دڵگیر و ناڕاحەت بوو. ئەو کاتێک لە پاریۆسڕا وەڕێکەوت، هیچ شتێکی ئەوتۆی لەگەڵ خۆی نەهێنابوو. تەنیا نۆکەرێکی لەگەڵ بوو کە لە ڕێگادا یارمەتی هەڵگرتنی ئەسپابەکانی دەدا.

کاتێک جەماوەر لە شوێنی میوانداری وەژوورکەوتن، پیاوماقووڵانی تراکی، ستراتێژ و لۆکاژەکانی یۆنانی و هەروەها وەڤدی باژێڕێک کە بە هەڵکەوت لەوێ بوون، گشتیان لە دەوری بازنەیەکدا دانیشتن. خزمەتکاران بەردەوام خەریکی دانان و ڕازاندنەوەی مێزێکی سێ پێچک بوون و گۆشت و نانی برژاویان بە چەنگاڵی سێ چوقڵەوە لەپێش میوانان دادەنا. زۆربەی ئەو مێزانە بۆ میوانانی بیانی داندرابوون. یەکەم کەس، سیڤتیس دەستی بە خواردن کرد. ناوبراو سەرەتا لە نانەکانی خوارد کە لە نیزیک ئەو داندرابوون. نانەکانی لەتدەکرد و دەیدا بە میوانانی دڵخوازی خۆی. بۆ گۆشتیش هەر هەمان کاری کرد. ئەو ئەوەندەی گەرەکی بوو، لە نان و گۆشتی لە پێش خۆی دانا و پاشماوەیەکەشی بۆ میوانان بەڕێکرد. میوانەکانیش بەو شێوەیە ڕەفتاریان کرد.

میوانێکی ئارکادی بەناوی ئاریستۆس، نەوسنێکی عەجایب بوو. نان و گۆشتی بۆ کەسانی دەوروبەری بەڕێنەدەکرد. بە قورسایی سێ خینیک (هەر خینیک بەرابەری سێونیو لیتر) گۆشت و نانی لەسەر کۆشی دانابوو و

خەریکی خواردن بوو. ساقی‌یەکانیش بەردەوام بەسەر مێزەکاندا دەگەڕان و پەرداخی شەڕابی میوانانیان پڕدەکردەوە و گشت لایەک بە ڕەزامەندی وەریاندەگرت. ئاریستۆس، وەختێک ساقی لێی نیزیک کەوتەوە و پەرداخی پڕ لە شەڕابی بۆ ڕاگرتبوو، ناوبراو بە دەنگی بەرز بە ساقی‌یەکەی گوت، بۆ گزنفۆنی بەری باشترە، ئەو بێکارە و من لەبەر خواردن وەختم نییە شەڕاب بخۆمەوە. سیڤتیس گوێی لەو قسەیە بوو و لە ساقییەکەی پرسی کە ئاریستۆس چی‌گوت، هەڵبەت ساقی زمانی یۆنانی بەباشی دەزانی. ساقی لە وڵامدا گوتی: ئاریستۆس دەڵێ لەبەر خواردن وەختی نییە و شەڕاب بۆ گزنفۆن بەرم چێترە، چونکە ئەو بێکارە. بەبیستنی ئەو قسەیە تەواوی میوانەکان لە قاقای پێکەنینیان‌دا.

وەختێک میوانەکان لەوپەڕی سەرخۆشیدا بوون، کابرایەکی خەڵکی تراکی جڵەوی ئەسپێکی سپی بە دەستەوە گرتبوو و وەژوور کەوت. کابرا پەرداخێک شەڕابی بە دەستەوە گرت و گوتی: " سیڤتیس ئەو شەڕابە بە سڵامەتی تۆ دەخۆمەوە. ئەو ئەسپەشم بەدیاری بۆ تۆ هێناوە. دەتوانی سواری بی و دوژمنی پێ ڕاوبنێی و هەرکەسێکی پێتخۆشە بیگری و کاتی پاشەکشەش نیگەران نەبی". یەکێکی‌تریش دوای ئەو کابرایە هاتە پێشەوە و غوڵامی خۆی پێشکەشی ناوبراو کرد و پەرداخێکی شەڕاب خواردەوە. دوابەدوای ئەوەشیان، میوانێکی‌تر جلوبەرگی ژنانەی هێنابوو و پێشکەشی سیڤتیسی کرد کە بیدا بە ژنەکەی. دوای ئەوانە ئەوجار تیماسیۆن هاتە مەیدان، فەرشێک و جامێکی زێوی پێشکەش کرد. میوانێکی خەڵکی ئاتێن بەناوی غنیسیپۆس هەستا سەرپێ و دەستی بە ئاخاوتن کرد و گوتی: " ئەوە ڕەسمێکی جوان و لەمێژینەیە کە هەرکەس بەنۆرەی خۆی دیارییەک پێشکەش بە پاشا بکا. پرسیار لێرەدایە، ئایا ئەو کەسانەی نەدارن، باشتر وانییە پاشا خەڵاتیان بکا تا دواتر منیش بتوانم دیارییەکی قابیل بەخۆت پێشکەش بکەم.

گزنفۆن لەو نێوەدا زۆر ناڕاحەت بوو و نەیدەزانی چبکا. ئەو لە ڕیزی میوانانی پرقەدری نیزیک لە سیڤتیس دانیشتبوو. ئیراکلیدیس داوای لە ساقی

کرد کە پەرداخێک شەڕاب بۆ گزنفۆن بەرێ. گزنفۆن هێندێک سەرخۆش بوو، پەرداخەکەی وەرگرت و هەستا سەرپێ و گوتی: " سێڤتیس! من خۆم و هاوڕێیانم کە لێرەین، پێشکەش بە جەنابت دەکەین. بۆوەی دۆستی باوەڕپێکراو بین و هەمووشمان بەدڵەوە ئەو خەڵات بەخشینە قبوڵدەکەین و بەڵێنت پێدەدەم کە ئەوان لە من زیادتر وەفادار بە تۆ دەبن، بەبێ ئەوەی بە داخوازی بێ مانا ئازارت بدەن. گشتیان متمانەیان بەخۆیە، گەرەکیانە شەڕت بۆ بکەن و گیانی خۆیان لە مەترسی بهاوێن. ئەگەر خواکان ڕەزایەتیان لەسەر بێ، جیا لە مەملەکەتی باوکت پانتاییەکی زۆر خاک دەکەوێتە سەر وڵاتی جەنابت. تۆ لە کیشوەر پەرەپێداندا سەردەکەوی. هێندێک بە ڕاحەتی دێنە ژێر ڕکێفت و دەبیە خاوەن ئەسپ و ژن و سەربازێکی زۆر و ئیتر پێویست ناکات تاڵان بکەیت بەڵکوو هەر ئەوانە بە خواستی خۆیان دیاری زۆر دێنن و پەلەیان دەبێ کە هەرچی زووتر سەری کڕنۆش دانەوێنن.

دوای ئەو قسانەی گزنفۆن ئەوجار سێڤتیس هەستا سەرپێ و لەگەڵ ناوبراو شەڕابی نۆشی و بە ڕەسمی تراکی، نەختێک لە شەڕابی بنی پەرداخەکەی بە جلوبەرگی گزنفۆندا کرد. لە درێژەدا دەستەی مۆسیقای دەربار وەژوور کەوت و بە شەیپوڕی شاخەکەڵ موسیقایان لێدەدا. تاقمێکی دیکە جۆرێکی‌تری شەیپوڕیان پێبوو. لە چەرمی خاوی گا دروستکرابوون و گشت دەستەی مۆسیقا وەک گوردانی تەشریفاتی نیزامی دەچوون. ئەوانە هەوای جۆراوجۆری ماغادی‌یان بۆ هەڵپەڕکێ لێدەدا. سێڤتیس هەستا سەرپێ و هاواری شەڕی کرد و بە چەشنێک تووشی هەیەجان هات کە لەجێوە هەڵبەزییەوە، وەک ئەوەی گەرەکی بێ خۆی لەدەست تیر و خەدەنگ ڕزگار بکا. لە درێژەدا دەستەی قەشمەر و مەسخەرە هاتنە ژوورەوە.

کاتێک هەوا بەرەو تاریکی چوو، میوانەکانی یۆنانی هەستانە سەرپێ و گوتیان کە وەختی گۆڕینی قەرەوڵەکانیان هاتووە و دەبێ ناوی شەویان بدەنێ. هاوکات داوایان لە سێڤتیس کرد کە هیچ کەسێکی تراکی بۆی نییە لە ئۆردوگای یۆنانییەکان نیزیک بکەوێتەوە، چونکە دوژمنی بە ڕەگەز تراکی زۆرن، هەرچەند تراکی دۆستیش هەن. وەختێک یۆنانییەکان خەریکی ڕۆیشتن

بوون، سیڤتیس وەک ئەوەی هیچ شەڕابێکی نەنۆشیبێ، خێرا دەرکەوت و چووە لای یۆنانییەکان. داوای کرد کە ستراتیژەکان بە تەنیا بچنە لای ئەو. ناوبراو پێیگوتن: " ستراتیژەکان، دوژمنانی ئێمە جارێ خەبەری ئەو هاوپەیمانییەیان پێنەگەیشتووە. ئەگەر ئێمە پێش ئەوەی خۆیان تاقەت کردبێ پەلاماریان بدەین و فرسەتی بەرگریان لێبستێنین و بێدیفاع بمێننەوە، دەتوانین دیلێکی زۆریان لێبگرین و دەستکەوتێکی فرەشمان هەبێ".

ستراتیژەکان ڕەزایەتیان دەربڕی و داوایان لە ناوبراو کرد کە ڕێنوێنی و چاوساغی گشت لایەک وەستۆبگرێ. سیڤتیس لە وڵامی ستراتیژەکاندا گوتی: " ئامادە و چاوەڕوان بن. منیش لە وەختێکی لەباردا دێمە لاتان و هێزی سووکە چەکداریش لەگەڵ خۆم دێنم. بە یارمەتی خواکان ڕێنوێنیتان دەکەم و وەپێش دەکەوم ".

گزنفۆنیش لەو نێوەدا قسەی کرد و گوتی: " سیڤتیس باش بیر بکەوە. ئەگەر قەرارە بە شەو هێرش بکەین، بەو مانایەیە کە جەنابت باوەڕت بە تاکتیکی شەڕی شەوانەی لەشکری یۆنانی هەیە. بەپێی تاکتیکەکانمان، وەختێک بە ڕۆژی ڕووناک بە ڕێگادا دەڕۆین گشت بەشەکانی لەشکر وەک چەکداری قورس، سوارە و سووکە چەکدار، سەرەڕای ناخۆشی ڕێگا بەڕاحەتی دەتوانن نەزم و تەرتیبی دووبارە بە ڕیزەکانی خۆیان بدەنەوە. بەڵام، ئەگەر بە شەو دەرکەوین، ناچارین دەستەی شەورۆ وەپێش بخەین. ڕەنگە ئاوا لەشکرمان تووشی پەرشوبڵاوی نەیە و سەربازەکانمان کەمتر هەتلە بن. ئەگەریش شتێکی ئەوتۆ بقەومێ، هێزەکانی پاشقەرەوڵ کە لە دواوە دێن خێرا پێیدەزانن. لەبیرت نەچێ زۆر جار ئەوانەی لەیەکتر هەڵدەبڕێن، دەکەونە گیانی یەکتر، بێ ئەوەی خۆیان پێیبزانن.

سیڤتیس لە وڵامدا گوتی: " زۆر ڕاستە. ئێوە بیر لە تاکتیکەکانی خۆتان بکەنەوە و منیش بە قەراری ئێوە هەڵسوکەوت دەکەم. من چەند کەس لە چاوساغەکانی پیر و بەئەزموون و لە باشترین ڕێنیشاندەران دەنێرمە لاتان کە بست بە بستی خاکی ئەو وڵاتە پێدەزانن. من خۆم و سوارەکانم بەدوای قۆشەنی پاشقەرەوڵدا دێین. بەو شێوەیە بۆ منیش هاسانتر دەبێ کە خێرا لە

فریاتان بکەوم ". بۆ ناوی شەو وشەی « ئاتێن » دیاریکرا. ئەوەش لەبەر دڵی تراکی و یۆنانییەکان بوو. گشت لایەک قەراریاندا و ئارام بوونەوە.

لای نیوە شەو سیڤتیس و سوارەکانی کە جلی شەڕیان لەبەر کردبوو لەگەڵ سووکەچەکدارەکان، چەک بەدەست وەدیار کەوتن. وەختێک چاوساغەکانیان ڕادەستی یۆنانییەکان کرد، لەپێشدا چەکدارە قورسەکانی یۆنانی وەپێشکەوتن. سووکە چەکدار بەدواياندا و سوارەنیزامیش لە پشتەوە جێگایان گرت. وەختی خۆر گزینگدان، سیڤتیس لەگەڵ سوارەکانی هاتە پێشەوە و شانازی بە چەکدارە قورسەکانی یۆنانی کرد و گوتی زۆرجار شەوانە لەگەڵ سوارەکانی کەوتووەتە ڕێگا و لە لەشکری پیادە هەڵبڕاوە. ئەو هەروەها گوتی: " ئێستا، وەک سروشتییە بەیانە و گشتمان لێرە کۆبووینەتەوە و چەشنی بەرەیەکی یەکگرتوو دەچین. ئێوە جارێ لێرە چاوەڕوان بن و پشوویەک بدەن. من خۆم لەپێشدا هەڵسەنگاندنێکی بارودۆخی شوێنەکە دەکەم، چاوێک بە وڵاتیدا دەگێڕم و خێرا دێمەوە لاتان ". سیڤتیس دوای ئەو لێدوانەی بە سواری ئەسپ بەرەو پێشەوە غاریدا و ڕێگایەکی داوێنی شاخەکانی دەڤەرەکەی گرتەبەر. کاتێک گەیشتە جێگایەکی تەواو بەفراوی، چاوی لە شەقڵی بەفر کرد بۆوەی بزانێ کەس بۆ پێشەوە یا پاشەوە بەو شوێنەدا دەرباز بووە یانا. کاتێک دڵنیا بوو کە شەقڵی بەفر نەشکاوە و هیچکەس پێیدا نەڕۆیشتووە، خێرا گەڕاوە دواوە و گوتی: " پیاوەکانی لەشکر، ئەگەر ڕەزای خوای لەسەر بێ هەموو شتێک بە دڵی ئێمە دەچێتە پێش، چونکە هێرشەکەمان بەجێیە و دوژمن غافڵگیر دەکەین. من بە ئەسپەوە وەپێش دەکەوم، ئەگەر کەسێکمان دیت، خێرا دەیگرین بۆوەی خەڵکمان لێ ئاگادار نەکاتەوە. ئێوەش لە پشت سەری من وەرن، ئەگەر تۆزێکیش وەدوا کەوتن، گرفت نییە. شوێنپێی ئەسپەکانی من هەڵگرنەوە و جێ مەمێنن. کاتێک گەیشتنە ئەو شاخانە، دێهاتگەلێکی زۆر و دەوڵەمەندمان دێنە سەر ڕێگا ".

لای نیوەڕۆ سیڤتیس و هێزەکانی گەیشتبوونە سەر بەرزاییەکان و لەوێڕا گوندەکانیان بەباشی دەدیت. بەپەلە گەڕاوە لای هێزەکانی چەکدار و گوتی: " ئێستا دەستوور بە سوارکارەکان دەدەم کە بە دەشتاییدا پەلامار بدەن و دەوری ناوچەکە بگرن و هێزی سووکە چەکداریش هێرش بەرنە سەر گوندەکان. ئێوەش

وەدوامان بکەون، چەندی دەکرێ خێرا بن، چوون ئەگەر کەسێکیش بۆسەی دانابێتەوە و گەرەکی بێ بەرگری بکا، پێویستە تێکبشکێ ". گزنفۆن کاتێک گوێی لەو قسانە بوو لە ئەسپەکەی دابەزی. سیڤتیس ڕووی لە ناوبراو کرد و لێی‌پرسی: " بۆچی دابەزی؟ ئێمە دەبێ پەلە بکەین ". گزنفۆن لە وڵامدا گوتی: " دەزانم، تۆ تەنیا پێویستیت بە من نییە، ئەگەر لەگەڵ چەکدارە قورسەکان بەپێ بڕۆم باری ڕووحیان دەچێتە سەر و خێراتر دەگەینەجێ ". گزنفۆن خێرا ڕۆیی و بەدوای ئەویشدا تیماسیۆن کە نیزیک بە چل چەکداری لەگەڵ بوو، بەدوایدا چوو. گزنفۆن لەلایەن خۆیەوە حوکمی کرد، کەس بە باروبنەوە خۆی قورس نەکات و گشت گەنجەکانی نیزیک بە سی ساڵ ئامادە بن و ئەو فەرمانە زاربەزار گەیشتە جەماوەر. ئەوانە دەبوایە وەک ستوونێکی نیزامی لەپێش لەشکر جێیان گرتبا. گزنفۆن خۆی وەپێش ئەو جەماوەرە کەوت. کلیئانۆر فەرماندەی باقی هێزەکانی لەشکریی وەستۆگرت. گشتیان پەلاماریان بۆ سەر گوندەکان دەستپێکرد.

کاتێک گەیشتنە ئاواییەکان، سیڤتیس بەخۆی و نیزیکەی سی سوارکار نیزیکی گزنفۆن بۆوە و پێیگوت: " گزنفۆن! ئەوانە ئەو گوندانەن کە پێشتر بۆم باسکردی. خەڵکی ئەو ئاواییانە هیچ جموجۆڵێکیان لە خۆیان نیشان نەداوە. سوارکارەکانی من دیار نین و بە غار دەڕۆن و بە وڵاتیدا بڵاو بوونەتەوە و بە تەنیان، لە هێزی سووکەچەکدار و چەکداری قورسیش کەسیان لەگەڵ نییە. لەوە دەترسم کە هێزەکانی دوژمن کۆبنەوە و پێکەوە پەلاماری لەنەکاویان بدەنێ. پێموایە لەنێو گوندەکانیش خەڵکی خۆمان هەیە، چونکە ئەو ئاواییانە پڕحەشیمەتن.

گزنفۆن گوتی: " من خۆم لەگەڵ هێزەکانم چیاکانی دەوروبەر دەگرم. تۆ فەرمان بە کلیئانۆر بدە کە هێزەکانی بڵاوبکاتەوە. با ناوبراو ئەوەندەی دەکرێ هێزەکانی بە دەشتاییدا بەرەو لای گوندەکان دابەش بکا ". دوای ئەو ئاڵوگۆڕانە، نیزیکەی هەزار کەسیان بەدیلگرت. دوو هەزار گاوگوڵ و دە هەزار سەر مەڕ و ماڵاتیان بە تاڵان برد و هەر لەوێش شەو مانەوە و خێمەیان لێدا.

## بەشی ٤

### تەواو بوونی لەشکرکێشی - سەرمای سەخت - لە مەترسی کەوتنی گیانی
### گزنفۆن - قەرار و پەیمانی سیڤتیس لەگەڵ تینی‌یەکان

ڕۆژی دوایی، سیڤتیس پاش ئەوەی تەواوی گوندەکانی ئاگرتێبەردا بەبێ ئەوەی هەست بە ناڕاحەتی بکا، تەنیا مەبەستی ئەوە بوو کە ترس و نیگەرانی لە دڵی دوژمنانی خۆیدا بخولقێنێ. بە واتایەک دەیویست بڵێ کە ئەو ناوچانەش کە مابوون، تووشی چارەنووسێکی ئەوتۆ دەهاتن ئەگەر نەیێنە ژێر ڕکێفی حوکمی ناوبراو. دوای ئەو کارەی ڕۆیشت. گشت تالانەکەشی ڕادەستی ئیراکلیدیس کرد بۆوەی بچێتە شاری پارینتۆ و خوردیان بکاتەوە و لەو ڕێگایەوە مووچەی هێزەکانی بەکرێگیراو بدا. سیڤتیس هەم خۆی و هەمیش یۆنانییەکان لە دەشتی تینی ئۆردویان لێدا. تینی‌یەکان ماڵ و کاشانەی خۆیان بەجێ‌هێشت و پەنایان بۆ شاخەکان برد. لەو کاتەدا بەفرێکی گەلێک قورس باری و پلەی هەوا ئەوەندە دابەزی کە گشت وڵات لە سەرمان بەستی. ئاوێکیش کە بۆ مەسرەفی خۆیان دەیان‌هێنا لەڕێوە دەیبەست و شەڕابی نێو کووپەکانیش بەو چەشنە ببوونە سەهۆڵ. کەپۆ و گوێی زۆربەی

یۆنانییەکان سەرما بردی. ئەوکاتە دەرکەوت بۆچی تراکییەکان کەوڵی ڕێوی لە سەروگوێلاکی خۆیان وەردەپێچن و جلوبەرگیان تاکوو سەر ڕانیان نییە و درێژە و دەگاتە سەر پێڵاوەکانیان. بە تایبەت ئەوکاتەی سوارکاری دەکەن، لیباسەکانیان دەگەیشتە گوێزینگیان.

سیڤتیس لەو نێوەدا هێندێک لە دیلەکانی ئازاد کرد بۆوەی بە دانیشتووانی پەنابەری نێو چیاکان بڵێن کە بگەڕێنەوە سەر ماڵوملکی خۆیان و ئیتاعەت لە فەرمانەکانی ئەو بکەن. ئەگەر خۆیان لەو ویستە ببوێرن، تەواوی گەنمی نێو حەمبارەکان و ماڵەکانیان دەسووتێنێ و گشتیان لەبرسان دەکوژێ. دوای ئەو هەڕەشەیە پیر و پەککەوتە و ژن و منداڵ گەڕانەوە سەر جێوڕێی خۆیان. لاوەکان بەپێچەوانەی ئەو هەڕەشەیە لە گوندەکانی سەر چیا سەختەکاندا خێمەیان لێدا و لەوێ مانەوە. کاتێک سیڤتیس ئاگادار بۆوە کە ئەو لاوانە نەگەڕاونەتەوە ئاواییەکان، بەدوای گزنفۆن‌یدا نارد و داوای لێکرد کە هێزێکی گەنج لەگەڵ خۆی بێنێ و ڕەگەڵ ئەو بکەوێ.

سیڤتیس و گزنفۆن شەو وەڕێکەوتن و بەیانی سەحەری گەیشتنە ئاواییەکان. زۆربەی دانیشتووانی (تینی) کە بۆ ئەو شوێنانە ڕایانکردبوو، پەنایان بۆ چیاکانی دەوروبەریان برد. سیڤتیس ئەوەندەی دەگیری کەوت، بێ بەزەییانە کوشتنی و بەسەر نێزەی وەکردن. لەنێو لەشکری یۆنانیدا کابرایەکی منداڵباز خزمەتی دەکرد. ناوی ئێپیس‌تێنیس و خەڵکی ئۆلینتۆ بوو. ناوبراو چاوی بە لاوێکی جوان کەوت کە تازە باڵغ ببوو و مەتاڵێکی چندراوی بچووکی پێبوو. ئەو لاوە لەلایەن سیڤتیس مەحکووم بە مەرگ کرابوو. کابرای منداڵباز خێرا ڕایکردە لای گزنفۆن و داوای لێکرد کە ئەو گەنجە لە کوشتن ڕزگار بکا. گزنفۆن چووە لای سیڤتیس و پێشنیاری کرد کە کوڕەکە نەکوژێ و هاوکاتیش باسی خواستی ئێپیس‌تێنیسی لای ئەو کرد. گزنفۆن بە سیڤتیسی گوت کە ئێپیس‌تێنیس هەمیشە خوازیاری ئەوە بووە کە لە کاتی دامەزراندنی دەستەکانی لەشکری بکەوێتە نێو کۆڕی کوڕە جحێڵە جوانەکان و خۆشی پیاوێکی بەغیرەت و شەڕکەر بووە و قەت خوازیاری پاداشیش نەبووە و دەگوترێ کە زۆریش جوامێرانە لەگەڵ گەنجەکان جولاوەتەوە.

سیڤتیس لە ئێپیس‌تێنیسی پرسی: " بەڕاستی تۆ دەخوازی لەجیات ئەو گەنجە سەرت لێبدرێ! ". ناوبراو سەری بەرزکردەوە و گوتی: " لێدە، سەرم لێدە، لەسەر چی ڕاوەستاوی، ئەگەر ئەو کوڕە ڕازی بێ و بەوە خۆشحاڵ بێ، ڕامەوەستە و سەری من لێدە ". سیڤتیس ئەوجار لە کوڕەی پرسی کە ئایا دەخوازێ لەجیات ئەو ئێپیس‌تێنیس بکوژرێ. گەنجەکە لە وڵامدا، لەبەر سیڤتیس پاڕاوە و گوتی کە ڕازی نییە، نە سەری ئەو و نە هی ئێپیس‌تێنیس لێبدرێ. لەو کاتەدا ئێپیس‌تێنیس کوڕەی لەباوەش گرت و بە سیڤتیسی گوت کە حازرم بە شەڕی تەنبەتەن ئەو گەنجە ڕزگار بکەم و قەتیش تازە لە خۆمی دوور ناکەمەوە. سیڤتیس لە قاقای پێکەنینی‌دا و ڕۆیشت و وەدوای کارەکانی کەوت. فەرمانی‌دا هەر لەوێ ئۆردو لێبدەن تا فرسەت بە پەنابەرەکانی تینی لە شاخەکان نەدرێ دەستیان بە ئازووقەی دێهاتی دەوروبەر ڕابگات.

دوای چەند ڕۆژ تراکییەکان لە چیاکان دابەزینەخوارێ بۆوەی چاویان بە سیڤتیس بکەوێ. لەگەڵ ناوبراو وتووێژیان لەسەر ئاشتی و دیلەکان کرد. وەختێک گزنفۆن‌یش سەردانی سیڤتیسی کرد، پێیگوت کە سەربازەکانی یۆنانی لە شوێنێکی مەترسی‌دار ئۆردویان لێداوە کە لە هێزەکانی دوژمن نیزیکە. گزنفۆن لەو باوەڕەدا بوو کە لەجیات ئەوەی بەسەر ماڵەکاندا دابەش بن و هەڕەشەی مەترسی و تێداچوونیان لەسەر بێ، باشترە لە دەشتایی و شوێنی قایم دامەزرێن. سیڤتیس دڵخۆشی گزنفۆنی داوە و دیلەکانیشی بە ناوبراو نیشان‌دا کە لەوێ بوون. هێندێک لە تینی‌یەکانی ڕاکردوو، لە چیاکان‌ڕا دابەزین و چوونە لای گزنفۆن و داوایان کرد کە ئەو بۆ ئاشتبوونەوەیان یارمەتییان بدا. گزنفۆن ڕەزایەتی دەربڕی و پێی‌گوتن ئەگەر ئیتاعەتی سیڤتیس‌یان بکردایە تووشی هیچ خەتەرێک نەدەهاتن و کەسیش نەدەکوژرا. لەڕاستیدا ئەو تینی‌یانەی کە هاتبوونە لای گزنفۆن بۆیە نەهاتبوون ئاشتی و ئارامی ڕەچاو بکەن، بەڵکوو بەپێچەوانەوە خەریکی سیخوڕی کردن بوون و گەرەکیان بوو بارودۆخی وەزعی ئۆردوگای یۆنانییەکان هەڵسەنگێنن.

ئەو ڕۆژە بەو شێوەیە دەرباز بوو. شەوی دوایی تینییەکان دابەزینە خوارێ و پەلاماری گوندێکیان لە بەرزاییەکاندا. گزنفۆن خۆی و پیاوەکانی لەو دێیەدا بوون. تینییەکان گەورەی بنەماڵەکانیان وەک چاوساغ لەگەڵ بوو. بۆ تینییەکان دژوار بوو بەو شەوە تاریکە ماڵەکانی نێو گوند بەبێ چاوساغ بدۆزنەوە. ماڵەکان گشتیان خاوەن حەساری چەپەری گەورە بۆ مەڕ و ماڵات بوون. کاتێک لە درگای ماڵەکان نیزیک کەوتنەوە، هێندێک بە نێزە لە درگاکانیان دەدا و بەشێکیش بە زۆری خۆیان لە ژووری داخنی و جەماوەرێکیش بە گۆپاڵ لە درگایان دەدا. گۆپاڵەکانیان بەجۆرێک بوو کە شەڕی شمشێری دەکرد. بەردەوام ئاگریان لە ماڵەکان بەردەدا و هاواریان لە گزنفۆن دەکرد بێتەدەر دەنا دەکوژرێ و لەنێو ئاگردا دەسووتێ. ئاگر خەریکبوو سەربازەکانیشی دادەگرت. گزنفۆن لەگەڵ پیاوەکانی هێشتا لە ژووریدا بوون. جلوبەرگی شەڕیان لەبەر خۆیان کرد و کڵاوخوودیان لەسەرنا و خەنجەر و قەڵغان بەدەست ئامادەی بەربەرەکانی بوون. سیلانۆسی هەژدە ساڵانەی شەیپوورچی خەڵکی ماکیستۆ تێتوراند. خێرا گشت یۆنانییەکان، ئەوانەی لە ماڵەکانیشدا بوون خەنجەر و شمشێریان لە کالان دەرکێشا و یەکدەنگ دەرپەڕینە دەرێ. تراکییەکان کاتێک وەزعەکەیان بەو شێوەیە دیت، مەتاڵە بچووکەکانیان لەسەر سەریان دانا بۆوەی خۆیان بپارێزن و خێرا ڕایانکرد و بەسەر حەساری چەپەری نووک تیژدا خۆیان فڕێدا نێو کۆڵانان. لەو نێوەدا هێندێکیان نەیانتوانی دەرباز بن و بەدیلگیران. چونکە بە نووکی دارەکانی چەپەرەوە ببوون و بە مەتاڵەوە گیریان خواردبوو. ژمارەیەکیشیان ڕێگای هەڵاتن و پاشەکشەیان نەدۆزییەوە و کوژران.

یۆنانییەکان پەلاماردەرەکانیان تا دەرەوەی دێ ڕاونا. لەپڕێکا جەماوەرێک لەو تینییانە بە تاریکی شەو گەڕانەوە و شەڕەنێزەیان لەگەڵ یۆنانییەکان دەستپێکردەوە. ئەوانە بەبەر ڕووناکی ئاگردا تێپەڕیبوون و خۆیان گەیاندبووە ئەو ماڵانەی لە ئاگردا دەسووتان و دوو کەسیان لە لۆکاژەکان بریندار کردبوو. لۆکاژەکان یەکیان یێرۆنیمۆی خەڵکی ئێڤۆدێئا و

ئەوەیتریش تیئۆپینی خەڵکی لوکرۆ بوو. یۆنانییەکانی دیکە هیچیان بەسەر نەهات. سیلاحی هێندێکیان سووتا بوو و جلەکانیشیان درابوو. سیڤتیس بەغاری ئەسپ خۆی گەیاندەجێ بۆوەی یارمەتییان بدا. ناوبراو حەوت سواری لەگەڵ بوو. ئەوانە یەکەم وەجبەی سوارەکانی ئەو بوون کە پێراگەیشتبوون لەگەڵی بێن. تراکیۆی شەیپورچیش لە نێویاندا بوو. لەو کاتەوە کە خەبەر بە سیڤتیس گەیشت کە یۆنانییەکان لە گەمارۆ کەوتوون، بەغار وەرێکەوتبوو تا لە فریایان بکەوێ. بەردەوام دەنگی شەیپوری تراکیۆ دەبیسترا و تێکەڵ بە مارشی ئەوانیتر دەبوو و مەترسی لە دڵی دوژمن خستبوو. کاتێک سیڤتیس گەیشتە لای یۆنانییەکان، ئەحواڵپرسی گشتیانی کرد و پێیوابوو کە بەسەر کوژراوێکی زۆردا دەکەوێ.

دوای هاتنی سیڤتیس، گزنفۆن داوای لە ناوبراو کرد کە دیلەکانی شەڕ رادەست بکا و لەگەڵ ئەو پێکەوە پەلاماری شاخەکانی دەوروبەر بدەن. هەڵبەت ئەگەر دەخوازێ، ئەگەرنا ئەوە گزنفۆن خۆی بەتەنیا ئەو کارە دەکات. ڕۆژی دوایی سیڤتیس دیلەکانی دایە گزنفۆن. گشتیان پیر و بە تەمەن بوون. ئەو جۆرەی دەگوترا ئەوانە تراکییەکانی چیا نشین بوون. سیڤتیس بەخۆی و تەواوی هێزەکانییەوە گەیشتەجێ کە ژمارەیان سێ هێندەی پیاوەکانی گزنفۆن دەبوون. زۆربەی دانیشتووانی ئۆدریسی هەستیان بە خەراپەکارییەکانی سیڤتیس کردبوو. بۆیە لە شاخەکانڕا دابەزیبوون و ڕەگەڵ هێزەکانی ئەو کەوتبوون. تینییەکان وەختێک دیتیان کە قەراری پەلامار لەلایەن لەشکرێکی زۆری چەکداری قورس و سووک و سوارکار لە گۆڕێدا، لە چیاکان دابەزینەخوار و خۆیان بە دەستەوەدا و ئیتاعەتی خۆیان ڕاگەیاند. ئەوانە هەروەها قبوڵیان کرد کە چی داوایان لێبکرێ، بەجێی دەگەیێنن و لە بەرامبەردا هەستی باوەڕپێکراوی و متمانە بە یەکتر جێبگرێ.

سیڤتیس بەدوای گزنفۆنیدا نارد و پێیگوت کە بڕیاری ئاشتی لەگەڵ تراکییەکان مۆرنەکردوە و لەسەر ڕزایەتی ئەو ویستاوە. ئەگەر گزنفۆن بخوازێ سەبارەت بە هێرشی ئەو شەوە سزایان بدا، ئەوە سەربەستە.

گزنفۆن له وڵامی سیڤتیس‌دا گوتی: " من لەو باوەڕەدام که هەر ئێستاش به ڕادەی پێویست سزا دراون، چونکه بوونەته غوڵام و کۆیلەی تۆ و ئیتر ئازاد نین ". ئەو هەروەها داوای له سیڤتیس کرد که لەمەو بەدوا کەسانی بەهێز و جوامێر بکاته هاوپەیمان، بۆوەی له شەڕدا تووشی زەرەد و زیان نەبێ. پیرەکان بەڕێکاتەوه سەر ماڵ و شوێنی خۆیان. دانیشتووانی تینی گشت قەرارەکانی ئاگربەسیان قبوڵکرد و لەگەڵ سیڤتیس ئاشتبوونەوه.

## بەشی ٥

### خۆبواردنی سیڤتیس لە مووچەی لەشکر - درێژەپێدانی لەشکر بە
### خزمەت کردنی سیڤتیس - ڕوو وەرگێرانی سەربازەکان لە گزنفۆن

هێزەکانی سیڤتیس و گزنفۆن بە ڕێگای چیاکاندا ڕۆیشتن و گەیشتنە نیزیک ناوچەکانی سەرووی ڤیزاندیۆ، واتە ئەو شوێنەی تراکییەکان لێی دەژیان و پێی دەگوترا دێلتا. ئەو دەڤەرە لەژێر حوکمی مێسادیس‌دا نەبوو. خاکی هەرێمەکە ناوی تیریس و ملکی هۆزی ئۆدریسی بوو. لەوێ چاویان بە ئیراکلیدیس کەوت کە قەرار بوو تالان و دەستکەوتەکان خورد بکاتەوە. سیڤتیس دەستووری‌دا کە داشقەی هێستر و ژمارەیەک کەڵ و گا کە بەجووت لە یەکتر بەسترابوونەوە، بۆ حیسابی خۆی جیا بکرێنەوە. پاشان بانگی گزنفۆنی کرد و داوای لێکرد کە بۆ شەخسی خۆی چی دەخوازێ هەڵگرێ و پاشماوەشی لەنێوان ستراتێژ و لۆکاژەکاندا دابەش بکا.

گزنفۆن ڕووی لە سیڤتیس کرد و گوتی: " من بە ڕادەی پێویست تالانم هەیە و هیچ ناخوازم. ئەوەی هەیە لەنێوان ستراتیژ و لۆکاژەکاندا دابەشی بکە کە لە شەڕەکاندا یارمەتی منیان داوە ". لە داشقەی هێسترەکان یەک وەبەر تیماسیۆن دارانی کەوت و دووەکەی‌تریش بۆ کلی‌ئانۆر ئۆرخۆمێنی و فرینیسکۆسی ئاخایی داندران ". عارەبانەکانی بە کەڵ ڕادەکێشران وەبەر لۆکاژەکان کەوتن.

هەرچەند مانگێک تێپەڕیبوو، سیڤتیس تەنیا مووچەی بیست ڕۆژی سەربازەکانی دابوو. ئیراکلیدیس گوتبووی کە نەیتوانیوە دەستکەوتەکانی تالان بە نرخێکی باش بفرۆشێ. گزنفۆن لەو بارەوە گەلێک ناڕاحەت بوو و سوێندی بە خواکان خوارد و گوتی: " ئیراکلیدیس! من لەو باوەڕەدام کە تۆ گرینگی بە خواستەکانی سیڤتیس نادەی. چونکە ئەگەر بایخت بەو کارە دابایە، پێویست بوو مووچەی تەواوت هێنابا. ئەگەر بۆت جێبەجێ نەدەکرا، دەتتوانی قەرز وەگری، تەنانەت ئەگەر جلوبەرگی خۆت فرۆشتبا ".

ئەو ئاخاوتنەی گزنفۆن ئیراکلیدیسی ناڕاحەت کرد، چونکە لەوە نیگەران بوو کە ڕەنگە متمانەی سیڤتیس لەدەست بدا. ناوبراو هەر لەو ڕۆژەوە لە پشت سەری گزنفۆن لەلای سیڤتیس قسە و بوختانی هەڵبەست. لە لایەکی‌ترەوە هێندێک لە سەربازان لەمەر وەدرەنگی کەوتنی مواجبەوە، گزنفۆن‌یان بە تاوانبار زانی. سیڤتیس‌یش بەنۆرەی خۆی لە گزنفۆن دڵگیر بوو، چونکە ناوبراو بەردەوام داوای مووچەی سەربازەکانی لێدەکرد. سیڤتیس ئەگەر تا ئەو کاتەش لە فکری ئەوەدا بوو بەڵێنەکەی بەرێتە سەر، واتە کاتێک بەرەو ڕۆخەکانی دەریا گەڕانەوە ناوچەکانی ڤیسانتی، غانۆ و نی‌ئۆتیخۆس بە گزنفۆن ببەخشێ، ئەویش لە بەڵێنەکانی پەژیوان بۆوە و ئیتر باسی نەکردەوە. ئیراکلیدیس بەردەوام لەگوێی سیڤتیس‌دا دەیخوێند کە باوەڕ بە کەسێک مەکە کە لەشکرێکی ئاوا بەهێزی هەبێ و لە شوێنی قایمی بە بورج و قەڵادا نیشتەجێیە.

لە پێوەندی لەگەڵ ئەو گشتە ڕووداو و گرفتانەدا، گزنفۆن بیری لەوە کردەوە ئاخۆ لە درێژەدانی ڕێگا بەرەو قووڵایی ناوچەی تراکی لەگەڵ لەشکر

بێ یان‌نا. ئیراکلیدیس، جیا له گزنفۆن، گشت ستراتیژەکانی دیکەی بردە لای سیڤتیس. داوای لێکردن کە لای ناوبراو بۆچوونەکانی ئەو سەبارەت بە توانایی لەشکر بەبێ سەرکردایەتی و چاوساغی کردنی گزنفۆن تەئید بکەن. ئیراکلیدیس بەڵێنی‌دا کە لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا مووچەی دوو مانگان بەسەر یەکەوە بە سەربازەکان دەدا. ئەو هەروەها داوای لە ستراتیژەکان کرد کە لەگەڵ سیڤتیس درێژە بە لەشکرکێشی بدەن.

تیماسیۆن لەو نێوەدا وەقسە هات و گوتی: " من ئەگەر مووچەی پێنج مانگانیش وەرگرم، قەرار نییە بەبێ گزنفۆن لە لەشکرکێشیدا بەشداری بکەم ". ستراتیژەکانی‌تریش، فری‌نیسکۆس و کلی‌ئانۆر لەگەڵ تیماسیۆن هاودەنگ بوون. لە ئاکامدا سیڤتیس گەلێک لە ئیراکلیدیس قەڵس بوو، چونکە گزنفۆنی هەڵاواردبوو و لەگەڵ ستراتیژەکان بانگهێشتی نەکردبوو. ناوبراو لەجێوە داوای کرد کە گزنفۆن بە تەنیا بێتە لای. گزنفۆن چوون بە بوختان هەڵبەستن و زەمکردنی ئیراکلیدیسی زانیبوو، بەتەنیا نەچووە لای سیڤتیس بەڵکوو گشت ستراتیژ و لۆکاژەکانی لەگەڵ خۆی برد. دوای ئەوەی هەموو لایەک ڕازی بوون و قسە و بوختانی ئیراکلیدیس پوچەڵکرایەوە، ئەوسا تێکرا بڕیاریان‌دا درێژە بە لەشکرکێشی سیڤتیس بدەن.

تەواوی ئەو هێزانە بە نێوەڕاستی وڵاتی مێلینۆفاغۆس‌یەکاندا تێپەڕین و گەیشتنە سالمیدیسۆس[۱۳۲] و وڵاتی پۆندۆ کە لەلای ڕاستیان هەڵکەوتبوو. لەو شوێنە گەلێک بەلەم و گەمی لە گڵ دەچەقین، چونکە ئاوی دەریا بۆ مەودایەکی دوور و درێژ تەنک دەبۆوە. تراکییەکان ئەو شوێنەیان بە چەقاندنی کۆڵەکە لە نێوان خۆیاندا دابەش‌کردبوو. هەر گەمی‌یەک لەگڵ دەچەقی، تراکییەکان لەنێو بەشی خۆیاندا خێرا تالانیان دەکرد. دەگوترا پێش ئەوەی ئەو دابەش‌کردنە لەنێو بەحرەکەدا بکرێ و کۆڵەکە بچەقێندرێن، تراکییەکان لەسەر تالانی گەمی چەقیو، لێیان دەبووە شەڕ و پێکدادان. لەو شوێنە ژمارەیەکی زۆر قەرەوێڵە و سندوق و کتێبی دەستنووس و

---

۱۳۲- سالمیدیسۆس ناوی دواتری میدیا بووە.

کەرستەی‌تر کە لەنێو سیپاندا بوون، بەرچاو دەکەوتن و باری گەمییەکان بوون.

هێزەکانی سیڤتیس و لەشکری یۆنانی لەو شوێنەڕا گەڕانەوە دواوە. تەواوی ئەو هەرێمە ژێردەستەیی خۆی ڕاگەیاندبوو. سیڤتیس ببووە خاوەن لەشکرێکی مەزنتر لە هی یۆنانییەکان. ژمارەیەکی زۆر لە ئۆدریسی‌یەکان بەرزاییەکانیان بەجێهێشت و داگەڕانە خوارەوە و تێکەڵ بە لەشکری سیڤتیس بوون. گشت هێزەکان لە سەحرای سەرووی سیلیڤریا و بە مەودای سی ستادیۆ دوور لە دەریا ئۆردویان لێدا. ڕۆژگار دەگوزەرا و خەبەر و باسێک لە مووچە نەبوو. سەربازەکان بە چاوی ڕق و تورەییەوە دەیانڕوانییە گزنفۆن. سیڤتیس‌یش بە نۆرەی خۆی دۆستانە لەگەڵ گزنفۆن هەڵسوکەوتی نەدەکرد. هەرکات گزنفۆن لە ناوبراو نیزیک دەبۆوە کە باسی گرفتی نێوانیان بکەن، کارێک بۆ ئەو دەهاتە پێش و خێرا بیانوویەکی دەدۆزییەوە.

## بەشی ٦

### ئاخاوتنی گزنفۆن – پشتیوانی کارمینۆس و پۆلیکراتیس – سەر سوڕمانی سیڤتیس و ئیراکلیدیس – ناجوامێری سیڤتیس دەرهەق بە گزنفۆن

دوو مانگ دوای ئەو بارودۆخە خارمینۆسی لاکۆنی و پۆلینیکۆس لەلایەن تیڤرۆنڕا هاتنە لای یۆنانییەکان و ڕایانگەیاند کە لاکیدیمۆنییەکان بڕیاریان داوە دژی تیسافێرن لەشکرکێشی بکەن. ئەوان گوتیان کە تیڤرۆن بۆ شەڕ لەگەڵ تیسافێرن کەوتووەتەڕێ و پێویستی بە هێزی نیزامی هەیە و بەڵێنی داوە کە بە هەر سەربازێک مانگانە یەک داریک و بە لۆکاژ دوو داریک و بە ستراتێژ چوار داریک مووچە بدا.

کاتێک ئیراکلیدیس ئاگاداری هاتنی ڕاسپاردەکانی لاکیدیمۆنی بوو و لە مەقسەد و مەبەستیان تێگەیی، چووە لای سیڤتیس و پێیگوت: " فرسەتێکی چاوەڕوان نەکراوی خێر بۆ تۆ دەستی‌داوە. لاکیدیمۆنییەکان پێویستیان بە لەشکر هەیە و تۆش ئیتر حەوجەت پێی نەماوە. ئێستا دەکرێ بەڕێیان

بکەیەوە وڵاتی خۆیان و لە یەخەی خۆتیان بکەیەوە و خۆشحاڵیان بکەی. ئیدی پێویست ناکا داخوازی مووچە بکەن و لە وڵاتی تۆ دەڕۆن ".

سیڤتیس وەختێک گوێی لەو قسانە بوو داوای دیتنی ڕاسپاردەکانی لاکیدیمۆنی کرد. کاتێک ڕاسپاردەکان بە سیڤتیس‌یان گوت کە بۆ لەشکر هاتوون، ناوبراو بە خۆشحاڵی و دڵنیاییەوە گوتی کە شاد دەبێ ئەگەر لەشکری یۆنانی بگەڕێتەوە وڵاتی خۆی. ئەو هەروەها گوتی کە گەرەکیەتی دۆست و هاوپەیمانی لەشکری یۆنانی بمێنێتەوە و بۆ ژەمی نیوەڕۆ بانگهێشتی کردن و میوانداریەکی بەجێی لێکردن. ناوبراو نە گزنفۆن و نە هیچکام لە ستراتێژەکانی بانگهێشت نەکرد.

لاکیدیمۆنییەکان ئەوکاتە لە سیڤتیس‌یان پرسی کە گزنفۆن چۆن مرۆڤێکە. سیڤتیس وڵامی دانەوە: " لەسەریەک مرۆڤێکی خەراپ نییە. سەربازەکانی زۆر خۆش دەوێ. هەر ئەوەشە زۆری زەرەر بە خۆی گەیاندوە ". لاکیدیمۆنییەکان گوتیان: " واتە دەکرێ لەشکر هەڵفریوێنین ". ئیراکلیدیس وڵامی دانەوە: " بێگومان " . لاکیدیمۆنییەکان ئەوجار پرسیان: " پێتان‌وایە گزنفۆن لەکاتی دوورکردنەوەی لەشکر دژایەتی بکا؟ ". ئیراکلیدیس لە وڵامدا گوتی: " ئێوە لەشکر کۆکەنەوە و بەڵێنی مووچەی باشیان پێبدەن، ئەوکات بە غار ڕەگەڵتان دەکەون ". لاکیدیمۆنییەکان پرسیان چۆن دەتوانین لەشکر کۆکەینەوە و قسەیان لەگەڵ بکەین ". ئیراکلیدیس وڵامی دانەوە: " سبەینێ بەیانی سەحەری، ئێوە ڕەوانەی لای ئەوان دەکەم. لەو باوەڕەدام هەرکە چاویان بە ئێوە بکەوێ، بە خۆشحاڵی و هومێدوارییەوە دێنە لاتان ". ئەو ڕۆژەش بەو چەشنە دەرباز بوو.

ڕۆژی دوایی سیڤتیس و ئیراکلیدیس، لاکیدیمۆنییەکانیان بردە لای لەشکری یۆنانی. کاتێک گشت سەربازەکان کۆبوونەوە، وەڤدی ڕاسپاردە گوتی: " لاکیدیمۆنییەکان بڕیاریان داوە دژی تیسافێرن شەڕ بکەن، واتە ئەو کەسەی ناهەقی لە ئێوە کرد. ئەگەر ئێوەش لەگەڵ ئێمە لە پەلاماری دژی ئەو کابرایەدا بەشدار بن، هەکام لە ئێوە بە گوێرەی خواستی خۆی دەتوانێ

ناوبراو سزا بدا و مانگانه یەک داریک مووچە وەرگرێ. هەر لۆکاژێکیش دوو داریکی دەدرێتێ و بۆ ستراتێژەکانیش چوار داریک دیاری کراوە ".

سەربازەکان کاتێک گوێیان لەو قسانە بوو گەلێک خۆشحاڵ بوون. لە نێو سەربازەکاندا کەسێکی خەڵکی ئارکاداس هەستا سەرپێ، تەنیا بۆوەی بە خەراپی باسی گزنفۆن بکا. سیڤتیس خۆیشی حزووری هەبوو. ناوبراو گەرەکی بوو بزانێ چدەقەومێ و لە شوێنێک دانیشتبوو و بەڕاحەتی گوێی لە ئاخاوتنەکان دەبوو و دیلمانجێکیشی لە تەنیشت خۆی دانابوو. هەڵبەت خۆیشی زمانی یۆنانی هێندک دەزانی. بە هەرحاڵ ئارکاداس هەستا سەرپێ و گوتی: " ئێمەی لاکێدێمۆنی نەک هەر ئێستا بەڵکوو لە داهاتووشدا هەر پشتیوانی ئێوە دەبین. گزنفۆن لەبەر خەراپەکاری خۆی ئێمەی گەیاندە ئێرە و ناچاربووین زستانێکی سەخت دەرباز بکەین و شەو و ڕۆژ خەریکی لەشکرکێشی بین و حەسانەوەمان نەبووە. گزنفۆن کەڵکی بە غەڵەتی لە ئێمە وەرگرت و ئێستاش بەرهەمی زەحمەتی ئێمە دەخوا و سیڤتیس ئەوی دەوڵەمەند کرد، بەڵام ئامادە نییە مووچەی ئێمە بدا. بۆیە من هەوەڵ کەس دەبم و پڕ بەدڵ حەز دەکەم بەردبارانی گزنفۆن بە چاوەکانی خۆم ببینم. لە بەرامبەر ئەو گشتە نەهامەتییەی کە ئێمە لە دەست جینایەتکارێکی ئەوتۆ دیتمان، ئاواتخوازم بە سزای خۆی بگات. ئەوکاتە هەست بە ڕەزایەتی تەواو دەکەم و بەو قەناعەتە دەگەم کە تەواوی مووچەی خۆم وەرگرتووە و لەمەر دژوارییەکانی دیتم گلەییم نامێنێ ". دوای ئارکاداس، دوو کەسی‌تریش هەستانە سەرپێ و قسەیان کرد.

گزنفۆن دوای بیستنی ئەو قسانە هەستا سەرپێ و دەستی بە وڵامدانەوە کرد: " ئەو جۆرەی دەیبینم، پیاو دەبێ چاوەڕوانی هەموو شتێک بێ. کاتێک بەو قەناعەتە بگات کە بەڕاست مرۆڤە. ئیمرۆ من لەلایەن ئێوەوە تاوانبار دەکرێم، بەڵام لە دەروونی خۆمدا پێموایە کەس لە من زیادتر خەمخۆری ئێوە نەبووە. کاتی خۆی هەرچەند بڕیارم دابوو بگەڕێمەوە وڵاتی خۆم، بەوحاڵەش لەلاتان مامەوە. سوێند بە خواوەند دیا، نەک لەبەر ئەوەی کە ئێوە لە ژیانێکی خۆشدا بوون، بەڵکوو بە پێچەوانەوە بیرم لە بەدبەختی و نەهامەتی ئێوە

دەکردەوە و مەبەستم بوو بە مانەوەم ئەگەر بکرێ لە جێگایەکدا قازانجێکم بۆتان هەبێ.

کاتێک هاتمە ولاتی تراکی، سێفتیس ئەو سەرکردەیەی لێرە دانیشتووە، گەلێک راسپاردەی ناردەلام و لەبەرم پاڕاوە و بەڵێنێکی فرەی پێدام کە چی بخوازم بۆم جێبەجێ بکات، بەو شەرتەی من ئێوە بەرمە لای ئەو. بەو حاڵەش بە قسەی سێفتیسم نەکرد و ئێوەش شاهیدن و بەپێچەوانەوە بەرەو شوێنێک رۆیشتین کە لەوێڕا ئیمکانی دەربازبوونمان بۆ ئاسیا خێراتر دەبوو. من ئەوکاتە لەو باوەڕەدا بووم کە ئەو بڕیارە زۆر بە قازانجی ئێوەیە و دڵنیاش بووم کە قبووڵی دەکەن. خۆتان دیتتان ڕاست لەو کاتەدا ئاریستارخۆس بە گەمی نەفەرهەڵگر هاتە ئەو شوێنەی ئێمەی لێبووین و نەیهێشت کە بە ئاسیادا دەرباز بین. ئەوکاتە دیسان من ئێوەم لێرە کۆکردەوە و لێم پرسین کە چبکەین باشترە. لەبیرتانە کە ئاریستارخۆس دەسەری کردن کە بەرەو خێرسۆنیسۆس بڕۆن و لەولاشەوە سێفتیس هات و ئێوەی رازی کرد کە لە لەشکرکێشی‌دا یارمەتی بدەن و گەلێک بەڵێنی پێدان و ئێوەش گشتتان یەکدەنگ لەسەر ئەوە ساغ بوونەوە کە بچنەلای ناوبراو. لە هەلومەرجێکی ئەوتۆدا، تاوانباری من لەکوێدا. وەختێک ئێوەم بۆ ئەو شوێنە ڕێنوێنی کرد کە خۆتان مەبەستتان بوو؟ بەداخەوە سێفتیس درۆزن دەرکەوت و لە بەڵێنەکانی پاشگەز بۆوە و مووچەی ئێوەی نەدا. ئەگەر من هەڵسووکەوتی ناوبراوم بە دروست زانیبا، دڵنیام ئەوکاتیش منتان بە تاوانبار دەزانی و دەکەوتمە بەر ڕقوکینی ئێوە. ئەگەر زیادتر لە هەرکەسێکی‌تر سێفتیسم بە دۆست زانی، ئێستا هیچ باوەڕێکم پێی نەماوە، بۆ؟ چونکە ئێوەم بەلاوە گرینگتر بوو، لەبەر ئەوەی بە ئەرکی خۆم هەستام نەک بە خواستی ئەو بجوڵێمەوە و ئێوەم لەجیات ئەو هەڵبژارد. ئێستاش ئێوە پێتانوایە کە ئەوە منم تەواوی پارەی مووچەی ئێوەم وەرگرتووە و ناتاندەمێ. بەڵێ ئەوەی ڕوون و ئاشکرایە ئەوەیە کە ئەگەر سێفتیس تەنانەت بەشێک لە بەڵێنەکانی بەجێ‌گەیاندبا، دەکرا بڕێکیش مووچەی بە من دابا، نەک خۆی لێ‌ببوێرێ. هەڵبەت ئەگەر پارەی کەمی بە ئێوە داوە، بەو مانایە نییە کە بەشی زۆرتری

بە من دابێ، یا بە پێچەوانەوە ئەگەر زۆرتری بە ئێوە دابێ حەتمەن کەمتری بە من داوە. ئەگەر ڕەوتی ڕووداوەکانتان وەک ئەوجۆرەی من باسم لێوەکردن، قبوڵ بێ، ئەوسا ئەرکی سەرشانتانە، چەندی لە من ئەوەندەش لە سێڤتیس داوای هەقی خۆتان بکەن و کێشەی بەرتیل وەرگرتنیش کە بۆتان پرسیار بوو، با بەجارێک ڕوونبێتەوە. بە باوەڕی من بەو شێوەیە دەردەکەوێ ئەگەر من لە سێڤتیس شتێکم وەرگرتبێ یان‌نا، گرینگ نییە ئەگەر کەمیش بێ. ئەو کاتە سێڤتیس‌یش بۆی هەیە داوای وەرگرتنەوەی ئەو بەرتیلە بکا، وەختێک من نەمتوانی ڕوونی بکەمەوە کە بۆ چ کارێک و مەبەستێک لە ناوبراوم وەرگرتووە. من لەو تاوانانەی وەپاڵ منی دەدەن تەواو بێبەریم. ئەوەی کە مووچەی ئێوە لە دەستی مندا بووە و لە دابەشکردنی خۆم پاراستووە، ئەبەدا ڕاست نییە. من بە هەموو خواکانی نێر و مێ سوێند دەخۆم کە سێڤتیس تەنانەت مووچەی منیشی نەداوە. ئەوەتا خۆی لێرەیە و گوێی لە قسەکانی منە و دەتوانێ شاهیدی بدا. ئەگەر ڕاست ناکەم با وەدرۆم بخاتەوە. بۆوەی زیادتر ئێوەم دڵنیا کردبێ، سوێند دەخۆم تەنانەت ئەو مواجبەی بە ستراتێژەکان درا، من ئەویشم پێنەگەیی. وەک لۆکاژەکانیش حیسابم بۆ نەکرا.

سەربازان! من بەو شێوەیە جوڵامەوە. پێش دەستپێکی لەشکرکێشی لەبەرامبەر ئەو گشتە فەقیری و برسییەتییە خۆم‌ڕاگرت، تەنیا بۆوەی کە سێڤتیس باشتر بکەمە دۆستی خۆمان. بەو هیوایەی ئەگەر ڕۆژێک ناوبراو بە سامانێک گەیشت پاداشی باشترمان بداتەوە. بەداخەوە دوایە تێگەییم کە سێڤتیس کاتێک بە دەسەڵات گەیشت، خێرا ڕووی لە من وەرگێڕا. ڕەنگە یەکێک پرسیار بکا و بڵێ کە تۆ گزنفۆن خەجاڵەت ناکێشی بەو شێوە ناحەزە فریوت خوارد. بەڵێ، سوێند بە خواوەند دیا دەخۆم کە ئەگەر دوژمن هەڵیفریواندبام شەرمم لە خۆم دەکرد، بەڵام داخەکەم فریوی دۆستم خوارد. بەلای منەوە لەوە ناحەزتر نییە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان من خۆم دۆست هەڵفریوێنم هەتا ئەو درۆم پێبڵێ.

بەڕاستی ئەگەر قەرار بێ لە بەرامبەر دۆستاندا خۆپارێزییەک لەبەر چاو بگیردرێ تا دڵگیرییەک نەیەتە پێش، ئەوە ئێمە بووین کە بە تەواوی توانامانەوە حەولمان‌دا کارێک نەکەین دۆستەکەمان بیانووی دەستکەوێ و خۆی لە بەجێ‌گەیاندنی بەڵێنەکان ببوێرێ. ئێمە هیچکات سیڤتیس‌مان تاوانبار نەکرد، نە لە کات و شوێنی نابەجێ پێداگریمان لەسەر دانی مووچەمان پێوەدیترا و نە لە کاتێکدا کە پێویستی بە یارمەتی ئێمە هەبوو، زەختمان لێکرد. ڕەنگە ئێستا ئێوە بە من بڵێن کە گزنفۆن تۆ دەتتوانی پێش بەستنی پەیمان لەمەر بەشداری لە لەشکرکێشیدا، پارەی پێش وەعدە وەربگری، ئەگەر لایەنی بەرامبەریشت درۆی کردبا گرینگ نەبوو و پارەی خۆمان وەرگرتبوو. سەبارەت بەو بەشە گوێتان لێبوو کە پێشتر چیم پێگوتن. من قەت حازر نەبووم لە حزووری ناوبراودا ئەو گشتە نهێنییە باس بکەم، بەڵام چیبکەم کە نمەک بە حەرامی ئێوە ناچار بە باسی ڕەوشی ئەو سەردەمەی خۆمانی کردم.

دەخوازم وەبیر خۆتانی بێننەوە کە هەلومەرجی ئەو کاتەمان چەندە دژوار بوو، واتە ئەو وەختەی ئێوەم بردە لای سیڤتیس. ڕەنگە لەبیرتان چووبێتەوە کاتێک نیزیکی شاری پێرینتۆ بووینەوە، ئاریستارخۆس چۆن ڕێگای چوونە نێوشاری لێگرتین و تەواوی دەروازەکانی داخست. مەگەر لەبیرتان چۆوە کە لە نێوەڕاستی زستانی سەخت و سارددا بەناچاری لە دەرەوەی شار ئۆردومان لێدا و ئازووقەی لەشکرمان بە پارە دەکڕی و تازە بە دەگمەن وەگیرمان دەکەوت. ئەی بۆ لەبیرتان چۆوە کە ئێمە لە وڵاتی تراکی و لە ڕووی بێدەرەتانی مابووینەوە، چونکە ئەو بەلەم و گەمییانەی دەبوایە ڕامانگوێزن بە فەرمانی ئاریستارخۆس لە بەندەرەکان ڕاگیرابوون و ناوبراو لە تەواوی دەوروبەری شاری پارینتۆ قەرەوڵی دانابوو و نەیدەهێشت بەرەو ئاسیا بڕۆین. هەڵبەت ئەوەش دەزانن کە ئەگەر لەوێ مابایینەوە، وڵاتی دوژمن بوو و هێزی سوارە و سووکە چەکدار بەردەوام هەڕەشەیان لێدەکردین و ئێمەش تەنیا چەکداری قورسمان هەبوو و بەس. بەڵێ ئەگەر ئێمەش هێزی سوارە و سووکە چەکدارمان بووایە و بە شێوەیەکی نیزامی ڕێکوپێک پەلاماری ئاواییەکانمان بدایە، دەمانتوانی گەنم و ئازووقە و مەڕوماڵات و

دیلێکی زۆر وەدەست بێنین، بەڵام مەخابن من ئەوکاتە نە هێزی سوارە و نە سووکە چەکداری ئامادەی شەڕم شکنەدەبرد.

لە بارودۆخێکی ئەوتۆدا کە ئێوە لەوپەڕی موحتاجیدا بوون، ئایا نەدەبوایە لەگەڵ سیڤتیس پەیمانی دۆستایەتی ببەستم و کەمترین مواجبیش قبوڵ بکەم. سیڤتیس ئەو کاتە هەم خاوەن هێزی سوارە بوو و هەمیش سووکەچەکدار. بە واتایەک ئەو هێزانەی ئێوە پێویستیتان پێیان هەبوو. ڕەنگە ئێوە ئێستاش لەو باوەڕەدا بن کە من بەو کارانەم خەریکی زیان گەیاندن بە ئێوە بوومە. باشە مەگەر بە یارمەتی هێزی سوارە و سووکە چەکداری سیڤتیس نەبوو کە ئەو کشتە گەنمەتان لە گوندەکان بە تالاّن هێنا و تراکییەکان لە ترسی گیانی خۆیان ناچار بوون دەست لە ماڵ و کاشانەیان هەڵگرن و مەڕوماڵات و ئەسپ و وڵاغەکانیان بۆ ئێوە جێبهێڵن؟ وادیارە لەبیرتان چووەتەوە ئیتر هەستمان بەبوونی دوژمن لە دەوروبەری خۆمان نەدەکرد و لە هەرجێگایەک تووشی شەڕ هاتباین، هێزی سوارەی سیڤتیس بەفریامان دەگەیی. لەحاڵێکدا پێش ئەو سەردەمە هێزەکانی دوژمن لێمان وەغیرەت کەوتبوون و بە زەبری سوارە نیزام و سووکەچەکدارەکانیان نەیاندەهێشت لە هیچ شوێنێک بژیوێکمان دەستکەوێ.

باشە ئەو کابرایە ژیانی ئێمەی نەجاتدا و بژیو و ئەمنییەتی بۆ دابین کردین، تەنیا مووچەی مانگانەی جوامێرانە نەداوینێ و هەر لەبەر ئەوەشە من ئێمرۆکە کەوتوومە بەر دادگایی ئێوە و نابێ بە زیندوویی ڕێگای گەڕانەوە بۆ وڵاتەکەم بگرمەبەر. ئێستا پرسیاری من ئەوەیە، ئێوە چۆن لەو وڵاتە دەڕۆن، ئایا دەخوازن لێرە بمێننەوە چونکە زستانتان دەرباز کرد، چوون قەیاسێکی زۆر ئازووقەتان هەیە، مەگەر گشتیی بەهۆی سیڤتیس دەستتان نەکەوتووە؟ پرسیارێکتان لێدەکەم، ئایا ئەوەی وەگیرتان کەوتووە و لە دوژمنتان ئەستاندوە و ئێستا لەوپەڕی بەختەوەریدا دەژین بەبێ ئەوەی تەنانەت یەک سەربازیش لە گوردانەکانتاندا کوژرابێ، یا جوامێرانە توانیتان شەڕ دژی بەربەرەکانی ئاسیا بکەن، هەرهەمووی لە پیاوەتی ئێوەیە؟ یانی کەسیتر لەو

نێوەدا نەخشی نەبووە؟ ئەو کاتەی بەسەر تراکییەکاندا زاڵبووین و لەشکرمان بردە سەریان و سەرکەوتین، ئایا ئەوەش لەبیرچوو؟ وڵامم بدەنەوە!

ئا لێرەدایە کە داواتان لێدەکەم ئەگەر لە منیش قەڵس و تووڕەن، نابێ یارمەتی خواکان لەبیر بکەن. سەری کڕنۆشیان بۆ دانەوێنن، چونکە ئەو گشتە خێروبێرەیان بۆ ئێوە بەدیاری هێنا. ئێوە دەبێ ئەو کارە بکەن. فەرمون دەی، دە تۆزێک وردتر بیر بکەنەوە. خوایە وەزعی من بە کوێ گەیشتووە. ماوەیەک لەوەپێش کاتێک خۆم ساز کردبوو کە بە گەمی بگەڕێمەوە وڵاتی خۆم ، بۆخاتری ئێوە بە دنیایەک فەخر و شانازییەوە دەگەڕامەوە و یۆنانییەکان بە قەدر و ڕێزەوە وەریان دەگرتم و جێگای باوەڕی لاکیدیمۆنییەکان دەبووم. ئیدی پێویست نەبوو بێمەوە لای ئێوە. بەداخەوە ئێستا ئەگەر بخوازم بگەڕێمەوە وڵاتی خۆم، لەلایەک بەهۆی بوختان هەڵبەستن لەلای لاکیدیمۆنییەکان بێزراوم، لەلایەکیتریشەوە ڕق و تووڕەیی سیڤتیس هەڕەشەم لێدەکا. من پێموابوو سیڤتیس دوای یارمەتی دانی ئێوە ڕازی دەبێ، بۆ منیش و منالەکانیشم وەک پەناگایەک دەبوو، بەڵام بەداخەوە دەبینم هیچ لایەک جێگای هومێد نین. دەزانن بۆچی؟ من لەبەر خاتری ئێوە کەوتوومە بەر ڕق و کین و بێ لوتفی ئەو دوو لایەنە. ئەویش لایەنی بەهێزتر. تەنیا لەبەر ئەوەی هیچکات بۆ وەرگرتنی مافی ئێوە و قازانج گەیاندن بێدەنگ دانەنیشتم و کۆڵم نەدا. ئەوە فکر و زکری من سەبارەت بە ئێوە بوو. ئێستاشی لەگەڵ بێ، من هەر کات و ساتێک پێویست بێ لە خزمەتی ئێوەدام. دڵنیابن نە بە دزی و نە بە ئاشکرا بە هیوای ڕۆیشتن نیم. ئەگەر ئێوە ئەوجۆرەی دەخوازن هەڵسوکەوت بکەن تەنیا ئەوەندە بزانن، پیاوێک دەکوژن کە ئەو گشتە خێرەی بۆ ئێوە هەبووە، لە هەموو ڕەنج و ئازارەکاندا لەگەڵتان شەریک بووە و تووشی ئەو هەموو خەتەر و مەترسییە هاتووە، چ ئەو کاتەی لەنێو ستوونەکانی لەشکردا بوو و چ وەختێک بە تەنیا بوو. ئێوە کەسێک دەکوژن کە بە یارمەتی خواکان لە تەواوی سەرکەوتنەکانی دژی بەربەرەکاندا لەگەڵتان بوو و شانبەشانی ئێوە بە هەموو توانایەوە شەڕی کرد، تەنیا بۆوەی نەبێتە دوژمنی هیچ یۆنانییەک.

ئێستاش بە خۆشییەوە ئازادی تەواوتان هەیە بەبێ هیچ گرفتێک بۆ هەر شوێنێک حەزتان لێیە بڕۆن. ئەوە ئێوەن کە ئیمڕۆ دیاری دەکەن بە دەریا یا بە ویشکاییدا بەرەو وڵاتی خۆتان بچنەوە. لەبیرتان نەچێ ئێستا بەختەوەریەکی تەواو ڕووی تێکردون. ئێوە دەتوانن سەفەر بۆ شوێنی جیاجیای وڵات بکەن کە سەردەمێک ئارەزووتان بوو. داوای یارمەتی لە لەشکرە بەهێزەکەتان لە گشت لاوە هاتووەتە گۆڕێ. مووچەی باشتان پێدەدرێ، سەرکردەکانتان ئاڵوگۆڕیان بەسەردا دێ و مرۆڤی باشتر لە لاکێدێمۆنییەکان فەرماندەریتان دەکەن. باشە ئێستا پرسیارتان لێدەکەم، لە وەختێکی ئاوا پڕ لە خۆشی و بەختەوەریدا ئایا دروستە بەو خێراییە من بکوژن؟ لەو هەموو ناخۆشی و نەهامەتییەدا کە تووشی هاتین و هیچکاتێکیش لەبیرمان ناچێتەوە، شتێکی لەو بابەتە ڕووی نەدا و منتان وەک باوکی خۆتان حیساب دەکرد و بەردەوام ڕێزتان لێدەگرتم و دەتانگوت کە گزنفۆن قەت تۆ لەبیر ناکەین، چونە ئێستا بیرێکی ئەوتۆ مێشکتانی داگیرکردوە؟ دەبێ ئەوەش بڵێم بەو کارە متمانەی خۆتان لەلای ئەو ڕاسپاردانەی کە ئیمڕۆ هاتوونەتە لای ئێوە دەفەوتێنن و هیچ قازانجێکی لێناکەن و وەک ڕەفتارێکی باش لە هەمبەر مندا چاوی لێناکرێ ". گزنفۆن بەو شێوەیە قسەکانی خۆی تەواو کرد.

دوای گزنفۆن، خارمینۆسی لاکێدێمۆنی هەستا سەرپێ و گوتی: " نا نا، سوێند بە خواکان دەخۆم کە ڕێگا بە هیچکەس نادرێ ڕوو لە گزنفۆن وەرگێڕێ. من خۆم شاهیدم کاتێک من و پۆلینیکۆس پرسیارمان لە سیڤتیس کرد کە گزنفۆن چۆن مرۆڤێکە و خاڵە لاوازەکانی کامانەن. ناوبراو لە وڵامی ئێمەدا تەنیا ئەوەندەی گوت کە گزنفۆن بە دڵ سەربازەکانی خۆش‌دەوێ و هەر ئەوەشە کە زیانی بەو گەیاندوە. ئەگەر ئەوەندە عاشقی سەربازەکانی نەبێ، زیادتر بە قازانجی ئێمە واتە سیڤتیس و لاکێدێمۆنییەکان دەجوڵێتەوە ".

دوای خارمینۆس، ئەوجار ئێڤریلۆخۆسی خەڵکی لوسیاتیسی سەر بە دەڤەری ئارکادی دەستی بە ئاخاوتن کرد و گوتی: " لاکێدێمۆنییەکان! منیش پێموایە یەکەم ئەرکی گرینگی ئێوە، ئەوەیە کە مووچەی سەربازەکان لە سیڤتیس بستێنن چوون پێمان قەرزدارە. ئەگەر بە ڕەزایەتی خۆی دای، باشە

ئەگینا بە زۆر ناچارین لێیبستێنین. ئەوەش پێویستە پێش ڕۆیشتنی ئێمە لێرە جێبەجێبکرێت ".

پۆلیکراتی ئاتێنی، ئەویش بە نورەی خۆی چەند قسەیەکی باشی سەبارەت بە گزنفۆن کرد و گوتی: " سەربازەکان! من دەبینم کە ئیراکلیدیس ئەویش لێرەیە. ئەو کابرایە تالانێکی کە بەو گشتە زەحمەتە بەدەستمان هێنابوو، بردی بیفرۆشێ. ئەو هیچ پارەیەکی نە بە سیڤتیس و نە بە ئێمە نەدا. هەمووی دزی و لەلای خۆی ڕایگرتووە. ئەگەر ڕاست دەکەین، دەبێ ناوبراو بگرین و ناچاری بکەین کە ڕادەستمان بکاتەوە. ئەو کابرایە تراکی نییە، بەڵکوو یۆنانییە و ناهەقی دەرهەق بە یۆنانییەکان دەکات ". کاتێک ئیراکلیدیس گوێی لەو قسانە بوو، تەواوێک ترسا و یەکسەر چووە لای سیڤتیس و پێیگوت: " ئێمە ئەگەر ئاقڵ بین، دەبێ خێرا لێرە بڕۆین. ئێرە لەبەر دەست یۆنانییەکاندایە ". سیڤتیس و ئیراکلیدیس بەپەلە خۆیان هاویشتە سەر پشتی ئەسپەکانیان و بەغار هەڵاتن و خۆیان گەیاندەوە ئۆردوگاکەیان. سیڤتیس لە ئۆردوگاڕا ئاڤرۆزێلمی دیلمانجی خۆی ناردە لای گزنفۆن و داوای لێکرد کە بەخۆی و سەد چەکدارەوە لەلای ئەو بمێنێتەوە. سیڤتیس دووبارە بەڵێنی بە گزنفۆن‌دا کە شوێنەکانی قەراخ بەحر کە پێشتر بەڵێنی دابوو لەگەڵ کۆمەڵێک خەڵاتی دیکە بە ناوبراو بدا. دیلمانجەکای سیڤتیس بەوپەڕی باوەڕپێکراوییەوە بە گزنفۆنی گوت کە لە زمانی پۆلینیکۆسی بیستووە کە ئەگەر ڕۆژێک گزنفۆن دەسەڵاتی لاکیدێمۆنییەکانی بکەوێتە دەست، تیڤرۆناس بە دڵنیاییەوە ناوبراو دەکوژێ. چەند کەسێکیتریش لەو هەواڵ و زانیارییانەیان بە گزنفۆن گەیاندبوو، واتە کەوتووەتە بەرچاوی لاکێدێمۆنییەکان و مەترسی هەڕەشەی لێدەکرێ و دەبێ ئاگای لە خۆی بێ. گزنفۆن کاتێک گوێی لەو قسانە بوو، دوو مەڕی هەڵگرت و بۆ خواوەند دیا قوربانی کرد. نییەتی ئەوە بوو کە کام یەک لەو دوو ڕێگایە بە مەسڵەحەتترە. لەلای سیڤتیس بمێنێتەوە و شەرتەکانی ئەو بەجێ بگەیێنێ یا لەگەڵ لەشکر ڕێگا بگرێتە بەر. لە نیشانەکانی قوربانی بۆ خواوەند دیا دەرکەوت کە بڕوا باشترە.

## بەشی ٧

### ڕۆیشتن بۆ دێهاتی پڕ لە ئازووقە - گفتوگۆ و ڕاوێژ لەگەڵ میدۆسادیس - ئاخاوتنی گزنفۆن بۆ سیڤتیس - ڕازیکردنی سیڤتیس لەمەڕ دانی مووچە

دوای ئەو ڕووداوانە، سیڤتیس لە شوێنێکی زۆر دوور ئۆردوی لێدا. یۆنانییەکانیش لە گوندەکان خێمەیان هەڵدا و گەرەکیان بوو دوای کۆکردنەوەی ئازووقەی پێویست بەرەو دەریا داگەڕێنە خوارەوە. سیڤتیس ئەو گوندانەی بە میدۆسادیس بەخشیبوو. کاتێک میدۆسادیس دیتی سامانی ئەو ئاواییانە لەلایەن یۆنانییەکانەوە بەتاڵان دەچێ، تەواوێک قەڵسبوو. ناوبراو پیاوێکی لە ئۆدریسییەکان ڕەگەڵ خۆیدا کە مرۆڤێکی بەهێز و بەقەڵافەت بوو. ئەو کابرایە لەو ئۆدریسییانە بوو کە وەختی خۆی لە ناوچەکانی کوێستانیی تراکی دابەزیبوو. میدۆسادیس لەگەڵ ئەو کابرا تراکییە و نیزیکەی سی سوارکار چوونە لای گزنفۆن و داوایان لە ناوبراو کرد کە لە دەرەوەی ئۆردوگا چاویان پێیبکەوێ.

گزنفۆن چەند کەس لە لۆکاژ و فەرماندەکان کە خۆی گەرەکی بوو، بۆ ئەو دیدارەی بردن. لەوێ میدۆسادیس بە گزنفۆنی گوت: " گزنفۆن، ئەوە ناهەقییە ئێوە گوندەکانی من تالان کەن. من لە لایەن سیڤتیس‌ڕا هاتووم و ئەو کابرایەش ڕاسپاردەی پاشای مەدیتەرانە، واتە میدۆکۆسە. ئێمە هاتووین کە ئاگادارتان بکەینەوە لەوە زیادتر بۆتان نییە زیان بەو گوندانە بگەیێنن و تالانیان بکەن، ئەگینا ناچار دەبین وەک دوژمن لێرە وەدەرتان بنێین ".

گزنفۆن گوێی لە قسەکانی میدۆسادیس بوو و بە توڕەییەوە وڵامی داوە: " ئەتۆیەکی بەو شێوەیە قسە دەکەی زۆر زەحمەتە پیاو بتوانێ جوابت بداتەوە. تەنیا بۆخاتری ئەو کوڕە جحێڵە دوو قسان دەکەم بۆوەی بزانێ ئێوە کێن و ئێمەش چ کەسانێکین. ئێمە پێش ئەوەی لەگەڵ ئێوە ببینە هاوپەیمان، بەکەیفی خۆمان لەو وڵاتەدا دەگەڕاین. هەر جێگایەکمان گەرەک بوایە تالانمان دەکرد و ئاگرمان تێبەردەدا، بەڵام تۆ ڕاست ئەوکات وەک ڕاسپاردە هاتیە لامان و لە نێوەڕاستی ئۆردوگای ئێمە خێمەت لێدا بەبێ ئەوەی لە هیچ دوژمنێک بترسێی. ئێوە هیچکات غیرەتتان نەدەکرد بەو گەڕەکەدا بێن، ئەگەریش بهاتبان ئەسپەکانتان هەمیشە لغاوکراو و ئامادەی ڕاکردن بوون و وەک ئەوە دەچوو کە لە وڵاتی حوکمڕانێکی بەهێزتر لە خۆتان بمێننەوە. کاتێک ئێوە بوونە دۆستی ئێمە، تەنیا بە یارمەتی ئێمە و خواکان توانیتان ئەو وڵاتە بێننە ژێر دەسەڵاتی خۆتان. ئێستاش لەولاوەڕا هاتووی و ئێمە لێرە دەردەکەی. بەواتایەک وڵاتێک کە ئێمە گرتمان، ئێستا ئێوە داوای دەکەن. تۆش خۆت باش دەزانی کە دوژمن ئەوەندە بەهێز نەبوو ئێمە لێرە دەربکا. تۆ ئەو کەسە نی بتوانی ئێمە لێرە دەربکەی. لەجیات ئەوەی خەڵات و دیاری لەگەڵ خۆت بێنی و حورمەتمان بگری، هاتووی و دەڵێی هەقتان نییە لێرە ئۆردو لێبدەن. ئەویش لە بارودۆخێکدا کە خۆمان بۆ ڕۆیشتن ئامادە دەکەین. تۆ بەوپەڕی بێشەرمییەوە ئەو قسانە دەکەی. تۆ نە لە خواکان و نە لە عەبدەکان خەجاڵەتی ناکێشی. تۆیەکی کە ئیمڕۆ بوویەتە خاوەن سامانێک، وادیارە لەبیرت چووەتەوە کە پێش هاوپەیمانی لەگەڵ ئێمە بۆ دابین کردنی بژیوی خۆت هەمیشە خەریکی تالان و دزی بووی. خۆت باشتر لە هەر کەسێک بە

ڕابردووت دەزانی. باشە ئەو قسانە بۆچی بە من دەڵێی! خۆ من سەرکردەی لەشکر نەماوەم. بۆ ناچیە لای لاکێدیمۆنییەکان؟ مەگەر ئێوە لەشکری یۆنانیتان ڕادەستی ئەوان نەکرد، بەبێ ئەوەی من بانگهێشت بکەن. بچوون لەگەڵ ئەوان قسە بکەن. بەڕاستی مرۆڤێکی سەیر و سەمەرەی. سەرەتا منتان لەبەر چاوی لاکێدیمۆنییەکان ڕەشکرد، ئەویش لەکاتێکدا من لەشکرم بۆ یارمەتی ئێوە هێنابوو، ئێستاش ئێوە لەوە دەترسن کە من مەبادا بتوانم لەشکرەکەم لەگەڵ خۆم بەرمەوە.

کاتێک کابرای ئۆدریسی گوێی لەو ئاخاوتنە بوو، گوتی: " میدۆساتیس! من کە گوێم لەو قسانە بوو خەریکە لە شەرمان بتلێمەوە و بچمە ژێر خاک. ئەگەر لە سەرەتاوە ئەو زانیاریانەم هەبوایە، ئیمکانی نەبوو لەگەڵت بێم. ئێستاش من دەڕۆم، چونکە میدۆکۆس پاشا منی نەناردووە کە ڕزگاریدەرەکانمان لێرە دەربکەم ".

ئۆدریسییەکە دوای ئەو قسانە سواری ئەسپ بوو و لەگەڵ سوارەکانی خێرا بۆیدەرچوون. میدۆساتیس کە لەشکری بە تالانی وڵات تاوانبار کرد، ئەوجار داوای لە گزنفۆن کرد کە دوو کەسە ڕاسپاردەکەی لاکێدیمۆنی بانگهێشتی چاوپێکەوتنەکە بکا. گزنفۆن دوای ئەوەی چەند کەس لە باشترین سەربازەکانی ڕەگەڵ خۆیدا و چووە لای خارمینۆس و پۆلینیکۆس، پێیگوتن کە میدۆساتیس داوای دیداریان دەکا و کاکڵی قسە و باسەکەشی بۆ ئەوان بەوردی باسکرد، واتە لەشکری یۆنانی دەبێ لەو وڵاتە بڕوا. لەنێو قسەکانیدا گوتی: " بەباوەڕی من ئێوە دەتوانن مواجبێکی باش بۆ لەشکر دابین بکەن. ئێوە بە میدۆساتیس بڵێن کە قۆشەن داوای لێکردون کە کارێک بکەن بەڵکوو سیڤتیس بە زۆری یا بە خۆشی مواجبەکەیان بدا. ئەگەر ئێوە ئەو کارە بکەن، لەشکر بە دڵخوازی خۆی لێرە دەڕوا و وەدوای ئێوە دەکەوێ. هەروەها باشترە بە میدۆساتیس بگوترێ کە لەشکر هەقی خۆیەتی ئەو داوایە بکا، چونکە ئێوە تەنیا باس لە ڕۆیشتن دەکەن بەبێ ئەوەی قەرزەکەیان بدەنەوە ".

لاکێدیمۆنییەکان بە گزنفۆنیان گوت کە جیا لەو قسانەی ئەو، زۆر شتیتریش بۆ گوتن هەن. هەردوای ئەو کورتە ڕاوێژە، خێرا گشتیان پێکەوە

وەڕێکەوتن. کۆمەڵێک لە باشترین سەربازەکانی یۆنانییان لەگەڵ خۆیان برد. بردنی ئەوانەش پارمەتییەک بوو بۆ چاوترساندن. کاتێک گەیشتنەجێ، سەرەتا خارمینۆس وەقسەهات و گوتی: " میدۆساتیس! ئەگەر قسەیەکت هەیە بیڵێ دەنا ئێمە شتمان زۆرە بە جەنابتی بڵێین ".

میدۆساتیس بە توڕەییەوە وەجواب هات و گوتی: " من و سێڤتیس یەک ڕوانگەمان هەیە. ئەو خەڵکەی ئێرە بوونەتە دۆستی ئێمە، کەس بۆی نییە ئازاریان بدا. چونکە هەر خەراپییەک دەرهەق بەوان، واتای دوژمنایەتی لەگەڵ ئێمە دەدا. ئەوانە بەشێک لە ئێمەن ". لاکێدیمۆنییەکان لە وڵامدا گوتیان: " زۆر باشە، ئێمە کاتێک دەڕۆین کە ئەوانەی ئێوە ئازارتان داون هەقی خۆیان وەرگرتبێ. غەیری ئەوە ئێمە ئامادەین پارمەتییان بدەین و ئەو کەسانەی زوڵم دەکەن بە سزای خۆیانیان بگەیێنن. ئەگەر ئێوەش لەو کەسانە بن کە ناهەقیتان کردبێ، هەر ئێستا خێرا دەست بە سزادانتان دەکەین و مافی خوراوی ئەو لەشکرەتان لێدەستێنین ".

لەو نێوەدا گزنفۆن دەستی بە ئاخاوتن کرد و گوتی: " میدۆساتیس! ئێوە ئەگەر ڕاستدەکەن، لەو وڵاتەی ئێمە ئۆردومان لێداوە و تۆش دەڵێی دۆستی ئێمەن، ڕێگا بدەن جەماوەر خۆی بڕیار بدا کە ئایا لێرە بمێنێتەوە یا بڕوا بۆ شوێنێکیتر ".

میدۆساتیس وڵامی ئەو پرسیارەی نەداوە، بەڵام داوای لە ڕاسپاردەکانی لاکێدیمۆنی کرد لەگەڵ ناوبراو بچنە لای سێڤتیس و باسی مووچەی سەربازەکان بکەن. ئەو هەروەها گوتی: " ئەگەر ئێوە ناچن، با گزنفۆن و من پێکەوە بچین و ئەو داخوازییە لەبەردەم سێڤتیس دابنێین. ئێستا داواکارم ئازاردانی گوندەکان بوەستێنن ". لەئاکامدا گزنفۆن و چەند کەسێکی گونجاو بۆ ئەو ئەرکە دیاریکران و ناردرانە لای سێڤتیس.

وەختێک گزنفۆن گەیشتە لای سێڤتیس پێیگوت: " سێڤتیس! من بۆ هیچ داواکارییەک نەهاتووم. دەخوازم دڵنیات بکەم کە تۆ بە ناهەق منت بوغزاند. من سەبارەت بە خواستی سەربازەکان بەردەوام پێداگر بووم، چوون تۆ بەڵێنت پێدابوون. من لەو باوەڕدا بووم کە تۆ بە خواست و مەیلی خۆت

مووچەی سەربازەکان بدەیە دەستیان. ئەوە زیادتر بە قازانجی تویە لەجیات ئەوەی ئەوان بێن و داوات لێبکەن.

بەر لە هەر شتێک، دوای ڕەزامەندی خواوەند ئەوان بوون کە یارمەتی تۆیان‌دا ببیە پاشای وڵاتێکی مەزن و حەشیمەتێکی زۆر. بۆ سەرکردەیەکی وەک تۆ ئاکاری چاک و خەراپ لەبەر چاوان وننابێ. ئێستا کە مرۆڤێکی بەناو و ناوبانگی، بە باوەڕی من باشترە دڵسۆزی خۆت نیشان بدەی و ئەو کەسانەی خزمەتیان پێکردوی لە وڵاتی خۆت دەریان نەکەی و هەقی خۆیان بدەیێ. گرینگ ئەوەیە کە شەش هەزار کەس تاریفت بکەن و تۆش نیشان بدەی کە مرۆڤێکی لەسەر قەول و بەڵێنەکانت ڕادەوەستی.

من دەبینم کە قسەی کەسانی بێ قیمەت لێرەولەوێ بڵاو دەبێتەوە و هیچ مانا و قەدر و قیمەتێکیان نییە. کەسانێکیش کە گوتەی ڕاستیان پێیە و بە ئاشکرا دەیڵێن، ئەگەر وەختی خۆی بەهێند وەرنەگیرێ، تازە لە هەلومەرجی سەخت و دژواردا ئەو کاریگەرییەی نامێنێ. چونکە زەبر و زەنگ و هەستی تۆڵە ئەستاندەوەی خەڵکی وەئامان هاتوو جێگای ئەو ئامۆژگاریانە دەگرێتەوە. ئەوەش بزانە! ئەگەر ڕۆژێک مرۆڤێکی خێرخواز کەسێک ئامۆژگاری بکا، دڵنیام کارتێکەری لە تۆڵە ئەستاندنەوەی خەڵکانی دیکە کەمتر نابێ و بگرە زیادتریش دەبێ. وەبیر خۆتی بێنەوە کە ئەو کاتەی ئێمەت کردە هاوپەیمان، چەندە پارەی پێشوەعدت پێماندا! لەبیرتە کە داوای هیچمان لێنەکردی، چونکە لەمەر جێبەجێ‌کردنی بەڵێنەکانت باوەڕمان پێکردی. ئەو خەڵە بەپانەوە لە دەورت کۆبۆوە و بەشداری لە لەشکرکێشی‌یەکانی تۆدا کرد و بەو هەموو زەحمەت و کوێرەوەریە دەسەڵاتێکیان بۆ ئامادەکردی کە ئیمڕۆ بەرهەمەکەی دەبینی.

ئەو دەسەڵاتە نرخی زۆر لە سێ تالاندۆس پارە پترە کە بەڵێنت دابوو وەک مووچە بیدەی. لە هەمووشیان گرینگتر باوەڕپێکراوی تویە کە ڕێگای بۆ کردیەوە تاکوو ببیە پاشایەکی خاوەن دەسەڵات. ئێستا وەبیر خۆتی بێنەوە کە چەندە ئاواتخواز بووی ڕۆژێک دەسەڵاتێکی وەک ئیمڕۆت هەبێ. من دڵنیام کە گەرەکت بوو لەجیات پارە کۆکردنەوە، پەرە بە پاشایەتییەکەت بدەی.

به باوەڕی من کاتێک تۆ نەتوانی ئەو دەسکەوتە بپارێزی، خەسارەت و عەیبێکی گەورە بۆ تۆ دەخولقێنێ و لەوە ناخۆشتر دەبێ کە پێشتر هیچ حوکمڕانییەکت نەبوو. کاتێک پیاو هیچی نییە، ئەوەندە ئازارناچێژێ، بەڵام وەختێک ساماندار بووی و لێتقەوما، نەهامەتییەکی مەزنە. هەڵبەت سرووشتییە کە زۆر کەس چارەنووسی دەگۆڕێ و پاشایەتی لەدەست دەچێ و نۆکەری ڕووی تێدەکا و دەکەوێتە بارودۆخێک کە دەڵێی قەت پاشا نەبووە. تۆ دەزانی کە ئەو خەڵکەی ئێستا بە یاسا و ڕێسای تۆ دەجوڵێنەوە و بەگوێتدەکەن، هیچیان بە ڕەزامەندی و ئارەزووی خۆیان ئەو کارە ناکەن و لە ڕووی ترس و نیگەرانییە. ئەوانەی ئیمڕۆ ملکەچی تۆن هەمیشە ئارەزووی ئازادی خۆیان دەکەن و قەراریش نییە لەوە زیادتر سەرشۆڕی فەرمانەکانی تۆ بن. باشتر ئەوەیە کە لەشکر بە تەواوی لە خزمەتی تۆدا بێ و ئەمرەکانت بەجێ بگەیێنێ. تۆش وەک مرۆڤێکی باش و خزمەتکاری خەڵک و وڵات بی، ئەوسا دەبینی چۆن جەماوەر پۆل پۆل بە خەڵاتەوە لێت نیزیک دەکەونەوە. ئەگەر بە پێچەوانەی ئەوانەی گوتم هەڵسوکەوت بکەی خەڵک هەست بە ڕاحەتی و ئازادی ناکات. دڵنیات دەکەم لەشکرەکەت لەجیات ئەوەی مل بۆ خواستەکانی تۆ ڕابکێشێ، پشتیوانی لە جەماوەر و دانیشتووانی وڵاتەکەت دەکا. ئەوەش بزانە ئەو خەڵکەی ناڕازییە و یارمەتی لەشکریش شک دەبا، لە عێل و عاشیرەتی تۆ کەمتر نین. تەنیا جیاوازیان ئەوەیە کە ئێستا کەس نییە سەرکردایەتییان بکا.

سیڤتیس! ئەوەی ڕوون و ئاشکرایە، تراکییەکان بەتەواوی نەهاتوونە ژێر فەرمانی تۆ، چونکە لەلایەن جەماوەرێک لە لەشکری ئێمەوە یارمەتی دەدرێن و جارێ خۆیان خاوەن هیچ سەرکردەیەک نین. کەوابوو ئەو مەترسییەش هەیە کە کەسێک لە فەرماندەرەکانی لەشکر بکەنە سەرکردە، ئەویش ڕاست لەو کەسانەی کە تۆ ناهەقیت دەگەڵ کردون. لەوەش خەراپتر ڕەنگە پەنا بۆ لاکێدیمۆنییەکان بەرن. بەتایبەت ئەگەر لاکێدیمۆنییەکان بەڵێن بدەن کە لەگەڵ لەشکری ئێمە هێرش بکەنە سەر جەنابت و مووچەی لەشکریش، ئەوان لە تۆ بستێنن. ئێستا لاکێدیمۆنییەکان پێویستیان بە یارمەتی ئێمە هەیە و چی لەشکر

بخوازێ، ئەوان بە قسەی دەکەن. ئەو تراکیانەش کە ئێمڕۆ لەژێر فەرمانی تۆدان، ئیحتیمالی زۆری هەیە کە دژی تۆ وەرسوڕێنەوە و لەوە زیادتر وەدوات نەکەون، ئەوەش ڕوون و ئاشکرایە و سەتاسەت ڕەنگە ببینی.

لەبیرت بێ ئەوەندەی تۆ پاشای، ئەوان کۆیلەن. ئەگەر تۆ وەبەر پەلامار بکەوی، ئەوکات ئەوان ئازادن. ئەگەر قەرار بێ هێندێک ڕێوشوێن بۆ ڕاگرتنی وڵاتەکەت ڕەچاو بکەی، پێتوابێ بە کامیەک لەو دوو ڕێگا چارەیە دەتوانی لەدەست گرفت و ئازارەکانی ڕزگاریت بێ! ئەگەر سەربازەکانی لەشکر مووچەی خۆیان بەخۆشی لە تۆ وەرگرن کە پێشتر بەڵێنت پێدابوون و ئێستا بۆی بە پەرۆشن و داوای دەکەن و ئەوسا بە مەیل و ڕەغبەتی خۆیان بڕۆن و وڵات بە سولح و هێمنی‌یەوە بۆ تۆ جێهێڵن، یا لێرە بمێننەوە و ئێرە وەک خاکی دوژمن چاو لێبکەن و تۆش ناچار بی لەشکرێکی زۆرتر پێکبێنی بۆوەی بتوانی دەرەقەتیان بێی و خەرجێکی زۆریش بۆ دامەزراندنی لەشکری خۆت تەرخان بکەی. کام یەک لەو دوو حاڵەتە زیادتر پارەی تێدەچێ؟ مووچەی پاشکەوتووی لەشکری یۆنانی بدەی یاکوو قەرزدار بمێنییەوە و ناچار بی لەشکری بەهێزتر و بەخەرجتر دامەزرێنی. هەڵبەت ئێراکلیدیس ئەوجۆرەی بە منی گوتووە، لەو باوەڕەدایە کە پارەی تاڵان و دەسکەوت ئێجگار زۆر هەیە.

ئێمە کاتێک دەهاتینە لای تۆ، ئەگەر یەک لە دەی ئەو پارەیەت دابا قەیاسێکی ئەوەندە زۆر نەبوو کە کاریگەری لەسەر سەرجەمی دەسکەوتەکان دابنێ. چونکە ژمارە و قەیاس ئەوەندە گرینگ نییە کە زۆری و کەمی مووچە دیاری دەکات بەڵکوو کردەوەی خاوەن پارە بەلای مووچە بگیر سرنجڕاکێشە. دەرامات و داهاتی تۆ ئێستا زیادتر لە سەرەتای لەشکرکێشییە. سیڤتیس! من ئەو کاتە تێکۆشام کە تۆ بە ئاوات و خواستەکانت بگەی. هیوادار بووم کە تۆش دۆستێکی بە وەفا و دروستکار دەمێنییەوە و لایەقی ئەو سامانە دەبی کە خواکان پێیان‌بەخشیوی و منیش ئیعتیبارەکەم وەک خۆی دەمێنێتەوە و لەنێو لەشکردا تووشی بێ‌متمانەیی نایەم. ئێستا باش بزانە من کە گەیشتوومەتە جێگایەک ئەگەر گەرەکیشم بێ ناتوانم دوژمن

ببەزێنم، تەنانەت ناتوانم یارمەتی تۆش بدەم. چونکە لەشکر ئیمڕۆکە باوەڕێکی ئەوتۆی بە من نەماوە. هەڵبەت باوەڕ بە تۆ و خواکانیش ناکا. خوا ئاگادارە هیچکات من خەلاتێکم نە بۆشەخسی خۆم و نە بۆ لەشکر لە تۆ وەرنەگرتووە، هەرچەند خۆت بەڵێنێکی زۆرت پێدابووم. سوێند دەخۆم کە ئەگەر بەڵێنەکانیشت لە هەمبەر من بەجێگەیاندبا، قبوڵم نەدەکردن. مەگەر سەربازەکانی لەشکریش وێڕای من بە مووچەی تەواوی خۆیان گەیشتبان. من بەڕاستی هەستم بە شەرمەزاری خۆم دەکرد ئەگەر گرفتەکانی خۆم چارەسەر بکردایە و ئازارەکانی لەشکرم لەبیر چووبا. بەتایبەتی لەو کاتەشدا کە خاوەن ڕێز و حورمەتی تەواو لەلای ئەوان بووم.

ئیراکلیدیس لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە بە هەر وەسیلە و ڕێگایەک بکرێ، پیاو پێویستە پارە کۆبکاتەوە، جیالەوە هەرچی بیکەی پڕوپووچە. سیڤتیس! من لەو باوەڕەدام بۆ پیاوی هەڵکەوتوو و سەرکردە، دەبێ ئەخلاق و عەداڵەت و جوامێری لە سامان و پارە گرینگتر بێ. هەر کەس خاوەن ئەو ڕەوشتە جوانانە بێ، هەم ساماندارە و هەمیش دۆستی بەوەج و بەنرخ و بەباوەڕ دەوری دەدەن. خەڵکانێکی زۆر خوازیاری دۆستایەتی ئەو دەبن و بە سەرکەوتنەکانی خوشحاڵ و لە گشت هەلومەرجێکدا ئامادەی یارمەتیدان دەبن. بەپێویستی دەزانم ئەوەش بڵێم: ئەگەر کردەوە و ڕەفتاری منت لە ڕابردوودا بەدڵ نەبوو و ئێستاش بە قسەکانم قانیع نابی، پێمخۆشە بە سرنجەوە داخوازی سەربازەکانی لەشکر وەبەرچاو بگری. تۆ لەوێ بووی و گوێبیسی تاوانەکان بووی و بیستت چۆن خەریک بوون بوختانم پێبکەن. منیان بەوە تاوانبار کرد کە بۆ بەرژەوەندییەکانی تایبەتی خۆم و لاکێدێمۆنییەکان حەولم داوە و ئەوەشت گوێ لێبوو کە بۆ جێبەجێکردنی خواستەکانی تۆ تێکۆشاوم و ویستی ئەوانم وەپاش گوێ خستووە. گوتیشیان کە خەلات و بەراتم لە جەنابت وەرگرتووە. لە تۆ دەپرسم، دەلیلی چییە کە سەربازەکان من بە تاوانبار دەزانن. ئایا وەرگرتنی خەلات و دیاری لە تۆ بوو، یا هەڵسوکەوتەکانی من لەمەر بەرژەوەندییەکانی تۆ؟ من لەو باوەڕەدام کە خەڵک بە گشتی ئەگەر ڕەفتاری منیان سەبارەت بە تۆ بەو باشییە نەدیتبا،

هیچکات قسەی ئەوتۆیان نەدەکرد. بەڵام تۆ، پێش ئەوەی خزمەتێکت پێبکەم، بە نیگا و قسەکانت پێشوازییەکی دۆستانەت لێکردم. بانگهێشتی زیافەتت کردم و بەردەوام بەڵێنی دیاری و خەڵاتت پێدام. لە ئاکامدا تۆ بە یارمەتی لەشکرەکەم و خزمەتەکانم بە دەسەڵات و ئامانجەکانت گەیشتی. ئێستا پێم سەیرە چۆن دەخوازی کەسایەتی من لەلای لەشکرەوە بەریە ژێر پرسیار. من لەو باوەڕەدام کە تۆ دەتوانی مووچەی سەربازەکان بدەی و گەرەکت نییە ئەو کەسانەی پشتیوانت بوونە بوختانیان بۆ هەڵبەستریٚ و درۆیان وەپاڵبخستریٚ. من تەنیا یەک داوام لە جەنابت هەیە، کاتی دانی مووچەی سەربازەکان حەول بدەی من وەک ئەو کەسە بەوان بناسێنی کە ڕۆژی یەکەم هاتمە لات و خزمەتم پێکردی. دەخوازم تێیان بگەیێنی کە من هەمان گزنفۆنم و درۆ و بوختانی هەڵبەستراو هیچیان ڕاست نین ".

سیڤتیس کاتێک گوێی لەو قسانەی گزنفۆن بوو تف و لەعنەتی لەو کەسە کرد کە ئەوی ناچار کردبوو خۆ لە دانی مووچەی لەشکر بپارێزیٚ. گشت لایەک دەیانزانی کە مەبەستی ناوبراو شەخسی ئیراکلیدیسە. سیڤتیس لە درێژەدا گوتی: " من هیچکات بیرم لەوە نەکردوەتەوە و بە خەیاڵیشمدا نەهاتووە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان مووچەی سەربازان نەدەم یا وەدرەنگی بخەم ". وەختێک گزنفۆن گوێی لەو ئاخاوتنەی سیڤتیس بوو، گوتی: " ئێستا کە ڕازی بە دانی مووچەی سەربازەکانی، داوات لێدەکەم ئەو پارەیە لە ئیختیاری من بنیٚ بۆوەی پێیانبدەم، تاکوو ڕێز و حورمەتی پێش هاتن بۆ لای تۆم لەنێو لەشکردا بێتەوە سەر جێیخۆی ". سیڤتیس گوتی: " من لەو نێوەدا هیچ تاوانێکم نییە کە تۆ حورمەتی جارانت نەماوە. تۆ ئەگەر بە هەزار چەکداری قورسەوە لە لای من بمێنییەوە، ئەو پلە و پایە و دیاری و خەڵاتەی بەڵێنم دابوو بەجێیان دەگەیێنم ". گزنفۆن لە وەڵامدا بە سیڤتیسی گوت: " ئەوەی کە داوا دەکەی لەلای تۆ بمێنمەوە، ئیمکانی نییە. ئەگەر بکریٚ هەرچی خێراتر دەینی سەربازەکانم بدەیە با لەوە زیادتر چاوەڕوان نەبین ". سیڤتیس جارێکیتریش پێیداگرت و گوتی: " مانەوەی تۆ گزنفۆن، لێرە بە مەسڵەحەتتر و باشتر لە ڕۆیشتنە ". گزنفۆن وەڵامی داوە: " بۆچوونەکانت دروستە و

پێشبینی‌یەکەت جێگای باوەڕە، بەڵام مانەوەم لێرە مەحاڵە. ئەگەر خاوەن قەدر و حورمەت بم، لە گشت شوێنێک دەتوانم خاوەنی ڕێز و پلەی خۆم بم. سپاس بۆ پێشنیارەکەت ".

سیڤتیس ئەوجار لەمەڕ مووچە گوتی: " من ئێستا پارەیەکی ئەوتۆم نییە و زۆر کەمە. بەڵام دەتوانم بۆ هەر سەربازێک یەک تالاندۆس دانێم و شەش سەد سەر ماڵات و چوار هەزار سەر مەڕ و سەدوبیست غوڵامت بدەمێ و لەگەڵ خۆت بیانبە. ئەو یەخسیرانەش کە زەرەدیان بە ئێوە گەیاندووە، ئەوانیش بۆ ئێوە ".

گزنفۆن ئەوجار بە پێکەنین و خۆشحاڵییەوە وڵامی داوە و گوتی: " باشە ئەگەر ئەوانەی دەمدەیەی و بەشی مووچەی سەربازەکانی نەکرد، من ئەو تالاندۆسە بۆ پاداشی چ خزمەتێکی ئەوان دابنێم؟ چونکە خۆم گەرەکمە بگەڕێمەوە وڵاتی خۆم و ناخوازم لەلایەن سەربازانەوە بەردەباران بکرێم، تەنیا لەبەر ئەوەی یەک تالاندۆسیان دەدەمێ. ئەوە بۆ من مەترسییەکی گەورەیە و تۆش لەو بارەوە ئاگاداری ".

گزنفۆن ئەو ڕۆژە لای سیڤتیس مایەوە. ڕۆژی دواتر بەیانی سەحەری ئەو بەڵێنانەی سیڤتیس بە یۆنانییەکانی دابوو ، بەجێی‌گەیاند و یەخسیرەکانیشی ڕادەست کردن. سەربازەکانی لەشکر تا کاتی گەڕانەوەی ڕاسپاردەکان هەر لەو باوەڕەدا بوون کە گزنفۆن ڕەنگە لەلای سیڤتیس دامەزرێ و نەگەڕێتەوە. پێیانوابوو خەڵات و دیاری لە سیڤتیس وەرگرتووە و ماوەتەوە. کاتێک چاویان بە گزنفۆن کەوت، گشتیان ڕایانکردە لای ئەو و گەلێک خۆشحاڵ بوون.

گزنفۆن هەرکە چاوی بە خارمینۆس و پۆلینیکۆس کەوت، پێی‌گوتن: " ئەو بار و کەرستەیەی دەیبینن، ئەوەن کە من توانیومە بۆ ئێوە لە سیڤتیسی بستێنم. ئێستاش وەرن و تەحویلیان وەرگرن. ئێوە کە وەریان‌دەگرن، تکایە بیانفرۆشن و پارەکەی بەسەر لەشکردا دابەش بکەن ".

خارمینۆس و پۆلی‌نیکۆس تەواوی بار و بنە و مەڕ و ماڵاتەکەیان تەحویل وەرگرت و خەریکی فرۆشتن بوون. لەسەر قیمەت و دابەشکردندا تووشی

قرەیەکی زۆر هاتن. گزنفۆن خۆی لە گشت ماجەراکە دوور ڕاگرتبوو و بە ئاشکرا خەریکی خۆسازکردن بۆ گەڕانەوەی وڵاتەکەی بوو. تا ئەو کاتە هێشتا حوکمی دوورخراوەیی گزنفۆن لە وڵاتی خۆیڕا ڕانەگەیاندرابوو. لەنێو لەشکردا ئەوانەی خاوەن پلە و دەسەڵات بوون، بەپانەوە هاتنە لای گزنفۆن و داوایان لێکرد بەر لەوەی لەشکر لەو شوێنە دوور بخاتەوە، ڕادەستی تریڤۆناسی بکا و خۆی بە تەنیا نەڕوا.

## بەشی ٨

## چوونە نێو وڵاتی لامپساکۆس و ترۆوا و شەڕ لەگەڵ ئاسیداتیس – ناوی ئەو وڵاتانەی لەشکری یۆنانی پێیاندا دەرباز بوو – ناوی حاکمانی ئەو وڵاتانە و گەڕانەوەی سەرجەم دە هەزار سەرباز

لە وڵاتی تراکیڕا گەیشتنە شاری لامپساکۆس. لەوێ گزنفۆن چاوی بە تاڵەبین ئێڤکلیدیسی خەڵکی فلیاسیۆس کەوت. ناوبراو کوڕی کلیئاغۆراسی شێوەکار بوو. کلیئاغۆراس چەند تابلۆیەکی لەژێر ناوی خەونەکانی قوتابخانەی ئاتێن[١٣٤] ئامادە کردبوو و بە دیتنی گزنفۆن ئێجگار شاد بوو و خێرا لێی پرسی چەندی پارە لەگەڵ خۆی هێناوەتەوە. گزنفۆن سوێندی بە خواکان خوارد کە تەنانەت پارەی گەڕانەوەشی بۆ وڵاتەکەی نەبووە. ناچار بووە ئەسپەکەی و گشت بار و کەرستەکانی بفرۆشێ و خەرجی ڕێگای پێدابینبکا. کلیئاغۆراس باوەڕی بە گزنفۆن نەکرد.

دانیشتووانی لامپساکۆس دیاری و میوانداریيان بەبۆنەی گەڕانەوەی گزنفۆن بۆ شارەکەیان پێشکەش بە خۆی و هێزەکانی کرد. گزنفۆن پێش

١٣٢- قوتابخانەی نیوەندی ئاتێن لە ڕۆژهەلاتی شار هەڵکەوتبوو، واتە لەو گەڕەکەی پێشکەش بە قوتابخانەی نیوەندی ئاپۆلۆن کرا. ئەو ناوەش هەر لەوێوە هاتووە.

ڕۆیشتن لەو شارە ئەرکی قوربانی بەجێهێنا و چاوەڕوانی پەند و ئامۆژگارییەکانی خواوەند ئاپۆلۆن بوو. ئێڤکلیدیسی تاڵەبینی بانگهێشت کرد کە هێماکانی قوربانی بخوێنێتەوە. ئێڤکلیدیس پاش خوێندنەوەی نیشانەکان بەو ئاکامە گەیشت کە گزنفۆن تەنانەت بۆ گەڕانەوەی وڵاتی خۆشی پارەی پێویستی نییە و لە درێژەدا پێیگوت: " گزنفۆن دەبینم کە ڕۆژێک لە ڕۆژان بە هەڵکەوت تووشی پارەیەکی دەسکەوت بۆ گەڕانەوەت دەبی، بەڵام بە دڵنیاییەوە گرفتێک لەمەر دەستخستنی ئەو برە پارەیە دێتەگۆڕێ. ئەگەر گرفتەکە لەلایەن نەیارەوە نەبێ، شەخسی خۆت بەربەستی سەرەکی دەبی ".
گزنفۆن خۆیشی تەواو لەگەڵ ئەو گوتەیە بوو. ئێڤکلیدیس لە درێژەدا گوتی: " بێشک خواوەند دیا پێشگیریت لێدەکا ". ئەوسا لە گزنفۆنی پرسی ئایا لە ماوەی سەفەردا قوربانی پێشکەشی ئەو خوایە کردوە یانا. گزنفۆن وڵامی داوە کە تەنیا ئەو کاتەی لە ئاتێن ژیاوە بەردەوام قوربانی کردوە. لەو وەختەوە کە بۆ سەفەر ڕۆیشتووە، نەیتوانیوە ئەو ئەرکە بەجێ بگەیێنێ. ئێڤکلیدیس داوای لە گزنفۆن کرد کە بەردەوام قوربانی بکا وەک چۆن پێشتر لە وڵاتی خۆی بە کردویەتی، بەتایبەت قوربانی پێشکەش بەو خوایەش بکا. ئێڤکلیدیس لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: " بەو قوربانیکردنە، چارەنووس و داهاتووت باشتر دەبێ ".

ڕۆژی دوایی گزنفۆن بەرەو ئۆفرینیۆ ڕۆیشت و بەپێی ڕەسمی وڵاتەکەی چەند بەرازێکی بۆ خواوەند دیا کردە قوربانی و نیشانەکانی خێر و خۆشی دەرکەوتن. هەر ئەو ڕۆژە ڤیۆن و ناڤسیکلیدیس گەیشتنە لای گزنفۆن و هێزەکانی بۆوەی پارەی مووچەی لەشکر بدەن و لەگەڵ ناوبراو ئاشت بنەوە. هەر ئەو ئەسپەی گزنفۆن لە شاری لامپساکۆ بە پەنجا داریک فرۆشتبووی و ئەوانە پێیان‌زانیبوو کە دەبێ لەبەر موحتاجی بووبێ، دووبارە کڕیانەوە و دایانەوە گزنفۆن و پارەشیان لێوەر نەگەرت چونکە دەیانزانی زۆری خۆشدەویست.

لەوێڕا بە نێوەڕاستی شاری (ترۆوا)دا دەرباز بوون. پاش ئەوەی لە کێوی ئیدی تێپەڕین، سەرەتا چوونە ئانتاندرۆ و دواتریش بە قەراخ ناوچە

بەحرییەکانی میسیادا ڕۆیشتن و گەیشتنە دەشتی تیڤی. لەوێشڕا بە نێوەڕاستی ئاندرا میتویوس و کێرتونوس هاتنە دەشتی کایکۆس و لە دەڤەری پێرغامۆسی سەر بە میسیا ئۆردویان لێدا.

لەو شوێنە گزنفۆن لەگەڵ بێوەژن ئێلادا (هێلاس، ناوی وڵاتی یۆنان)، خێزانی ڕەحمەتی غونگیلۆسی ئێرترییئا و دایکی غورغیۆناس و غونگلیۆسی بچووک دیداری کرد. ئەو خاتوونە بە گزنفۆنی گوت کە فارسێک بە ناوی ئاسیداتیس لەو دەشتە ماوەتەوە. ئێلادا لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: " گزنفۆن! ئەگەر خۆت و سێسەد پیاوی جەنگاوەر پەلاماری ئاسیداتیس بدەن، دەتوانن خۆی و ژن و منالّی بەدیل بگرن و تەواوی سامان و دارایی ناوبراو کە ئێجگار زۆرە تالان بکەن ". ئێلادا بۆ ڕێنوێنی کردنی گزنفۆن لەو پەلامارەدا، برازای خۆی و دافناغۆراسی ناردە لای گزنفۆن چونکە باوەڕی پێدەکردن. گزنفۆن بە بوونی ئەو پیاوانە، قوربانی بە نییەتی چارەنووسی ئەو شەڕە پێشکەش بە خواوەند دیا کرد. تاڵەبین ڤاسیاس ئیلیۆس ئەرکی خوێندنەوەی هێماکانی وەستۆ گرت و گوتی کە خێروبێر بەڕێوەیە و ئاسیداتیس‌یش بەدیل دەگیرێ. گزنفۆن دوای ژەمی شەو گشت لۆکاژەکانی جێی متمانە بوون لەگەڵ خۆی برد بۆوەی تالانێکی باشیان وەگیرکەوێ. جەماوەرێکی فرەش نیزیک بە شەش سەد کەس بە زۆری خۆیان ڕەگەڵ پەلاماردەراندا. لۆکاژەکان لە پێشەوە دەڕۆیشتن تا پێش بەو جەماوەرە تالانچییە بگرن. وەک ئەوە دەچوو کە تالان ئامادە بۆ ڕفاندن داندرابێ.

کاتێک گەیشتنە شوێنەکە، لای نیوە شەو بوو. ماوەیەکی زۆری خایاند هەتا ئەوان توانیان ئاسیداتیس و پیاوەکان گەمارۆ بدەن. بەشێکی زۆر لە غولام و ولاغەکانیان ڕاپانکرد. شەڕ لە دەوری قەڵا بە خەستی بەردەوام بوو. داگیرکردنی قەڵا دژوار بوو، چونکە بەرز و گەورە و خاوەن حەسار و چەپەر و پڕ لە پیاوانی شەڕکەر بوو. هێزەکانی گزنفۆن لە ئاکامدا توانیان کونێک لە دیواری قەڵا بکەن. بەرینایی ئەو دیوارە هەشت ڕیز خشت و ئەو شەوە تا نیوەی کونکرا. کاتێک یەکەم کون ئامادە بوو ڕۆژ هەڵات. بە ڕووناکی ڕۆژ نێو قەڵا بە جوانی دەدیترا. لەو کاتەدا یەکێک لە پیاوانی

ئاسیداتیس لە نێوەوەی قلا لە نیزیک کونەکە وێستابوو و بە شیشی ئاسن یەکەم کەس لە پیاوانی گزنفۆنی بریندار کرد. لە شوێنەکانی‌تری قەڵارا پاسەوانەکان توانیان بەدەم شەڕکردن و هاوار و نەعرەتەوە پێش بە هاتنە ژوورەوەی پەلاماردەران بگرن. پاسەوانەکان و خەڵکی نێو قەڵا بەو هەراوهوریایە ئاوایییەکانی دەوروبەریان لەو هێرشە ئاگادار کردەوە. دوای فەترەیەکی کەم ئیتامێنییەکان بە گشت هێزەکانیانەوە گەیشتنێ. هەروەها چەکدارە قورسەکانی ئاسوڕی خەڵکی کۆمانیا و سوارەکانی گرکانی کە ژمارەیان دەگەیشتە حەفتا کەس، بە هاواری خەڵکی نێو قەڵاوە هاتن. ئەو ئاسوریانە گشتیان ئەو سەردەمە مووچە بگیری پاشا بوون.

لەلایەکی‌ترەوە نیزیک بە هەشت سەد کەس سووکە چەکدار کە هێندێکیان خەڵکی پارتی‌نیۆ وبەشێکیشیان دانیشتووانی ئاپۆلۆنیا بوون، بۆ یارمەتیدانی خەڵکی نێو قەڵا گەیشتنەجێ. ئەوانەش خەڵکی دێهاتی دەوروبەر و هەموشیان سوارکار بوون. هێزە یۆنانییەکان ئێستا دەبوایە بیر لە پاشەکشەدا بکەنەوە. ئەوەندەی وڵاغ و مەڕ و ماڵاتی وەگیریان کەوتبوو لەگەڵ خۆیان بردیان. گشت ئەو تاڵانەیان لەنێو خۆیاندا بەشێوەی چوارگۆشەیەکی درێژ لە سەرتاسەری مەودای ڕێگادا پاراست. یۆنانییەکان زیادتر گرینگیان بە پاشەکشە دەدا هەتا دەسکەوتەکانیان. ئەوان گەرەکیان نەبوو ڕواڵەتی ڕاکردن بەخۆوە بگرن. ئەوەش بۆوەی بوو کە دوژمن غیرەتی وەبەر نەیێ و سەربازەکانی یۆنانیش لە مەترسی نەکەون. دیارە هەڵمەتی ئەوجارەیان تەنیا بە مەبەستی تاڵان بوو. کاتێک غونگیلۆس دیتی کە یۆنانییەکان ژمارەیان لە کەمی‌دا و دوژمنیش زۆرە، سەرەڕای نارەزایەتی دایکی بە هەموو هێزی‌یەوە دژی ئاسیداتیس چووە پێشەوە. ئەو گەرەکی بوو کە خۆیشی بەشداری شەڕەکە بێ. ئەو کارەی بووە هۆی ورەدان بە پرۆکلیسی ئالیسارنی و تێڤرانیا واتە نەوەکانی دیماراتۆی پاشای سپارت.

پیاوانی گزنفۆن، چوون لەبەر بارودۆخی خوڵقاو گەلێک ناڕاحەت بوون و کەوتبوونە بەر تیر و کەوان و نێزەی دوژمن، بەشێوەی بازنەیی لە قەڵا دوورکەوتنەوە و مەتاڵەکانیان بەرەوڕووی قەڵا ڕاگرتبوو و زۆر بە دژواری

لە چۆمی کارکاسو پەڕینەوە. لەو سەربازانەی گزنفۆن نیزیک بە نیوەیان بریندار ببوون. لەو کاتەدا لۆکاژ ئاغاسیاسی ستێمفالی بریندار بوو. ناوبراو تەواوی ئەو وەختە جوامێرانە شەڕی دژی دوژمن کردبوو. لەگەڵ یەخسیرەکان ژمارەیەکیش مەڕومالاَت بەتالاَن گیرا کە تەنیا بەشی قوربانییەکانی دەکرد.

ڕۆژی دوایی کاتێک گزنفۆن قوربانی کرد و ئامۆژگاری خواکانی مەبەست بوو، تەواوی لەشکری وەڕێخست تا بە ڕێگایەکی دووردا بگاتە وڵاتی لیدیا و ئاسیداتیش لەوە زیادتر لە ترس و خۆفدا ڕانەگرێ. چونکە یۆنانییەکان ئیتر دوور دەکەوتنەوە و ئەویش پێویستی بە خۆپاراستنی پتر نەبوو. ئاسیداتیس وەختێک بیستی کە گزنفۆن دووبارە قوربانی کردوە و چاوی لە ئامۆژگاری خواکان بڕیوە، لەبەرخۆیەوە بەو قەناعەتە گەیشت کە ناوبراو دووبارە گەرەکییەتی هێرش بکاتەوە سەر ئەو. خێرا قەلاَی چۆلکرد و هێرشی کردە سەر گوندەکانی داوێنی چیای پارتێنیۆ. لەو دەڤەرە شارۆچکەی خاوەن حەساری لێبوو. بەهەڵکەوت لەو ناوچەیە ئاسیداتیس تووشی هێزەکانی گزنفۆن هات. پیاوانی گزنفۆن ئاسیداتیس خۆی و ژن و مناڵ و تەواوی ئەسپەکان و چی هەیبوو گرتیان. بەو شێوەیە نیشانەکانی قوربانی ڕۆژی پێشتری گزنفۆن بۆ خواوەند دیا دەرکەوتن.

دوای ئەو ڕووداوانە یۆنانییەکان گەڕانەوە پێرغامۆ. لێرە گزنفۆن شوکری خوای بەجێهێنا چونکە هەم لاکۆنییەکان و هەمیش لۆکاژ و ستراتێژەکانیتر بە بڕیارێک گەیشتبوون کە ڕادەیەکی زۆر تالاَنیان وەک ئەسپ و عارەبانەی کەڵ و گا و زۆر شتیتر وەبەرکەوێ. تیڤرۆن لەو بەینەدا گەیشتە ئەوێ بۆوەی لەشکرەکە تەحویل وەرگرێ و تێکەڵ بە باقی لەشکری ژێر فەرمانی خۆی بکا کە لە سپارترا هێنابووی. ناوبراو گەرەکی بوو دژی تیسافێرن و فارناڤازۆس شەڕ بکا.

حوکمڕانانی ئەو وڵاتانەی پێیاندا دەرباز بوون، بریتین لە: ئارتیماس لە وڵاتی لیدیا، ئارتاکاماس لە فریغیاس(فریژی)، میتراداتیس لە وڵاتانی لیکائۆنیۆس و کاپادۆکییاس، دێرنیس لە وڵاتانی فینیقییە و عەرەبستان،

ڤلێسیس لە وڵاتانی ئاسیریا (ئاسووری) و سیریا (سوریا)، روباراس لە بابیلۆن، ئارڤاکاس لە میدیا، تیریڤازۆس لە وڵاتانی فاسیانی و ئێسپێریتۆ.
گەلانی سەربەخۆ کە سەر بە هیچ وڵاتێکیتر نەبوون، وەک: کاردوخ، خالیڤی، خالدی، ماکرۆنی، کۆلخی، مووسینی، کیتی و تیڤارینی.
حاکمی پاڤلاغۆنی، کۆریلاس بوو. سەرۆکی ڤیتینییەکان، فارناڤازۆس و هی تراکییەکانی سەر بە ئوروپاش، سیڤتیس بوو.
مەودای تەواوی ڕێگا لە یەکەم ڕۆژی وەڕێکەوتن بۆ چوون تا دوایین قۆناخی گەیشتنەوە، دوو سەد و پازدە مەنزڵ، هەزار و سەد و پەنجا فەرسەخ، سی و چوار هەزار و دوو سەد و پەنجا و پێنج ستادیۆ بوو.
ئەو وەخت و زەمانەی بۆ چوون و گەڕانەوە سەرفکرا، ساڵێک و سێ مانگ بوو.

## ژیاننامەی گزنفۆن

مێژووناس و فەیلەسوف، گزنفۆن کوڕی غریلۆس و دیۆدۆرا بوو. بنەماڵەی ناوبراو خەڵکی ئێرخییێئۆ و دەوڵەمەند و لە چینی ئەسپ سواران بوو. زانیارییەکان سەبارەت بە کاتی لەدایکبوونی گزنفۆن تۆزێک جیاوازن. دەکرێ بگوترێ کە لە نێوان ساڵەکانی ٤٤٠ و ٤٢٥ی پێش زاییندا بووە. لە کتێبی ئاناباس‌دا، تەمەنی گزنفۆن زیادتر لە سی ساڵ وەبەرچاو دەکەوێ. ئەگەر ئەو بۆچوونە ڕاست بێ، ئەوە دەوروبەری ٤٣١ی پێش زایین لەدایک بووە. لە سەردەمی لاوەتیدا قوتابی سوقڕات بووە. دیۆیێنیس لائێرتیس سەبارەت بە یەکەم چاوپێکەوتنی سوقڕات و گزنفۆن دەڵێ: " سوقڕات لە کۆلانێکدا تووشی گزنفۆن دەبێت. سوقڕات بە وەکازی دەستی پێش بە گزنفۆن دەگرێ و لێیدەپرسێ، مرۆڤ لە کوێ و چۆن دەتوانێ شایستە و خۆشەویست بێ؟ ". گزنفۆنی لاو ناتوانێ وڵامی پرسیارەکە بداتەوە.

فەیلەسوفی گەورەی یۆنانی باستان پێیدەڵێ: " ئەو شوێنەی جێگای فێربوونە ". سوقرات هەر لەو کاتییەوە دەبێتە خاوەن قوتابییەکی نوێ.

گزنفۆن کاتێک مەزنتر بوو، بەپێی داب و نەریتی نەجیبزادەکانی ناوچەی ئەتیکی (ئاتێن) خەریکی وەرزیش کردن و هۆگری زۆرەوانی و ئەسپ سواری و ڕاو و شکار بوو. هەر لەبەر ئەو چەشنە ژیانەش نەیتوانی لە پرسیاری سوقرات تێبگات. بەردەوام پێیوابوو سوقرات مامۆستایەکی سادەی خاوەن ڕەوشتی دروست و ژیانی شارستانیانەیە. هەڵبەت ئەوە بەو مانایە نەبوو کە ڕەفتار و بۆچوونەکانی سوقرات کارتێکەرییان لەسەر ناوبراو نەبووبێ.

ساڵی ٤٠١ی پێش زایین پرۆکسێنۆس ڤیۆتی کە لە شاری سارد دەژیا و دۆستی گزنفۆن بوو، داوای لێکرد بەشداری لەشکرکێشی کوروشی مناڵکار دژی براکەی واتە ئەردەشیر پاشای دووهەم بکا. گزنفۆن وەختێک داوەتنامەکەی پرۆکسێنۆسی خوێندەوە، نێوەرۆکەکەی بە سوقرات راگەیاند و بیروڕای ئەوی پرسی. فەیلەسوفی مەزن، بەپێی بیرکردنەوەیەک لە شەڕی پێلۆپۆنیسۆس کە لەوێدا کوروش دژی ئاتێنییەکان واتە هاوڵاتیانی گزنفۆن، یارمەتی لاکێدێمۆنییەکانی دابوو، لەوە نیگەران بوو کە قوتابییە نوێیەکەی ڕەنگە ببێتە دۆستی کوروشی مناڵکاری ئاسیایی و لەلایەن خەڵکی خۆیەوە سەرکۆنە بکرێ و بەچاوی سووکەوە سەیربکرێت. سوقرات لەبەر ئەو نیگەرانییە داوای لە گزنفۆن کرد بچێتە مەعبەدەکانی دێلفووس و لە خواوەندی چارەنووس پرسیاری ئاکامی ئەو سەفەرە بکا.

گزنفۆن پێشنیارەکەی سوقراتی پەسند کرد بەڵام ئەو لە ئاپۆلۆنی پرسی کە بۆ کام خوا قوربانی بکا تا سەرکەوتن لەو سەفەرەدا وەدەست بێنێ و بە ساغ و سڵامەتی بگەڕێتەوە دواوە. ئاپۆلۆن بە نێوهێنانی چەند خواوەندێک وڵامی گزنفۆنی داوە. گزنفۆن وڵامەکەی بە سوقرات گوتەوە. دەرکەوت کە گزنفۆن پرسیاری بە شێوەیەکی دروست لە خواکان نەکردبوو. ئەو نەیپرسیبوو ئاخۆ بچێ یان‌نا. لەجیات ئەوەی ڕەزایەتی خواکان لەسەر چوون و نەچوون بپرسێ، پێشتر بڕیاری چوونی دابوو و تەنیا پرسیاری زەرەر و

زیان و خێر و بێری لە خواکان کردبوو و قوربانی پێشکەش کردبوون. سوقرات دەستبەجێ لە مەبەستی گزنفۆن گەیی و لەگەڵیشی باسکرد.

جیا لەو باسە، گزنفۆن گەیشتە ئاسیا و لەپاڵ کورۆش بەشداری لە لەشکرکێشی ناوبراودا کرد. لە کتێبی ئاناباس‌دا بە وردی باسی ئەو سەفەر و بەسەرهاتانە دەکات. گزنفۆن لە کتێبی پەروەردەی کورۆش‌دا، ژیانی ئەو شازادە لاوە دێنێتە بەرباس. هونەر و لێهاتوویی و هەستی خۆشەویستی کورۆش لە بەرامبەر یۆنانییەکاندا زەق دەکاتەوە. کورۆش کاتێک ڕوو لە یۆنانییەکان دەکات، دەڵێ: " من بۆیە یۆنانییەکانم وەک هاوپەیمان هەڵبژاردوە چونکە لەباری چینایەتییەوە باڵاتر لە زۆربەی بەربەرەکانی دیکەن. نەک لەبەر ئەوەی کە هێزی نیزامی بەربەر لە لەشکرەکەمدا کەم بێت ". یۆنانییەکان هەمیشە خاوەن ئازادی و سەربەستی خۆیان بوونە و ئامادەنەبوونە بە هیچ شێوەیەک ئەو ئازادییە لەدەست بدەن. کورۆش پێیوابوو کە ئەخلاق و ڕەوشتی جوانی یۆنانییەکان تەنیا بەرهەمی ئەو ئازادییەیە.

سەبارەت بە پلە و پایەی گزنفۆن لەنێو لەشکری کورۆش و بارەگاکەیدا هیچ زانیارییەکی ئەوتۆ لەگۆڕێدا نییە. گزنفۆن دوای مەرگی کورۆش لە شەڕی کوناکسا و پاش کوژرانی ناجوامێرانەی سەرکردەکانی لەشکری یۆنانی بەدەست تیسافێرن، ناچار بوو ڕێنوێنی سەربازەکانی لەشکری یۆنان بکا. گزنفۆن بە سەرکەوتنەوە سەرکردایەتی لەشکری یۆنانی کرد و دوای دەرباز بوون لە مەترسیەکی زۆر لە چیاکانی کاردوخ و ئەرمەنستان و دوایەش ترابزۆن ڕزگاری هات و گشتیان گەڕانەوە هەرێمی بیزانس. وەختێک گەیشتنە ناوچەی تراکی، لەلایەن سێڤتیس وەرگیران و لە کۆتاییدا ناوبراو بێ مووچە و ئەرزاقی هێشتنەوە. گزنفۆن توانی لەشکر لەو بارودۆخەشدا ئارام بکاتەوە و بیگەیێنێتە ناوچەی پێرغامۆ و ڕادەستی فەرماندەی سپارتی بەناوی تێڤرۆناسی لاکێدیمۆنی بکا کە ئەو کاتە دژی تیسافێرن و فارناڤازۆس لە شەڕدا بوو.

ئەو سەردەمە سپارتییەکان توانیان یۆنانییەکانی ئاسیای بچووک لەدەست دوو قوڵە پاشای فارس ڕزگار بکەن. ئەوەش بگوترێ کە گزنفۆن بەدڵەوە

بەشداری ئەو شەڕانەی کرد. کاتێک ئاییسیلائۆس بوو بە پاشای لاکیدێمۆنییەکان، دۆستی نیزیکی گزنفۆن بوو. گزنفۆن لە ڕێگای وڵاتی تراکیڕا گەیشتە ڤیۆتیا (ساڵی ٣٩٤ی پێش‌زایین) و لەگەڵ ئاییسیلائۆس کە دژی تیڤایۆنەکانی هاوپەیمانی ئاتێنییەکان لەشەڕدا بوو، چووە شەڕی کۆرۆنیاس و لەپاڵ سپارتی‌یەکان دژی هاوڵاتیانی خۆی کەوتە بەربەرەکانی. هەر لەبەر ئەو هۆیەش بوو کە ئاتێنییەکان گزنفۆن‌یان بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ دەرکرد. تاوانەکەشی هاوکاری کوروش و یارمەتیدانی لاکیدێمۆنییەکان بوو.

ئەوەی ڕوون و ئاشکرایە کە دوورخراوەیی گزنفۆن لە سەردەمی هێرشەکانی کوروش‌دا نەبووە و زۆریش دواتر بووە. ئەوەمان لە کتێبی ئاناباس‌دا بۆ دەردەکەوێ. ناوبراو کاتێک لە تراکی بوو، خۆی ئامادەکرد کە بچێتەوە وڵاتەکەی واتە ئاتێن. گزنفۆن کاتێک لە ئاتێن دوور خرایەوە، تەواوی سەروەت و سامانەکەی لەدەستدا. لاکیدێمۆنییەکان بە بەخشینی زەوی و مڵک و ماڵی زۆر ئەو زەرەرەیان بۆ قەرەبوو کردەوە و ناوبراو لە سکیلووندا نیشتەجێ بوو. گوندی سکیلووندا ڕێگای سەعاتێک لە ئۆلیمبیا دوور بوو. گزنفۆن لەو دێیە چەند دێر و مەعبەدی بۆ حورمەت گرتنی ئێفێسیۆس ئارتیمیداس دروست کرد.

گزنفۆن لە گوندی سکیلووندا لەگەڵ ژنەکەی بەناوی فیلیسیا و دوو کوڕەکانی واتە غریلۆس و دیۆدۆرۆس ژیا. ناوبراو ساڵی ٣٠٠ی پێش میلاد فەوتی کرد. گزنفۆن دوای خۆی ژمارەیەک بەرهەمی بەنرخی جێهێشت کە لێرەدا ناوی هێندێکیان ئەوانەن:

ئاناباس، پەروەردەی کوروش، هەواڵ و زانیارییەکانی یۆنان، بیرەوەرییەکانی سوقرات، بەزم، باسێکی ئابووری، ڕاو، فەرماندەی سوارە نیزام، سوارکاری، داهات و دەرامات، ئیستیدلالی سوقرات، هیرۆن، ئاییسیلائۆس و هتد.

من دەمزانی بەشی زۆری زانیارییەکان کە لەسەر ئەو کتێبە هەن، ڕاستە وخۆ لە تەرجەمەی فارسی، عەرەبی یا تورکی وەرگیراون. بەتایبەت فارسییەکە لە تەرجەمەی فەڕانسەویڕا و لە سەردەمی قاجار وەرگێڕدراوەتەوە سەر فارسی. بە ئاشکرا دەسکاری کراوە. کاتێک وەرگێڕاوی فارسییەکە و ئەسڵی یۆنانییەکەم لەبەریەکدانا، ئەوسا بۆم دەرکەوت کە بەهەڵە نەچوومە و بۆچوونە کەم درووستە. ئەوەی ئێستا تۆی بەڕێز دەیخوێنییەوە، دەقی یۆنانییەکەیەتی. من دوو جۆر چاپی یۆنانی ئاناباسم لەبەردەستدا بوو. هەردووک چاپیان پێداچوونەوە و تەئیدی بەشێکی زۆر لە ماموستایانی بەشی مێژووی زانستگاکانی یۆنانیان لەسەرە. پاش فەترەیەک بەراورد لەنێوان فارسی و یۆنانییەکە، بۆم دەرکەوت کە ئێرانییەکان یا واباشترە بڵێم فارسەکان، ئەو کتێبەیان بەدڵی خۆیان تەرجەمە کردوەتەوە. لە هیچ شوێنێکی کتێبی ئاناباس دا وشەی ئێران و ئێرانی بەکار نەهاتووە و لەجیات ئەوانە واژەی بەربەر نووسراوە. فارسەکان لەو شوێنانەی باسی خۆیان هاتووەتەگۆڕێ، لەجیات وشە ی بەربەر گورجێک فارس یا ئێرانیان نووسیوە. بەڵام لەو جێگایانەی باسی کورد و نەتەوەکانیتر کراوە، وشەی بەربەر وەک خۆی ماوەتەوە و دەستی لێنە دراوە. لە زۆر شوێن تێکستەکە یا هەر تەرجەمە نەکراوەتەوە، یا ئاڵوگۆڕی بە سەردا هاتووە و هیچ پێوەندییەکی بە ئەسڵی ماناکەوە نیە و هتد. بە باوەڕی من ئەوەندەش بۆ دابەزینی نرخ و قیمەتی وەرگێڕدراوێک بەسە.

وەرگێڕ

خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

MUKIRYANI HOUSE FOR PRINTING AND PUBLISHING

www.Mukiryani.com

2013

بایی (٥٠٠٠) دینارە